ناوی کتێب: ناسینی هاوەڵان(ﷺ) - بەرگی سێیەم -

ناوی نووسەر: نهاد جلال حبیب الله

بابەت: مێژوویی

دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن

دیزاینی تێکست: دانا حەسەن

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٣

چاپ: ناوەندی ڕێنوێن

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (٢٢١٩)ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.

لە بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی میعراج بۆ توێژینەوە و گەشەپێدان







ڕێکخراوی میعراج
بۆ توێژینەوە و گەشەپێدان




ناوەندی ڕێنوێن



07511408868 - 07501269689



hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com



سلێمانی - بازاڕی کاسۆمۆڵ - نهۆمی دووەم
دوکانی ژمارە (٤٥)

## ٥٧٥. جابانی باوکی مەیموون(ﷺ)

جابان کوڕێکی هەبوو بە ناوی مەیموون کە فەرموودەی لە هاوەڵانەوە گێڕاوەتەوە[١] و فەرموودەی لە باوکیشیەوە گێڕاوەتەوە.[٢]

جابان هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و کورد بوو، هەروەک ئیبن ئەثیر لە باسی مەیموونی کوریدا هێناویەتی (مەیموونی کوردی لە باوکیەوە-فەرموودەی گێڕاوەتەوە- کە دەوترێت ناوی باوکی جابان بووە).[٣]

ئەبووخالید دەڵێت: لە مەیموونی کوڕی جابانی صەردیم بیست لە باوکیەوە دەیگێڕایەوە زیاد لە جارێک و دوو جار تا دەگەیشتە دە جار لە پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو (من تزوج امرأة و هو ينوي ألا يعطيها الصداق لقي الله و هو زان)،[٤] (هەرکەس ئافرەتێک مارە بکات و نیازی ئەوەی هەبێت مارەییەکەی پێ نەدات ئەوە کە دەگاتەوە بە خوا وەک زیناکار دەگاتەوە بە خوا).

لە گێڕانەوەکەی طەبەرانیشدا هاتووە:

لە مەیموونی کوردی لە باوکیەوە دەڵێت: نە جارێک و نە دوو جار و نە سێ جار و زیاتر لەوەش بەڵکو دەگاتە دە جار لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو (أيما رجل تزوج امرأة بما قل من المهر أو كثر ليس في نفسه أن يؤدي إليها حقها، خدعها، فمات ولم يؤد إليها حقها، لقي الله يوم القيامة وهو زان)،[٥] (هەر پیاوێک ئافرەتێک مارە بکات بە مارەیی کەم بێت یان زۆر و لە نیەتیدا بە تەما

---

[١] سنن أبي داوود، الرقم ١٥٩٢،

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٢٩.

[٣] أسد الغابة، ج٦، ص ٣٧١.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٢٩.

[٥] المعجم الأوسط للطبراني - باب الألف - من اسمه أحمد - أحمد بن القاسم البرتي، الرقم ١٨٥١، صححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب، الرقم ١٩٢١.

نەبێت مافەکەی ئەو ژنە بدات، هەڵیبخەڵەتێنێت، جا ئەو پیاوە کە مرد و مافی ئەو ژنەی نەدابوو، ئەوە کە رۆژی دوایی دەگاتەوە بە خوا وەک زیناکار دەگاتەوە بە خوا).

ئەم فەرموودەیە کە لە جابانەوە گێردراوەتەوە ئاماژەیە بەوەی کوردیش گەیشتوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، سەبارەت بەوەی ئایا وەک تاکەکەس چووە یان وەک وەفد چووە ئەوەیان روون نیە، دەتوانین چەند ئەگەرێک باس بکەین:

**یەکەم:** ئەگەر جابان وەک وەفد بچوایە ئەوا موسڵمانبوونی بە لێشاوی کورد لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) بەدیدەکرا و کوردانێکی تر دەچوونە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و فەرموودەیان لێوە دەگێڕایەوە وەک چۆن لە هۆزەکانی تردا بەدیدەکرا.

**دووەم:** ناوچەی حیجاز بۆ کوردەکان ناوچەیەکی دوور نەبووەو بەهۆی بوونی رێی بازرگانیەوە گونجاوە ئەو هاوەڵە کوردە رێی کەوتبێتە ئەوێ و لەو کاتەشدا سەردەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ) بووبێت.

**سێیەم:** دەبینین جابان پەیامی خوای گەیاندووە بە مەیموونی کوڕی کە ئەمەش ئاماژەیە بەوەی جابان هەوڵیداوە پەیامی ئیسلام بڵاو بکاتەوە، جا چ لەسەر ئاستی خێزانەکەی خۆی بووبێت و ترسی هەبووبێت لەوەی خەڵکی دەوروبەری پەیامەکەی وەرنەگرن و خێرا بیکوژن وەک چۆن نموونەی وا لەناو هۆزە عەرەبەکاندا روویدا، یان لەوانەشە پەیامەکەی گەیاندبێت بە خەڵکی تریش.

بەهەرحاڵ ئەوەی دڵنیایەو ئەگەر نیە، ئەوەیە جابان پەیامی ئیسلامی گەیاندووە بە مەیموونی کوڕی و فەرموودەیەکیشی بۆ گێڕاوەتەوە کە لە پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیستووە.

هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جابان ماوەیەکی زۆر لە خزمەت

پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بووە، چونکە دەڵێت: دە جار ئەو فەرموودەی لە پێغەمبەر(ﷺ) بیستووە، بە دڵنیاییشەوە پێغەمبەر(ﷺ) لەیەک کاتدا دەجار ئەو فەرموودەی دووبارە نەکردوەتەوە، بەڵکو ئەگەر لە یەک کاتدا زۆریش دووبارەی کردبێتەوە سێ جار بووە وەک ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هەندێ فەرمایشتی سێ جار دووبارە کردوەتەوە، ئیتر ئایا جابان ماوەیەک لەوێ ماوەتەوە بۆ نموونە مانگێک لەوێ بووبێت و پێغەمبەر(ﷺ) لەو ماوەدا ئەوەندە دووبارەی کردبێتەوە، یان جابان چەند جارێک سەردانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کردبێت و هەر جارەو ئەو فەرموودەی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیستبێت.

سەبارەت بە حوکمی فەرموودەکەش سەبارەت بە مەسەلەی مارەیی، ئەوا دەبێتە ئەرکی سەرشانی پیاو هەر مارەییەکی دانا بۆ ئەو ئافرەتەی کە مارەی دەکات، ئەو مارەییەی بدات، چونکە ئەگەر نیازی هەبێت ئەو مارەییە نەدات و تەنها بۆ بەڕێکردنی هاوسەرگیریەکە بەڵێ بکات ئەوە بنەڕەتی ئەو هاوسەرگیریە دانەمەزراوەو وەک فەرموودەکە ئاماژەی پێداوە حوکمی زیانی دەبێت بۆی، ئەوە جیایە کە هاوسەرەکەی گەردنی ئازاد بکات نەیەوێت، ئەمە جیاوازە لەوەی پیاوەکە نیازی پێنەدانی مارەییەکەی هەبێت، جا ئەگەر بەس نیازەکە ئەو حوکمەی هەبێت دەبێت حوکمی ئەوە چی بێت کە مارەییەکەی لەدەستدایەو ئەمەش دەزانێت و مارەییەکەش نادات.

زۆر جار بووک وادەکات زاوا تووشی ئەو تاوانە بکات، ئەویش بەوەی مارەییەکی لێ داوا دەکات کە بە دڵنیاییەوە زاوا ناتوانێت ئەو مارەییە بدات، بەڵام بۆ سەرگرتنی ئیشەکە بەڵێ دەکات، جا با هەردوولا وریای داوەکانی شەیتان و سنوورەکانی خوا بن.

هەروەها جابان فەرموودەیەکی تری لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە ئەمە بەسەرهاتەکەیەتی:

ئەبی خەلدە دەڵێت: مەیموونی کوردی لای مالیکی کوڕی دینار بوو، مالیک پێی وت: ئەوە چیە مامۆستای فەرموودە لە باوکیەوە فەرمووده‌مان بۆ ناگێڕێتەوە، خۆ باوکی تۆ گەیشتووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و فەرموودەی لە بارەوە گێڕاوەتەوە، مەیموونیش وتی: باوکم فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بۆ نەدەگێڕاینەوە لە ترسی ئەوەی نەبادا کەم و زیادی تێدا بکات، باوکم دەیوت: بیستوومە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (من كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار)،[1] (هەرکەس بە ئەنقەست درۆیەکم بە دەمەوە بکات، با شوێنی خۆی لە دۆزەخ دیاری بکات).

لێرەوە دەردەکەوێت چوونی جابان بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) هێندە دیار بووە کە لە مەدینەدا دەنگی داوەتەوەو موسڵمانانێکی زۆریش ئاگادار بون بەوە.

مەسەلەیەکی ترکە پێویستە بیخەینە روو و ئاماژەیەکی ترە بە پەیوەندی کورد و پیغەمبەری خواوە(ﷺ)فەرموودەیەکە کە لە سونەنی ئەبوداوودا هاتووە:

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: جارێک پێغەمبەر(ﷺ) بە جلێکی رەشەوە (خمیصە) نوێژی دەکرد کە برێک گوڵنگە و شتی رازاندنەوەی پێوە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەم گوڵنک و رازاندنەوانەی ئەم جلەم لە نوێژەکەم سەرقاڵم دەکەن، ئەمە ببەن بۆ ئەبوو جەهم و ئینبیجانیەتەکەی ئەوم بۆ بهێنن... ئەوەبوو جلێکی کوردی ئەبوو جەهمی کردەبەری.[2]

وشەی ئینبیجانیەت وا پێناسەی هاتووە کە جلێکی لە خوری دروست کراو و زۆر زبرە.[3]

بەو پێیە بێت دەبێت ئەو جلەی پێغەمبەر(ﷺ) شتێکی وەک شاڵ بوو بێت.

[1] المعجم الاوسط للطبراني، الرقم ٦٣٢٢، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٦٤٧٦.
[2] سنن أبي داود - كتاب الصلاة - باب النظر في الصلاة، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٩١٥.
[3] النهاية في غريب الحديث و الأثر، ج١، ص ٧٣.

## ٥٧٦. جابیری کوڕی سەمورە(ﷺ)

ناوی جابیری کوڕی سەمورەی کوڕی جونادەی کوڕی جوندەبی کوڕی جوحەیری عامریە، کونیەکەی ئەبووخالید یان ئەبووعەبدولایە.

سەمورەی باوکیشی یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و فەرموودەیشی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[1]

دایکی جابیر ناوی خالیدەی کچی ئەبی وەققاصە کە خوشکی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصە.[2]

جابیر هێندە لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بووە کە خۆی دەڵێت: زیاد لە جار و دووجاریش لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی هەردوو جەژنەکەم کردووە کە بانگ و قامەتیان نەبوو،[3] ئەمە ئاماژەیە بەوەی جابیری کوڕی سەمورە ماوەیەکی زۆر لە نزیکی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بووە، چونکە وەک دەزانین لە ساڵێکدا دوو جەژن هەیە، ئەویش دەڵێت: زیاتر لە دووجار لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) نوێژی دوو جەژنەکەم کردووە.

جابیری کوڕی سەمورە دواتر پاش سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ کووفەو لەوێ نیشتەجێ بوو و لەوێ خانوویەکی دروست کرد و مایەوە تا لە سەردەمی والیەتی بیشری کوڕی مەروان لەسەر کووفە لە ساڵی حەفتاو چواری کۆچی لە کووفە مرد،[4] عەمری کوڕی حریثیش نوێژی مردووی لەسەر کرد، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو لە ساڵی شەست و شەشی کۆچیدا وەفاتی کرد،[5] ذەهەبی دەڵێت: راستتر ئەوەیە لە سەردەمی بیشری

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣١٢.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٤.

[3] صحيح مسلم - كتاب صلاة العيدين، الرقم ٨٨٧.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣١.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٣.

کوڕی مەڕواندا مردووە.[1]

لـە جەنگـی مەدائینـدا جابیـر بەشـداری کـرد و خـوای گـەورە فەتحـی مەدائینـی بەخشـی بـە موسـڵمانان،[2] کە جەنگەکە تـەواو بـوو سـەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دوو کۆیلـەی لـە نـەوەی کیسـراکان بەخشـی بـە جابیری کوڕی سـەمورە، جابیریـش ئەوانـی ئـازاد کـرد.[3]

جابیـر دوای خـۆی چـوار کـوڕی جێهێشـت کـە بریتـی بـوون لـە خالیـد و موسـلیم و ئەبووجەعفـەر و جوبەیـر،[4] بـەڵام ذەهەبـی دەڵێت: ئـەم کوڕانـەی لـەدوای خـۆی جێهێشـت (خالیـد، طەلحـە، سـالم).[5]

جابیر سـەردانی ماڵـی پێغەمبـەری(ﷺ) دەکرد وەک خۆی دەڵێت: جارێک چـووم بـۆ ماڵـی پێغەمبـەر(ﷺ) بینیـم پێغەمبـەر(ﷺ) شـانی دادابـوو بەسـەر پشـتیەکەوە.[6]

سـەماکی کوڕی حـەرب دەڵێت: بـە جابیری کوڕی سـەمورەم وت: ئایا تۆ لـە کۆڕی پێغەمبـەردا(ﷺ) دادەنیشـتیت؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبـەر(ﷺ) زۆر بێدەنگ دەبـوو، هاوەڵانـی شـیعریان دەوت و باسـی شـتانێکی سـەردەمی نەفامیـان دەکرد و پێدەکەنین، کـە ئـەوان پێبکەنینایـە پێغەمبەریش(ﷺ) بـزە دەیگرت،[7] لـە گێڕانەوەیەکـی تـردا هاتـووە وتـی: بەڵـێ زۆر جـار پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دوای نوێـژی بەیانـی لـە شـوێنی نوێژەکـەی هەڵنەدەسـا تـا خـۆر هەڵدەهـات، هاوەڵانیشـی شیعریان دەوت و باسـی شـتانێکی سـەردەمی نەفامییان دەکرد و پێدەکەنیـن، کـە ئـەوان پێبکەنینایـە پێغەمبەریش(ﷺ) بـزە دەیگرت.[8]

---

[1] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ١٨٧.
[2] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ١٨٧.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٤٨١.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٤.
[5] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ١٨٧.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٤٦٥.
[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٣٧٢.
[8] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٤٢.

جابیری کوڕی سەمورە چەندین فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.

## ٥٧٧. جابیری کوڕی صەخر(رضي الله عنه)

ناوی جابیری کوڕی صەخری کوڕی ئومەییەیە، لە پشتیوانانە، برایەکی هەبوو بە ناوی جەببار.[٩]

ژنەکەی ناوی قوبەیسەی کچی صەیفی بوو، کچێکی لێ بوو بە ناوی عائیشە.[١٠]

جابیر لە بەیعەتی عەقەبەدا بەشدار بوو، بەڵام لە غەزای بەدردا بەشداری نەکرد،[١١] دواتر لە غەزای ئوحود و[١٢] غەزاکانی تریشدا بەشداری کرد.[١٣]

## ٥٧٨. جابیری کوڕی طاریق(رضي الله عنه)

ناوی جابیری کوڕی طاریقی کوڕی ئەبووطاریقی ئەحمەسی بەجلیە، ئیبن حیببان هەریەک لە جابیری کوڕی طاریقی ئەحمەسی و جابیری کوڕی عەوفی ئەحمەسی بەجیا دادەنێت، بەڵام ئیبن حەجەر پێی وایە ئەو دوو کەسە هەر یەک کەسایەتیە، چونکە جار هەیە جابیر بە ناوی باپیرە گەورەیەوە ناودەبرێ (جابیری کوڕی عەوف) یان بە جابیری کوڕی ئەبووطاریق ناوی دێت،[١٤] کونیەکەی ئەبووحەکیمە.[١٥]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی حەکیم کە فەرموودەی لە باوکی و لە هاوەڵانی

---

[٩] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٢.

[١٠] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٣٩٨.

[١١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٢.

[١٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٤.

[١٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٢.

[١٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٢.

[١٥] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٥.

تریشـەوە گێڕاوەتەوە،[1] کەنیزەیەکیشـی هەبـوو کـە جارێـک نـاردی بـۆ لای حەسـەنی کـوڕی عەلـی، کەنیزەکـە کـە گەیشـتە ئـەوێ سـەیری کـرد حەسـەنی کـوڕی عەلـی دەسـتنوێژی دەگرت.[2]

جابیر یەکێک بوو لـە بەشـداربوانی قادسـیە،[3] لـە کووفـە نیشـتەجێ دەبوو[4] و بۆ ریشیشـی رەنگی خەنەیی بەکاردەهێنا.[5]

جابیـر دەڵێـت: جارێـک کابرایەکـی دەشـتەکی هـات و کەوتـە پیاهەڵدانـی پێغەمبـەر(ﷺ) تـا لادەمـی کەفـی کـرد، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (عليكم بقلة الكلام ولا يستهوينكم الشيطان فإن تشقيق الكلام من شقائق الشيطان)،[6] (قسـەی کـەم بکـەن و شـەیتان بەلارێتـان نەبـات، چونکـە زۆر قسـەکردن و لەسـەر رۆیشـتنی بـرای شـەیتانە).

ئەلبانی حوکمی لاوازی داوە بەسەر ئەم گێڕانەوەدا.

## ٥٧٩. جابیری کوڕی نوعمان(ﷺ)

نـاوی جابیـری کـوڕی نوعمانـی کـوڕی عومەیـری کـوڕی مالیکـی بەلویـە، هاوپەیمانـی پشـتیوانان بـوو.[7]

## ٥٨٠. جابیری کوڕی حابیس(ﷺ)

نـاوی جابیـری کـوڕی حابیسـی یەمامیـە،[8] فەرموودەیەکـی لـە پێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) گێڕاوەتـەوە کـە دەڵێـت: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (من قال علي ما

[1] سنن ابن ماجة، الرقم ٣٣٠١، السنن الصغرى للنسائي، الرقم ٤٥١٥.
[2] مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ١٥٥٧.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٢.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٥.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٢.
[6] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٤٢٧، أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٦، ضعفه الألباني في ضعيف الجامع الصغير و زيادته، الرقم ٣٧٨٨.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٠.
[8] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧١.

لم أقل فليتبوأ مقعده من النار)،[1] (هەرکەس قسەیەک بەناوی منەوە بڵێت کە من نەموتووە با شوێنی خۆی لە دۆزەخدا دیاری بکات).

ئیبن حەجەر سەبارەت بەم فەرموودەیە دەڵێت: سەنەدەکەی مەجهووڵە.[2]

## ٥٨١. جابیری کوڕی حارث(ﷺ)

ناوی جابیری کوڕی حارثی عەبدیە، یەکێکە لە ئەندامانی ئەو وەفدەی کە لەگەڵ ئەشجەعدا هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوون.[3]

## ٥٨٢. جابیری کوڕی خالید(ﷺ)

ناوی جابیری کوڕی خالیدی کوڕی مەسعوودی کوڕی عەبدولئەشهەلە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان لە بەنی نەججار،[4] ژنەکەی ناوی عومەیرەی کچی سەلیمە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدورەحمان، بەڵام نەوەی جێنەهێشت.[5]

لە غەزای بەدر[6] و ئوحودیشدا بەشداری کرد.[7]

جابیر دوای خۆی نەوەی جێنەهێشت.[8]

## ٥٨٣. جابیری کوڕی سوفیان(ﷺ)

ناوی جابیری کوڕی سوفیانی ئەنصاری زورقیە، سوفیانی باوکی لەگەڵ مەعمەری کوڕی حەبیبدا لە مەککە هاوپەیمانی هەبوو، بۆیە لە مەککە نیشتەجێ بوو.[9]

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٤٤٥، أسد الغابة، ج١، ص ٣٧١.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٠.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٠.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧١.
[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٢٠.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٠.
[7] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧١.
[8] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧١.
[9] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٢١، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣١.

جابیر برایەکی تری هەبوو بە ناوی جەنادە کە دایک و باوکیشیان یەک بوو، هەروەها برایەکی تریشی هەبوو بە ناوی شورەحبیل کە لە سەری دایکەوە برای ئەو دوانە بوو، چونکە سوفیان کاتێک لە مەککە بوو دایکی شورەحبیلی بەهاوسەرگرت.[١]

دایکیان ناوی حەسەنە بوو کە ئافرەتێکی عەدوی بوو، شورەحبیلی کوڕی هەر بە ناوی ئەوەوە بانگ دەکرا و بە شورەحبیلی کوڕی حەسەنە ناسرابوو.[٢]

سوفیان کە لە مەککە بوو لەوێ موسڵمان بوو و کۆچی کرد بۆ حەبەشە، دواتر جابیر و جەنادەو سوفیانی باوکیان هەرسێیان پێکەوە لە خاکی حەبەشەوە لە دوو بەلەمی جیادا گەڕانەوە.[٣]

لە ساڵی سێیەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتتابدا جابیر کۆچی دوایی کرد،[٤] جەنادەی برایشی هەر لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا کۆچی دوایی کرد.[٥]

## ٥٨٤. جابیری کوڕی ظالیم(ﷺ)

ناوی جابیری کوڕی ظالیمی کوڕی حارثەی کوڕی عیتابی بەحتەری طائیە، وەک وەفد هاتوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بووە، پێغەمبەریش(ﷺ) نامەیەکی بۆ نووسی.[٦]

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٢.
[٢] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ١٢٧.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣١.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣١.
[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٢.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٣.

## ٥٨٥. جابیری کوڕی عەبدوڵای عەبدی(رضي الله عنه)

ناوی جابیری کوڕی عەبدوڵا یان کوڕی عوبەیدی کوڕی جابیری عەبدیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا،[١] کونیەکەی ئەبووعەبدوڕەحمان بوو.[٢]

عەبدوڵای کوڕی جابیر دەڵێت: کاتێک وەفدی عەبدولقەیس هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) منیش هاتم، بەڵام یەکێک نەبووم لە عەبدولقەیس، لەگەڵ باوکم هاتبووم، کاتێک چووینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) هۆشیاری پێدان کە لەم جۆرە قاپ و قاچاخانەدا خواردنەوە نەخۆنەوە (الدباء، الحنتم، النقير، المزفت) [٣].[٤]

عەبدوڵای کوڕی جابیری عەبدی دەڵێت: پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆچی دوایی کرد من لەگەڵ باوکم چووم بۆ حەج، لە مینا بووین کە باوکم وتی: ئادەی کوڕم وەرە با بڕۆین سەلام بکەین لە حەسەنی کوڕی عەلی، عەبدوڵا دەڵێت: کە چووین بۆ لای حەسەن هەر کە باوکمی بینی سەلامی لێکرد و بە گەرمی پێشوازی لێکرد و ڕێی بۆ کردەوە، ئێمەش دانیشتین، سەبارەت بە چۆڕاوەی-شەربەتی- ناو گۆزە پرسیاری لێکرا، ئەویش مۆڵەتی پێدا، باوکم پێی وت: ئەی باوکی فلان ئەمە دەڵێیت لە کاتێکدا پێغەمبەر(ﷺ) لەو بارەوە وای پێ فەرمووین کە فەرمووی؟ حەسەن وتی: بەڵێ، دوای ئێوە مۆڵەت درا بەوە).[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٥.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٩.

[٣] مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار(رضي الله عنهم) - حديث جابر بن عتيك(رضي الله عنه)، الرقم ٢٤٢٥١.

[٤] سەبارەت بە واتای ئەو وشانە:

الدباء: کوولەکەی خڕ-کوولەکە ئاوی- بوو کە ناوەکەی هەڵدەکۆڵراو خواردنەوەی تێدەکرا.

الحنتم: گۆزەیەک بوو کە ناوەکەی بە چەوری چەور دەکرا، ئیتر چی خواردنەوەی تێبکرایە خواردنەوەکە تێکدەچوو.

النقير: بریتی بوو لە بنی دارخورما کە ناوەکەی هەڵدەکۆڵراو دواتر خواردنەوەی تێدەکرا.

المزفت: ئەو قاپ و قاچاخەی کە ناوپۆش دەکرا بە زفت(کە بریتی بوو لە ماددەیەکی ڕەشی ڕەق-قیر-).

[٥] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٣٦٠٠.

ئەمە ئاماژەیە بەوەی جابیر کە هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) زوو چووەتەوەو ماوەیەکی زۆر نەهاتوەتەوە بۆ ئەوێ تا پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کردووە، هەروەها ئاماژەیە بەوەی جابیر زۆر بە جوانی ڕێنمایی و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەبەرکردووەو بیری ماوە.

لە گێڕانەوەیەکی تردا عەبدوڵا دەڵێت: لەگەڵ باوکم (جابیری عەبدی)حەجم کرد، ئینجا ڕێی مەدینەمان گرتەبەر، باوکم وتی: ئەرێ بۆ نەڕۆین سەرێک بدەین لە دایکی باوەڕداران؟ وتم: زۆر باشە، ئەوەبوو سەرکەوتین بۆ لای و چووین بۆ لای، من گوێم دەگرت و باوکیشم قسەی لەگەڵ دایکی باوەڕداران دەکرد، باوکم وتی: من لەو وەفدە بووم کە لە بەحرەینەوە هاتن، ئایا هیچت بیستووە لە پێغەمبەر(ﷺ) دوای چوونەوەی ئێمە هیچ لەو جۆرە خواردنەوانەی مۆڵەت پێ دابێت کە پێشتر بە حەرامی دانابوون؟ دایکی باوەڕدارانیش وتی: نا.[1]

ئەمەش ئاماژەیە بە گەورەیی و زانایی دایکی باوەڕداران تا ئاستێک کەسانی دووریش زانیویانە عائیشەی دایکی باوەڕداران شارەزاییەکی کەموێنەی هەیە لە ئیسلامدا لەبەر نزیکی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ).

ئەم هاوەڵە دواتر لە بەصرە نیشتەجێ بوو، ڕایەکیش دەڵێت: بەڵکو لە بەحرەین نیشتەجێ بوو.[2]

جا پێدەچێت سەرەتا لە بەحرەین نیشتەجێ بووبێت و دواتر چووبێت بۆ بەصرە.

## ٥٨٦. جابیری کوڕی عەبدوڵای کوڕی ڕیئاب(رضي الله عنه)

ناوی جابیری کوڕی عەبدوڵای کوڕی ڕیئابی کوڕی نوعمانی کوڕی سینانە،[3] لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[4]دایکی ناسراوە بە ئوم جابیری

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٥.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٩.
[3] الطبقات كالبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٧٤.
[4] دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢٢٠.

کچی زوهەیر.[1]

یەکێکە لەو شەش کەسەی کە لە بەیعەتی عەقەبەی یەکەمدا بەشدار بون، ئەو شەش کەسەش بریتی بوون لە ئەسعەدی کوڕی زورارەو جابیری کوڕی عەبدولای کوڕی ریئاب و قوطبەی کوڕی عامر و رافیعی کوڕی مالیک و عوقبەی کوڕی عامری کوڕی زەید و عەوفی کوڕی مالیک، هەموویان لەوێ موسڵمان بوون.[2]

ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: یەکێکە لەو یەکەم موسڵمانبوانەی -پشتیوانان- کە لەپێش عەقەبەی یەکەمدا موسڵمان بوو.[3]

کاتێک ئەم شەش کەسە لە مەککە گەیشتن بە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئێوە لە کێن؟ وتیان: لە خەزرەجیەکان، فەرمووی: ئایا لە هاوپەیمانانی جوولەکەن؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ئەی بۆچی دانانیشن تا قسەتان لەگەڵ بکەم؟ وتیان: باشە، ئەوەبوو لەگەڵیدا دانیشتن و ئەویش بانگی کردن بۆ لای خوا و باسی ئیسلامی کرد بۆیان و قورئانی خوێندەوە بەسەریاندا، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) قسەی کرد بۆیان و بانگی کردن بۆ لای خوا، ئەوان لەنێو خۆیاندا بە یەکتریان وت: بەخوا دەزانن ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە جوولەکە ئێوەی پێ دەترسێنێت-کە بێت ئەوان شوێنی دەکەون و کوشتاری ئێوە دەکەن-، دەی با جوولەکە پێش ئێوە نەکەون-لە شوێنکەوتنیدا-، بۆیە چوون بە دەم بانگەوازەکەیەوەو و بڕوایان پێ هێنا و چی بۆ باس کردبوون سەبارەت بە ئیسلام قبووڵیان کرد، ئینجا وتیان: ئێمە لای هۆزی خۆمانەوە هاتوین و ئەو دژایەتیەی لەنێوان ئەواندا هەیە لەنێوان کەسدا هێندە دژایەتی نیە، بەڵکو خوای گەورە بەهۆی

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٧٤.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٣.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢١٩.

تۆوە یەکیان بخات، ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ لایان و بانگیان دەکەیت بۆ پەیامەکەت، ئەگەر خوا کۆیان بکاتەوە-لەسەر پەیامەکەت- ئەوە کەس لە تۆ شکۆدارتر نابێت، ئیتر گەڕانەوە بەرەو وڵاتی خۆیان، ئەوانەش شەش کەس بوون لە خەزرەجیەکان...کاتێک چوونەوە مەدینە بۆ لای هۆزەکەی خۆیان، باسی پێغەمبەری خوایان بۆ کردن و بانگیان کردن بۆ لای ئیسلام تا وای لێهات چی ماڵی پشتیوانان هەیە باسی ئیسلامی پێ گەیشت.[1]

ئەمە بەڵگەیە لەسەر چەند شتێک، لەوانەش:

**یەکەم:** ئاگاداری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە باری خەڵکی مەدینەو ڕێککەوتن و هاوپەیمانێتیەکانیان.

**دووەم:** بێزاری ئەو پشتیوانانە لە جەنگی ناو شارەکەیان و گەڕانیان بۆ دەربازبوونێک لەو تەنگژە و ئاژاوەیە.

**سێیەم:** نەبوونی هیچ کەمتەرخەمییەک لە پێغەمبەری خوادا(ﷺ) سەبارەت بە گەیاندنی پەیامی خوا بە خەڵک و هەر دەرفەتێکی بەهەند وەرگرتووە.

جابیری کوڕی عەبدوڵا لە غەزای بەدر و ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی تریشدا بەشداری کرد.[2]

جابیری کوڕی عەبدوڵای کوڕی ڕیئاب چەند فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە ئیبن حەجەر دەڵێت: سەنەدەکەیان لاوازە،[3] جابیر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە ئایەتی (لهم البشرى في الحياة الدنيا) فەرمووی: ئەوە خەوی باشە.[4]

جابیر پاش وەفاتی خۆی نەوەی لێ بەجێ نەما.[5]

---

[1] دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢٢٠، البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ١٤٩.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٧.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٣.

[4] مسند عبد بن حميد، الرقم ١١٠٦، الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٧٤.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٧٤.

## ٥٨٧. جابیری کوڕی عەبدوڵای کوڕی عەمر(ﷺ)

ناوی جابیری کوڕی عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرامی کوڕی کەعبە،[١] لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان لە سولەمیەکان.

سەبارەت بە کونیەکەی هەریەک لە ئەبووعەبدوڵا و ئەبووعەبدوڕەحمان و ئەبوو موحەممەد هاتووە،[٢] ئیبن ئەثیر دەڵێت: راستتر ئەوەیە کونیەکەی ئەبووعەبدوڵایە.[٣]

جابیر خۆیشی و عەبدوڵای باوکیشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بون،[٤] عەبدوڵای باوکی لە بەشداربوانی عەقەبە بوو و یەکێک بوو لە دوانزە نەقیبەکە.[٥]

دایکی ناوی ئەنیسەی کچی عەنمەی کوڕی عەددیە،[٦]ژنەکەی جابیر ناوی سهیمەی کچی مەسعوودی کوڕی ئەوس بوو کە پوورزای جابیر بوو، لەم ژنەی کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڕرەحمان و کچێکیشی هەبوو کە بە ئوممو حەبیب ناسراوە،[٧] عەبدوڕەحمانی کوڕی فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە،[٨] هەروەها ژنێکی تریشی هەبوو بە ناوی ئوممولحارثی کچی موحەممەد، لەم ژنەشی کوڕێکی هەبوو بە ناوی[٩] موحەممەد کە فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە.[١٠]

جابیر یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەیعەتی عەقەبەی دووەم کە لەگەڵ

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٧.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٤.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٧.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٤.

[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٦١.

[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٦١.

[٧] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٣٣٩.

[٨] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٨٤.

[٩] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٢٧٦.

[١٠] التاريخ الكبير للبخاري، ج١، ص ٥٣.

باوکیدا بەشداری کرد،[1] لەناو ئەو حەفتا کەسەشدا لە رووی تەمەنەوە لە هەموویان بچووکتر بوو.[2]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە تەمەنی جابیری کوڕی عەبدوڵا نۆزدە یان بیست ساڵ بوو، چونکە سەبارەت بە مردنی هاتووە لە ساڵی حەفتا و سێ یان حەفتاو چواری کۆچی و لە تەمەنی نەوەدو چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.[3]

ذەهەبی دەڵێت: دەوترێت جابیر نەوەدو چوار ساڵ ژیاوە، بۆیە لە کاتی جەنگی بەدردا تەمەنی هەژدە ساڵ بووە.[4]

سەبارەت بە بەشداری کردنی لە غەزای بەدردا بوخاری لە ئەبووسوفیان لە جابیرەوە هێناویەتی کە دەڵێت: من لە رۆژی بەدردا ئاوم دەگێڕا بۆ هاوەڵانم، ئیبن حەجەریش دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحە، بەڵام واقیدی ئەو گێڕانەوە بەرپەرچ دەداتەوە.[5]

جابیر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری بیست و یەک غەزا بوو و منیش لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری نۆزدە غەزام کردووە، هەروەها جابیر دەڵێت: بەشدار نەبووم لە غەزای بەدر و ئوحوددا چونکە باوکم رێی پێ نەدام بەشداری بکەم، بەڵام کاتێک لە رۆژی ئوحوددا عەبدوڵا-باوکی- کوژرا ئیتر لە هیچ غەزایەکدا لە پێغەمبەر(ﷺ) دوانەکەوتم.[6]

جابیر دەڵێت: جارێک نەخۆش بووم، پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبووبەکر بە پیادەو بێ سوار هاتن بۆ سەردانم، کاتێک گەیشتنە ئەوێ من لەهۆش خۆم چووبووم، دواتر پێغەمبەر(ﷺ) دەستنوێژی گرت و لە ئاوی دەشتنوێژەکەی پرژاند

---
[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٧.
[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١٩٢.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٤.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١٩١.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٤.
[6] صحيح مسلم - كتاب الجهاد والسير - باب عدد غزوات النبي(ﷺ)، الرقم ١٨١٣.

بەسەرمدا، منیش هۆشم هاتەوە بە خۆمدا، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چی بکەم بە سامانم؟ چۆن داوەری لەسەر بکەم؟ پێغەمبەریش(ﷺ) وەڵامی نەدامەوە تا ئایەتی میرات دابەزی،[1] چونکە ئەوکات جابیر هێشتا خوشکەکانی لەلای بوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی جابیر وا نابینم لەم نەخۆشیەتدا بمریت، خواش ئایەتی دابەزاند و بەشی بۆ خوشکەکانت دیاری کرد.[2]

جابیر دەڵێت: جارێک باوکم فەرمانی کرد خواردنی (خەزیزە) ئامادە کرا، ئینجا بە مندا ناردی بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، منیش بردم بۆی و پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی خۆی بوو، فەرمووی: (ئەی جابیر ئەوە چیە؟ ئایا گۆشتە؟) وتم: نا بەڵکو خواردنی (خەزیزە)یە، ئەویش فەرمانی کرد و خواردنەکەیان لەدەست گرتم، کاتێک گەڕامەوە بۆ لای باوکم وتی: ئایا پێغەمبەری خوات(ﷺ) بینی؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئایا هیچی وت؟ وتم: بەڵێ فەرمووی: (ئەی جابیر ئەوە چیە؟ ئایا گۆشتە؟) باوکم وتی: لەوانەیە پێغەمبەر(ﷺ) تاسەی گۆشتی کردبێت، چوو گێسکێکی سەربڕی و چاک برژێنرا، ئینجا پێی وتم: بیبە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، منیش کە گەیشتمە لای پێغەمبەر(ﷺ) هەر لەو شوێنەی خۆی بوو، فەرمووی: (ئەوە چیە ئەی جابیر) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەڕامەوە بۆ لای باوکم و تی ئایا پێغەمبەری خوات(ﷺ) بینی؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئایا هیچی فەرموو؟ وتم: بەڵێ وای فەرموو، باوکیشم وتی: لەوانەیە پێغەمبەر(ﷺ) تاسەی گۆشتی کردبێت، بۆیە چوو گێسکێکی سەربڕی و چاک برژێنرا، ئینجا پێی وتم: بیبە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (جزى الله الأنصار عنا خيرا، ولا سيما عبدالله بن عمرو بن حرام وسعد بن عبادة)،[3] (خوای گەورە لە بری ئێمە پاداشتی خێری پشتیوانان بداتەوە بەتایبەت عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرام و سەعدی کوڕی عوبادە).

[1] صحيح مسلم - كتاب الفرائض - باب ميراث الكلالة، الرقم ١٦١٦.

[2] السنن الكبرى للنسائي - كتاب الفرائض - ذكر ميراث الأخوات على انفرادهن، الرقم ٦٢٩٠.

[3] المستدرك على الصحيحين - كتاب الأطعمة - أطيب اللحم لحم الظهر ، الرقم ٧١٩١ و صححه و وافقه الذهبي، صححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٤٦١.

کاتێک بڕیار بوو غەزای ئوحود رووبدات، عەبدوڵا جابیری کوڕی بانگ کرد و وتی: -کوڕم- هیوام وایە سبەینێ یەکەم کەس بم بپێکرێم، جا وەسیەتت بۆ دەکەم لەگەڵ کچەکانی عەبدوڵا-خوشکەکانت- باش بە، جابیر دەڵێت: ئەوەبوو بەیانی باوکم کوژرا و دوو دوو تەرمەکان دەخرانە یەک گۆڕەوە، باوکیشم لەگەڵ کەسێکی تر خرایە یەک گۆڕەوە، شەش مانگ وابوو، دواتر دڵم ئۆقرەی نەگرت تا بڕیارم دا بە جیا لەیەک گۆڕدا بیخەمە ژێر خاک، تەرمەکەیم دەرهێنایەوە، بینیم خۆڵ و زەویەکە هیچی بە جەستەی نەکردبوو تەنها تۆزێکی نەرمایی گوێی نەبێت.[1]

عەبدوڵای باوکی جابیر لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و لەو غەزایەشدا شەهید بوو، دواتریش کە تەرمەکان خرانە ژێر خاک هەریەک لە عەبدوڵای کوڕی عەمر و عەمری کوڕی جەمووح خرانە یەک گۆڕەوە.[2]

جابیر دەڵێت: کاتێک تەرمی باوکم هێنرا و تەرمەکەشی شێوێنرابوو، تەرمەکەی هێنرا و لەبەردەم پێغەمبەری خوا(ﷺ) دانرا و بە جلێکیش داپۆشرابوو.[3]

جابیر دەڵێت: کاتێک تەرمی باوکم دانرابوو پۆشاکەکەی سەر دەموچاویم لادەبرد و سەیرم دەکرد و دەگریام، هاوەڵانی پێغەمبەریش(ﷺ) ڕێگرییان لێدەکردم، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگری لێ نەدەکردم،[4] ویستم هەمتر پۆشاکەکەی سەر دەموچاوی لابەرم بەڵام هاوەڵان نەیانهێشت، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لایبرد-یان فەرمانی کرد لابرا- کە دەموچاوی دەرکەوت دەنگی گریانێک بەرزبوویەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە کێیە؟ وتیان: کچی عەمرە،[5] فاطیمەی کچی عەمری پوورم لەسەر تەرمی

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٦٣.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٤٤.

[3] صحيح البخاري - كتاب الجنائز - باب حدثنا علي بن عبد الله، الرقم ١٤٩٣.

[4] صحيح البخاري - كتاب الجنائز - باب حدثنا علي بن عبد الله، الرقم ١٤٩٣.

[5] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب من فضائل عبد الله بن عمرو بن حرام والد جابر، الرقم ٢٤٧١.

باوکم دەگریا، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (تبكين أولا تبكين ما زالت الملائكة تظله بأجنحتها حتى رفعتموه)،[١] (بگریت بۆی یان نەگریت بەردەوام فریشتەکان بە باڵەکانیان سێبەری بۆ دەکەن تا تەرمەکەی هەڵدەگرن).

باوکی یەکێک بوو لە شەهیدانی غەزای ئوحود، دواتریش لە سەردەمی دەسەڵاتی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیاندا کە موعاویە جۆگایەکی بەلای گۆڕی شەهیدانی ئوحوددا راکێشا تەرمی عەبدوڵای باوکی جابیر دەرکەوت، ئەوەبوو پاش ماوەیەکی زۆر جابیر سەرلەنوێ جەستەی باوکی خۆی بینی و تەماشای کرد جەستەی هیچ تێکنەچووبوو.[٢]

لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیاندا موعاویە فەرمانی کرد جۆگایەک رابکێشرێت، ئەوانەی ئیشەکەیان دەکرد نامەیان نووسی بۆ موعاویە کە هەر دەبێت ئەو جۆگەیە بەناو گۆڕستانی ئوحوددا بڕوات، ئەویش نامەی نووسی بۆیان گۆڕەکان هەڵدەنەوە، جابیر دەڵێت: تەرمی شەهیدەکانم دەدی بەسەر شانی ئەو خەڵکەوە بوون دەتوت خەوتون، پاچێک بەر لایەکی قاچی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب کەوت، خوێن لە قاچی هات.[٣]

خێرا جابیر پاش شەهیدبوونی باوکی رێی جیهادی گرتەبەر، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) دوای شکستی ئوحود ویستی سوپا کۆبکاتەوەو بچێت بەدوای بێباوەڕاندا، فەرمانی کرد تەنها ئەو کەسانە بێن کە لە جەنگی ئوحوددا بەشدار بون، جابیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من بۆ ئوحود ویستم بەشداری بکەم کەچی باوکم رێی پێ نەدام، دەی ئێستا دەرفەتم پێ بدە تا بێم لەگەڵتدا، پێغەمبەریش(ﷺ) رێی پێدا، لەو غەزایەدا جگە لە جابیر هیچ کەسی تر نەبوو بەشداری ئوحود نەبووبێت و چووبێت لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ).[٤]

[١] صحيح البخاري - كتاب الجنائز - باب الدخول على الميت بعد الموت، الرقم ١٢٤٤.

[٢] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١٩٠.

[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١١.

[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٤٩.

جابیر دەڵێت: دوای مەرگی باوکم خەڵکێک قەرزیان لای باوکم بوو، منیش داوام لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد داوا لە خاوەن قەرزەکان بکات لە قەرزەکەیان خۆش بن، پێغەمبەریش(ﷺ) داوای کرد لێیان، بەڵام ئەوان رازی نەبوون، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم (اذهب فصنف تمرك أصنافا، العجوة على حدة، وعذق زيد على حدة، ثم أرسل إلي)، (برۆ و خورماکەت بەش بەش بکە، خورمای عەجوە لەلایەک و خورمای عذق لەلایەک، ئینجا بنێرە بەشوێنمدا)، منیش چووم و وامکرد و دواتر هەواڵم نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش هات و لە سەروو یان لە لای ناوەڕاستی خورماکانەوە وەستا، پاشان فەرمووی: (بیکێشە بۆ خەڵک)، منیش بۆم دەکێشان تا چی قەرزیان هەبوو پێمدانەوە، ئینجا خورماکەش وەک خۆی مایەوە وەک ئەوەی هیچی لێ کەم نەبووبێتەوە.[1]

یەکێک لەو کەسانەی قەرزی لای عەبدوڵای باوکی جابیر بوو کابرایەکی جوولەکە بوو، سی کۆڵ خورمای لای عەبدوڵا بوو، جابیر داوای کرد کابرای جوولەکە ماوەیەک لەسەری بوەستێت، بەڵام ئەو رازی نەبوو، جابیر چوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) قسەی کرد تا لای کابرای جوولەکە سکاڵای بۆ بکات، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) هات بۆ لای کابرای جوولەکەو داوای لێکرد لەبری قەرزەکەی بەرهەمی خورماکەی ئەو ببات، بەڵام کابرا رازی نەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) چوویە ناو دارخورماکان و پیایدا تێپەڕ بوو، پاشان بە جابیری فەرموو (جد له، فأوف له الذي له)، (بۆی لێبکەرەوەو ئەوەی هی ئەوە بۆی بکێشە)، ئەویش دەستی پێکرد، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە جابیر سی کۆڵەکەی دا بە کابرا و لە سەروو ئەوەشەوە حەڤدە کۆڵی تر مایەوە، جابیر هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا هەواڵی پێبدات چی روویداوە، کەچی بینی پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی عەسر دەکات، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) نوێژەکەی تەواو کرد جابیر پێی وت: ئەو زیادەی ماوەتەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (هەواڵی ئەوە بدە بە کوڕی خەططاب)، جابیریش چوو بۆ لای

[1] صحيح البخاري – كتاب البيوع – باب الكيل على البائع والمعطي، الرقم ٢١٢٧.

عومەر و هەواڵی ئەوەی پێدا، عومەریش پێی وت: من بە دڵنیایی دەمزانی کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەناو دارخورماکاندا تێدەپەڕی خوا بەرەکەت دەخاتە ناو دارخورماکانەوە.[1]

جابیری کوڕی عەبدوڵا دەڵێت: لە رێیەکدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین و منیش لەسەر وشترێک بووم، لە دوای خەڵکەکەوە بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) بە شتێک کە لەدەستیدا بوو دای لە وشترەکە-بۆ ئەوەی بڕوات- ئیتر وشترەکە پێش خەڵکەکە دەکەوت، ئیتر وای لێهاتبوو جڵەوم دەگرت تا زۆر نەڕوات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بە ئەوەندەو ئەوەندە ئەیفرۆشیت و خواش لێت خۆش بێت؟ وتم: پێشکەشت بێت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بە ئەوەندەو ئەوەندە ئەیفرۆشیت و خواش لێت خۆش بێت؟ وتم: پێشکەشت بێت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)،منیش شەرمم کرد، چونکە تەنها ئەو وشترەمان هەبوو، وتم: بەڵێ دەیفرۆشم، ئەوەبوو فرۆشتم پێی بە مەرجێک تا دەگەمە مەدینە پێم بێت، ئینجا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من زاوام، بۆیە داوای مۆڵەتم لێکرد، پێی فەرمووم ئایا دوای باوکت هاوسەرگیریت کردووە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: کچ یان بێوەژنت هێنا؟ وتم: بێوەژن، فەرمووی: (فهلا تزوجت بكرا تضاحكك وتضاحكها، وتلاعبك وتلاعبها)،[2] (خۆزگە کچێکت بهێنایە تا بتخاتە پێکەنین و بتخستایەتە پێکەنین و گەمەی لەگەڵ بکردایتایەو گەمەت لەگەڵ بکردایە)، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) باوکم رۆژی ئوحود کوژرا و نۆ کچی جێهێشتووە کە نۆ خوشکن بۆ من، منیش حەزم نەکرد ئافرەتێکی پێنەگەیشتووی وەک خۆیان بێنم بۆ لایان، بەڵام ژنێک بێت کۆیان بکاتەوەو چاوی لەسەریان بێت باشترە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (أصبت)، (چاکت کرد)،[3] ئینجا

[1] صحيح البخاري - كتاب في الاستقراض - باب إذا قاص أو جازفه في الدين تمرا بتمر أو غيره، الرقم ٢٣٩٦.

[2] صحيح مسلم - كتاب الرضاع - باب استحباب نكاح البكر، الرقم ٧١٥.

[3] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب إذ همت طائفتان منكم أن تفشلا والله وليهما. الرقم ٤٠٥٢.

مۆڵەتی پێدام، منیش پێش خەڵک بەرەو مەدینە چووم تا هاتمەوە مەدینە، خاڵۆم گەیشت پێم و سەبارەت بە وشترەکە پرسیاری لێکردم، منیش پێم وت: چیم پێکردووە، ئەویش سەرکۆنەی کردم، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هاتەوە وشترەکەم بۆ برد، ئەویش پارەی وشترەکەی پێدام و وشترەکەشی دایەوە بە خۆم.[1]

ئەم رووداوەش کاتی گەڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە غەزای (ذاتورقاع).[2]

جابیری کوڕی عەبدوڵا لە دوای غەزای ئوحودەوە لە هەموو غەزاکانی تردا بەشدار بوو، هەروەها یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەیعەتی ریضوان.[3]

هەروەها جابیر لە غەزاکانی تریشدا بەشداری کردووەو وردەکاریەکانی هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەو غەزایانەدا باس کردووە، هەروەک لە باسی خەیبەردا دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) رێگری لێکردین لە خواردنی گۆشتی کەرەکێوی بەڵام رێی پێداین بۆ گۆشتی ئەسپ، یان لە فەتحی مەککەدا دەڵێت: هیچ شتێک بە غەنیمەت نەگیرا، هەروەها سەبارەت بە حەجی ماڵئاواییش باسی وردەکاریەکانی حەجەکەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات کە چی کردووە بە قوربانی و چەندی کردووەو چۆن رەجمی کردووەو... هتد،[4] باسی دواساتەکانی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە چۆن لە نزیکیەوە بووە، دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) داوای کرد پەڕەیەک بهێنن تا وەسیەتێک بنووسێت تا ئوممەتەکەی دوای خۆی گومڕا نەبن و سەریان لێ نەشێوێت، بەڵام قسەو دەمەبۆڵەیەک هەبوو و عومەری کوڕی خەططابیش قسەی تێدا کرد، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) نامەکەی نەنووسی،[5] بەمجۆرە جابیر هەمیشە لە نزیکی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بوو.

---

[1] صحیح مسلم - کتاب الرضاع - باب استحباب نکاح البکر، الرقم ٧١٥.

[2] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٢، ص ٦١.

[3] سیر أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ١٨٩.

[4] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٢، ص ١١٣، ١٤٣، ١٧٦، ١٧٧، ١٨٠، ١٨٧.

[5] مسند أحمد بن حنبل - مسند جابر بن عبد الله(ﷺ)، الرقم ١٤٩٥٣، قال شعیب الأرناؤوط: صحیح لغیره.

کاتێک ئەبووبەکر بوو بە خەلیفە و لە بەحرەینەوە سامانێکی بۆ هات، وتی: کێ لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەڵێنێکی پێدراوە با بێت وەریبگرێت، جابیریش چوو بۆ لای ئەبووبەکر و وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بەڵێنی پێدام ئەگەر سامانی بەحرەینی بۆ هات ئەوەو ئەوەم پێبدات، ئاماژەی بە هەردوو مشتی کرد، ئەبووبەکریش وتی: بیبە، ئەویش بە هەردوو مشتی هەڵیگرت نزیکەی پێنج سەد درهەمی کرد، ئەبووبەکریش ئەو پێنج سەد درهەمەو هەزار درهەمی تریشی پێدا.[1]

دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) جابیر لە مەدینە مایەوەو لە مزگەوتی مەدینە-مزگەوتەکەی پێغەمبەر(ﷺ)- دا بازنەی وانەوتنەوەی هەبوو و خەڵکی زانستیان لێ وەردەگرت.[2]

جابیری کوڕی عەبدوڵا مێزەرێکی سپی لەسەری دەبەست و لە پشتەوە مێزەرەکەی شۆڕدەکردەوە، هەروەها ئەو جلەی لەبەری دەکرد نەدەگەیشتە لای قولەپێی، ریشیشی خەنەیی دەکرد، جاریش هەبوو سەر و ریشی هەر بە سپێتی دەهێشتەوە.[3]

هەروەها جابیری کوڕی عەبدوڵا موفتی مەدینە بوو.[4]

لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا جابیری کوڕی عەبدوڵا چوو بۆ مەککەو ماوەیەک لەوێ بو، ئینجا گەڕایەوە بۆ مەدینە.[5]

پەیوەندی جابیر لەگەڵ خەلیفە عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕواندا باش بوو، بەڵکو عەبدولمەلیک فەرمودەی لە جابیر دەبیست و لەبەری دەکرد،[6] کاتێک عەبدولمەلیک هات بۆ حەج جابیر چوو بۆ لای، عەبدولمەلیکیش پێشوازی

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الكفالة - باب من تكفل عن ميت دينا فليس له أن يرجع، الرقم ٢٢٩٦.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٤.
[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١٩٤.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١٩٠.
[5] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١٩١.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٢٣٤.

لێکرد،[1] جابیر وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران مەدینە ئەوەیە کە دەیبینیت و (طیبة) یە و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ناوی ناوە و خەڵکەکەشی سنووردراون، جا ئەگەر ئەمیری باوەڕداران پێی باش بێت سەردانیان بکات و مافیان بزانێت، عەبدولمەلیک حەزی بەوە نەکرد، جابیریش بەردەوام لێی دووبارە دەکردەوە تا ئەوەی قوبەیصە ئاماژەی کرد بۆ کوڕەکەی کە سەرکردەی ئەو بوو-جابیریش ئەوکات بینایی لەدەست دابوو-بە ئاماژە پێی وت: بێدەنگی بکە، کوڕەکەشی هەوڵی دەدا جابیر بێدەنگ بکات، جابیر وتی: قوڕت بەسەر چیم پێ دەکەیت؟ وتی: بێدەنگ بە، جابیریش بێدەنگ بوو، کاتێک جابیر چوویەدەرەوە قوبەیصە دەستی جابیری گرت و وتی: ئەی ئەبووعەبدوڵا ئەو خەڵکە بون بە پاشا و دەسەڵاتدار، جابیریش پێی وت: خوا تاقیکردنەوەی چاکی بەخشی، هیچ بیانووت بۆ نیە و بەرپرسەکەشت ئەو قسانەت لێ دەبیستێت، ئەویش وتی: دەبیستێت و نابیستێت، ئەوەی بیەوێت بیستوویەتی، ئەمیری باوەڕداران فەرمانی کردووە پێنج هەزار درهەمت پێ بدرێت، جا تۆش سوودی لێوەربگرە، جابیریش وەریگرت.[2]

جابیری کوڕی عەبدوڵا ماوەیەک پێش مردنی بینایی چاوەکانی لەدەست دا.[3]

قەتادە دەڵێت: جابیر کۆتا هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە مەدینە کۆچی دوایی کردبێت، بەڵام بەغەوی دەڵێت: کۆتا هاوەڵ لە مەدینە کۆچی دوایی کردبێت سەهلی کوڕی سەعد بوو.[4]

رای راستیش ئەوەیە سەهلی کوڕی سەعد کۆتا هاوەڵ بوو کە لە مەدینە کۆچی دوایی کرد، چونکە جابیر لەساڵی حەفتا و سێ یان حەفتاو چواری کۆچیدا وەفاتی کردووە، بەڵام سەهلی کوڕی سەعد لە ساڵی هەشتاو هەشت -یان رایەک دەڵێت: نەوەدو یەک-ی کۆچی و لە تەمەنی نەوەدو

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١٩٣.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٢٣١.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٩، ص ٢٢.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٤.

شەش یان سەدساڵیدا کۆچی دوایی کرد.[1]

سەبارەت بە ساڵی مردنەکەی رایەک دەڵێت: لە ساڵی حەفتاو سێی کۆچی مردووە، رایەکی تریش دەڵێت: لە ساڵی حەفتاو چواری کۆچیدا مردووە،[2] بەڵام ئیبن سەعد دەڵێت: ساڵی حەفتاو هەشتی کۆچی وەفاتی کردووە،[3] ئیبن حەجەریش ساڵی حەفتاو چواری کۆچی بە راستتر دادەنێت.[4]

دەوترێت کاتێک جابیری کوڕی عەبدوڵا وەفاتی کرد تەمەنی نەوەد و چوار ساڵ بوو.[5]

واتە کۆتا هاوەڵ کە لە مەدینە مردبێت نەک کۆتا هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە کۆچی دوایی کردبێت، چونکە کۆتا هاوەڵ کە کۆچی دوایی کردبێت ئەنەسی کوڕی مالیک بووە وەک ئیمامی ذەهەبی دەڵێت: کۆتا هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە کۆچی دوایی کرد ئەنەسی کوڕی مالیک بوو.[6]

هەروەها جابیر کۆتا کەس بوو لە بەشداربوانی بەیعەتی عەقەبەی دووەم کە مرد، واتە هەموو بەشداربوان مردون و دواجار ئەو ماوەتەوە و پاش هەموویان وەفاتی کردووە.[7]

کاتێک جابیری کوڕی عەبدوڵا کۆچی دوایی کرد والی مەدینە ئەبانی کوڕی عوثمان بوو کە ماوەی حەوت ساڵ والی مەدینە بوو.[8]

کاتێک جابیر کۆچی دوایی کرد تەرمەکەی لەناو بەنی سەلەمەدا بوو، کە تەرمەکەی هێنرایەدەرەوە حەسەنی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ٥٤٨.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٤.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ١١٢.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٤.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٤.
[6] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٦، ص٢٨٩.
[7] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١٨٩.
[8] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ١٥٢.

ئەبووطالیب لە پێشەوە دارەمەیتەکەی هەڵگرتبوو، حەججاج فەرمانی پێکرد حەسەن لابچێت تا ئەو تەرمەکە هەڵگرێت، بەڵام ئەو رازی نەبوو، منداڵەکانی جابیر داوایان لێکرد حەسەن لابچێت، ئەمجار حەسەن رازی بوو، ئینجا حەججاج چوویە شوێنەکەی حەسەن و تەرمەکەی هەڵگرت تا دانرا، ئینجا نوێژی لەسەرکرد، پاشان هاتە لای گۆڕەکە، ئەوکات حەسەنی کوڕی حەسەن دابەزیبوویە ناو گۆڕەکەوە، حەججاج فەرمانی پێکرد بێتەدەرەوە تا ئەو بڕواتە ناویەوە، بەڵام حەسەن رازی نەبوو، هەمدی کوڕانی جابیر داوایان لە حەسەن کرد بێتە دەرەوە، ئەویش رازی بوو، ئینجا چوویە دەرەوەو حەججاج چوویە ناو گۆڕەکەیەوە، ذەهەبی دەڵێت: لەوانەیە حەججاج لەو کاتەدا بۆ حەج یان وەک سەردان چووبێتە حیجاز و هاتبێتە مەدینە.[1]

لەوانەیە هۆکاری ئەو توندیەی حەسەنی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی بەرامبەر بە حەججاج لەبەرئەوەی بووبێت کە وەک ئیبنولمدینی دەڵێت: جابیر وەسیەتی کرد تا حەججاج نوێژی لەسەر نەکات،[2] واتە لەو کاتەدا حەججاج لەوێ بووبێت و جابیریش زانیبێتی لەوێیە و ئەو وەسیەتەی کردبێت.

ژمارەی ئەو فەرموودانەی بە سەنەد دەدرێنەوە پاڵ جابیری کوڕی عەبدوڵا نزیک بە هەزار و پێنج سەد و چل فەرموودەن،[3] پەنجاو هەشت فەرموودەی لای هەریەک لە بوخاری و موسلیم هاتون،[4] هەروەها فەرموودەو گێڕانەوەی زۆری گێڕاوەتەوە لە هەریەک لە ئەبووبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەططاب و عەلی کوڕی ئەبووطالیب و ئەبووعوبەیدەو موعاذی کوڕی جەبەل و زوبەیری کوڕی عەوام و چەندینی تر، هەریەک لە ئیبن موسەییب و عەتائی کوڕی ئەبی رەباح و سامی کوڕی ئەبولجەعد و حەسەنی بەصری و حەسەنی کوڕی موحەممەد ئیبنولحەنەفیەو

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١٩٣-١٩٤.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٤.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٩، ص ٢٢.

[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١٩٤.

ئەبووجەعفەری باقیر و سەعیدی کوڕی میناو ئەبووزوبەیر و چەندینی تریش فەرموودەیان لێوەگێڕاوەتەوە.[1]

جابیر بۆ وەرگرتنی فەرموودەی قیصاص سەفەرێکی بەرەو میصر کرد تا ئەو فەرموودەیە لە عەبدوڵای کوڕی ئەنیس ببیستێت، ئینجا گەڕایەوە بۆ مەدینە.[2]

**پەندو وانە**

خاکیبوونی پێغەمبەر(ﷺ) کە کاتێک دەسەڵاتداری دەوڵەت و پێغەمبەری خواش بوو دەبینین لەگەڵ ئەبووبەکری صدیقدا سەردانی جابیر دەکات کاتێک دەزانێت نەخۆشە، چونکە مافێکی موسڵمان بەسەر موسڵمانەوە ئەوەیە سەردانی برا نەخۆشەکەی بکات، هەروەها دەبینین بە پیادە دەچن و هیچ پاسەوانێکیشیان لەگەڵ نەبووە، ئەمە بەو واتایە نا کە ئەگەر ئەمڕۆ سەرکردەیەکی موسڵمانان پاسەوانی هەبێت ئەوە لە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) لایدابێت، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) خوای گەورە پاراستوویەتی، بەڵام خاکیبوونەکە واجبە بۆ سەرکردەکانی ئەمڕۆی موسڵمانان.

ئاوی دەستنوێژ پاکەو ئەو ئاوپرژاندنەش لە ئاوی دەستنوێژ کە پێغەمبەر(ﷺ) بەرامبەر جابیر بەکاری هێنا هەم بەڵگەی ئەوەیە، هەم خاکیبوونی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نیشان دەدات کە سەردانی هاوڵاتیەکی نەخۆشی ژێر دەسەڵاتی دەکات و لەوێ دەستنوێژ دەگرێت و ئاوی دەستنوێژیشی دەکاتە ئاوپرژێن بۆ ئەو نەخۆشە.

بۆ گەنج باش وایە هەوڵ بدات لە پرۆسەی هاوسەرگیریدا ڕەچاوی جیاوازی تەمەن و وادەی جیاوازی ویستەکان بکات، وەک چۆن پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاری جابیری کرد خۆزگە کچێکت بهێنایە لەبری پیرەژن، بەڵام حاڵەتی تایبەت و پێویست کە بیانووی گونجاوی بۆ هەبێت هەمان ئەو پێوەرەری

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١٨٩.

[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١٩٢.

بۆ دەبێت کە جابیر مەسەلەو هۆکارەکەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) روون کردەوە و پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو (باشت کرد)، چونکە هۆکارێکی گەورەتر لەوە هەبوو کە لە حاڵەتی ئاساییدا هەیە، ئەویش بوونی ژمارەیەک خوشکە کە پێویستیان بە ئافرەتێکی شارەزاو ژیر و خاوەن ئەزموونی پەروەردەو سەرپەرشتی هەیە.

لەبەرچاوگرتنی باری جەرگ سوٚوتاوی و نارەحەتی کەسێک کە نزیکێکی دەمرێت پێویستە، ئەمە بەو واتایە نا کە رێی پێ بدرێت سنوورەکانی خوا ببەزێنێت، بەڵام لەو شتانەدا کە رەوان رێگر نەبین، وەک گریانی بێ شیوەن و سەیرکردن و ماچکردنی مردووەکە، دەبینین هاوەڵان رێیان نەدەدا جابیر جلی سەر دەموچاوی باوکی لاببات، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) خۆی جلەکەی لەسەر دەموچاوی لابرد تا جابیر سەیری بکات، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) خۆی بۆ مەرگی ئیبراهیمی کوڕی گریا و بە چەند دەربڕینێک سۆزی ناخی خۆی نیشاندا، لەوانە (تَدْمَعُ الْعَيْنُ وَيَحْزَنُ الْقَلْبُ ، وَلاَ نَقُولُ إِلاَّ مَا يَرْضَى رَبُّنَا ، وَاللهِ يَا إِبْرَاهِيمُ إِنَّا بِكَ لَمَحْزُونُونَ)،[1] (چاو فرمێسک دەڕژێ و دڵ خەمبار دەبێ، هیچیش ناڵێین جگە لەوەی پەروەردگار پێی رازی بێت، ئەی ئیبراهیم ئێمە زۆر دڵگرانین بۆت).

هەروەها دەیفەرموو (يا إبراهيم لولا أنه أمر حق و وعد صدق وأنها سبيل مأتية وأن آخرنا سيلحق أولنا لحزنا عليك حزنا أشد من هذا، وإنا بك يا إبراهيم لمحزونون، تبكي العين ويحزن القلب و لا نقول ما يسخط الرب)،[2] (ئەی ئیبراهیم ئەگەر ئەمە ئەمرێکی هەق و بەڵێنێکی راست نەبوایە و رێیەکی هاتوو نەبوایە و لەبەرئەوە نەبوایە دەزانین پاشینمان (کۆتامان) دەگەین بە پێشینمان (یەکەممان) ئەوا خەفەتێکی زیاتر لەم دڵگرانیەمان بۆ دەخواردیت، ئەی ئیبراهیم ئێمە زۆر دڵگرانین بۆت، چاو دەگری و دڵ خەمبار دەبێ، شتێکیش ناڵێین کە پەروەردگار تووڕە بکات).

[1] صحيح مسلم - كتاب الفضائل - باب رحمته(ﷺ) الصبيان والعيال وتواضعه وفضل ذلك، الرقم ٢٣١٥.
[2] الطبقات لابن سعد، الرقم ٢٩٢، المستدرک على الصحيحين، الرقم ٦٩٢٥، صححه الألباني.

عەبدورەحمان دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تۆ ڕێگری دەکەی لە گریان کەچی خۆت دەگریت؟ فەرمووی: (إني لم أنه عن البكاء ولكني نهيت عن صوتين أحمقين فاجرين، صوت عند نعمة لهو ومزامير الشيطان وصوت عند مصيبة لطم وجوه وشق جيوب، وهذه رحمة ومن لا يرحم لا يُرحم...)،[1] ( من هەرگیز دوورەپەرێزیم لێ نەکردون لە گریان بەڵکو دوورەپەرێزیم لێ کردون لە دوو دەنگی ئەحمەقانەی خراپ و لەڕێدەرچوو، دەنگێ لە کاتی بەخششی خۆشیەک و ئاوازی شەیتان، وەدەنگێ لەکاتی موسیبەتدا بە دان لە دەموچاوو سنگ دادڕین، ئەمە سۆزە و هەرکەس سۆز و ڕەحمی نەبێ سۆز و ڕەحمی بۆ نابێ...).

ئامۆژگاری کردنی کەسانی بەرپرس و دەسەڵاتدار ئەرکی سەرشانی زانایانی ئوممەتە، وەک چۆن ئامۆژگاری ڕێنماییەکی دیاری پەیامی خوایەو فەرمانی کردووە بە موسڵمانان ئامۆژگاری یەکدی بکەن، ئەو ئەزموونە باڵایە لە مێژووی ئیسلامیدا بەدیکراوە کە زانایان ئامۆژگاری پێویستیان پێشکەش کردووە، زۆرجار دووری زانایان لە سەرکردەکانی وڵاتی موسڵمانان هۆکار بووە تا کەسانێکی دنیاویست و لەخوانەترس لەدەوری ئەو سەرکردانە بن و پێشنیازی خراپیان بۆ بخەنە ڕوو، بەڵام ئەگەر زانایانی ئوممەت توانییان بچنە لای سەرکردەکان بۆ پێدانی ئامۆژگاری و داوای مافی خەڵکو هاوکارییان لەسەر کاری چاکەو بێدارکردنەوەیان لە کاری خراپە، ئەمە دوور لە نیازی شەخصی و ویستی دنیایی، ئەو کات دەبنە پاڵپشتی خێر بۆ ئەو سەرکردەیە، جابیریش ئەوەی لەسەرشانی بوو لە ئامۆژگاری کردنی سەرکردەی موسڵماناندا ئەنجامی دا، لە نموونەی زانایانی دواتریشدا ئەوە دەبینین وەک چۆن ئیبن تەیمیە دەچوویە لای سەرکردەکان و ئامۆژگاری پێشکەش دەکرد و مافی خەڵکی داوا دەکرد و پێشنیازی چاکەی دەکرد بۆیان وەک چۆن داوای جیهادی کرد لە سەرکردەی موسڵمانان و خۆیشی بەشداری کرد و دوا وتەشی ئەوەبوو (من موڵکی گەلم نەک دەوڵەت).

[1] المستدرک علی الصحیحین، الرقم ٦٩٢٥، صححه الألباني في السلسلة الصحيحة.

## ٥٨٨. جابیری کوڕی عومەیر(رضي الله عنه)

ناوی جابیری کوڕی عومەیرەو لە پشتیوانانە،لە هاوەڵانی دانیشتووی مەدینەیە.[١]
نەسائی گێڕانەوەیەکی هێناوە لە عەطائی کوڕی ئەبی ڕەباحەوە دەڵێت: هەریەک لە جابیری کوڕی عەبدوڵا و جابیری کوڕی عومەیرم بینی کە هەردووکیان لە پشتیوانانن، پێکەوە ڕمهاوێژییان دەکرد، پاش ماوەیەک یەکێکیان دانیشت، ئەوی تریان پێی وت: ئەرێ تەواو، ماندوو بوویت؟ وتی: بەڵێ، یەکێکیان بەوی تریانی وت: ئایا نەتبیستووە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (كل شيء ليس من ذكر الله فهو لعب لا يكون أربعة: ملاعبة الرجل امرأته، وتأديب الرجل فرسه، ومشي الرجل بين الغرضين، وتعلم الرجل السباحة)،[٢] (هەر شتێک کە لە یادی خوادا نەبێت ئەوە گەمەو ڕابواردنە جگە لە چوار شت: ڕابواردن و گەمەی پیاو لەگەڵ ژنەکەی، ڕاهێنانی ئەسپ لەلایەن خاوەنەکەیەوە، کێبڕکێی ڕاکردن (چوونی خێرا)، کەسێک خۆی فێری مەلەوانی بکات).

## ٥٨٩. جابیری کوڕی یاسر(رضي الله عنه)

ناوی جابیری کوڕی یاسری کوڕی عوەیصە، هیچ فەرموودەیەکی لێوە نەگێڕدراوەتەوە، یەکێک بوو لە بەشداربوانی فەتحی میصر.[٣]

## ٥٩٠. جابیری کوڕی ئەرزەق(رضي الله عنه)

ناوی جابیری کوڕی ئەرزەقی غاضریە،[٤] نیشتەجێی یەمەن بوو،[٥] دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) لە ناوچەی حیمص نیشتەجێ بوو.[٦]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٣٨٠.
[٢] السنن الكبرى للنسائي - كتاب عشرة النساء - ملاعبة الرجل زوجته ، الرقم ٨٨٨٩ و قال ابن حجر في الإصابة: صحيح الإسناد، صححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب، الرقم ١٢٨٢.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٠.
[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٢٩.
[٥] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٤٤٠.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٢٩.

جابیری کوڕی ئەرزەق دەڵێت: بە سوارێک و بڕێ شمەکەوە چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، بەردەوام لەگەڵیدا ڕێم دەکرد، ئینجا چوویە ناو قوبەیەکی لە چەرم درووستکراو، کە چوویەژوورەوە زیاد لە سی کەس لەگەڵی بوون کە قامچییان پێ بوو و لەبەردەرگاکەی وەستابوون، منیش نزیک بوومەوە، ئەوەبوو کەسێک ڕێی پێگرتم، منیش پێم وت: ئەگەر ڕێم نەدەیت بەرامبەرت دەوەستمەوە و لێشم بدەیت لێت دەدەمەوە، کابرا وتی: بەراستی کابرایەکی خراپیت، منیش وتم: بەخوا تۆ لە من خراپتریت، وتی: چۆن؟ وتم: من لە ناوچەکانی یەمەنەوە هاتوم تا بڕۆم گوێ لە پێغەمبەر(ﷺ) بگرم و تێبگەم، ئینجا بگەڕێمەوەو ئەو بیستنەم بگەیەنمە ئەوانەی نەهاتون، کەچی تۆ ڕێم لێ دەگریت؟ ئەویش وتی: بەخوا ڕاست دەکەیت من لە تۆ خراپترم، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) سەرکەوتەوە، خەڵکی لە عەقەبە لە میناوە لە دەوری بوون تا خەڵکی پرسیاری زۆریان لێدەکرد، لەبەر زۆرییان کەسیان نەدەگەیشتن بە پێغەمبەر(ﷺ)، کابرایەک هات کە قژی خۆی کورت کردبوویەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) صەلەواتم لەسەر بدە، ئەویش فەرمووی: (صلى الله على المحلقين)، (صەلەواتی خوا بۆ ئەوانەی قژیان دەتاشن-هەموو قژیان-) کابرا دووبارە ئەوەی وتەوەو پێغەمبەریش(ﷺ) هەمان وەڵامی دایەوە تا سێ جار، ئینجا چوو سەری تاشی، ئیتر چی پیاو لەوێ بوون هەموو سەریان تاشی.[1]

سەبارەت بە حوکمی فەرموودەکە ئیبن موندە دەڵێت: ئەم فەرموودەیە غەریبە و تەنها بەم سەنەدە زانراوە.

## ٥٩١. جابیری کوڕی ئوسامە(رضي الله عنه)

ناوی جابیری کوڕی ئوسامەی جیهەنیە،[2] کونیەکەی ئەبووسوعادە،[3] لە هاوەڵە حیجازیەکاندا ئەژمار کراوە،[4] ئیبن حەجەر دەڵێت: دواتر چووەتە

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٤٤٠، أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٠.
[2] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص ١٣٨.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٢٩.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٠.

میصر و لەوێ نیشتەجێ بووەو هەر لەوێیش مردووە.[1]

جابیری کوڕی ئوسامە دەڵێت: ڕۆژێک لە بازاڕ گەیشتم بە پێغەمبەر(ﷺ) کە هەندێ لە هاوەڵانی لەگەڵدا بوو، پرسیارم کرد -لە یەکێک لە هاوەڵان- ئەرێ بەرەو کوێ دەچن؟ (وە لە گێڕانەوەکەی طەبەریدا هاتووە: پرسیارم کرد لە هاوەڵان پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ کوێ دەڕوات، لە گێڕانەوەکەی ئیبن شیبەشدا هاتووە: پرسیارم کرد لە هاوەڵان ئێوەو پێغەمبەر(ﷺ) بۆ کوێ دەچن؟) وتیان: دەچین تا خەت داڕێژین بۆ مزگەوتێک بۆ هۆزەکەی تۆ، منیش دواتر کە گەڕامەوە بینیم هۆزەکەم کۆبوونەتەوە، وتم: ئەرێ ئەوە چیتانە؟ وتیان: پێغەمبەر(ﷺ) خەتی مزگەوتێکی بۆ داڕشتین و لە رووی قیبلەشەوە دارێکی بۆ داچەقاندین.[2]

ئەمە بەڵگەی ئەوەیە جابیر تا ئیشەکەی خۆی تەواو نەکردووە لە بازاڕ نەگەڕاوەتەوە بۆ ناوچەکەی خۆی، بۆیە کاتێک دەچێتەوە بۆ ناو هۆزەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە خەتکێشانی مزگەوتەکە تەواو بووەو گەڕاوەتەوە.

## ٥٩٢. جابیری کوڕی شەیبان(ﷺ)

ناوی جابیری کوڕی شەیبانی کوڕی عەجلانی ثەقەفیە، یەکێک بووە لە بەشداربوانی بەیعەتی ڕیضوان.[3]

## ٥٩٣. جابیری کوڕی عەبدولا(ﷺ)

ناوی جابیری کوڕی عەبدولایەو جیایە لەو سێ جابیرەی تر کە ئەوانیش ناوی باوکیان عەبدولایە، چونکە جابیری کوڕی عەبدولای کوڕی عەمر نیە بەو بەڵگەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم هاوەڵەی لەگەڵ چەند هاوەڵێکی تر لە

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٢٩.

[2] الآحاد و المثانى لابن أبي عاصم، الرقم ٢٢٥٤ و اللفظ له، المعجم الكبيرللطبراني، الرقم ٢٠٤٣، تأريخ المدينة لابن شبة، الرقم ١٧٨، حسنه الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة، الرقم ٤٤٩ و قال إسناده حسن أو قريب من الحسن.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٤.

غەزای ئوحود گەڕاندەوەو نەیهێشت لەبەر کەمی تەمەنیان بەشداری بکەن،[1] بەڵام ئەوکات تەمەنی جابیری کوڕی عەبدوڵای کوڕی عەمر لە سەروو بیست ساڵیەوە دەبوو و باوکیشی نەیهێشت بەشداری بکات لەبەرئەوەی نۆ خوشکی هەبوو و دەبوو ئاگاداریان بێت.

ئیبن حەجەر سەبارەت بە هەریەک لەو دوو جابیرەکەی تریش کە عەبدی و راسی-یان راسیبی- بوون دەڵێت: لە باسیاندا نەهاتووە پێغەمبەر(ﷺ)لە غەزای ئوحوددا ئەوانی گەڕاندبێتەوە.[2]

## ٥٩٤. جابیری کوڕی عەبدوڵای راسی(رضي الله عنه)

ناوی جابیری کوڕی عەبدوڵایە، هەندێ بە راسیبی دادەنێن،[3] بەڵام ئەبوونوعەیم دەڵێت: راست ئەوەیە لە پشتیوانانە، دواتر چوو لە بەصرە نیشتەجێ بوو،[4] ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئەبوونوعەیم کە دەڵێت: وادەزانم هەر لە پشتیوانانەو سولەمیە، ئەوا دوو جابیر هەبوون پشتیوانی و سولەمی بن، یەکێکیان جابیری کوڕی عەبدوڵای کوڕی ریئاب، دووەمیش جابیری کوڕی عەبدوڵای کوڕی عەمر، هەردووکیشیان لە مەککە نیشتەجێ بون و نەچون لە بەصرە نیشتەجێ بن،[5] بۆیە ئەم هاوەڵەش جیایە لەو دوو جابیرەی تر کە ئەوانیش ناوی باوکیان عەبدوڵایە.

فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت (من عفا عن قاتله دخل الجنة)،[6] (هەرکەس لە بکوژەکەی خۆش بێت دەچێتە بەهەشتەوە).

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٧.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٧.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٦.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٦.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٧.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٦.

## ٥٩٥. جابیری کوڕی عەتیکی سولەمی(ﷺ)

ناوی جابیری کوڕی عەتیکی کوڕی قەیسی کوڕی ئەسوەدە، ئەم هاوەڵە جیایە لە جابیری کوڕی عەتیکی کوڕی قەیسی ئەوسی، چونکە ئەمەیان لە پشتیوانانە لە سولەمیەکان واتە خەزرەجیە.[1]

## ٥٩٦. جابیری کوڕی عەتیکی کوڕی نوعمان(ﷺ)

ناوی جابیری کوڕی عەتیکی کوڕی نوعمانی کوڕی عەتیکە، لە پشتیوانانە، کونیەکەی ئەبوعەبدوڵایە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی سوفیان کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[2]

## ٥٩٧. جابیری کوڕی عەتیکی ئەوسی(ﷺ)

ناوی جابیری کوڕی عەتیکی کوڕی قەیسی کوڕی حارثە، یان ناوی بە جەبریش هاتووە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، کونیەکەی ئەبووعەبدوڵایە.[3]

هەندێ پێیان وایە جەبر و جابیری کوڕی عەتیک هەر یەک کەسایەتی بن، بەڵام رای تریش هەیە کە بە برای یەکتریان دەزانێت وەک چۆن ئیبن سەعد ئاماژەی بەوە کردووەو ئیبن حەجەریش ئەو مەسەلەی باس کردووە،[4] بەڵام بەو پێیەی لە باسی هەریەک لە جەبر و جابیردا هاتووە لە فەتحی مەککەدا ئاڵای هۆزەکەی خۆی پێ بووەو زۆرێکیش ئاماژە بەوە دەدەن یەک کەسایەتی بن، پێدەچێت رای راستتر ئەوەبێت کە جەبر و جابیر هەر یەک کەسایەتی بن.

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٩.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٨.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٩.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥٢.

دایکی ناوی جەمیلەی کچی زەیدی کوڕی صەیفییە،[١]ژنێکی هەبوو ناوی هەضەبەی کچی عەمری کوڕی مالیک بوو کە لەو ژنەی ئەم منداڵانەی هەبوو (عەتیک، عەبدوڵا، ئومموثابت).[٢]جەبری کوڕی عەتیک دوو کوڕی تریشی هەبوو بە ناوەکانی (موحەممەد و عەبدولمەلیک).[٣]

هەروەها جەبر برایەکی هەبوو بە ناوی بەشیر، بەشیری کوڕی عەتیک لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە جەنگی یەمامەشدا بەشداری کرد و هەر لەو جەنگەشدا کوژرا.[٤]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەری و پشتیوانەکانەوە، برایەتی خستە نێوان خەبابی کوڕی ئەرەت و جەبری کوڕی عەتیکەوە.[٥]

جابیر کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە،[٦] کوڕێکی تریشی هەبوو بە ناوی ئەبووسوفیان کە ئەمیشیان فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٧]

هەروەها جابیر برایەکی هەبوو بە ناوی حارثی کوڕی عەتیک.[٨]

جابیر لە بەدر و غەزاکانی تریشدا بەشداری کرد،[٩] لە فەتحی مەککەدا ئاڵای بەنوموعاویە بەدەست جابیری کوڕی عەتیکەوە بوو.[١٠]

جابیری کوڕی عەتیک هەر لە مەدینە ژیاوەو لەوێش مایەوە تا کاتی مردنی.[١١]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٠.
[٢] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٦٩.
[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٢٦١.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١٢.
[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٦٦.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٧.
[٧] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٩.
[٨] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٩.
[٩] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٧.
[١٠] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٩.
[١١] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٠.

موحەممەدی کوڕی عومەر دەڵێت: جەبری کوڕی عەتیک لە ساڵی شەست و یەکی کۆچیدا وەفاتی کرد لەو کاتەی یەزیدی کوڕی موعاویە دەسەڵاتدار بوو، تەمەنیشی لە کاتی مردنیدا حەفتاو یەک ساڵ بوو.[١٢]

## ٥٩٨. جابیری کوڕی ئەبی سەبرە(ﷺ)

ناوی جابیری کوڕی ئەبی سەبرەی ئەسەدیە.[١٣]

جابیر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) باسی جیهادی دەکرد و دەیفەرموو (إن الشيطان جلس لابن آدم بطرقه، قال فجلس له على طريق الإسلام فقال تسلم وتدع دينك ودين آبائك؟ فعصاه فأسلم، ثم أتاه من قبل الهجرة وقال تهاجر وتدع أرضك وسماءك ومولدك وتضيع عيالك؟ فعصاه فهاجر، ثم أتاه من قبل الجهاد فقال تجاهد فيهراق دمك وتنكح زوجتك ويقسم مالك ويضيع عيالك؟ فعصاه فجاهد)،(شەیتان لە هەموو ڕێگەکانەوە دادەنیشێت بۆ ئادەمیزاد، دەڵێت: لە ڕێی موسڵمانبوونیدا دادەنیشێت بۆی و پێی دەڵێت: موسڵمان دەبیت و واز دێنیت لە ئایینی خۆت و ئایینی باوباپیرانت، ئادەمیزادیش لەو قسەی شەیتان یاخی دەبێت و موسڵمان دەبێت، ئینجا لە ڕێی کۆچکردنی موسڵماندا بۆی دادەنیشێت و پێی دەڵێت: کۆچ دەکەیت و واز دێنیت لە زەوی و خاک و ئاسمان و شوێنی لەدایکبوونی خۆت و ژن و منداڵت بەهیلاکا دەبەیت؟ ئادەمیزاد لێی سەرکەش دەبێت و کۆچ دەکات، ئینجا لە ڕێی جیهادەوە دێت بۆی و دەڵێت: جیهاد دەکەیت و خوێنت دەڕژێت و ژنەکەت مارە دەکرێتەوەو سامانەکەت دابەش دەکرێت و ژن و منداڵت بە هیلاکا دەبەیت؟ ئادەمیزادیش لە شەیتان سەرکەش دەبێت و جیهاد دەکات)، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (فحق على الله من فعل ذلك فخر من دابته فمات فقد وقع أجره على الله، وإن لسعته الدابة فمات، فقد وقع أجره على الله، وإن قتل قعصا فحق على الله أن يدخله

[١٢] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٤٦٩.

[١٣] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٠.

الجنة)،[1] ( جا حەقە بەسەر خواوە هەرکەس وابکات و لەسەر ئاژەڵەکەی بکەوێتە خوارەوەو بمرێت، پاداشتی لای خوایە، ئەگەر گیاندارێک بیگەزێت و بمرێت ئەوە پاداشتی لای خوایە، ئەگەریش یەکسەرە بکوژرێت ئەوا مافە لەسەر خوا بیخاتە بەهەشتەوە).

ئەم فەرموودە لە هەندێ گێڕانەوەی تردا لە سەبرەی کوڕی ئەبی فاکیهەوە بە دەقێکی هاوشێوە هاتووە و ئەلبانیش لە تەحقیقی ئەو فەرموودەی سەبرەدا باسی ئەوەشی کردووە کە بە سەنەدی جابیری کوڕی ئەبی سەبرەش هاتووەو فەرموودەکەی بە صەحیح داناوە.[2]

## ٥٩٩. جابیری کوڕی ئەبی صەعصەعە(رضي الله عنه)

ناوی جابیری کوڕی ئەبی صەعصەعە (عەمر)ی کوڕی زەیدی کوڕی عەوفە، لە پشتیوانانە لە مازنیەکان،[3] دایکی ناوی شەیبەی کچی عاصمی کوڕی عەمرە.[4]

کوڕانی ئەبی صەعصەعە چوار برا بوون: قەیس و ئەبوکیلاب و جابیر و حارث.[5]

قەیسی کوڕی ئەبی صەعەصەعەی برای بەشداری هەریەک لە عەقەبە و بەدری کرد.[6]

حارثی کوڕی ئەبی صەعصەعەش لە رۆژی یەمامەدا کوژرا.[7]

ئەبووکیلابی برایشی لە غەزای موئتەدا کوژرا.[8]

---

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٤٣٩، شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ٤٠٦٧.
[2] سلسلة الأحاديث الصحيحة لألباني، الرقم ٢٩٧٩.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٩.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥١٧.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٥.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٩.
[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥١٧.
[8] أسد الغابة، ج٦، ص ٢٧٧.

جابیر لە غەزای ئوحود و غەزاکانی دواتریشدا بەشدار بوو،[1] دواجاریش لە غەزای موئتەدا شەهید بوو.[2]

## ٦٠٠. جاروودی کوڕی مونذیر(ﷺ)

ناوی جاروودی کوڕی مونذیری عەبدیە، هەندێ پێیان وایە جاروودی کوڕی موعەللا و ئەم هاوەڵە هەر یەک کەسایەتین، بەڵام هەریەک لە بوخاری و ئیبن حەجەریش پێیان وایە ئەم کەسایەتیە جیایە لەو هاوەڵەی پێشوو و ئەم هاوەڵەیان ماوەیەکی زۆ دوای جاروودی کوڕی موعەللا مردووەو حەسەن و ئیبن سیرین فەرموودەیان لێ وەرگرتووە.[3]

## ٦٠١. جاروودی کوڕی موعەللا(ﷺ)

ناوی جاروودی کوڕی موعەللا یان جاروودی کوڕی عەمری کوڕی موعەللا یان جاروودی کوڕی عەلائی عەبدییە،[4] کونیەکەی ئەبولمونذیر یان ئەبووغیاثە.[5]

رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو ناوی بیشر بووە.[6]

دایکی جاروود ناوی دەرمەکەی کچی روەیم بوو.[7]

جاروود سەرەتا کەسێکی مەسیحی بوو، لە ساڵی دەی کۆچیدا کاتێک وەفدی عەبدولقەیس هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، جاروودیش هات لەگەڵیان و موسڵمان بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) دڵخۆش بوو بە موسڵمانبوونەکەی و لەخۆی نزیک کردەوە.[8]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣٩.
[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص ١٧٣٩.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٣.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج، ص ٢٦٢.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٣٨٢.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٢.
[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٥٥٩.
[8] أسد الغابة، ج١، ص ٣٨٣.

جاروود له سەردەمی نەفامی و لەکاتی مەسیحی بوونیشیدا کەسایەتیەکی ناسراوو وخانەدان بوو و لەناو خەڵکدا ڕێزی زۆری لێ دەنرا.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) نامەی نووسی بۆ خەڵکی بەحرەین و داوای کرد لێیان بیست کەسیان وەک وەفد بێن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوەبوو بیست کەسیان هاتن کە عەبدوڵای کوڕی عەوفی ئەشەج بەرپرسیان بوو و جاروودیش لەناو وەفدەکەدا بوو، هاتنەکەشیان لە ساڵی فەتحدا بوو، وترا ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانە وەفدی عەبدولقەیسن، فەرمووی: مەرحەبایان لێ بێت عەبدولقەیس هۆزێکی زۆر باشن، وەفدەکە ماوەی دە ڕۆژ لە مەدینە مانەوەو میوانداری کران،[2] لەو بیست کەسە دوانزە کەسیان لە عەبدولقەیس بوون و جاروودیش یەکێک بوو لەوان.[3]

جاروود دەڵێت: کاتێک چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتم: ئەگەر من واز بهێنم لە ئایینی خۆم و بێمە ناو ئایینەکەی تۆوە ئەوەم بۆ هەیە کە خوا سزام نەدات؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ).[4]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (من زامنی ئەوەت دەکەم کە خوای گەورە ڕێنموونی کردویت بۆ چاکتر لەوەی-لەسەری بویت)، بۆیە جاروود بە چاکی موسڵمان بوو، کاتێک ویستی بچێتەوە بۆ وڵاتی خۆی داوای لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد سوارێکی پێ بدات تا پێی بچێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هیچ سوارێک شک نابەم پێت بدەم، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نێوانی من و وڵاتەکەم وشتری ونبووی تێدایە، ئایا سواری ئەو وشترانە ببم؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إنما هو حرق النار فلا تقربها)، (بەراستی ئەوە سووتانی دۆزەخە، بۆیە نزیکی شتی وا نەبیتەوە).[5]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٥٥٩.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٣١٤-٣١٥.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٥٥٧.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٢.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٥٦٠.

دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) جاررود لەسەر موسڵمانێتی خۆی بەردەوام بوو، کاتێک خەڵکی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هۆزەکەی ئەویش لەگەڵ مەعرووری کوڕی مونذیر لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، جاروود بە موسڵمانی مایەوەو شایەتومانی حەقی دووبارە کردەوەو خەڵکی بانگکردەوە بەرەو ئیسلام و وتی: ئەی خەڵکینە من شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوا و موحەممەدیش بەندەو نێردراوی خوایە[1]

جاروود خزمی ئەبووهورەیرە بوو، کاتێک عومەر ئەبوهورەیرەی نارد بۆ بەحرەین، جاروود لەگەڵی چوو.[2]

کاتێک عومەری کوڕی خەتتاب قودامەی کوڕی مەظعوونی کرد بە والی بەحرەین، قودامە بە جوانی کارەکانی خۆی دەکرد و سکاڵای لەسەر نەبوو ئەوەندە نەبێت ئامادەی نوێژی جەماعەت نەدەبوو، جاروود کە ئەوکات گەورەی عەبدولقەیس بوو هات بۆ لای عومەری کوڕی خەططاب وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران قودامە مەی خواردوەتەوەو منیش حەددێک لە حەددەکانی خوا دەبینم کە پێویستە لەسەرم بیگەیەنم بە تۆ، عومەر وتی: کێ شایەتی دەدات لەسەر ئەوە، جاروود وتی: ئەبوهورەیرە شایەتی ئەوە دەدات، عومەریش نامەی نووسی بۆ قودامەو داوای کرد بێت بۆ لای، جاروود قسەی دەکرد بۆ عومەر و دەیوت: پەیامی خوا لەم مەسەلەدا بەجێبگەیەنە، عومەریش پێی وت: تۆ لەم مەسەلەدا شاهیدیت یان نەیاریت (لایەنی کێشەکە) جاروود وتی: من شاهیدم، عومەر وتی: دەی تۆ شایەتی خۆتت بەجێگەیاند، بۆیە جاروود بێدەنگ بوو، بەیانی هەمدی هاتەوە بۆ لای و بە عومەری وت: حەددی خوا لەسەر ئەم کەسە جێبەجێ بکە، عومەریش وتی: هەرچی

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٥٦٠.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٢.

سەیرت دەکەم تۆ نەیارو سکالاکاریت، تەنها یەک کەسیش هەیە شاهیدی لەسەر بدات، سوێند بەخوا یان زمانی خۆت رادەگریت یان توندیت لەڕوودا دەنوێنم، جاروودیش وتی: سوێند بەخوا ئەوە حەق نیە ئامۆزاکەت مەی بخواتەوەو تۆش توندی بەرامبەر من بنوێنیت، ئەوەبوو عومەر لێی تووڕە بوو و ماوەیەک بە بەندی هێشتیەوە.[1]

ئەم کارەی عومەری کوڕی خەططاب بۆ بەرگری کردن نەبوو لە قودامە و چاوپۆشی نەبوو لە جێبەجێکردنی حەددێکی ئیسلام، بەڵکو نەبوونی دوو شایەت واتە نەبوونی رەوایی لە پەیڕەوکردنی حەددێکدا، بۆیە مەسەلەی حوکمدان لە مەسەلەیەکدا لەسەر بنەمای متمانە بەکەس بوون و رێڕەوی سۆزداری نابێت، با حەقیش بووبێت و ئەو کەسەی سکالای لەسەر کراوە تاوانێکی کردبێت کە حەددی لەسەر واجب بکات، بەڵام ئەگەر بە پێی پێویست شایەتی لەسەر نەبوو و کەسەکەش خۆی دانی نەنا بەو تاوانەدا، ئەوا ناکرێت حەددی لەسەر جێبەجێ بکرێت، بۆیە ئەگەر سەنەدی ئەم گێڕانەوە صەحیح بێت و رووداوی وا روویدابێت، ئەوە بەڵگەیە لەسەر حەقبوونی عومەری کوڕی خەططاب تا رێ نەدات لەسەر بنەمای متمانەی تاکەکەسی یان سۆزداری حوکمی خوا بدرێت بەسەر هیچ کەسدا، بەڵکو حوکمی خوا تەنها کاتێک پەیڕەو دەبێت ئەو هۆکارو بنەمایانەش بوونیان هەبێت کە خوا دیاری کردون، بۆیە تەنها شایەتێک نابێتە بەڵگە بۆ پەیڕەوی حەددی خوا بەسەر زیناکارێکدا با زیناکەش کرابێت، مادەم ژمارەی پێویستی شایەت نین دەبێت ئەو دۆسیەیە دابخرێت، هەر شلگیری یان زێدەکاری یان رێپێدانێکی زیادە لە بەشی سزادان (حەدد) لە ئیسلامدا قبوول نەکراوە، بە دڵنیاییەوە هەرکەس لەسەر بنەمای سۆز بڕیار بدات ئەوەی پێ ناڕەوایە کە کەسێک سکالای لەسەر کرابێت هیچی پێ

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٥٦٠-٥٦١.

نەکرێت و کەسێکیش کە خۆی مەی نەخواردوەتەوەو سکاڵای لەسەر کەسێک کردووە سزا بدرێت.

جاروود دواتر چوو لە بەصرە نیشتەجێ بوو و لەوێ مایەوە.[1]

دواجار لە ساڵی بیست و یەکەمی کۆچی و لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا لە خاکی فارس کوژرا.[2]

رایەکی تریش دەڵێت: بەڵکو لە جەنگی نەهاوەند لەگەڵ نوعمانی کوڕی موقرن بوو و تیایدا کوژرا.[3]

## ٦٠٢. جاریەی کوڕی ظوفەر(ﷺ)

ناوی جاریەی کوڕی ظوفەری یەمامی حەنەفییە، کونیەکەی ئەبوونمرانە، چونکە کوڕێکی هەبوو بە ناوی نمران، مەولایەکیشی هەبوو بە ناوی عقیلی کوڕی دینار، هەریەک لە کوڕەکەی و مەولاکەی فەرموودەیان لێوەگێڕاوەتەوە،[4] بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: سەنەدی گێڕانەوەکەی لە دهثمهوەیە کە زۆر لاوازە.[5]

ئەم هاوەڵە لە کووفە نیشتەجێ بووە.[6]

## ٦٠٣. جاریەی کوڕی جابیر(ﷺ)

رایەک دەڵێت: ناوی جاریەی کوڕی جابیری عەصرییە، ئیبن حەجەر دەڵێت: وا دەزانم ناوی جوەیریەی عەصریە کە ئیبن مونده باسی کردووە،[7] یەکێک بوو لە ئەندامانی وەفدی عەبدولقەیس.

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٨٣.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٢.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣٨٣.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣٨٥.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٤.
[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٢٧.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٤.

## ٦٠٤. جاریەی کوڕی حومەیل(﵁)

ناوی جاریەی کوڕی حومەیلی کوڕی نوشەبەی ئەشجەعیە، هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو، لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) مایەوەو بەشداری غەزای بەدری کرد.[١] جاریەی کوڕی حومەیل دواتریش لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[٢]

## ٦٠٥. جاریەی کوڕی زەید(﵁)

ناوی جاریەی کوڕی زەیدی کوڕی عەددەی کوڕی کەلبیە، تا سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیب مایەوەو لە جەنگی صفیندا لە ریزەکانی عەلیدا بەشداری کرد.[٣]

## ٦٠٦. جاریەی کوڕی عەبدوڵای ئەشجەعی(﵁)

ناوی جاریەی کوڕی عەبدوڵای ئەشجەعیەو هاوپەیمانی بەنی سەلەمە بوو لە پشتیوانان، لە جەنگی یەرمووکدا بەشدار بووەو بەرپرسی بەشێکی سوپاکە بوو، سیفەتی خەلیفە راشیدینەکانیش وابوو تەنها هاوەڵانی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) کردووە بە بەرپرسی سوپا و بەشەکانی سوپا.[٤]

## ٦٠٧. جاریەی کوڕی عەبدولمونذیر(﵁)

ناوی جاریەی کوڕی عەبدولمونذیری کوڕی زەنبەرە، فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت (یوم الجمعة سید الأیام)،[٥] (رۆژی

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٣٨٤.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٨٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٤.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٤.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٤.
[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٣٨٥.

هەینی گەورەی ڕۆژەکانە).

ئەبونوعەیمی ئەصبەهانی کە ئەو فەرموودەی هێناوە (یوم الجمعة سید الأیام) لە ئەبولوبابەی کوڕی عەبدولمونذیرەوە هێناویەتی و لەژێر ناوی جاریەی کوڕی عەبدولمونذیریشدا هێناویەتی،[1] واتە پێدەچێت کونیەکەی جاریە ئەبولوبابە بووبێت چونکە باوکی ئەمیش عەبدولمونذیر بووەو هەمان فەرموودەش گێردراوەتەوە.

## ٦٠٨. جاریەی کوڕی قودامە(ﷺ)

ناوی جاریەی کوڕی قودامەی کوڕی مالیکی کوڕی زوهەیری تەمیمی سەعدیە، بەوە ناسراوە کە مامی ئەحنەف بووە، بەڵام لە بنەڕەتدا مامی نەبووە بەڵکو ئەحنەف وەک ڕێزلێنان و بەرزراگرتنی جاریە بە مامە بانگی دەکرد،[2] کونیەی جاریە ئەبووعەمر یان ئەبوو ئەیووب بووە،[3] یان دەوترێت کونیەکەی ئەبوویەزید بووە.[4]

جاریە دواتر لە بەصرە نیشتەجێ بوو.[5]

جاریەی کوڕی قودامە جارێک لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمایشتێکم پێ بفەرموو کە خوای گەورە بەوە سوودمەندم بکات، بە کورتیش پێم بفەرموو بەڵکو لەبیرم نەچێتەوە، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) فەرمووی: (لا تغضب)، (تووڕە مەبە) چەند جارێک جاریەی کوڕی قودامە ئەو قسەی دووبارە دەکردەوەو پێغەمبەری خوایش(ﷺ) هەمان شتی دەفەرموو.[6]

---

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٥٥٤.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٥.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٢٦.

[4] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ٢٦.

[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٢٦.

[6] مسند أحمد بن حنبل - مسند المكيين(ﷺ) - حديث جارية بن قدامة(ﷺ)، الرقم ١٦٢١٠، صححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب، الرقم ٢٧٤٨.

جاریە ئامادەی ئەو حاڵە بوو کە تیایدا عومەری کوڕی خەططاب شەهید کرا، جاریە دەڵێت: ئێمە لە کۆتا کەسان بووین کە چووین بۆ لای عومەری کوڕی خەططاب، داوای وەسیەتێکمان لێکرد کە کەسی تر لێی نەکردبوو.[1]

جاریە لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا سەرکردەیەکی دڵسۆزی عەلی بوو،[2] تەنانەت عەلی بۆ بڕیاردان رای ئەوی وەردەگرت، بۆ نموونە کاتێک ویستی کەسێکی بەتوانا دابنێت بۆ ناوچەی فارس کاتێک ئامادە نەبوون خەراج بدەن، جاریە وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئایا کەسێکت پێ بڵێم کە رادروست و شارەزای سیاسەت بێت و دەرەقەتی ئەو ئیشە بێت کە پێی دەسپێریت، عەلی وتی: ئەو کەسە کێیە؟ وتی: زیاد، ئەوەبوو عەلی زیادی دانا بۆ ناوچەی فارس و کرمان و چوار هەزار سەربازی خستە بەردەستی.[3]

کاتێک دایکی باوەڕداران عائیشە لەگەڵ طەلحەو زوبەیردا بەرەو بەصرە دەرچوو، جاریەی کوڕی قودامە چوو بۆ لای و وتی: ئەی دایکی باوەڕداران سوێند بەخوا کوژرانی عوثمانی کوڕی عەففان زۆر ئازارو زیانی کەمترە لەم دەرچوونەی تۆ لە ماڵەوە کە بەم وشترە نەفرەتیە دەرچویت، تۆ پەردەو حورمەتێکت لای خواوە بۆ هەبوو کەچی وا ئەو پەردە نەماوەو حورمەتیشت بەزێنراوە، هەرکەس بڕوای هەبێ لەگەڵت بجەنگێت بڕواشی هەیە بە کوشتنت، ئەگەر بە ویستی خۆت هاتویت ئەوا بگەڕێرەوە بۆ ماڵی خۆت، ئەگەریش بە زۆرەملێ و ناچاری هێنراویت ئەوا پشت بە من ببەستەو من هاوکارت دەبم.[4]

عەلی کوڕی ئەبووطالیب ئەوی بە سوپایەکەوە نارد بۆ بەصرە کە لەو کاتەدا عەبدوڵای کوڕی حەضرەمی لێ بوو کە لەلایەن موعاویەوە

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٥٦.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٢٦.

[3] تأريخ الطبري، ج٣، ص ١٥١.

[4] تأريخ الطبري، ج٣، ص ١٥.

نێردرابوو تا بەیعەت کۆ بکاتەوە بۆ موعاویە، ئەویش لە ماڵێکدا گەمارۆی دا، دواتریش ماڵەکەی بەسەردا سووتاند.[١]

لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا خەڵکێک لە یەمەن لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، ئەوەبوو عەلی سوپایەکی ئامادە کردو جاریەی کوڕی قودامەی کرد بە سەرکردەی سوپاکەو ناردی بۆ ئەوێ، لەوێ هەموو ئەوانەی کۆکردەوە کە لە ئیسلام هەڵگەڕابوونەوەو دای لە گەردنی هەموویان و بە ئاگریش جەستەی ئەوانی سووتاند، چونکە عەلی کوڕی ئەبووطالیب فەرمانی بەو کارە کردبوو.[٢]

هەروەها عەلی کوڕی ئەبووطالیب بیستی بوسری کوڕی ئەرطەئە لە حیجاز چ خوێنرێژیەکی کردوە، بۆیە جاریەی کوڕی قودامەی نارد بۆ حیجاز، ئەویش چوو بۆ ئەوێ و هەرکەسی ببینیایە بەیعەتدان بە عەلی هەڵوەشاندبێتەوە دەیکوشت.[٣]

هەروەها جاریە لە جەنگەکانی تردا لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا بەشداری کرد.[٤]

## ٦٠٩. جاهیمەی کوڕی عەبباس(ﷺ)

ناوی جاهیمەی کوڕی عەبباسی کوڕی میرداسی سولەمیە، کونیەکەی ئەبوو موعاویەیە،[٥] جاهیمە کوڕێکی هەبوو بە ناوی موعاویە کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٦]

جاهیمە یەکێک بوو لە بەشداربوانی غەزای خەندەق.[٧]

---

[١] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٢٦-٢٢٧، تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٥٨٧.

[٢] تهذيب الآثار للطبري، الرقم ١٣٨٢.

[٣] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ٣٦.

[٤] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٥٤٥.

[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٣٨٧.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٦.

[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٦.

عەبباسی باوکی یەکێک بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کە پێش فەتحی مەککە موسڵمان بوو و بە ژمارەیەکی زۆری سوارەوە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا لەگەڵیدا لە فەتحی مەککەدا بەشدار بن.[1]

جاهیمە دەڵێت: هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا سەبارەت بە جیهاد کردن راوێژی پێ بکەم،[2] لە گێڕانەوەیەکی تردا موعاویەی کوڕی جاهیمە دەڵێت: وتم: من نیەتی جیهادم هێناوە لەگەڵ تۆدا تا بەوە رەزامەندی خواو بەهەشت بەدەست بهێنم، ئەویش فەرمووی: (ئایا دایکت زیندووەو ماوە؟) وتم: بەڵێ، فەرمووی: (ارجع فبرها)، (دەی بگەڕێرەوەو چاکە لەگەڵ دایکت بکە)، دواتر لە لایەکی ترەوە هاتمە خزمەتی و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من نیەتی جیهادم هێناوە لەگەڵ تۆدا تا بەوە رەزامەندی خواو بەهەشت بەدەست بهێنم، ئەویش فەرمووی (ويحك أحية أمك؟)ماڵوێران ئایا دایکت زیندووە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: (دەی بگەڕێرەوە بۆ لای و چاکەی لەگەڵ بکە)، جاهیمە دەڵێت: ئەمجاریان لە بەرامبەریەوە هاتمەوە خزمەتی و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من نیەتی جیهادم هێناوە لەگەڵ تۆدا تا بەوە رەزامەندی خواو بەهەشت بەدەست بهێنم، ئەویش فەرمووی: (ماڵوێران ئایا دایکت زیندووە؟) وتم: بەڵێ، فەرمووی: (ويحك، الزم رجلها فثم الجنة)،[3] (ماڵت وێران دەی برۆ پەیوەستی قاچەکانی بە چونکە بەهەشت لەوێدایە).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو (اذهب فألزمها فإن الجنة عند رجليها)،[4] (برۆ لای دایکت بە چونکە بەهەشت لای پێکانی دایکتە).

ئەم فەرموودەیە ئاماژەیە بە گەورەیی فەزڵی دایک وباوک و

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٧١.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٦.
[3] سنن ابن ماجه – أبواب الجهاد – باب الرجل يغزو وله أبوان ، الرقم ٢٧٨١، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ٢٧٨١.
[4] المستدرک على الصحيحين – كتاب الجهاد – الجنة عند رجلي الوالدة ، الرقم ٢٥١٦ و صححه ووافقه الذهبي في التلخيص.

چاكەكردن لەگەڵیاندا، هەروەک لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە یەكێک لە گوناهە گەورەكان بریتییە لە ئازاردانی دایک و باوک، خوای گەورەش فەرمان دەكات بە موسڵمان ئەگەر دایک و باوک یەكێكیان یان هەردووكیان پیر بوون و لای منداڵەكەیان مانەوەو ئازار و نارەحەتیشیان دروست كرد بۆیان ئەوا منداڵەكەیان تەنها ئۆف وتنێكیش چیە لە بەرامبەریاندا نەیڵێت، چ جای ئەو منداڵانەی كە بێ ئەوەی دایک و باوكیان پێویستیان بەوان بێت خراپە دەنوێنن لە ڕووی دایک وباوكیاندا، هەیانە كاریگەرە بە ماددە و هەیانە كاریگەرە بە ژنەكەی و هەیانە كاریگەرە بە منداڵەكەی و هەیانە كاریگەرە بە بیرو بیركردنەوەی خۆی، هەریەک لەوانەو چەندینی تر هۆكارن بۆ ئازاردانی دایک و باوک، وەک چۆن دەكرێت هەریەک لەوانە بكرێنە هۆكار بۆ دڵخۆش كردنی دایک و باوک، جا چ ڕەحمەتێكە كەسێک سۆزی دایک و باوكی بۆ بمێنێت، مەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) تكای نەكرد لای خوای گەورە تا ڕێی پێ بدات سەردانی گۆڕەكەیان بكات؟ هەروەک بەپێی فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) دەزانین ئەركی منداڵ بەرامبەر بە دایک و باوک تەنها بە مردنیان كۆتایی نایەت، بەڵكو چەندین مافی تری دایک و باوک هەن بەسەر منداڵەوە وەک نزاكردن بۆ دایک و باوک و سەردانی خزمان و كەسە خۆشەویستەكانیان و سەردانی گۆڕیان و خۆپاراستن لە قسەو كارێک كە ببێتە هۆكار تا خەڵكی تر نەفرین و قسەی ناشیرینیان پێ بڵێن.

هەروەها ئەوەش ڕوونە كە فەزڵی چاكەكردن لەگەڵ دایكدا لەپێشترە لە ئاست باوكدا وەک چۆن لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) لە وەڵامی هاوەڵێكدا كە وتی: كێ باشترین كەسە تا هاودەمی بكەم فەرمووی: دایكت، تا سێ جار ئەوەی دووبارە كردەوە تا لە جاری چوارەمدا فەرمووی:

باوکت، ئەمە بەو مانایە نا باوک پشتگوێ بخرێت، چونکە چاکە لەگەڵ دایک و باوک و ئازاردانی دایک و باوک لە قورئان و فەرمووودەدا پێکەوە باس کراون، چاکە لەگەڵ هەردووکیان واجبە و خراپە نواندیش بەرامبەریان گوناهی گەورەیە و هیچ راجیاییەکیش لەوەدا نیەو چەندین دەقی قورئان و فەرمووودەش لەو بارەوە هەن،

سەبارەت بە حوکمی چوون و نەچوون بۆ جیهاد لەکاتی بوونی دایک و باوکدا، ئەوا ئەگەر جیهادکردنەکە جیهادی کیفایە بوو ئەوا مۆڵەت خواستنی دەوێت، بەڵام ئەگەر جیهادکردنەکە بوو بە فەرزی عەین ئەوا پێویست بە مۆڵەتی دایک و باوک ناکات، شەوکانی لە کتێبەکەیدا (نیل الأوطار) ئەم فەرمووودەو فەرمووودەی تریش دێنێت و دواتر دەڵێت: هەموو ئەمانە لە کاتێکدایە کە جیهاد لەسەر ئەو کەسە نەبوو بێت بە فەرزی عەین، بەڵام کە بوو بە فەرزی عەین ئەوا گوێڕایەڵی بەندە لە سەرپێچی خوادا دروست نیە).[1]

## ٦١٠. جەبباری ثەعلەبی(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵە ناسراوە بە جەبباری ثەعلەبی، لە بەسەرهاتی ژیانیدا هاتووە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لە رێیاندا بەرەو (ذي أمر) لە مانگی رەبیعولئەوەلدا و پاش بیست و پێنج مانگ دوای کۆچ بۆ مەدینە جەبباریان بەدیل گرت، ئەوانیش لای پێغەمبەر(ﷺ) دایاننا، پێغەمبەریش(ﷺ) بانگی کرد بۆ ئیسلام، ئەویش موسڵمان بوو.[2]

هەروەها لە گێرانەوەیەکی تردا هاتووە جەببار رێنیشاندەری پێغەمبەر(ﷺ) بوو بەرەو لای غەطەفانیەکان.[3]

[1] نيل الأوطار للشوكاني، ج٨، ص ٣٨.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥٠.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥٠.

## ٦١١. جەبباری کوڕی حەکەم(ﷺ)

ناوی جەبباری کوڕی حەکەمی سولەمیە، یەکێکە لەوانەی وەک وەفد هاتوەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمان بووە.[١]

## ٦١٢. جەبباری کوڕی سولما(ﷺ)

ناوی جەبباری کوڕی سولمای کوڕی مالیکی کوڕی جەعفەرە، وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو.[٢]

جەببار بە نیازی کوشتنی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ عامری کوڕی طوفەیلدا هات بۆ مەدینە، بەڵام دواتر گەڕایەوە، ئینجا لە ڕۆژی بیئر مەعوونەدا بەشدار بوو و عامری کوڕی فهیرەی کوشت، بەڵام دواتر هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو، ئینجا خۆی دەیوت: ئەوەی وایکرد موسڵمان ببم ئەوەبوو -لە بیئر مەعوونەدا- شمشێرێکم کرد بە سکی کەسێک لە موسڵمانەکاندا-ئەوانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناردبوونی- کەچی بیستم دەیوت: سوێند بەخوا براوە بووم، منیش لە دەروونی خۆمدا وتم: مەگەر من نەمکوشتووە ئیتر بە چی براوە بووە؟!! تا دواتر سەبارەت بەو قسەی پرسیارم کرد وتیان: ئەوە شەهیدی دەستکەوتووە، منیش وتم: سوێند بەخوا براوە بوو.[٣]

کاتێک جەبباری کوڕی سولما شمشێرەکەی کرد بە سکی عامردا عامر وتی: سوێند بەخوا بردمەوە، ئینجا تەرمەکەی بەرەو ئاسمان بەرزبوویەوە، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ئاماژەی پێدا کە فریشتەکان بوون تەرمەکەیان بەرزکردەوە.[٤]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٨.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٨.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٣٨٨.
[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٣١.

لـه سـاڵی نـۆی کۆچیدا وەفدی بەنـی کیـلاب هاتـن بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) و سـیانزە کـەس دەبـوون، لەنێویانـدا لوبەیـدی کـوڕی رەبیعـەو جەببـاری کـوڕی سـولما هەبـوون، پێغەمبەریـش(ﷺ) لـە ماڵـی رەملـەی کچـی حـارث داینـان، دۆسـتایەتیەک لەنێوان جەببـار و کەعبی کـوڕی مالیکدا هەبـوو، کاتێک کەعب بیستی ئەوان هاتون بەخێرهاتنی کردن و دیاری و خەڵاتی دا بـە جەببـار، ئینجـا هەموویـان لەگـەڵ کەعـب چوونـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) و سـەلامیان لێکـردو وتیـان: ضـحاکی کـوڕی سـوفیان لەنێوماندا بەپێی قورئـان و سـوننەتی تـۆ دەجووڵێتـەوەو بانگـی کردیـن بـۆ لای خـوا، ئێمـەش چوویـن بـەدەم بانگـەوازی خـوا و پێغەمبەرەکەیـەوە، هەروەهـا ضحـاک زەکاتمـان لێوەردەگرێـت و دابەشـی دەکاتـەوە بەسـەر هەژارەکانمانـدا.[1]

## ٦١٣. جەبباری کوڕی صەخر(رضي الله عنه)

نـاوی جەببـاری کـوڕی صەخـری کوڕی ئومەییـەی کوڕی خەنسـائی کوڕی سینانە،[2] کونیەکـەی ئەبـوو عەبدوڵایـە،[3] لـە پشـتیوانانە لـە خەزرەجیـەکان لـە سولەمیەکان.[4]

دایکـی نـاوی عەتیکـەی کچـی خەرشـەی کـوڕی عەمـر بـوو،[5] بـەڵام ئیبـن ئەثیـر دەڵێـت: دایکـی نـاوی سـوعادی کچـی سـەلەمە بـوو.[6]

کچێکـی نـاوی سـمیکە بـوو، کچێکـی تریشـی نـاوی عوصەیمـە بـوو کـە هەردووکیـان موسـڵمان بـوون و بەیعەتیـان دابـوو بـە پێغەمبـەر(ﷺ).[7]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێک برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە،

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٣٠٠.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٨٨.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٧٦.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٧٦.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٧٦.

[6] أسد الغابة، ج١، ص ٣٨٨.

[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٤٠٧.

برایەتی خستە نێوان میقداد و جەبباری کوڕی صەخرەوە.[1]

جەببـاری کـوڕی صەخـر یەکێـک بـوو لـەو حەفتـا کەسـەی لـە بەیعەتـی عەقەبـەدا بەشـدارییان کـرد.[2]

جەبـبار لـە غـەزای بـەدردا بەشـداری کـرد،[3] لـەو کاتـەدا تەمەنـی سـی و دوو سـاڵ بـوو.[4]

دواتـر لـە غەزاکانـی تریشـدا بەشـداری کـرد، لـە غـەزای خەیبـەردا پێغەمبـەر(ﷺ) جەببـاری کـوڕی صەخـری نـارد تـا جوولەکـەکان بخەملێنێت.[5]

جابیـر دەڵێت: جارێـک لەگـەڵ پێغەمبـەر(ﷺ) دەڕۆیشـتین تـا نزیـک بووینـەوە لـە ئاوێکـی عـەرەب، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمووی: ( من رجل يتقدمنا فيمدر الحوض فيشرب و يسقينا)،(چ پیاوێ هەیە پێش ئێمە بکەوێت و حەوزەکە بسوێت و ئاو بخواتەوەو ئاویـش نۆشـی ئێمـە بـکات)، جابیـر دەڵێت: منیش هەسـتام و وتـم: ئەوە پیاوێکە- واتـە مـن ئامـادەم- ئـەی پێغەمبـەر(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: چ کەسێک لەگـەڵ جابیـر دەڕوات؟ ئەوەبوو جەببـاری کـوڕی صـەخر هەسـتا، هەردووکمان چووین بۆ لای بیرەکە، سـەتڵێک یان دوو سـەتڵ ئاومان کردە ناو حەوزەکەوە، ئینجا چـاک سـویمان، ئینجـا ئاومـان تێکرد تـا پڕمـان کرد، یەکەم کەس گەیشـت پێمـان پێغەمبـەر(ﷺ) بـوو، فەرمـوی (ئایـا مۆڵـەت دەدەن؟) وتمـان: بەڵـێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)، ئەویـش ئـاوی دا بـە وشـترەکەی، ڕەشـۆکەی گـرت و وشـترەکەش میزی کـرد، ئینجـا وشـترەکەی مـۆڵ دا، پاشـان پێغەمبەر(ﷺ) هات بـۆ لای حەوزەکـەو دەسـتنوێژی لێگـرت، دواتـر منیـش هەسـتام و لـە شـوێن دەسـتنوێژەکەی پێغەمبـەردا(ﷺ) دەسـتنوێژم گـرت، ئینجـا جەببـاری کـوڕی صەخـر چـوو تـا دەسـت بـە ئـاو بگەیەنێت، پێغەمبـەر(ﷺ) هەسـتا تا نوێژ بکات،

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٦١.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٩.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٩.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٧٦.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٩.

منیش لەلای چەپی پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەستام، ئەویش دەستی گرتم و منی خستە لای راستیەوە، ئینجا جەبباری کوڕی صەخر هات و دەستنوێژی گرت، دواتر هات و لە لای چەپی پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەستا، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی هەردووکمانی گرت و پاڵی پێوەناین تا ئێمەی خستە پشت خۆیەوە، جا پێغەمبەری خوا(ﷺ) چاوی لەسەرم بوو و منیش هەستم بەوە نەدەکرد، دواتر زانیم کە پێغەمبەر(ﷺ) چاوی لەسەرمە...[1]

لە سەردەمی عومەری کوڕی خەطتابدا کاتێک عومەر جوولەکەکانی خەیبەری دەرکرد ژمارەیەک لە کۆچەران و پشتیوانانی لەگەڵدا بوو، جەبباری کوڕی صەخریش لەگەڵیدا بوو، جەببار خەمڵێنەری خەڵکی مەدینە بوو و ئەو حسابی بۆ دەکردن.[2]

دواجار جەبباری کوڕی صەخر لە تەمەنی شەست و دووساڵی و لە ساڵی سی کۆچی و لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا کۆچی دوایی کرد.[3]

## ٦١٤. جەبەلەی کوڕی ثەور(رضي الله عنه)

ناوی جەبەلەی کوڕی ثەوری حەنەفیەو یەکێک بوو لەوانەی لە وەفدی بەنی حەنیفەدا بوون، دواتریش ژیا و یەکێک بوو لەوانەی بەشدار بون لە کوشتنی موسەیلەمەی درۆزندا.[4]

## ٦١٥. جەبەلەی کوڕی حارثە(رضي الله عنه)

ناوی جەبەلەی کوڕی حارثەی کوڕی شەراحیلە، برای زەیدی کوڕی حارثە و مامی ئوسامەی کوڕی زەیدە، برا گەورەی زەیدی باوکی ئوسامەیە.[5]

---

[1] صحيح مسلم - كتاب الزهد والرقائق - باب حديث جابر الطويل وقصة أبي اليسر، الرقم ٣٠١٤.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٤٩.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥٦.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥٦.

دایکی ناوی سعدای کچی ثەعلەبەیە.[1]

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەککە بوو جەبەلە لەگەڵ حارثەی باوکیدا هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، حارثە چوو بۆ لای زەیدی کوڕی و لەلایەوە وەستا، جەبەلەش گەڕایەوەو دواتر هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو.[2]

جەبەلە دەگێڕێتەوە دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتم: براکەم بنێرە لەگەڵمدا با لەگەڵم بێتەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (هو ذا فإن انطلق معك لم أمنعه)، (ئا ئەوەتا لەبەردەمتدایە، ئەگەر لەگەڵت بێت رێی لێ ناگرم)، بەڵام زەید وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەس بەسەر تۆدا هەڵنابژێرم، جەبەلە دەڵێت: سەیرم کرد قسەکەی زەیدی برام لە قسەکەی من زۆر چاکتر بوو.[3]

جەبەلە براگەورەی زەید بوو، بەڵام زۆر بە چاوی رێز و گەورەتر لە خۆی تەماشای زەیدی دەکرد، بۆیە کاتێک پرسیاری لێکرا ئایا تۆ گەورەتریت یان زەیدی برات؟ وتی: زەید زۆر لە من باشترەو منیش پێش ئەو لەدایک بووم، با ئەوەشتان بۆ بگێڕمەوە کە کاتێک دایکمان مرد ئێمە لە ماڵی باوکی دایکمان بووین، ئینجا هەردوو مامم هاتن و بە باپیرەی ئێمەیان وت: ئێمە شیاوترین بە برازاکانمان، ئەویش وتی: دەی جەبەلە ببەن و زەید بۆ من جێبهێڵن، ئەوەبوو مامەکانم منیان برد، سوپایەکی سوارەی تهامە هات و زەیدیان بە کۆیلە برد، حاڵی ئەمسەر و ئەوسەر بوو تا دواجار کەوتە لای خەدیجە و ئەویش بە خەڵات بەخشی بە پێغەمبەر(ﷺ).[4]

---

[1] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٣، ص ٤٠.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٣.
[3] جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) - باب مناقب زيد بن حارثة(ﷺ) ، الرقم ٣٨١٥ وقال حسن غريب، حسنه الألباني.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٣.

جەبەلـە دەڵێـت: جارێـک دوو جـل بـە خـەڵات هێنـران بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ)، ئەویش یەکێکیانـی دانـا بـۆ خـۆی و ئـەوی تـری بەخشـی بـە زەیـد-ی بـرای جەبەلـە-.[1]

جەبەلـە دەڵێـت: پرسـیارم کـرد لـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) و وتـم: شـتێکم فێـر بکـە کـە سـوودم پـێ بگەیەنێـت، فەرمـووی: (إذا أخذت مضجعك، فاقرأ: قل يا أيها الكافرون، فإنها براءة من الشرك).[2] (کـە چوویتـە نـاو جێـی خەوەکـەت قـل یـا أیهـا الکافـرون بخوێنـە، چونکـە ئـەوە دوورەپەرێزیـە لـە هاوەڵدانـان).

## ٦١٦. جەبەلەی کوڕی عەمر(ﷺ)

نـاوی جەبەلـەی کوڕی عەمری کوڕی ئەوسـی کوڕی عامرە، لە پشـتیوانانە لـە بەنـی سـاعیدە، یەکێک بـوو لـە بەشـداربوانی غـەزای ئوحود.[3]

دوای وەفاتی پێغەمبەری خوایش(ﷺ) لە مەدینە مایەوە.[4]

لـە سـەردەمی خیلافەتـی عوثمانـی کـوڕی عەففانـدا کەوتـە داوی ئاشـووبخوازانەوەو بەرامبـەر عوثمانـی کـوڕی عەففـان نارەزایـی دەردەبـڕی، ئەوەبـوو جارێـک عوثمـان ئـەو کۆمەڵـەی دەدوانـد کـە نارەزاییـان دەردەبـڕی، وتـی: چیتـان دەوێـت؟ وتیـان: یـان دەتکوژیـن یـان لاتدەبەیـن، ئەویـش وتـی: ئـەی بۆچـی خەڵکـێ نەنێریـن بـۆ ئاسـۆکان تـا لـە هـەر ناوچەیـەک دەسـتەیەک لـە چاکترینیـان بێـن و دادوەری نێـوان مـن و ئێـوە بکـەن؟ ئەگـەر مافێکـم لـێ زەوت کـردون بـا بتاندەمـەوە، پاشـان وتـی: ئایـا جەبەلـەی کـوڕی عەمـری سـاعیدیتان تێدایـە؟ جەبەلـە وتـی: بەڵـێ، عوثمـان وتـی: داوای چ مافێـک دەکەیـت لـە مـن؟ ئەویـش وتـی: تـۆ چـل قامچیـت لێداوم، عوثمـان وتـی: ئـەرێ مەگـەر

---

[1] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٤٩١٦.

[2] السنن الکبرى للنسائي - کتاب عمل اليوم والليلة - قراءة قل يا أيها الكافرون عند النوم وذكر اختلاف الناقلين للخبر في ذلک ، الرقم ١٠٥٦٨، قال الحافظ ابن حجر في الإصابة: حديث متصل صحيح الإسناد.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥٧.

[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٤.

مـن نەهاتـم بـۆ ماڵـەوە بـۆ لات تـا مافـت بدەمـەوە کەچـی رازی نەبوویـت؟!!
ئەویش وتـی: بـا، عوثمـان وتـی: ئێسـتا تـۆ لـەوە زیاتـرت لـە مـن دەوێـت، داوای
خوێنـم دەکەیـت؟[١] هەروەهـا دواتریـش بـۆ ئەسـپەردەکردنی تەرمـی عوثمانـی
کـوڕی عەففـان رێگـری دەکـرد لـەوەی تەرمـی لـە گـۆڕسـتانی بەقیـع ئەسـپەردە
بکرێـت.[٢]

لـە سـەردەمی خیلافەتـی عەلـی کـوڕی ئەبوطالیبدا لـە سـوپای عەلیدا بـوو و
لە جەنگی صفیندا بەشداری کرد.[٣]

دواتر جەبەلە چوو لە میصر نیشتەجێ بوو و لەوێ مایەوە.[٤]

جەبەلـە لـە سـاڵی پەنجـای کۆچیـدا لەگـەڵ موعاویـەی کـوڕی خدیجـدا لـە
فەتحـی ئەفریقیـادا بەشـداری کـرد.[٥]

## ٦١٧. جەبەلەی کوڕی مالیک(ﷺ)

نـاوی جەبەلـەی کـوڕی مالیکـی کـوڕی جەبەلـەی کـوڕی صفـارەی لەخمـی
دارییـە، لەگـەڵ هاتنـی وەفـدی دارییـەکان بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ) جەبەلـەش
لەگـەڵ دارییـەکان هـات ئـەو کات پێغەمبـەر(ﷺ) لـە تەبـووک دەگەڕایـەوە.[٦]

## ٦١٨. جەبەلەی کوڕی ئەبووکەریب(ﷺ)

نـاوی جەبەلـەی کـوڕی ئەبووکەریبـی کـوڕی قەیسـە، وەک وەفـد هاتـووەتـە
خزمـەت پێغەمبـەری خـوا(ﷺ).[٧]

---

[١] تاريخ المدينة، رقم الحديث، ١٩٣٦.
[٢] تاريخ المدينة، رقم الحديث، ٣٢٢.
[٣] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢١٥٤.
[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٤.
[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٤.
[٦] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٤-٣٩٥.
[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥٨.

## ٦١٩. جەبەلەی کوڕی ئەزرەق(رضي الله عنه)

ناوی جەبەلەی کوڕی ئەزرەقی حیمصیە،[١] فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە[٢] کە دەڵێت: جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە پاڵ دیوارێکدا نوێژی دەکرد بە دیوارەکە وردە کونی زۆری هەبوو، نوێژی نیوەڕۆ یان عەسری کرد، کاتێک لە دووەم رکاتدا دانیشت دووپشکێک پێوەی دا، ئەوەبوو لەهۆش خۆی چوویەوەو خەڵکەکە هاتن بە دەمیەوەو روقیەیان بۆ کرد، کاتێک هاتەوە هۆش فەرمووی: (الله شفاني وليس برقيتكم)،[٣] (خوا شیفای دام نەک بە روقیەکەی ئێوە شیفام بۆ هاتبێت).

## ٦٢٠. جەبەلی کوڕی جەووال(رضي الله عنه)

ناوی جەبەلی کوڕی جەووالی کوڕی صەفوانی کوڕی بیلالی ذبیانی ثەعلەبیە، ئەم کەسە سەرەتا جوولەکە بوو و لەگەڵ بەنی قورەیضە بوو، دواتر موسڵمان بوو.[٤]

## ٦٢١. جەبر(رضي الله عنه)

ناوی جەبرەو مەولای بەنی عەبدوددارە، ئەم کەسە سەرەتا جوولەکە بوو و لە مەککە بوو، گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە سوورەتی یووسفی دەخوێند، بەو هۆیەوە جەبر موسڵمان بوو و موسڵمانبوونی خۆی شاردەوە، دواتر مەولاکانی خۆی لەوە ئاگادار کردەوە کە ئەو موسڵمان بووە، ئەوانیش سزایان دا، کاتێک فەتحی مەککە کرا، جەبر چوو لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥٥.

[٢] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٤٣٢.

[٣] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢١٥٣، ضعفه الألباني في صحيح و ضعيف الجامع الصغير و زيادته، الرقم ٣٥٣٧.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥٤.

سکاڵای کرد کە تووشی چ ئازارێک بووە، پێغەمبەریش(ﷺ) پارەی پێدا و جەبریش خۆی کڕیەوەو بەرەبەرە شتێکی پێکەوەنا و ئافرەتێکی خانەدانی لە هۆزی بەنی عامر بەهاوسەرگرت.[1]

ئیبن حبان دەڵێت: ئەم هاوەڵە یەکێک بوو لەوانەی کە ئەم ئایەتە لە بارەیانەوە دابەزی (إلا من أكره وقلبه مطمئن بالإيمان...) هەروەها ئەم ئایەتەش سەبارەت بە جەبر دابەزیوە (وجعلنا بعضكم لبعض فتنة).[2]

## ٦٢٢. جەبری کوڕی عەبدولا(ﷺ)

ناوی جەبری کوڕی عەبدولای قیبطیە، دەوترێت مەولای بەنی غیفار بووە،[3] نوێنەری موقەوقس بوو کە ماریەی هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ).[4]

جەبری کوڕی عەبدولا دواتر لە ساڵی شەست و سێی کۆچیدا وەفاتی کرد.[5]

## ٦٢٣. جەبری کوڕی ئەنەس(ﷺ)

جەبری کوڕی ئەنەسی کوڕی ئەبی زورەیق، تا سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیب ژیا و لە جەنگی صفینیشدا بەشداری کرد،[6] رایەکیش دەڵێت: جەبر لە غەزای بەدردا بەشدار بوو،[7] بەڵام ئیبن حەجەر بەرپەرچی ئەوە دەداتەوە، هەروەک چۆن بەرپەرچی ئەوەش دەداتەوە جەبری کوڕی ئەنەس و جوبەیری کوڕی ئیاس یەک کەسایەتی بن.[8]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥٢.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥٢.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥١.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٣١.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥١.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥١.
[7] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٠.
[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥١.

## ٦٢٤. جەبری کیندی(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵەش فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە کوڕەکەی لێوەی گێڕاوەتەوە و دەڵێت: لە وەفدێکدا چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ).[1]

## ٦٢٥. جەبری ئەعرابی(رضي الله عنه)

ناوی جەبرە و ناوی باوکی نەزانراوە، ئەسوەدی کوڕی هیلال دەڵێت: کەسێکی ئەعرابیمان لەناودا بوو کە لە (الحيرة) بانگی دەدا، پێی دەوترا جەبر، دەیوت: عوثمان نامرێت تا دوای ئەم دێت-دوای عومەری کوڕی خەططاب دەبێتە خەلیفە-، پێی وترا چۆن ئەوە دەزانیت؟ وتی: من لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی بەیانیم دەکرد، کاتێک سەلامی دایەوە سەیری ئێمەی کرد و فەرمووی: (إن ناسا من أصحابي وزنوا الليلة فوزن أبو بكر فوزن ووزن عمر فوزن ثم وزن عثمان وهو صالح)،[2] (خەڵکانێ لە هاوەڵانم ئەمشەو کێشانە کران، ئەبووبەکر کێشانە کرا و کێشی –قورس- بوو، عومەریش کێشانە کرا و کێشی –قورس- بوو، ئینجا عوثمان کێشانە کراو کەسێکی صاڵح بوو)، بەڵام لە گێڕانەوەکەی ئەحمەددا ناوی جەبر نەهاتووە بەڵام هەمان بەسەرهاتە-واتە هەر جەبرە- و تیایدا سەبارەت بە عوثمانی کوڕی عەففان واهاتووە (ثم وزن عثمان فنقص صاحبنا وهو صالح)،[3] (ئینجا عوثمان کێشانە کرا و هاوەڵەکەمان کێشی تەواو نەبوو و پیاوچاک و صاڵحیشە).

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩١.

[2] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص ١٤٣.

[3] مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار(رضي الله عنهم) - رجل من أصحاب النبي(ﷺ)، الرقم ٢٣٦٦٤، قال شعيب الأرناؤوط إسناده صحيح و رجاله ثقات رجال الشيخين.

## ٦٣٦. جەثثامە(ﷺ)

ئەم ئافرەتە هاوەڵە ناوی جەثثامەیە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناوی گۆڕی و ناوی نا حەسسانە.[1]

دایکی باوەڕداران عائیشە دەڵێت: جارێک پیرەژنێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێیت؟ وتی: من جەثثامەی موزەنیم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی دوای دووریمان لەیەکتر حاڵتان چۆنە؟ ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم باشین، عائیشە دەڵێت: کاتێک پیرەژنەکە چوو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن بەو جۆرە گەرموگوڕ پێشوازیت لەو پیرەژنە کرد؟ ئەویش فەرمووی: (کاتێک خەدیجە مابوو ئەم ئافرەتە دەهات بۆ لامان).[2]

لە گێڕانەوەیەکی تردا کە طەبەرانی هێناویەتی ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئینجا خواردن هێنرا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش لێی دەخوارد و لە خواردنەکەی بەردەستیشی دەخستە بەردەم ئەو ئافرەتە، پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو کاتێک خەدیجە مابوو ئەم ئافرەتە دەهات بۆ لامان و وەفاداریش یان پەیمان پارێزیش لە ئیمانەوەیە، عائیشە دەڵێت: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خوا ئەو ئافرەتە بەتەمەنەی-خەدیجە- بۆ گۆڕیت بە ئافرەتێکی گەنج-عائیشە-، پێغەمبەر(ﷺ) تووڕە بوو و دواتر فەرمووی: (چی بکەم کە خوا لە خەدیجە منداڵی پێ بەخشیم کەچی لە تۆ منداڵی پێ نەبەخشیم)، عائیشەش دەڵێت: وتم: سوێند بەوەی تۆی بەحەق ناردووە ئیتر بەس بە چاکە باسی خەدیجە دەکەم.[3]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥١.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٠.

[3] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٩٣١.

## ٦٢٧. جەثثامەی کوڕی قەیس(ﷺ)

هاوەڵی پێغەمبەرە(ﷺ) و فەرمودەیەکی لە عەبدوڵای کوڕی سوفیانەوە گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (من صام يوما في سبيل الله باعده الله من النار مقدار مائة عام)،[1] (هەرکەس ڕۆژێک لە پێناو خوادا ڕۆژوو بگرێت خوا ڕێژەی سەد ساڵ لە دۆزەخ دووری دەخاتەوە).

## ٦٢٨. جەثثامەی کوڕی موساحیق(ﷺ)

ناوی جەثثامەی کوڕی موساحیقی کوڕی ڕەبیعی کوڕی قەیسی کینانیە، هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا خەلیفە ئەوی ناردووە بۆ لای هیرەقل، جەثثامە دەڵێت: لەسەر شتێک دانیشتم نەمدەزانی ژێرم چیە، سەیرم کرد کورسیەک بوو لە زێڕ دروست کرابوو، کە بینیم دابەزیم، ئەویش پێکەنی و پێی وتم: بۆچی لەسەر ئەو کورسیە دابەزیت خۆ ئێمە ڕێزمان لێنابوویت؟ منیش وتم: لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دوورەپەرێزی لە شتی وا دەکرد.[2]

## ٦٢٩. جەحدەم(ﷺ)

ناوی جەحدەمەو کوڕێکی هەبوو بە ناوی حەکیم کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[3]

جەحدەم دەڵێت: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو (من حلب شاته ورقع قميصه وخصف نعله وأكل مع خادمه وحمل من سوقه فقد بريء من الكبر)،[4] (هەر کەس

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٠.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦٤.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٠.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦٥

مەڕەکەی بدۆشێ و پینەی جلەکەی بکات و نەعلەکەی بدووریتەوەو لەگەڵ خزمەتکارەکەیدا نان بخوات و خۆی شمەکی کڕینی ناو بازاڕی هەڵبگرێت، ئەوە پارێزراو دەبێت لە خۆبەزلزانین).

ئیبن حەجەر دەڵێت: سەنەدی ئەم فەرموودەیە لاوازە.

## ٦٣٠. جەحدەمی کوڕی فەضالە(رضي الله عنه)

ناوی جەحدەمی کوڕی فەضالەیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[١]

جەحدەم دەڵێت: هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش دەستی هێنا بەسەر سەرمدا و فەرمووی: (بارک الله في جحدم)، (خوا بەرەکەت بخاتە جەحدەمەوە)، ئینجا نامەیەکی بۆ نووسیم.[٢]

کەسایەتیەکی تر هاتووە بە ناوی جەحدەمی جوهەنی و هەمان بەسەرهاتی دەست بەسەردا هێنان و هەمان نزای تێدایە، ئیبن حەجەریش دەڵێت: لەوانەیە ئەم دوانە هەر یەک کەسایەتی بن و بە دوو سەنەدی جیا گێڕانەوەکە هاتبێت.[٣]

## ٦٣١. جەحشی کوڕی ریئاب(رضي الله عنه)

ناوی جەحشی کوڕی ریئابی ئەسەدیە، کوڕێکی هەبوو کە ناسرابوو بە ئەبووئەحمەد، کچێکیشی هەبوو بە ناوی بەررە کە پێغەمبەر(ﷺ) ناوی گۆڕی.[٤]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠١.

[٢] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٦٢٩، قال الحافظ ابن حجر في (الإصابة): في إسناده من لا يعرف ثم هو من رواية النضر بن سلمة بن شاذان وهو متروک.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦٥.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦٦.

## ٦٣٢. جەذعی ئەنصاری(﵁)

لە پشتیوانانەو کوڕێکی هەبوو کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، نازانرێت ئایا ئەو کوڕەشی هاوەڵ بووە یان نا.[١]

## ٦٣٣. جەراحی ئەشجەعی(﵁)

لە ئەشجەعیەکانەو لە گێڕانەوەی فەرموودەیەکدا باسی هاتووە، کەسانێ هاتن بۆ لای عەبدوڵای کوڕی مەسعوود و باسی پیاوێکیان بۆ کرد کە ژنێکی هێنا کەچی پێش ئەوەی بیگوازێتەوە مرد و مارەییشی بۆ دیاری نەکردبوو، ئەویش هیچی نەوت، دواتر گەڕانەوە، ئینجا هەمدی هاتنەوە بۆ لای عەبدوڵای کوڕی مەسعوود، ئەویش وتی: بە ئیجتیهادی خۆم رای خۆم دەڵێم، ئەگەر پێکام ئەوە خوا تەوفیقی داوم بۆ ئەوە، ئەگەریش نەمپێکا ئەوە لە هەڵەی خۆمەوەیە، ئەو ئافرەتە مارەیی وەک مارەیی ژنەکانی تری بۆ هەیە و میراتیشی بۆ هەیە و دەبێت عیددەش تەواو بکات، ئەوەبوو کەسێک لە ئەشجەعیەکان هەستا و وتی: من شایەتی دەدەم پێغەمبەر(ﷺ) بەو جۆرە حوکمی دا، عەبدوڵا وتی: ئادەی شایەت بێنە کە پێغەمبەر(ﷺ) وای فەرمووە، هەریەک لە ئەبووسینان و جەراح کە دوو کەسی ئەشجەعی بوون شایەتییان دا.[٢]

دیارە ئەم بەسەرهاتە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جەراح لە دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاوە.

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٣.

[٢] مسند أحمد بن حنبل - مسند عبد الله بن مسعود(﵁) ، الرقم ٤١٨٠، قال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

## ٦٣٤. جەربائی کچی قەسامە(﵂)

ناوی جەربائی کچی قەسامەی کوڕی قەیسە، هاتوەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و باوەڕی هێناوەو شووی کردووە بە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا، کچێکی هەبوو بە ناوی ئومموئیسحاق.[1]

ئەم ئافرەتە زۆر جوان بوو، هێندە جوان بوو کە هەر ئافرەتێک لەلای دەوەستا خۆی لەبەرچاو دەکەوت.[2]

## ٦٣٥. جەرهەدی کوڕی خومیلید(ﷺ)

ناوی جەرهەدی کوڕی خوەیلیدی کوڕی بەجرەی کوڕی عەبدیالیلیە،[3] ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: دەشوترێت ناوی جەرهەدی کوڕی رەزاحە.[4]

ئەم هاوەڵە لە ئەسلەمیەکان بوو، کونیەکەی ئەبووعەبدوڕەحمان بوو، کەسێکی رێزدار و ناسراو بوو. [5]

ئیبن حیببان دەڵێت: دواتر چوو لە بەصرە نیشتەجێ بوو، بەڵام رای تر هەیە دەڵێت: هەر لە مەدینە نیشتەجێ بووە، ئیبن حەجەریش دەڵێت: راستتر ئەوەیە هەر لە مەدینە نیشتەجێ بووە.

ئەم هاوەڵە لە ئەهلی صوففە بوو.[6]

جەرهەد یەکێک بوو لە بەشداربوانی حودەیبیە.[7]

جەرهەد دەڵێت: جارێک بە دەستی چەپ خواردنم دەخوارد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بە دەستی راست بخۆ)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستی

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥٢.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص ٤٤١.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٣.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٧٠.
[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٩٨.
[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٧١.
[7] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٧.

راستم ئـازار و نەخۆشـی هەیـە، پێغەمبـەر(ﷺ) فـووی کـرد بەسـەر دەسـتی راسـتیدا، جەرهـەد دەڵێت: ئیتر دەسـتی راسـتم ئـازاری نەمـا.[1]

جەرهـەد دەڵێت: جارێک لـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ) دانیشـتبووم، رانیشـم دەرکەوتبوو، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمووی: (أما علمت أن الفخذ عورة)،[2] (مەگەر نازانیـت ران شــەرمگەیە؟)، لـە گێڕانـەوەی تـردا هاتـووە پێغەمبـەر(ﷺ) پێـی فەرمـوو (داپۆشـە چونکە ڕان لـە شـەرمگەیە).[3]

جەرهـەد دوای سـەردەمی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ژیـا و لـە مەدینـە مایـەوە تـا لـە سـەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویـەدا کۆچـی دوایـی کـرد.[4]

## ٦٣٦. جەروەلی کوڕی عەبباس(رضي الله عنه)

نـاوی جەروەلـی کـوڕی عەبباسـی کـوڕی عامـرە، لـە پشـتیوانانە لـە ئەوسـیەکان،[5] جەروەل تـا دوای وەفاتـی پێغەمبەریـش(ﷺ) ژیـا و لـە جەنگـی یەمامـەدا کـوژرا.[6]

## ٦٣٧. جەروەلی کوڕی مالیک(رضي الله عنه)

رایـەک دەڵێت: نـاوی جەروەلـە و رایەکی تر دەڵێت: نـاوی جوروە، کوڕی مالیکی کوڕی عەمری کوڕی عوەیمرە، لە پشـتیوانانە لە ئەوسـیەکان، کوڕێکی هەبوو بـە نـاوی زورارە.[7]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٣.
[2] سنن أبي داود - كتاب الحمام - باب النهي عن التعري ، الرقم ٤٠١٠، صححه الألباني.
[3] جامع الترمذي - أبواب الأدب عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء أن الفخذ عورة، الرقم ٣٠٤١ و حسنه.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٣.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٧.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٣.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٣.

## ٦٣٨. جەروی سەدووسی(رضي الله عنه)

ناوی جەروەو لە سەدووسیەکانە، فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە دەڵێت: هاتینە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و خورمایەکی یەمامەمان هێنایە خزمەتی، ئەویش فەرمووی: (أی تمر هذا)، (ئەوە چ خورمایەکە)، وتمان: ئەوە خورمای (جورام)ە، ئەویش فەرمووی: (اللهم بارک فی الجرام)، (خوایە بەرەکەت بخەرە جورامەوە).[1]

## ٦٣٩. جەروی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

سەبارەت بە ناوی ئەم هاوەڵە چەند رایەک هەیە، بە (جەرو) و و (جورەو) و (جەزء) یش هاتووە.[2]

جەروی کوڕی عەمر دەگێڕێتەوە چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) نامەیەکی بۆ نووسی.[3]

بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: سەنەدی گێڕانەوەکە مەجهوولە.[4]

## ٦٤٠. جەروی کوڕی مالیک(رضي الله عنه)

ناوی جەروی کوڕی مالیکی کوڕی عەمرە، دەشوترێت بەڵکو ناوی جەزئە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، لە جەنگی یەمامەدا شەهید بوو.[5]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٦.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٢.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٦.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٢.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٢.

## ٦٤١. جەریری کوڕی عەبدولا (ﷺ)

ناوی جەریری کوڕی عەبدولای کوڕی جابیری کوڕی مالیکی کوڕ نەضری بەجلیە،[١] کونیەکەی ئەبووعەمرە، دەشوترێت بەڵکو ئەبووعەبدولایە.[٢]

جەریری کوڕی عەبدولای بەجلی گەورەی هۆزی بەجیلە بوو.[٣]

جەریر کەسێکی زۆر قۆز و کەشخە بوو، هێندە کەشخە بوو عومەر پێی دەوت جەریر یووسفی ئەم ئوممەتەیە.[٤]

جەریر کوڕێکی هەبوو بە ناوی عائیشە،[٥] کچێکی تریشی هەبوو بە ناوی رواع،[٦] کچێکی تری ناوی ئامینە بوو،[٧] کوڕێکیشی هەبوو بە ناوی عومەر،[٨] کوڕێکی تری ناوی زیاد بوو،[٩] کوڕێکی تریشی هەبوو بە ناوی ئیبراهیم و کوڕێکی تریشی ناوی ئەبان بوو.[١٠]

سەبارەت بە کاتی موسڵمانبوونی رای جیاواز هاتووە، رایەک گێڕانەوەیەکی جەریری هێناوە کە دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: بۆچی هاتویت؟ وتم: هاتوم تا موسڵمان بم، ئەویش جلەکەی خۆی راخست بۆم و فەرمووی: (إذا أتاكم كريم قوم فأكرموه)،[١١] (ئەگەر گەورەو رێزداری قەومێک هات بۆ لاتان رێزی بگرن).

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٩.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٥، سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥٣٠.

[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٣٧.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٥.

[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٣٠.

[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٣١.

[٧] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٨٦

[٨] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٢٣٨.

[٩] البداية والنهاية لابن كثير، ج٩، ص ٧٣.

[١٠] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٦، ص ٢٩٧.

[١١] السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٥٥١٩،

ڕایەکی تر دەڵێت: پاش فەتحی مەککە کە وەفدی ناوچەکان دەهاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان دەبوون ئەوکات جەریریش هات.[1]

ئیبن عەبدولبەر پێی وایە جەریر چل ڕۆژ پێش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمان بووە،[2] بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەم ڕایە هەڵەیە بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی کە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) لە حەجیماڵئاواییدا فەرمانی کرد بە جەریر تا خەڵکی بێدەنگ بکات.[3]

واقیدی پێی وایە جەریر لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی دەی کۆچیدا هاتوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و دواتر پێغەمبەر(ﷺ) ناردوویەتی بۆ (ذي الخلصة) و پاش ئەوەش لە حەجی ماڵئاواییدا هاودەمی پێغەمبەری(ﷺ) کردووە.[4]

ئیبن سەعدیش ڕای وایە جەریر هاودەم بە سەدوپەنجا کەس لە هۆزەکەی هاتووە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بووە.[5]

بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: ڕام وایە جەریر پێش ساڵی دەی کۆچی موسڵمان بووە، چونکە لەو فەرموودەدا کە جەریر دەیگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووین (إن أخاكم النجاشي قد مات فاستغفروا له)،[6] (نەجاشی براتان مرد دەی داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن)، ئەمەش بەڵگەیە کە جەریر پێش ساڵی دەی کۆچی موسڵمان بووە چونکە نەجاشی پێش دەی کۆچی مردووە.[7]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٥.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٣٧.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٥.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٥.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٣٤٧.

[6] مسند أحمد بن حنبل - أول مسند الكوفيين(ﷺ) - ومن حديث جرير بن عبد الله عن النبي(ﷺ) ، الرقم ١٩٤٩٣، حسنه الألباني.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٥.

جەریـر دەڵێـت: مـن دوای دابەزینـی سـوورەتی مائیـدە موسـڵمان بـووم و دەیشـمبینی پێغەمبـەر(ﷺ) مەسـحی دەکـرد.[1]

جەریر کە موسـڵمان بوو بەیعەتی دا بە پێغەمبـەر(ﷺ) لەسـەر ئامۆژگاری کردنـی هـەر موسـڵمانێک،[2] واتـا لـە کوێـدا موسـڵمانێکی بینـی پێویسـتی بـە ئامـۆژگاری بـوو ئامـۆژگاری بـکات.

جەریـر دەڵێـت: پێغەمبـەر(ﷺ) پێـی فەرمـووم (ألا تريحني من ذي الخلصة)، (ئایـا ذەلخەلەصـەم لەکۆڵ ناکەیتـەوە؟) ذەلخەلەصـەش ماڵێک بـوو لـە خەثعـەم کە بە کەعبـەی یەمانـی ناسرابوو،[3] منیش وتـم: ئـەی پێغەمبـەر(ﷺ) من کەسـێکم لەسـەر ئەسـپ خـۆم ناگـرم،[4] پێغەمبـەر(ﷺ) دای بەسـەر سـنگمدا تـا شـوێن پەنجەکانیـم لـە سـنگمدا بینـی، فەرمـووی: (اللهم ثبته واجعله هاديا مهديا)، (خوایـە پێ چەسـپاو و سـەقامگیری بکـەو بیکـەرە رێنموونیکراو و رێنموونـی کـەر)، جەریر دەڵێت: ئەوەبوو بـە سـەدو پەنجا سـوار لـە ئەحمەسـەوە لـە هۆزەکـەی خـۆم دەرچـووم بـۆ ذەلخەلەصـە و تێکمانـدا و سـووتاندمان، ئینجـا جەریـر نوێنـەری خـۆی نـارد بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ)[5]،- لـە گێڕانەوەکـەی موسـلیم و ئەبـووداوددا هاتـووە ئـەو نوێنـەرەش نـاوی ئەبـوو ئەرطەئـە بـوو،[6] لـە گێڕانەوەکـەی بەیهەقیشدا دەڵێت: ئـەو نوێنـەرە نـاوی حوصەینی کوڕی رەبیعە بـوو،[7] ئەویـش هەواڵـی دا بـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) کـە چییـان کـردووە، پێغەمبەریـش(ﷺ) پێنـج جـار نـزای بەرەکەتـی کـرد بـۆ هـۆزی ئەحمـەس و پیاوانـی ئەحمـەس.[8]

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٧٩.

[2] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ٥٣١.

[3] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب حرق الدور والنخيل، الرقم ٣٠٢٠.

[4] صحيح البخاري - كتاب الدعوات - باب قول الله تعالى وصل عليهم ومن، الرقم ٦٣٣٣.

[5] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب حرق الدور والنخيل، الرقم ٣٠٢٠.

[6] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب من فضائل جرير بن عبد الله(ﷺ)، الرقم ٢٤٧٦.

[7] السنن الكبرى للبيهقي - كتاب السير - جماع أبواب السير - باب البشارة في الفتوح الرقم ١٨٦٥٦.

[8] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب حرق الدور والنخيل، الرقم ٢٩١١.

جەریر دەڵێت: لەو کاتەوەی موسڵمان بووم هەرکات پێغەمبەر(ﷺ) منی بدیایە یان ڕێی چوونی لێ بگرتمایە پێدەکەنی[1] -لە هەندێ گێڕانەوەشدا هاتووە -بزەی دەکرد-.[2]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) نامەی نووسی بۆ هۆزی خەثعەم یەکێک لەوانەی شاهید بوو جەریری کوڕی عەبدوڵا بوو.[3]

جەریر باسی چوونی خۆی دەکات بۆ مەدینەو دەڵێت: کاتێک هاتمە مەدینەو چوومە مزگەوت، پێغەمبەر(ﷺ) وتاری دەدا، پێغەمبەر(ﷺ) سەلامی لێکردم و خەڵکەکەش بە زیتەی چاو سەیریان دەکردم، منیش بەو کەسەی پاڵ خۆمم وت: ئەی بەندەی خوا ئایا پێغەمبەر(ﷺ) هیچی لە بارەی منەوە نەفەرمووە؟ ئەویش وتی: با، بە جوانترین شێوە باسی کردیت، لەکاتی وتارەکەیدا بوو فەرمووی: (إنه سيدخل عليكم من هذا الباب أو من هذا الفج من خير ذي يمن وإن على وجهه لمسحة ملك)، (لەو دەرگایەوە یان لەو لایەوە چاکترین کەسی یەمەنی دێتەژوورەوە بۆ لاتان، دەموچاویشی شوێنەواری فریشتەی پێوەیە)، جەریر دەڵێت: منیش سوپاسی خوام لەسەر کرد.[4]

گێڕانەوەیەک هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی (جرير منا أهل البيت)،[5] (جەریر لە ئێمەیە لە ئەهلوبەیت)، بەڵام ئەلبانی حوکمی (مونکەر) دەدات بەسەر سەنەدەکەیدا.

جەریر دەڵێت: لە یەمەن بووم کە فەرموودەی پێغەمبەرم(ﷺ) دەگێڕایەوە بۆ دوو کەس، ئەوانیش وتیان: ئەگەر وابێت کە دەیڵێیت ئەوە هاوڕێکەت-

---

[1] صحيح البخاري - كتاب مناقب الأنصار - باب ذكر جرير بن عبد الله البجلي(رضي الله عنه)، الرقم ٣٨٢٢.
[2] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب من لا يثبت على الخيل، الرقم ٣٠٣٥.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٢٨٦.
[4] السنن الكبرى للنسائي - كتاب المناقب - جرير بن عبد الله(رضي الله عنه) ، الرقم ٨٢٤٦ المستدرک على الصحيحين - كتاب الجمعة - قراءة سورة ص في الخطبة والسجود فيها ، الرقم ١٠٥٧ و صححه و وافقه الذهبي، صححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٣١٩٣.
[5] الآحاد و المثاني لابن أبي عصم، الرقم ٢٢٢٢، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢١٦٨، حكم عليه الألباني ب(منكر) في سلسلة الأحاديث الضعيفة، الرقم ١٢٠٧.

پێغەمبەر(ﷺ)- نزیکەی سێ ساڵ دەبێت مردووە، جەریر دەڵێت: ئەوەبوو لە ڕێدا بووین کە کاروانێک لە مەدینەوە هات، پرسیارمان لێکردن سەبارەت بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوانیش وتیان: پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کردووەو ئەبووبەکر بووە بە خەلیفە، جەریر دەڵێت: ئەو دوو کەسە وتیان: بە هاوڕێکەت بڵێ ئێمە هاتین و لەوانەشە پشت بەخوا بگەڕێینەوە، ئینجا گەڕاینەوە بەرەو یەمەن، جەریر دەڵێت: دواتر کە هاتم بۆ لای ئەبووبەکر باسی ئەو دوو پیاوەم بۆ کرد، ئەویش وتی: بۆ نەتهێنان.[1]

دیارە جەریر پاش ئەو هاتنەی بۆ لای ئەبوبەکر ماوەیەکی زۆر ماوەتەوە، چونکە دەبینین ئەبووبەکر ئەوی ناردووە لەگەڵ خالیدی کوڕی سەعیددا تا بڕوات بۆ شام، بەڵام جەریر داوای لە خالید کرد ڕێی بدات بگەڕێتەوە بۆ لای ئەبووبەکر تا هۆزی بەجیلە کۆبکاتەوە و لەگەڵیدا بن، کاتێک گەڕایەوەو مەسەلەکەی بۆ باس کرد خەلیفە لێی تووڕە بوو، بۆیە ئەمجار جەریری نارد بۆ لای خالیدی کوڕی وەلید لە عێراق.[2]

جەریر لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا بەشداری فتووحاتی کرد، ئەوەبوو عومەریش ئەوی کردە سەرکردەی هەموو (بەجیلە)، ئەو هۆزەش لە فەتحی قادسیەدا ڕۆڵێکی زۆر گەورەیان هەبوو.[3]

جەریر دەڵێت: جارێک لەگەڵ عومەری کوڕی خەططاب و ژمارەیەک لە موسڵماناندا بووین، کەسێکیان بایەکی لێ بوویەوە، عومەر وتی: ئێستا پێی دەڵێم بڕوات دەستنوێژ بگرێت، جەریر وتی: بەڵکو فەرمان بکە با هەمووومان دەستنوێژ بگرین، عومەر وتی: دەبێت خۆم و هەموویشتان دەستنوێژ بگرین، هەستاین دەستنوێژمان گرت و نوێژمان کرد، عومەریش بە جەریری دەفەرموو (ڕەحمەتی خوات لێ بێت لە سەردەمی نەفامیدا

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٢٧٨.
[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٤٨.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٩، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٥.

گەورەیەکی زۆر چاک بوویت، لە سەردەمی ئیسلامیشدا گەورەیەکی زۆر چاک بویت).[1]

جەریر کەسێکی خاکی بوو، ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: جەریر لە من گەورەتر بوو کەچی خزمەتی دەکردم،[2] ئەنەس دەڵێت: جەریر خزمەتی دەکردم و دەیوت: من دیومە پشتیوانان چۆن خزمەتی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) دەکرد، بۆیە هەرکامیان ببینم خزمەتی دەکەم.[3]

لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا جەریری کوڕی عەبدولا والی هەمەدان بوو،[4] پاش شەهید بوونی عوثمان عەلی داوای لێکرد تا بەیعەتی خەڵکی هەمەدانی بۆ وەربگرێت و بێت بۆ لای، جەریریش ئەو فەرمانەی بەجێگەیاند، کاتێک عەلی ویستی کەسێک بنێرێت بۆ لای موعاویە تا بەیعەتی لێ وەربگرێت، جەریر وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من دەڕۆم، چونکە خۆشەویستیەک لە نێوان من و ئەودا هەیە، دەڕۆم و بەیعەتی لێ وەردەگرم بۆت، ئەشتەر لەوێ بوو وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران جەریر مەنێرە ئەترسم هەواداری موعاویە بێت و لای بمێنێتەوە، عەلی وتی: وازی لێ بهێنە، ئەوەبوو نامەیەکی نووسی بۆ موعاویەو تیایدا هەواڵی پێدا کە کۆچەران و پشتیوانانیش بەیعەتیان پێداوە، باسی ڕووداوی جەمەلیشی بۆ نووسیبوو، داوایشی لێکرد وەک ئەو خەڵکەی تر بەیعەتی پێبدات،[5] ئینجا جەریر خەڵکی کۆکردەوەو وتارێکی پێشکەش کرد و تیایدا داوای لە موعاویە کرد گوێڕایەڵی بنوێنێت و ناکۆکی نەنێتەوەو نەبێتە هۆی جەنگی نێوان موسڵمانان، موعاویەش داوای کرد پەلەی لێ نەکات تا ڕای خەڵکی شام

[1] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ٥٣٥.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٥.
[3] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ٤٠١.
[4] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ٥٣٦.
[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٥٤.

وەربگرێت،[1] کە جەریر نامەکەی دا بە موعاویە، موعاویە عەمری کوڕی عاص و گەورەکانی خەڵکی شامی کۆکردەوەو راوێژی کرد بە هەموویان، ئەوانیش وتیان: تا بکوژانی عوثمان نەکوژرێنەوە بەیعەت نادەین یان دەبێت بکوژەکانی عوثمانیان بدرێنە دەست، ئەگەرنا جەنگی لەگەڵ دەکەن و بەیعەتی پێ نادەن، جەریر گەڕایەوەو هەواڵەکەی دا بە عەلی، ئەشتەر وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران مەگەر من نەموت جەریر مەنێرە ئەگەر منت بناردایە موعاویە هەر دەرگایەکی بکردایەتەوە دامدەخست، جەریر بە ئەشتەری وت: ئەگەر تۆ بوویتایە لە بری خوێنی عوثمان دەیانکوشتیت، ئەشتەریش بە توندی وەڵامی دایەوە، ئەمە جەریری تووڕە کرد، بۆیە جەریر چوو بەرەو قرقیسیا و نامەی نارد بۆ موعاویەش کە چی وتووەو چی پێ وتراوە، موعاویەش نامەی بۆ نووسی و داوای لێکرد بچێت بۆ لای،[2] بەڵام ئەو کەناری گرت و لە قرقیسیا مایەوە تا لەوێ مرد.[3]

دواتر جەریر لە کووفە نیشتەجێ بوو و هەر لەوێ مایەوە، لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبووطالیبیشدا لە ریزی خەلیفەدا بوو، عەلی جەریری بە نوێنەر نارد بۆ لای موعاویە، دواتر جەریر کەناری گرت و چوو لە ناوچەی (قرقیسیا) نیشتەجێ بوو تا وەفاتی کرد.[4]

جەریر پێشتریش بەرپرسی ناوچەی قرقیسیا بوو.[5]

جەریر دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبووطالیب منی نارد بۆ لای موعاویە تا بچم بەیعەتی لێ وەربگرم، کە چوومە ئەوێ دەبینم خەریکە وتار دەدات و کراسەکەی عوثمانی کوڕی عەففانیش کراوە بە نووکی رمێکەوەو خەڵکی

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٢٧.
[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٥٤.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٥.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٥.
[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٢٨.

لە دەوری دەگرین.[1]

جەریر لە ناوچەی قرقیسیا[2] یان ناوچەی سرات مرد،[3] لە ساڵی پەنجا و یەکی کۆچی[4] یان لە ساڵی پەنجاو چواری کۆچیدا مرد.[5]

## ٦٤٢. جەریری کوڕی ئەرقەط(ﷺ)

ناوی جەریری کوڕی ئەرقەطە، جەریر دەڵێت: لە حەجی ماڵئاواییدا پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی و لێم بیست دەیفەرموو (أعطيت الشفاعة).[6]

بەڵام ئیبن حەجەر سەنەدی ئەم گێڕانەوە بە لاواز دادەنێت.[7]

## ٦٤٣. جەریری کوڕی ئەوس(ﷺ)

ناوی جەریری کوڕی ئەوسی کوڕی حارثەی طائیە،[8] برایەکی هەبوو بەناوی خورەیم.[9]

هەریەک لە جەریر و خورەیمی برای پێکەوە کۆچیان کرد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) لە تەبووک دەگەڕایەوە، ئەوەبوو موسڵمان بوو، هەروەها ئەو شیعرەی وتەوە کە عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب لە وەسفی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) وتبووی.[10]

جارێک لە سەردەمی دەسەڵاتی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیاندا موعاویە بە خەڵکێکی وت: ئەمڕۆ کێ گەورەی ئێوەیە، جەریریش لە نێویاندا بوو،

---

[1] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ٥٣٦.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٣٨.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٦، ص ٢٢.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٥.

[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٣٨.

[6] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٥٣٥.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٤.

[8] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٤٠.

[9] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٨.

[10] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٤٠.

هەستاو و تی گەورەمان ئەو کەسەیە کە بەخشینی هەبێت بۆ ئەو کەسەی داوای لێ دەکات و بەرامبەر نەفامەمان چاوپۆشی هەبێت و لە زەبوونیشمان خۆش بێت، موعاویەش وتی: ئافەرین ئەی جەریر.[11]

## ٦٤٤. جەزء(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵەش ناوی جەزئە بەڵام ناوی باوک و رەچەڵەکی نەزانراوە، فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[12]

جەزء هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ژن و منالم لێم یاخی دەبن، جا بە چی سزایان بدەم؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (تعفوا ثلاثا فإن عاقبت فعاقب بقدر الذنب و اتق الوجه)،[13] (سێ جار لێیان خۆش بە، ئەگەر-دوای ئەوە-سزات دان ئەوا بەپێی تاوانەکە سزایان بدەو وریاش بە نەدەیت لە دەموچاویان).

## ٦٤٥. جەزی(رضي الله عنه)

ناوی جەزیە یان دەوترێت ناوی جەزئە، کونیەکەی ئەبووخوزەیمەیەو لە سولەمەیەکانە، یان دەوترێت لە ئەسلەمیەکانە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی حیببان کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، کوڕێکی تریشی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە فەرموودەی لە حیببانی برایەوە گێڕاوەتەوە.[14]

جەزی لەگەڵ چەند کەسێکی تر بێباوەڕ بوون و هاوەڵێکی پێغەمبەریان(ﷺ) بەند کردبوو، دواتر ئەوانە موسڵمان بوون و جەزیش موسڵمان بوو و هاوەڵەکەی هێنایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خواش(ﷺ) دوو جلی

---

[11] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٤.

[12] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٩

[13] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٥٨٥، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٠٨٩، ضعفه الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة، الرقم ٢٨٥٠.

[14] أسد الغابة، ج١، ص ٤١٤.

پێ بەخشی.[1]

پێدەچێت هۆکاری موسڵمانبوونەکەیان بەهۆی کاریگەری کردارو گوفتاری ئەو هاوەڵە بەندکراوەوە بووبێت، چونکە دەبینین هەموو ئەوانەی ئەو هاوەڵەیان بەندکردبوو باوەڕیان هێنا.

## ٦٤٦. جەزئی کوڕی حیدریجان(رضي الله عنه)

ناوی جەزئی کوڕی حیدریجانی کوڕی مالیکی یەمانیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدورەحمان کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە،[2] جەزء و باوکیشی هەردووکیان هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بون.[3]

هەروەها برایەکی هەبوو بە ناوی قوداد.[4]

جەزئی کوڕی حیدریجان دەڵێت: قودادی برام بە ئیمانی خۆی و ژن و منداڵە موسڵمانبووەکانی و کەس وکاریەوە کە نزیکەی شەش سەد ماڵ دەبوون شوێن کەوتەی قداد بوون چوو بەرەو مەدینە، بەڵام لە رێدا گەیشت بە سریەیەکی پێغەمبەر(ﷺ)، قداد بەوانی وت: موسڵمان بووە، بەڵام ئەوان بڕوایان پێ نەکرد و کوشتیان، جەزئی کوڕی حیدریجان دەڵێت: کە ئەو هەواڵەم پێ گەیشت چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوەبوو ئەم ئایەتە دابەزی(یا أیها الذین ءامنوا إذا ضربتم في سبیل الله فتبینوا...)، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) خوێن بایی براکەمی پێدام کە سەد وشتری سوور بوو، هەروەها بەشداری هێرش بردنە سەر (طيء)م کرد و دەستکەوتێکی زۆرم دەستکەوت و چل ئافرەتم بە

[1] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص ٤٨٠.
[2] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص ٤٧٨.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤١٢.
[4] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص ٤٧٨.

کەنیزە گرت و هەموویانم هێنا بۆ مەدینە،[1] خوای گەورە ئەو ئافرەتانەی ڕێنموونی کرد و موسڵمان بوون،[2] پێغەمبەریش(ﷺ) ئەو ئافرەتانەی مارە کرد لە هاوەڵەکانی.[3]

جەزئی کوڕی حیدریجان ماوەیەک خزمەتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەکرد.[4]

## ٦٤٧. جەزئی کوڕی عەمر(ﷺ)

ناوی جەزئی کوڕی عەمری عوذریە، هاتوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەری خواش(ﷺ) نامەیەکی بۆ نووسی.[5]

## ٦٤٨. جەزئی کوڕی موعاویە(ﷺ)

ناوی جەزئی کوڕی موعاویەی کوڕی حوصەینە، لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا بەرپرسی ئەهواز بوو، خەلیفە عومەریش تەنها هاوەڵانی دەکردە بەرپرس، بۆیە ئەوە بەڵگەیە لەسەر هاوەڵبوونی.[6]

## ٦٤٩. جەعدە(ﷺ)

ئەم هاوەڵە ناوی باوکی و بنەماڵەکەی نەزانراوە، بەڵام هێندە زانیاری لەسەر هاتووە قژێکی لوولی هەبوو، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نا جەعدە.[7]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٨.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤١٣.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٨، و قال ابن حجر إسناده مجهول.

[4] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٨٦٤.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ٤١٣.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٩.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٨٤.

## ٦٥٠. جەعدەی کچی عوبەید(ﷺ)

ناوی جەعدەی کچی عوبەیدی کوڕی ئەعلەبەیە، لە پشتیوانانە،[٨] دایکی ناوی رعاتی کچی عەددیە،[٩] برایەکی هەبوو بە ناوی عەمر کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو.[١٠]

جەعدە ژنی نوعمانی کوڕی نەفعە و منداڵێکی لێی بوو بە ناوی حارثەی کوڕی نوعمان، ئینجا دوای مەرگی نوعمان شووی کرد بە حەبابی کوڕی ئەرقەم و لەویش منداڵێکی بوو کە ناوی نا حارث.[١١]

## ٦٥١. جەعدەی کوڕی خالید(ﷺ)

ناوی جەعدەی کوڕی خالیدی کوڕی صەممەی جوشەمیە، یەکێک بووە لە هاوەڵانی دانیشتووی بەصرە، رایەکیش دەڵێت: دواتر لە کووفە نیشتەجێ بوو.

جەعدە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) کابرایەکی قەڵەوی بینی، بە دەستی ئاماژەی دەکرد بۆ ورگی کابراو دەیفەرموو (لوكان هذا في غير هذا لكان خيرا لك)،[١٢] (ئەگەر ئەوە لە شتی تردا بوایە -ورگت دانەنایە- زۆر باشتر بوو بۆت).

هەروەها جەعدە دەڵێت: پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی، کابرایەکی بۆ هێنرا و پێی وترا ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم کەسە دەیویست تۆ بکوژێت، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموو (لم ترع لم ترع لو أردت ذلك لم يسلطك الله علي)،[١٣] (ترست نەبێ، ترست نەبێ، نیازی ئەوەشت هەبوایە، خوا تۆی زاڵ نەدەکرد بەسەر مندا).

[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥٢.

[٩] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٤٤٣.

[١٠] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥٢.

[١١] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٤٤٣.

[١٢] مسند أحمد بن حنبل - مسند المكيين(ﷺ) - حديث جعدة(ﷺ)، الرقم ١٦٠٤٠، ضعفه الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة، الرقم ٤٨٦١، ضعفه شعيب الأرناؤوط في تعليقه على مسند أحمد بن حنبل.

[١٣] مسند أحمد بن حنبل - مسند المكيين(ﷺ) - حديث جعدة(ﷺ)، الرقم ١٦١١٢، ضعفه الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة، الرقم ٤٣٣٦، و قال شعيب الأرناؤوط إسناده ضعيف.

## ٦٥٢. جەعدەی کوڕی هانیء(ﷺ)

ناوی جەعدەی کوڕی هانیئی حەضرەمیە، فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) عومەری نارد بۆ لای کابرایەکی مەسیحی کە لە مەدینە بوو تا بانگی بکات بۆ لای ئیسلام.[1]

## ٦٥٣. جەعدەی کوڕی هوبەیرە(ﷺ)

ناوی جەعدەی کوڕی هوبەیرەی کوڕی ئەبی وەهبی کوڕی عەمری مەخزوومیە، سەبارەت بە هاوەڵبوونی راجیایی هەیە، بوخاری دەڵێت: هاوەڵە، ئیبن حیببان دەڵێت: بەڵگەیەکی دروست نابینم بۆ هاوەڵبوونی، بەغەوی دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) لەدایک بووە، بەڵام پێغەمبەری خوای(ﷺ) نەدیوە، ئیبن حەجەر بە هاوەڵی دەزانێت.[2]

دایکی ناوی ئومموهانیئی کچی ئەبووطالیبە، هەروەها دوو برای هەبوو بە ناوەکانی هانیء و یووسف.[3]

جەعدەی کوڕی هوبەیرە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) رێگری لێدەکردم خاتەمی زێڕ بەکاربهێنم.[4]

جەعدە کوڕێکی هەبوو بە ناوی یەحیا کە لە سەردەمی عەبدوڵای کوڕی زوبەیردا کوژرا.[5]

## ٦٥٤. جەعفەری کوڕی موحەممەد(ﷺ)

ناوی جەعفەری کوڕی موحەممەدی کوڕی مەسلەمەیەو لە پشتیوانانەو لە فەتحی مەککەو غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد.[6]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٤١٨.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٢٧.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤١٨.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٢٧.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٤٩.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٨٩.

## ٦٥٥. جەعفەری کوڕی ئەبووسوفیان(ﷺ)

ناوی جەعفەری کوڕی ئەبوسوفیانی کوڕی حارثی کوڕی عەبدولموطەلیبە، لەگەڵ باوکیدا چوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بووەو لەگەڵ باوکیشیدا لە غەزای حونەیندا بەشداری کرد.[1]

## ٦٥٦. جەعفەری کوڕی ئەبووطالیب(ﷺ)

ناوی جەعفەری کوڕی ئەبووطالیبی کوڕی عەبدولموطەلیبی کوڕی هاشمە، ئامۆزای پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، کونیەکەی ئەبووعەبدوڵایە، یەکێکە لە یەکەمین دەستەی موسڵمان بوان.

دایکی ناوی فاطیمەی کچی ئەسەدی کوڕی هاشمە.[2]

جەعفەر برای عەلی بوو و دە ساڵ گەورەتر بوو لە عەلی، هەروەها برای عەقیل بوو، عەقیلیش برا گەورەی جەعفەر بوو و دە ساڵ لە جەعفەر گەورەتر بوو،[3] طالیبی برایشیان گەورەی هەموویان بوو کە بیست ساڵ لە جەعفەر گەورەتر بوو.[4]

ژنەکەی جەعفەر ناوی ئەسمائی کچی عومەیس بوو کە ئەویش لە یەکەم موسڵمان بووەکان بوو،[5] منداڵەکانی جەعفەر و ئەسمائیش بریتی بوون لە عەبدوڵا و موحەممەد و عەون کە هەموویان لە خاکی حەبەشە لەدایک بوون.[6]

جەعفەر هەر لە قۆناغی مەککەو لە سەرەتاوە موسڵمان بوو، دەوترێت

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٨٥.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٤.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٧٠.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٤٢١.
[5] سير أعلام النبلاء، ج ١، ص ١٤٤.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٤.

بیست و شەشەمین کەس بووە موسڵمان بووە، رایەکی تر دەڵێت: سی و دووەم کەس بووە موسڵمان بووە.

ئەبووهورەیرە دەیوت: دوای پێغەمبەر(ﷺ) جەعفەر چاکترین کەس بوو، هەروەها دەیوت: جەعفەر چاکترین کەس بوو بۆ هەژاران، لەگەڵ هەژاراندا هەڵسوکەوتی دەکرد و خزمەتی هەژارانی دەکرد و ئەوانیش خزمەتیان دەکرد، ئیتر وای لێهات پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەبولمەساکین (باوکی هەژاران) ناوی دەبرد.[1]

جەعفەر لەرووی شێوەی روخساری و پەیڕەوی رەوشتیەوە زۆر لە پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێی دەفەرموو (أشبهت خلقي وخلقي)،[2] (لە شێوەو روخسارو رەوشتدا لە من دەچیت).

جەعفەر کۆچی کرد بۆ حەبەشەو لەوێ مایەوەو لەسەر دەستی ئەو نەجاشی و کەسانێکی تریش موسڵمان بوون، جەعفەر ماوەیەکی زۆر لە حەبەشە مایەوە تا دواتر لە کاتی جەنگی خەیبەردا لە حەبەشەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە.[3]

جەعفەر لە کۆچی دووەمی موسڵمانانیشدا بۆ حەبەشە هاودەم بە ئەسمائی ژنی کۆچیان کرد بۆ حەبەشە.[4]

ئیبن مەسعوود دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئێمەی نارد بۆ لای نەجاشی کە هەشتا پیاو دەبووین، من و جەعفەر و ئەبوموسا و عەبدوڵای کوڕی عورفوطە و عوثمانی کوڕی مەظعوون، قورەیشیش عەمری کوڕی عاص و عمارەی کوڕی وەلیدیان بە بڕێک دیاریەوە نارد و هاتن بۆ لای نەجاشی، کە چوونە ژوورەوە بۆ لای نەجاشی کڕنووشیان بۆ برد و چوون بۆ لای،

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٨٦.

[2] صحيح البخاري - كتاب الصلح - باب كيف يكتب هذا ما صالح فلان بن فلان وفلان بن فلان، الرقم ٢٦٩٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٨٦.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٤.

یەکێکیان لە لای راستیەوەو ئەوی تریش لەلای چەپیەوە دانیشت، ئینجا وتیان: دەستەیەک لە کەس وکاری ئێمە هاتوونەتە خاکی تۆ و پشتیان کردوەتە ئێمە، ئەویش وتی: ئەوان لە کوێن؟[1] شتی وا هەیە؟ پێی وترا بەڵێ، نەجاشی وتی: بەخوا نایاندەمەوە دەستتان تا قسەیان لەگەڵ نەکەم، ئەوەبوو ناردی بە شوێنیاندا،[2] جەعفەر بە هاوەڵەکانی وت: من لەبری هەمووتان قسە دەکەم، هەموو بە دوای جەعفەردا چوونە ژوورەوە، بە جەعفەریان وت: بۆچی کڕنووش نابەیت بۆ پاشا؟ وتی: ئێمە تەنها کڕنووش بۆ خوا دەبەین، وتیان: بۆچی؟ وتی: چونکە خوا پێغەمبەرێکی لەنێوماندا نارد و فەرمانی پێکردین تەنها کڕنووش بۆ خوا بەرین و نوێژ بکەین و زەکات بدەین،[3] نەجاشی وتی: ئەم ئایینەی ئێوە چیە؟ جەعفەریش وتی: ئەی پاشا ئێمە گەلێک بووین لەسەر بێباوەڕی بووین و بتمان دەپەرست و مردارەوەبوومان دەخوارد و حەرامەکانمان بە حەڵاڵ دەزانین و خوێنمان رەوا دەکرد، ئەوەبوو خوا لە ناو خۆماندا پێغەمبەرێکی بۆ ناردین کە وەفاداری و راستگۆیی و سپاردەکاری ئەومان دەزانی، بانگی کردین تا خوای تاک و تەنها بپەرستین و پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنین و دراوسێیەتیمان باش بێت و نوێژ بکەین و رۆژوو بگرین،[4] عەمر وتی: ئەوان سەبارەت بە کوڕی مەریەم و دایکی رایان پێچەوانەی رای ئێوەیە، نەجاشی وتی: سەبارەت بە کوڕی مەریەم و دایکی چی دەڵێن؟ جەعفەریش وتی: ئەوە دەڵێین کە خوا فەرموویەتی رۆح و کەلیمەی خوایە کە بەخشیویەتی بە مەریەمی پاکداوێنی بێ هاوسەر کە هیچ مرۆڤێک دەستی پێی نەگەیشتووە،[5] نەجاشی وتی: هیچتان پێیە لەوەی بۆی دابەزیوە؟ فەرمانیشی کرد بە قەشەکان

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٠٦-٢٠٧.

[2] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢١٥.

[3] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٠٦-٢٠٧.

[4] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢١٥.

[5] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٠٦-٢٠٧.

تا پەرتووکەکانی خۆیان بکەنەوە، جەعفەر وتی: بەڵێ، ئەوەبوو برێک لە سوورەتی مەریەمی لە سەرەتاوە بۆ خوێندنەوە، نەجاشی دەستی کرد بە گریان تا ریشی تەڕ بوو، قەشەکانیش هەروا گریان تا پەرتووکەکانیان تەڕ بوو،[1] نەجاشیش دارێکی لەسەر زەوی هەڵگرت و وتی: ئەی خەڵکی حەبەشە و قەشە و راهیبەکان ئێوە دەڵێن چی من ئەمەم پێ خراپ نیە، من شایەتی دەدەم ئەو پێغەمبەری خوایەو ئەوەیە کە لە ئینجیلدا هاتووەو عیسا مزگێنی لەبارەوە داوە، سوێند بەخوا ئەگەر من لەم پاشایەتیەمدا نەبوومایە دەچووم بۆ لای و دەبوومە نەعل هەڵگر و ئاوی دەستنوێژیم دەدا، ئینجا بە موسڵمانانی وت: بڕۆن لەکوێ دەتانەوێت بمێننەوە، فەرمانیشی کرد دیاریەکانی قورەیشیەکان گێڕدرایەوە.[2]

جەعفەر ئەمیری هاوەڵانی موسڵمانی حەبەشە بووە، پێغەمبەریش(ﷺ) ئەوەی راگەیاند و نەجاشیش لەسەر دەستی ئەو موسڵمان بووە، ئەم گێڕانەوەش بەڵگەیەکە لەو بارەیەوە:

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) نامەی نووسی بۆ نەجاشی بە عەمری کوڕی ئومەییەدا نامەکەی بۆ نارد و تیایدا هاتبوو (بسم الله الرحمن الرحيم من محمد رسول الله إلى النجاشي الأصحم ملك الحبشة، سلام عليك، فإني أحمد إليك الله الملك القدوس المؤمن المهيمن، وأشهد أن عيسى ابن مريم روح الله، وكلمته ألقاها إلى مريم البتول الطيبة الحصينة، فحملت بعيسى، فخلقه من روحه ونفخه كما خلق آدم بيده ونفخه، وإني أدعوك إلى الله وحده لا شريك له، والموالاة على طاعته، وأن تتبعني وتؤمن بي وبالذي جاءني، فإني رسول الله، وقد بعثت إليكم ابن عمي جعفرا، ومعه نفر من المسلمين، فإذا جاءوك فاقرهم ودع التجبر فإني أدعوك وجنودك إلى الله وقد بلغت ونصحت فاقبلوا نصيحتي, والسلام على من اتبع الهدى)، (بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، لە موحەممەدی پێغەمبەری خواوە بۆ نەجاشی ئەصحەمی پاشای حەبەشە، سەلامت لێ بێت، من سوپاسی خوای مەلیکی قوددوسی

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢١٥-٢١٦.

[2] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٠٦-٢٠٧.

موئمینی موهەیمینت لا دەکەم، من شایەتی دەدەم عیسای کوڕی مەریەم ڕۆح و کەلیمەی خوایە کە بەخشی بە مەریەمی پاکداوێن و ئەویش سکپڕ بوو بە عیسا، خوا لە ڕۆحی خۆی دروستی کرد و فووی پێداکرد وەک چۆن بە دەست و فووی خۆی ئادەمی دروست کرد، من تۆ بانگ دەکەم بۆ لای خوای تاک و تەنهای بێ هاوەڵ و هەواداری لەسەر گوێڕایەڵی خوا و شوێن من بکەویت و بڕوا بهێنیت بە خۆم و ئەو پەیامەی هێناومە، چونکە من پێغەمبەری خوام، هەروەها من جەعفەری ئامۆزام و دەستەیەک لە موسڵمانانم ناردووە بۆ لاتان، ئەگەر هاتن بۆ لات ڕێیان بکەرەوەو واز لە خۆسەپێنی بهێنە، چونکە من خۆت و سەربازانت بانگ دەکەم بۆ لای خوا، من گەیاندم و ئامۆژگاریم بەخشی، دەی ئامۆژگاریەکەم قبووڵ بکەن، وە سەلام لەوەی شوێن ڕێنموونی دەکەوێت)، لە وەڵامدا نەجاشی نووسی(بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، بۆ موحەممەدی پێغەمبەری خوا لە نەجاشی ئەصحەمی کوڕی ئەبجەرەوە، سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا، هیچ پەرستراوێک نیە جگە لەو خوایەی کە ڕێنموونی کردم بۆ ئیسلام، ئەی پێغەمبەری خوا نامەکەتم پێگەیشت کە سەبارەت بە عیسا باست کردووە، دەی سوێند بە پەروەردگاری ئاسمان و زەوی عیسا زیاتر نیە لەوەی کە باست کردووە، زانیمان چی پەیامێکت بۆ ناردوین، ئامۆزاکەت و هاورێکانیمان نزیک و ڕێزدار داناوە، شایەتی ڕاستی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت، من بەیعەتم داوە بە تۆ و بەیعەتم داوە بە ئامۆزاکەت و لەسەر دەستی ئەو موسڵمان بوم، ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وا من ئەریحای کوڕی ئەصحەمی کوڕی ئەبجەرت بۆ دەنێرم چونکە من تەنها دەسەڵاتی خۆمم هەیە، ئەگەریش دەتەوێت بێم بۆ لات دێم بۆ لات ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، چونکە من شایەتی دەدەم ئەوەی دەیفەرموویت حەقە).[1]

[1] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٥٩٩.

جەعفەر لە حەبەشە بەرپرس و دەمڕاستی موسڵمانان بوو، کاتێکیش کاروانێکی موسڵمانان لە یەمەنەوە کەوتنەڕێ و ڕێیان کەوتە حەبەشە، لای جەعفەر مانەوە تا تا دواتر هەموو پێکەوە چوونەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ).[1]

کاتێک جەنگی بەرد ڕوویدا و موسڵمانان سەرکەوتن، جەعفەر و هاوەڵانی هەواڵیان لا نەبوو، نەجاشی ناردی بە شوێن جەعفەرو هاوەڵانیدا، کە چوونە ژوورەوە بۆ لای، لە ماڵێکدا بوو جلی پینەکراوی لەبەردا بوو، جەعفەرو هاوەڵانی دڵیان سووتا بۆی، نەجاشی کە دەموچاوی بێتاقەتی ئەوانی بینی وتی: من موژدەیەکتان پێدەدەم کە دڵخۆشتان دەکات، هەواڵگرەکەم لە خاکی ئێوەوە هاتووە بۆ لام و هەواڵی پێداوم خوا پێغەمبەرەکەی سەرخستووەو دوژمنەکەی شکاندووەو فلان و فلانەکەس بەند کراون، لە دۆڵێک جەنگەکە بووە کە پێی دەوترێت بەدر کە داری ئەراکی زۆرە، دەڵێیت ئەمڕۆیە دێتە بەرچاوم لەوێ شوانەیی وشترم دەکرد بۆ گەورەکەم کە کەسێک بوو لە بەنی ضەمرە، جەعفەر بە نەجاشی وت: ئەوە چیە بۆچی لەسەر خۆڵ دانیشتویت و هیچ ڕاخەرێکت لەژێردا نیە و ئەو جلانەت لەبەرە؟ ئەویش وتی: لەوەدا کە خوا دایبەزاندووە بۆ سەر عیسا ئێمە ئەوەمان دیتووە کە حەقە لەسەر بەندەکانی خوا کاتێک بەخششێکی خوایان پێدەگات تەوازوع بنوێنن، کاتێک خواش سەرکەوتنی پێغەمبەرەکەی بەخشی پێم، منیش ئەم تەوازوعەم بۆ نواند.[2]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) پەیامی نارد بۆ نەجاشی تا ئوممو حەبیبەی لێ مارە بکات، نەجاشی ئامادەسازی بۆ کرد و ناردی بە شوێن جەعفەردا و موسڵمانانی هاودەمی جەعفەریشی بانگ کرد، کە هاتن نەجاشی وتارێکی پێشکەش کرد و بەبەرچاویانەوە شایەتومانی دووبارە کردەوە.[3]

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٧١.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٣٠٧-٣٠٨.

[3] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٤٣.

کاتێک جەعفەر و یارانی گەیشتنە مەدینە، پێغەمبەر(ﷺ) نێوچاوانی جەعفەری ماچ کرد،[1] ئینجا فەرمووی: نازانم بە کامیان دڵخۆش بم، بە هاتنی جەعفەر یان بە فەتحی خەیبەر.[2]

جەعفەر و موسڵمانان هاودەم بە خۆیان بڕێکی زۆر دیاری و خەڵاتی نەجاشیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هێنابوو، دەستەی ئەبوومووسای ئەشعەریش کە لە یەمەنەوە چووبوونە حەبەشە لەگەڵ جەعفەر هاتنەوە بۆ مەدینە، هەروەها نەجاشی برازایەکی خۆی ناردبوو تا لە بری خۆیدا خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بکات.[3]

پێغەمبەر(ﷺ)لە دەستکەوتەکانی خەیبەردا جەعفەر و هاوەڵانی بەشدار کرد، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) ساڵانە پەنجا کوڵ خورمای بڕیەوە بۆ جەعفەر.[4]

بە فەرمایشتی پێغەمبەر(ﷺ) شایەتی بۆ جەعفەر و هاودەمانی دراوە کە پاداشتی دوو کۆچیان بۆ نووسراوە، کۆچێک بۆ حەبەشەو کۆچێکیش بۆ مەدینە، وەک لەو فەرموودەی صەحیحی بوخاریدا هاتووە کاتێ کۆچەرانی حەبەشە هاتنەوە بۆ مەدینە، خەڵکێ لە کۆچەران پێیان دەوتن ئێمە پێش ئێوە کۆچمان کردووە بۆ مەدینە، ئەسمائی کچی عومەیسیش کە لەو کۆچەرانەی حەبەشە بوو بە سەردان چوو بۆ لای حەفصەی ژنی پێغەمبەر(ﷺ)، عومەر چوویە ژوورەوە بۆ لای حەفصە و ئەسمائی لەوێ بینی، بە حەفصەی وت: ئەو ئافرەتە کێیە؟ وتی: ئەسمائی کچی عومەیسە، عومەر وتی: ئەمە حەبەشیەکەیە، ئەمە لەوانەی کەشتیەکەیە؟ (واتە ئەو کۆچەرانەی بە کەشتی

---

[1] المستدرک علی الصحیحین - کتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذکر مناقب جعفر بن أبي طالب بن عبد المطلب بن هاشم - ذکر سادات أهل الجنة، الرقم ٤٩٧١.

[2] المستدرک علی الصحیحین - کتاب الهجرة الأولی إلی الحبشة - هجرة عثمان مع رقیة(ﷺ) إلی الحبشة ، الرقم ٤٢٧٢، صححه ووافقه الذهبي.

[3] البدایة والنهایة لابن کثیر، ج٣، ص ٧٨.

[4] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٤، ص ٤١.

لە حەبەشـەوە هاتبوون بۆ مەدینە)، دایکی باوەرداران وتی: بەڵێ، عومەر وتی: بە کۆچکردن پێشتان کەوتین، جا ئێمە لەئێوە لەپێشتر و شیاوترین بە پێغەمبەری خوا، ئەسمائیش تووڕە بوو و وتی: نەبەخوا، ئێوە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوون و نانی برسیتانی دەدا و ئامۆژگاری نەزانتانی دەکرد، بەڵام ئێمە لە خاکێکی-یان وڵاتێکی- دوور و ناخۆش بووین لە حەبەشە، ئەوەش لەبەر خوا و لەبەر پێغەمبەرەکەی، سوێند بەخوا نان ناخۆم و ئاو ناخۆمەوە تا ئەوەی وتت باسی نەکەم بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئێمە ئازارمان بەردەکەوت و دەترساین، دەچم و بۆی باس دەکەم و پرسیاری لێدەکەم و درۆ و فێڵیش ناکەم و کەم و زیادی بۆ ناکەم، ئەسماء چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و مەسەلەکەی بۆ باس کرد، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو ئەی تۆ چیت پێ وت؟ وتی: ئاواو ئاوام پێ وت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ليس بأحق بي منكم، وله ولأصحابه هجرة واحدة، ولكم أنتم - أهل السفينة – هجرتان) (ئەو لە ئێوە شیاوتر نیە بە من، ئەو و هاوەڵانی یەک کۆچیان بۆ هەیە و ئێوەش-یارانی کەشتی- دوو کۆچتان بۆ هەیە).[1]

عەلی کە برای جەعفەر بوو زۆر جەعفەری خۆشدەویست، بۆیە عەبدوڵای کوری جەعفەر کە برازای عەلیە دەڵێت: هەرکات داوای شتێکم لە عەلی بکردایەو نەیکردایە بموتایە لەبەر خاتری جەعفەر ئەوەم بدەرێ یەکسەر پێی دەدام.[2]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ عومرەی پاش حودەیبیە جەعفەریشی لەگەڵدا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) جەعفەری نارد بۆ داوای مەیموونەی کچی حارث، مەیموونەش مەسەلەکەی دایە دەست عەبباس کە مێردی خوشکەکەی بوو، عەبباسیش مەیموونەی لە پێغەمبەر(ﷺ) مارە کرد.[3]

---

[1] صحيح البخاري – كتاب المغازي – باب غزوة خيبر، الرقم ٤٢٣٠.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٨٦.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢٢٩.

پێغەمبەر(ﷺ) جەعفەری کوڕی ئەبووطالیبی نارد بۆ شەڕی موئتە لە خاکی شام، ئەوەبوو لە مانگی جەمادیلئوولای ساڵی هەشتەمی کۆچیدا لەو غەزایەدا شەهید بوو.

موئتە لە خوارووی بەلقا بوو ماوەیەک دوور بوو لە شام، ئەوەبوو لە مانگی جەمادیلئوولادا پێغەمبەر(ﷺ) بە نامەیەکەوە حارثی کوڕی عومەیری ئەزدی نارد بۆ لای پاشای بوصرا، کەچی کە گەیشتە موئتە شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسانی ڕێی پێ گرت و کوشتی، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی لەسەر سەخت بوو، بۆیە سوپایەکی نارد کە نزیکەی سێ هەزار کەس دەبوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەمیری خەڵکەکە زەیدی کوڕی حارثەیە، ئەگەر کوژرا ئەوە جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب ئەمیرە، ئەگەر ئەویش کوژرا ئەوە عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە ئەمیرە، ئەگەر ئەویش کوژرا با موسڵمانان بە ڕەزامەندی خۆیان لەنێو خۆیاندا کەسێک دیاری بکەن و بیکەنە ئەمیریان)، پێغەمبەر(ﷺ) ئاڵایەکی سپی دایە دەست زەیدی کوڕی حارثەو وەسیەتی کرد بۆیان تا بچنە شوێنی کوژرانەکەی حارثی کوڕی عومەیر و خەڵکی ئەوێ بانگ بکەن بۆ ئیسلام، ئەگەر موسڵمان بوون باشە، ئەگەرنا پشت بەخوا ببەستن و دژیان بجەنگن، خۆیشی بۆ بەڕێکردنیان لەگەڵیان چوو تا گەیشتە (ثنیة الوداع)، ئیتر لەوێ وەستا و ماڵئاوایی کرد لێیان، موسڵمانانیش نزایان دەکرد بۆیان و دەیانوت خوا بتانپارێزێ و بە چاکی و دەستکەوتەوە بتانگێڕێتەوە، دوژمنیش ئەم هەواڵەی بیست و سوپای کۆکردەوەو شورەحبیل نزیکەی سەد هەزار سەربازی کۆکردەوەو دەستەی پێشڕەوی نارد.

کاتێک موسڵمانان گەیشتنە خاکی شام و هەواڵی زۆری سوپای دوژمن و هاتنی هیرەقلیشیان بە سوپایەکەوە بیست کە نزیک لەو ناوچە بوو، وتیان: با نامە بنێرین بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تا بزانین فەرمان بە چی

دەكات، بەڵام عەبدوڵای كوڕی ڕەواحە موسڵمانانی هاندا تا درێژە بدەن بە چوونەكەیان، ئەوەبوو درێژەیان دا بە چوونەكەیان تا گەیشتنە موئتە، دوژمنیش بە سوپایەكی گەورەوە هاتن و جەنگ لەنێوانیاندا ڕوویدا، زەید بە ئاڵاكەوە جەنگا تا ڕمێكی بەركەوت و شەهید بوو، ئینجا جەعفەری كوڕی ئەبووطالیب ئاڵاكەی گرتەدەست و لەسەر ئەسپەكەی دابەزی و دەمارێكی پێی ئەسپەكەی بڕی تا نیشانی بدات ڕاكردن نیە، ئینجا جەنگا تا سەربازێكی ڕۆمی بە شمشێر لێیدا و وا لێیدا كردی بە دوو بەشەوە، یەكێك لە بەشەكانی جەستەی نزیكەی سی و ئەوەندە برینداری پێوە بوو، بە هەموو جەستەیەوە نزیكەی حەفتاو ئەوەندە برینداری بینرا چ لە بەركەوتنی شمشێر یان ڕم بێت، ئینجا عەبدوڵای كوڕی ڕەواحە ئاڵاكەی هەڵگرت و ئەویش جەنگا تا كوژرا، ئینجا موسڵمانان ئاڵاكەیان دایە دەست خالیدی كوڕی وەلید و ئەویش بە پلانێكی سەركەوتوو توانی پاشەكشە بكات بە سوپای موسڵمانان.[1]

كاتێك جەعفەر ئاڵاكەی بەدەستی ڕاستەوە گرتبوو شمشێرێك درا لە دەستی و دەستی بڕا، بۆیە بە دەستی چەپ ئاڵاكەی گرتە دەست، پاش كەمێكی تر درا لە دەستی چەپیشی و هەردوو دەستی بڕا.[2]

كاتێك ئەم ڕووداوانە ڕوویاندەدا پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە لەلایەن پەروەردگارەوە هەواڵی پێدەدراو دەیگێڕایەوە بۆ هاوەڵان.[3]

ئەسمائی ژنی جەعفەر دەڵێت: جارێك هەویرم شێلا بوو و منداڵەكانم شۆردبوون و ڕۆنم دابوو لە قژیان و پاك و پوختم كردبوونەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لامان و فەرمووی: (منداڵەكانی جەعفەرم بۆ بهێنە)، منیش ئەوانم هێنا، پێغەمبەریش(ﷺ) بۆنی ئەوانی دەكرد و فرمێسك بە چاوانیدا دەهاتە

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٢٨-١٢٩.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢٤٦.

[3] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٣٨٤٣.

خوارەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە دایک و باوکمەوە بە قوربانت بم بۆچی دەگریت، ئایا هیچت سەبارەت بە جەعفەر و هاوەڵانی بیستووە؟ فەرمووی: (نعم أصيبوا هذ اليوم)، (بەڵێ ئەمڕۆ کوژران)، ئەسمائی کچی عومەیس دەڵێت: منیش هەستام دەستم کرد بە شیوەن و ژنان لە دەورم کۆبوونەوە و پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بۆماڵەوەو بە ژن و خێزانەکانی فەرموو (لا تغفلوا آل جعفر من أن تصنعوا لهم طعاما فإنهم قد شغلوا بأمر صاحبهم)،[1] (بنەماڵەی جەعفەر پشتگوێ مەخەن و چاوتان لێیان بێت خواردنیان بۆ ئامادە بکەن چونکە ئەوان خۆیان پەشۆکاون بە مردووەکەیانەوە).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) بە خەڵکی فەرموو (اصنعوا لآل جعفر طعاما فإنه قد أتاهم أمر يشغلهم)،[2] (خواردنێک ئامادە بکەن بۆ خێزانی جەعفەر چونکە بارێکیان تووش بووە کە پەشۆکاوی کردون).

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی کوژرانی جەعفەر و زەید و عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەی بیست، دانیشت و خەفەت دەموچاوی داگرتبوو، پیاوێک هات وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئافرەتانی جەعفەر وا دەگرین و بەردەوامن لە گریانیان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بڕوات ڕێی گریانیان لێ بگرێت، ئەویش چوو و هاتەوەو وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) من پێم وتن بەڵام بەگوێیان نەکردم، پێغەمبەر(ﷺ) هەمتر ناردیەوە، کابرا چوو و هاتەوەو وتی: بەخوا چاریان ناکەم هەر دەگرین، جاری سێیەمیش هەر وا بوو، عائیشە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) بە کابرای فەرموو (فاحث في أفواههن التراب)، (دەی خۆڵ بپرژێنە بە دەموچاویاندا).[3]

---

[1] مسند أحمد بن حنبل - مسند النساء(ﷺ) - حديث أسماء بنت عميس(ﷺ)، الرقم ٢٧٧٢٨، ضعفه شعيب الأرناؤوط.

[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند أهل البيت رضوان الله عليهم أجمعين - حديث عبد الله بن جعفر بن أبي طالب(ﷺ)، الرقم ١٧٧٦، سنن أبي داود - كتاب الجنائز - باب صنعة الطعام لأهل الميت ، الرقم ٣١٣٢، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داوود، الرقم ٣١٣٢، حسنه شعيب الأرناؤوط في تعليقه على مسند أحمد بن حنبل.

[3] صحيح البخاري - كتاب الجنائز - باب ما ينهى من النوح والبكاء والزجر عن ذلك، الرقم ١٣٠٥.

پێغەمبەر(ﷺ) تا سێ ڕۆژ مۆڵەتی دا خێزانی جەعفەر ماتەمینی بگێڕن، دواتر پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ لایان و فەرمووی: (لا تبكوا على أخي بعد اليوم)، (لەمڕۆ بەدواوە مەگرین بەسەر براکەمدا)، ئینجا فەرمووی: (برازاکانمم بۆ بانگ بکەن)، ئەوانیش هاتن، ئینجا داوای سەرتاشی کرد و سەرتاش هات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد سەری کوڕەکانی جەعفەری چاک کرد.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (رأيت جعفرا يطير في الجنة مع الملائكة)،[2] (جەعفەرم بینی لە بەهەشتدا لەگەڵ فریشتەکاندا دەفڕی).

**پەندو وانە**

دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو بارە سەختەکاندا خۆیشی و ئازیزانیشی هاودەم بە هاوەڵان بەشدار کردووە، بۆ جێهێشتنی خاکی خۆیان و کۆچێکی دوور و سەخت پێغەمبەر(ﷺ) جەعفەری ئامۆزای دەنێرێت، بۆ فەتحی خەیبەر عەلی ئامۆزای دەنێرێتە پێشەوە، بۆ جەنگی موئتە جەعفەر دەنێرێت، خۆی بەشداری هەموو ناڕەحەتیەکان دەبێت، ئەمە وادەکات ئیتر هاوڵاتی لەئاست کێشەو نارەحەتیەکاندا ناڕەزایی دەرنەبڕێت، چونکە دەبینێت سەرکردە و دەوروبەرەکەشی وەک ئەو دەژین.

پەندو وانەیەک کە لە سەرکردایەتی جەعفەرەوە فێری دەبین بنەڕەتە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵە گەورەی کە ئەمڕۆ لەناو موسڵماناندا هەیە، ئەویش شەرمکردن و ترسانە لە وتنی هەندێ ڕاستی ئیسلام بە بیانووی جۆراوجۆر کە زۆربەی کات ئەو بیانووانە زادەی بیرکردنەوەی عەقڵی نین بەڵکو ترسە لە بەرامبەرو بەرگەنەگرتنی شاڵاویانە، دەبینین جەعفەر کاتێک پرسیاری لێدەکرێت سەبارەت بە پیرۆزترین بنەمای ئایینی وڵاتی حەبەشە، لە وەڵامدا تەنها ئەوە دەڵێت: کە خوا دایبەزاندووەو پەیامی خوایە، ئیتر

[1] سنن النسائي - كتاب الزينة - باب حلق رؤوس الصبيان ، الرقم ٥٢٤٢، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن النسائي.

[2] جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) - باب مناقب جعفر بن أبي طالب(رضي الله عنه) ، الرقم ٣٧٦٣ و قال حديث غريب، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٣٧٦٣.

باکی نیە چی بەسەر دێ، چونکە ئەوان لەبەر نەگۆڕینی پەیامی خوا کۆچیان کردووە بۆ حەبەشە، جا ئێستا چۆن دەکرێت پاش ئەو هەموو نارەحەتیە ئەو کارە بکەن کە ئامادە نەبوون لە وڵاتی خۆیان بیکەن ئەویش دەسکاری کردنی پەیامی خوایە، دەبینین لەمڕۆشدا موسڵمانانێک لەبەر ئاینی خوا چەندین نارەحەتییان دێتەڕێ و قبووڵی دەکەن و ئامادەن لەو پێناوەدا باج بدەن، کەچی لەلایەکی ترەوە ئەو ماندووبوونەیان سفر دەکەنەوە.

لە نامەکەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بۆ نەجاشی رەچاوی ئەو خاڵە دەکەین کە پێغەمبەر(ﷺ) لە دواندنی بەرامبەردا رەچاوی باری بەرامبەری کردووەو لەەر مەسەلە پەیوەستەکانی نێوانیشیان دواوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەزانێت ئایینی نەجاشی و حەبەشە مەسیحیەتە، بۆیە سەبارەت بە عیسا و مەریەم قسە دەکات، سەبارەت بەو پرسانەی کێشەی ناو ئەو ئایینە بوون کە بریتی بوو لە بەندایەتی عیسا و لەدایکبوونی عیسا و پاکداوێنی مەریەم، بەمە هەم ئەو مەسەلانەی بۆ یەکلا کردەوە، هەم تێیگەیاند کە خاڵی هاوبەش لەنێوانیان ئیسلام و مەسیحیەتدا هەیە.

رێزگرتنی نەجاشی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لە ئاستێکی زۆر گەورەدا بووە، دەبینین لە هەنگاوی یەکەمدا باوەڕی پێ دەهێنێت و بە هەموان دەڵێت: ئامادەم ببمە خزمەتکاری، پاشان کوڕەکەی خۆی دەنێرێت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا لە وەڵامی نامەکەیدا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەم دەربڕینە بەکاردێنێت (بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، بۆ موحەممەدی پێغەمبەری خوا لە نەجاشی ئەصحەمی کوڕی ئەبجەرەوە، سەلام و رەحمەت و بەرەکەتی خوات لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا)، ئەمەش لووتکەی رێزە کە هەرچەندە ئەو نامەنووسە کەچی ناوی خۆی دەخاتە دوای ناوی پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها هاودەم بە جەعفەرو یارانی برازاکەی خۆی دەنێرێت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا خزمەتی بکات، جگە لەوەش گرانبەهاترین دیاری بۆ دەنێرێت.

دروستی ماچکردنی پیاو بۆ پیاو و هەروەها ئافرەت بۆ ئافرەتیش، ئەوەش وەک نیشاندانی ئەوپەڕی خۆشەویستی، پێغەمبەر(ﷺ) کە جەعفەری بینی باوەشیان بە یەکدا کرد و پێغەمبەر(ﷺ) نێوچاوانی جەعفەری ماچ کرد، وەک چۆن حەسەن و حوسەینیشی دەگرتە کۆش و ماچی دەکردن.

لەبەرچاوگرتنی ئەگەرەکان خاڵێکی بنەڕەتی و پێویستە لە سەرکردەدا هەبێت، پێغەمبەر(ﷺ) لە ناردنی ئەو سوپایەدا ئەگەری دانا بۆ کوژرانی سێ سەرکردەو ریزبەندی دانا کە ئەگەر هەرکامیان کوژرا ئەوی تریان بچێتە شوێنی، دوای ئەوەش با ئیتر موسڵمانان لەنێو خۆیاندا سەرکردەیەک دیاری بکەن.

چوونی پێغەمبەر(ﷺ) بە پیادە بۆ ماڵئاوایی کردن لە سوپاکەی موئتەو پەرۆشی بۆیان پاڵپشتێکی گەورەیە بۆ ورەو گوڕو تینی سەربازان، هەروەها بەشداری کارای سەرکردە یەکدوای یەکەکانی ئەو سوپایەو جەنگانیان بە گوڕو تینەوە دووبارە ورەبەرزیە بۆ سوپا بە گشتی.

ئامادەکردنی خواردن بۆ مردوو فەرمانی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) بۆ موسڵمانان بەتایبەت بۆ دەرودراوسێی ماڵی مردووەکە چونکە ئەوان لە بارێکی سەختدان، کەچی ئەمڕۆ بارەکە لای زۆرێک لە موسڵمانان پێچەوانە بوەتەوەو کەس وکاری مردووەکە لەبەر سەرقاڵییان بە ئامادەکردنی خواردن بۆ ئەوانەی دێن بۆ سەرەخۆشییان پەشۆکاویەکەیان دەبێت بە چەند بەرامبەر.

## ٦٥٧. جەعفەری کوڕی یەزید(رضي الله عنه)

ناوی جەعفەری کوڕی یەزیدی کوڕی هاشمی قورەیشیە، برایەکی هەبوو بەناوی رکانە، لە غەزای خەیبەردا کە پێغەمبەر(ﷺ) دەستکەوتەکانی دابەش کرد پەنجا کۆڵ خورمای پێ بەخشی، ئەوەندەشی بەخشی بە رکانەی برای.[1]

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٨٨.

## ٦٥٨. جەمرەی کچی عەبدولا(رضي الله عنها)

ناوی جەمرەیە و کچی عەبدوڵای تەمیمی یەربووعیە، هەم خۆی و هەم باوکیشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بون.[١]

جەمرە دەڵێت: باوکم منی برد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای بەرەکەت بکە بۆ ئەم کچەم، پێغەمبەریش(ﷺ) دایینیشاندم و دەستی خستە سەر سەرم و نزای بەرەکەتی بۆ کردم.[٢]

ئەم ئافرەتە دواتر لە کووفە نیشتەجێ بوو.[٣]

## ٦٥٩. جەمرەی کچی قوحافە(رضي الله عنها)

ناوی جەمرەیە و کچی قوحافەی کیندیە،[٤] کچێکی هەبوو بە ناوی ئومموکلثوم کە فەرموودەی لە دایکیەوە گێڕاوەتەوە.[٥]

جەمرە دەڵێت: لە حەجیماڵئاواییدا لەگەڵ ئومموسەلەمەدا بووم و گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو ئەی ئوممەتە خۆشەویستەکەم ئایا گەیاندم پێتان؟ جا کوڕێکی جەمرە وتی: دایە گیان ئەوە چیە دایکی بانگ دەکات؟ منیش وتم: کوڕی شیرینم مەبەستی ئوممەتەکەیەتی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (ألا إن أعراضكم وأموالكم ودماءكم عليكم حرام، كحرمة يومكم هذا، في بلدكم هذا، في شهركم هذا)،[٦] (وریابن ئابڕوو و سامان و خوێنتان لەیەکتر حەرامە وەک حەرامی ئەم ڕۆژەتان، لەم خاکەتاندا و لەم مانگەتاندا).

---

[١] أسد الغابة، ج٧، ص ٥٦.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥٤.

[٣] أسد الغابة، ج٧، ص ٥٦.

[٤] أسد الغابة، ج٧، ص ٥٧.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥٤.

[٦] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٠٣٨٢، أسد الغابة، ج٧، ص ٥٧.

## ٦٦٠. جەمرەی کچی نوعمان(رضي الله عنها)

ناوی جەمرەی کچی نوعمانی عەدەویە، ئەم ئافرەتە فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی کرد موو و خوێن بخرێنە ژێر خاک.[١]

## ٦٦١. جەمرەی کوڕی عەوف(رضي الله عنه)

ناوی جەمرەی کوڕی عەوفە، کونیەکەی ئەبوویەزیدە، لەو هاوەڵانە ئەژمار دەکرێت کە دواتر لە فەلەستین نیشتەجێ بووە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی یەزید کە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، برایەکیشی هەبوو بە ناوی حورەیث.[٢]

یەزید دەڵێت: لەگەڵ جەمرەی باوکم چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتمان دا بە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خواش(ﷺ) نزای بۆ کرد و دەستی هێنا بەسەر سنگیدا،[٣]نزای بەرەکەتیشی بۆ کرد.[٤]

## ٦٦٢. جەمرەی کوڕی نوعمان(رضي الله عنه)

ناوی جەمرەی کوڕی نوعمانی کوڕی هەوەذەی کوڕی مالیکی کوڕی سەمعانی عوذریە، یەکەم کەس بوو لە حیجازدا صەدەقەو زەکاتی هۆزەکەی خۆی بردە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)،[٥] چوونەکەشی لەگەڵ وەفدێکی دوانزە کەسیدا بوو کە لە مانگی صەفەری ساڵی نۆی کۆچیدا بوو.[٦]

---

[١] أسد الغابة، ج٧، ص ٥٧.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٤٣٠.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٩٦.

[٤] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٦٢٦.

[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٥٦.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ٧٣.

جەمرە گەورەی هۆزەکەی خۆی بووە، پێغەمبەر(ﷺ) ناوچەیەکی بۆ بڕیەوەو ئەویش تا وەفاتی کرد لەوێ مایەوە.[1]

## ٦٦٣. جەمووحی ئەنصاری(رضي الله عنه)

ناوی جەمووحەو لە هاوەڵە پشتیوانیەکانە لە خەزرەجیەکان لە بەنی سەلەمە. بەنی سەلەمە بتێکیان هەبوو کە پێی دەوترا مەناف، کەسێک لە هۆزەکە کە پێی دەوترا جەمووح هەستاو ئەو بتەی بە پەتێکەوە بەستەوە بە سەگێکەوە، ئینجا فڕێی دایە ناو بیرێکەوە-چاڵێکەوە- و بە شیعر گاڵتەی پێ دەکرد.[2]

## ٦٦٤. جەمیعی کوڕی مەسعوود(رضي الله عنه)

ناوی جەمیعی کوڕی مەسعوودی کوڕی عەمری کوڕی ئەصرەمە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، یەکێک بوو لە خێرخوازەکان.[3]

## ٦٦٥. جەمیلەی کچی زەید(رضي الله عنها)

ناوی جەمیلەی کچی زەیدەو خوشکی عەلبەی کچی زەیدە، ئەم ئافرەتە لە پشتیوانانەو بەیعەتی داوە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ).[4]

## ٦٦٦. جەمیلەی کچی سەعد(رضي الله عنها)

ناوی جەمیلەی کچی سەعدی کوڕی رەبیعە، ئەم ئافرەتە لە پشتیوانانە،[5] کونیەکەی ئوموسەعدە.[6]

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٥٦، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٩٧.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٩٨.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٩٨.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٠.
[5] أسد الغابة، ج٧، ص ٦٠.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٠.

سەعدی باوکی لەگەڵ براکەیدا (مامی جەمیلە) لە غەزای ئوحوددا شەهید بوون و هەردووکیان لە یەک گۆڕدا ئەسپەردە کران.[1]
جەمیلە لەگەڵ زەیدی کوڕی ثابتدا هاوسەرگیری کرد و خاریجە و یەحیا و ئیسماعیل و سولەیمانی لێ بوو.[2]

## ٦٦٧. جەمیلەی کچی سینان(رضي الله عنها)

ناوی جەمیلەی کچی سینانە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە،[3] دایکی ناوی خەولەیە.[4]

## ٦٦٨. جەمیلەی کچی صەیفی(رضي الله عنها)

ناوی جەمیلەی کچی صەیفیە، دایکی ناوی نواری کچی قەیسە، جەمیلە شووی کرد بە عەتیکی کوڕی قەیس.[5]

## ٦٦٩. جەمیلەی کچی عەبدولا(رضي الله عنها)

ناوی جەمیلەی کچی عەبدوڵای کوڕی حەنظەلەیە، لە پشتیوانانەو لەو ئافرەتانەیە کە بەیعەتیان داوە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ).

## ٦٧٠. جەمیلەی کچی عەبدولعوززا(رضي الله عنها)

ناوی جەمیلەی کچی عەبدولعوززای کوڕی قەطەنی خوزاعیە، ئەم ئافرەتە موسڵمان بوو و بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، هەروەها ئەم ژنە هاوسەری عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوام بوو.[6]

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص ١٨٠٣.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٠.
[3] أسد الغابة، ج٧، ص ٦٠.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦١.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦١.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٣.

## ٦٧١. جەمیلەی کچی عەمر(ﷺ)

ناوی جەمیلەی کچی عەمری کوڕی زەیدە، دایکی ناوی ئەنیسەی کچی عاصیمە، ئەم ئافرەتەش لەوانەیە کە بەیعەتیان داوە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، سەرەتا شووی کرد بە عوبادەی کوڕی صامت و وەلیدی لێ بوو، دواتر شووی کرد بە رەبیعی کوڕی سوراقە و عەبدولا و موحەممەدی لێ بوو، دواتر شووی کرد بە کلدەی کوڕی ئەبووخالید.[1]

## ٦٧٢. جەمیلەی کچی ئەبولئەفلەح(ﷺ)

ناوی جەمیلەی کچی ئەبولئەفلەح بوو، ئەم ئافرەتە سەرەتا ناوی عاصیە بوو بەلام پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نا جەمیلە.[2]

لە ساڵی حەوتی کۆچیدا عومەر جەمیلەی بەهاوسەر گرت و عاصمی لێ بوو، دواتر تەلاقی دا، ئینجا یەزیدی کوڕی حارث بەهاوسەری گرت و عەبدورەحمانی لێ بوو.[3]

جەمیلە کاتێک هاوسەری عومەر بوو هێشتا ناوی عاصیە بوو وتی: عومەر رقمە لە ناوەکەی خۆم ناوێکی ترم لێ بنێ، ئەویش ناوی نا جەمیلە، ئەویش تووڕە بوو و وتی: هیچت بۆ نەدۆزیمەوە جگە لە ناوی کەنیزەیەک؟ بۆیە چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) رقم لە ناوەکەمە ناوێکی ترم لێ بنێ، ئەویش ناوی نا جەمیلە، بەڵام ئەو تووڕە بوو و وتی: کە پێشتریش عومەر وا ناوی ناوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (أما علمت أن الله عند لسان عمر وقلبه)،[4] (مەگەر نازانیت خوا لەگەڵ زمان و دڵی عومەرە؟).

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦١.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥٦.
[3] أسد الغابة، ج٧، ص ٥٩.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥٨.

## ٦٧٣. جەمیلەی کچی ئەبووجەهل(رضي الله عنها)

ناوی جەمیلەی کچی ئەبووجەهلی کوڕی هیشامی مەخزوومیە.

جەمیلە دەڵێت: جارێک پێغەمبەر(ﷺ) دای بە لاماندا و داوای ئاوی کرد و منیش ئاوم بۆ برد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خير أمتي قرني، ثم الذين يلونهم)،[١] (چاکترینی ئوممەتەکەم سەردەمەکەی منن، دواتر ئەوانەی دوای ئەوان دێن).

## ٦٧٤. جەمیلەی کچی ئوبەی(رضي الله عنها)

ناوی جەمیلەی کچی ئوبەی کوڕی سەلوولە، خوشکی عەبدوڵای کوڕی سەلوولی سەرۆکی دووروووەکانی مەدینەیە.[٢]

ئەم ئافرەتە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان.[٣]

جەمیلە سەرەتا ژنی حەنظەلەی کوڕی ئەبی عامر بوو، بەڵام لە رۆژی ئوحوددا حەنظەلە شەهید بوو، دواتر شووی کرد بە ثابتی کوڕی قەیس.[٤]

ئەم ئافرەتە یەکەم ئافرەت بوو کە لە ئیسلامدا تەڵاقی خولعی بەکارهێنا.

جەمیلە هاوسەری ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس بوو، بڕیاری دا لە ثابت جیا بێتەوەو چووە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و داوای تەڵاقی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: مارەییەکەت چیە؟ ئەویش وتی: باخێکە، فەرمووی: ئامادەی بیدەیتەوە بە ثابت؟ وتی: بەڵێ، بەوەش یەکەم ئافرەت بوو لە ئیسلامدا خولعی بەکارهێنا.[٥]

کاتێک جەمیلە لە ثابت جیا بوویەوە سکی پڕ بوو بە موحەممەد، کاتێک موحەممەدی بوو سوێندی خوارد شیری خۆی پێ نەدات، ثابت هات بۆ

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥٩.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥٦.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥٦.

[٤] أسد الغابة، ج٧، ص ٥٨.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥٦.

لای پێغەمبەر(ﷺ) و مەسەلەکەی بۆ باس کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نزیکی بکەرەوە لێم) واتە منداڵەکەی مەبەست بوو، ئەویش نزیکی کردەوە لێی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) تفی دا لە دەمی و ناوی نا موحەممەد و بە خورمایەکی عەجوە لێوی سوی و فەرمووی: (بیبە خوای گەورە رۆزی دەریەتی).[1]

## ٦٧٥. جەمیلی کوڕی مەعمەر(ﷺ)

ناوی جەمیلی کوڕی مەعمەری کوڕی حەبیبی جومەحیە،[2] یەکێک بوو لەو کەسانەی کە قسەی نەدەشاردەوە.[3]

جەمیل برایەکی هەبوو بە ناوی سوفیان کە یەکێک بوو لەوانەی زوو موسڵمان بوون و یەکێک بوو لە کۆچەرانی حەبەشە.[4]

جەمیل یەکێک بوو لە بەشداربوانی جەنگی فوججار و تەمەنیشی کەم نەبوو، واتە مێردمنداڵ نەبوو.[5]

کاتێک عومەری کوڕی خەططاب موسڵمان بوو، پرسیاری کرد چ کەسێک لەناو قورەیشدا زۆر قسە ئاشکرا دەکات؟ پێی وترا جەمیلی کوڕی مەعمەر، عومەریش چوو بۆ لای و هەواڵی پێدا کە موسڵمان بووە و پێی وت: بەڵام تکام وایە لای کەس باسی نەکەیت و بیشاریتەوە، جەمیلیش تا توانی لەناو خەڵکدا هاواری کرد عومەر وازی لە ئایینەکەی هێناوە.[6]

عەبدوڵای کوڕی عومەر دەڵێت: کە عومەر موسڵمان بوو وتی: کێ زۆر قسە دەگێڕێتەوە، پێی وترا جەمیلی کوڕی مەعمەری جومەحی، دەمەو

---

[1] أسد الغابة، ج٥، ص ٨٥.
[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٤٧.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤٣٣.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٦٣٠.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠٠.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠٠.

بەیان بوو کە چوو بۆ لای، منیش بەدوایدا چووم و تەماشام دەکرد بزانم چی دەکات، کە گەیشتە لای جەمیل وتی: ئەی جەمیل ئەریێ زانیوتە من موسڵمان بووم و چوومەتە ناو ئایینی موحەممەدەوە؟ عەبدوڵا دەڵێت: سوێند بەخوا جەمیل هەرکە ئەوەی بیست هەستا و عەباکەی بەدوایدا دەخشا و عومەریش بەدوایدا دەڕۆیشت و منیش بەدوایاندا چووم، جەمیل گەیشتە لای دەرگای کەعبە، قورەیشیەکانیش لە کۆڕ و مەجلیسیاندا دانیشتبوون، جەمیل تا توانی هاواری کرد ئەی خەڵکینە کوڕی خەططاب لەدین دەرچوو، عومەریش لە پشتیەوە دەیوت: درۆ دەکات بەڵکو من موسڵمان بووم و شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوا و موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، خێرا قورەیشیەکان بەڕوویدا راپەڕین و عومەریش بەرگری لەخۆی دەکرد و بەرامبەریان وەستایەوە... کابرایەک هات و وتی: ئەوە چیە؟ وتیان: عومەر لە دین هەڵگەڕاوەتەوە، ئەویش وتی: وازبێنن کابرا شتێکی بۆ خۆی هەڵبژاردووەو دەستی لێ هەڵبگرن، بۆ وادەزانن بەنی عەددی هەروا وازتان لێدێنن چیتان دەوێت بەرامبەر عومەر بیکەن؟ ئیتر ئەوانیش وازیان لێهێنا.[1]

سەبارەت بە کاتی موسڵمانبوونی جەمیل دوو را هەیە، رایەک دەڵێت: لە پاش فەتحی مەککە، رایەکیش دەڵێت: لە پێش فەتحی مەککە بووە، ئەوکات تەمەنیشی زۆر بوو،[2] بەڵام ئەو رایە راستترە کە پێش فەتحی مەککە موسڵمان بووە چونکە لە فەتحی مەککەدا بەشداری کرد.[3]

هەروەها لە غەزای حونەینیشدا بەشداری کرد و تیایدا یەکێک لە بەندکراوەکانی کوشت بەناوی زوهەیری کوڕی ئەبجور.[4]

---

[1] صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله عليهم أجمعين - ذكر وصف إسلام عمر رضوان الله عليه وقد فعل، الرقم ٦٨٧٩، البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٨٢ و قال الحافظ ابن كثير إسناده جيد قوي.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤٣٣.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠٠.

[4] أسد الغابة، ج١، ص ٤٣٣.

جەمیل دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ژیاو لە فەتحی میصریشدا بەشداری کرد، لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا وەفاتی کرد و عومەریش بە مەرگی زۆر دڵگران بوو، ئەوکات تەمەنی جەمیل نزیک بە سەد ساڵ دەبوو،[1] جەمیل پاش وەفاتی خۆی نەوەی جێنەهێشت.[2]

## ٦٧٦. جەمیلی کوڕی ردام(ﷺ)

ناوی جەمیلی کوڕی ردامی عوذریە، پێغەمبەر(ﷺ) نامەیەکی بۆ نووسی و نووسەری نامەکەش عەلی کوڕی ئەبووطالیب بوو.[3]

## ٦٧٧. جەمیلی کوڕی عامیر(ﷺ)

ناوی جەمیلی کوڕی عامیری کوڕی حوذەیمی جومەحی، برایەکی هەبوو بە ناوی سەعید، کوڕێکیشی هەبوو بە ناوی عەبدولا، بەڵام هیچ فەرموودەیەک لە جەمیلەوە نەگێردراوەتەوە.[4]

## ٦٧٨. جەنابی کەلبی(ﷺ)

ئەم هاوەڵە لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا موسڵمان بووەو فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوەو دەڵێت: بیستم پێغەمبەر(ﷺ) بە کەسێکی رەبعەی دەفەرموو (جبرەئیل لە راستمەوەیەو میکائیلیش لە چەپمەوەیەو فریشتەکانیش سێبەریان کردووە بۆ سەربازگەکەم، دەی شتێ لە وتەی- شیعری- خۆت بڵێ)، کابراش شیعرێکی هۆنیەوە، منیش وتم: ئەرێ ئەو شاعیرە کێ بوو؟ وترا حەسسانە، بینیم پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای بۆ دەکرد و فەرمایشتی خێری دەفەرموو.[5]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠٠.
[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٦٣١.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٩٩.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠٠.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٤٣٥.

## ٦٧٩. جەنابی کوڕی حارثە(رضي الله عنه)

ناوی جەنابی کوڕی حارثەی کوڕی صەخری کوڕی مالیکە، یەکێکە لە کۆچەران، کاتێک کۆچی کرد بۆ مەدینە باوکی زۆر خەفەتی پێ خوارد و بە پارچە شیعرێکیش ئەو خەفەت و دڵتەنگیەی خۆی نووسی بۆ جەنابی کوڕی.

ئیبن حەجەر دەڵێت: جۆرێک لە هەست کردن بە موسڵمانبوونی حارثەی باوکی جەناب لەو شیعرەیدا بەدی دەکرێت.[١]

## ٦٨٠. جەنادەی کوڕی تەمیم(رضي الله عنه)

ناوی جەنادەی کوڕی تەمیمی مالیکی کینانیە، تاکە بەڵگەی هاوەڵبوونی ئەوەیە کە عەمری کوڕی عاص لە جەنگی ئەجنادەین ئەوی وەک بەرپرسی یەکەیەکی سوپا داناوە،[٢] پێشتریش وتمان: ئەو هاوەڵانە تەنها گەورە هاوەڵانی دیاریان دەکرد بە بەرپرسی سوپا و ناوچەکان.

## ٦٨١. جەنادەی کوڕی ئەبی نەقبە(رضي الله عنه)

ناوی جەنادەی کوڕی ئەبی نەقبە عەبدوڵای کوڕی عەلقەمەیە، برایەکی هەبوو بە ناوی هوزەیم کە هەردووکیان لە جەنگی یەمامەدا شەهید بوون.[٣]

## ٦٨٢. جەنادیحی کوڕی مەیموون(رضي الله عنه)

ناوی جەنادیحی کوڕی مەیموونەو دوای وەفاتی پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) ژیاو لە فەتحی میصردا بەشداری کرد.[٤]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠١.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠٣.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠٤.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠٢.

## ٦٨٣. جەندەعی کوڕی ضەمرە(ﷺ)

ناوی جەندەعی کوڕی ضەمرەیە، یان دەوترێت ناوی جوندوبە، لە کۆچەران بوو، بەڵام کۆچەکەی نەگەیشتووەتە مەدینە.

جەندەع لە مەککە نیشتەجێ بوو و موسڵمانیش بوو، بەڵام کۆچکردنەکەی دواخست، دواتر بڕیاریدا کۆچ بکات بۆ مەدینە، بەڵام لە ڕێدا مرد و نەگەیشتە مەدینە.[1]

ئەبوونوعەیم دەڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر جەندەع دابەزی (ومن يخرج من بيته مهاجرا إلى الله ورسوله...).

جەندەعی کوڕی ضەمرە لە مەککە نەخۆش بوو و لە کەسە پەککەوتە و لاوازەکان بوو، کاتێک بیستی خوای گەورە سەبارەت بە کۆچکردن چی دابەزاندووەو چەندە خێری هەیە داوای کرد بیبەن بۆ مەدینە،[2] جەندەع چوار منداڵیشی هەبوو، وتی: خوایە من بە گیانی خۆم پێغەمبەرەکەت سەردەخەم، وا لە ناو بێباوەڕانەوە دەچم بۆ دارولهیجرەو لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەبم و ژمارەو ڕەنگی کۆچەران و پشتیوانان زیاد دەکەم، ئینجا بە کوڕەکانی وت: بمبەن بۆ دارولهیجرە تا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بم،[3] راخەرێکی بۆ ئامادە کرا و خرایە سەر راخەرەکەو سوار کرا و بەرەو مەدینە برا، ئەوەبوو لە ناوچەی تەنعیم کۆچی دوایی کرد، خوای گەورەش ئەو ئایەتەی لەو بارەوە دابەزاند.[4]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٥.

[2] الجامع لأحكام القرآن للقرطبي، دار عالم الكتب(الرياض-٢٠٠٣)، ، ج٥، ص ٣٤٩.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤٤٣.

[4] الجامع لأحكام القرآن للقرطبي، ج٥، ص ٣٤٩.

## ٦٨٤. جەندەعی ئەنصاری(رضي الله عنه)

ناوی جەندەعەو لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[١] فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە و دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (من كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار)،[٢] (هەرکەس دەست ئەنقەست درۆیەک بەدەم منەوە بکات با شوێنی خۆی لە دۆزەخدا دیاری بکات).

## ٦٨٥. جەندەلی کوڕی نەضلە(رضي الله عنه)

ناوی جەندەلی کوڕی نەضلەی کوڕی عەمرە، چوویە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من شاعیرێک بووم و هاوەڵێکی جنۆکەشم هەبوو، ئاگاداری کردمەوە لە هاتنی تۆ، منیش بەرەو لای تۆ هاتم، ئەویش بە شیعرێک هانی دام تا بەرەو لای تۆ بێم، ئەوەبوو جەندەل هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمان بوو.[٣]

## ٦٨٦. جەهبەلی کوڕی سەیف(رضي الله عنه)

ناوی جەهبەلی کوڕی سەیفەو لە بەنی جەللاحە، ئەم هاوەڵە بوو کە هەواڵی وەفاتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) برد بۆ حەضرەمەوت.[٤]

## ٦٨٧. جەهجاهی کوڕی سەعید(رضي الله عنه)

ناوی جەهجاهەو کوڕی سەعیدە، یان دەوترێت کوڕی قەیسە یان دەوترێت کوڕی مەسعوودی غیفاریە.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٦.

[٢] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٦٢٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٦.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٧.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٧.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٨

جەهجاهی غیفاری دەڵێت: لەگەڵ دەستەیەک لە ئەندامانی هۆزەکەم هاتم تا موسڵمان بم، کاتێک هاتین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی ئێوارە بوو، کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەلامی دایەوە فەرمووی: (با هەرکامتان دەستی ئەوەی پاڵی بگرێت)، ئیتر هیچ کەس لە مزگەوتدا نەمایەوە جگە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و من، منیش کەسێکی باڵابەرز و قەبە بووم و کەس خۆی نەدەدا لە قەرەم، ئەو شەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) منی بردەوە بۆ ماڵی خۆی، ئەوەبوو بزنێک دۆشرا بۆم، منیش هەموویم خواردەوە، پێغەمبەر(ﷺ) شیری حەوت بزنی بۆ هێنام و منیش شیرەکەم دەخواردەوە، دواتر خواردنێکی ترم بۆ هێنرا و منیش خواردمەوە، ئوممو ئەیمەن وتی: خوایە ئەوەی ئەمشەو پێغەمبەری خوای(ﷺ) برسی کرد برسی بکەیت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (مه يا أم أيمن أكل رزقه ورزقنا على الله تعالى)، وس ئەی ئوممو ئەیمەن، رۆزی خۆی خواردووە و رۆزی ئێمەش لای خوایە، بۆ بەیانی هەمدی هەموو هاوەڵان کۆبوونەوەو هەر هاوەڵێک باسی ئەوەی دەکرد شەو چی کردووەو چی خواردووە، جەهجاهیش وتی: من شیری حەوت بزنم خواردوەتەوەو خواردنێکی تریشم (البرمة) بۆ هێنراوەو ئەویشم خواردووە، ئینجا هەموویان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی ئێوارەیان کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (با هەرکەستان کەسەکەی پاڵ خۆی بباتەوە لەگەڵ خۆی)، ئەوەبوو هەموو چوونەوەو تەنها مایەوە سەر من و پێغەمبەر(ﷺ)، منیش کەسێکی باڵابەرز و زەبەلاح بووم و کەس خۆی نەدەدا لە قەرەم، هەمدی پێغەمبەر(ﷺ) منی بردەوەو بزنم بۆ دۆشرا و منیش تێرم خواردەوەو تێر بووم، ئوممو ئەیمەن وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا ئەوە میوانەکەی دوێنێ شەومان نەبوو؟ فەرمووی: با، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إنه أكل في معاء مؤمن الليلة و أكل قبل ذلك في معاء كافر، والكافر يأكل في سبعة أمعاء و المؤمن يأكل في معاء واحد)،[1] (ئەو ئەمشەو بە ریخۆڵەی باوەڕدار نانی خوارد و پێشتر بە

[1] المعجم الكبير للطبراني - باب الجيم - من اسمه جهجاه - جهجاه الغفاري، الرقم ٢١٥٢.

ریخۆڵەی بێباوەڕ نانی دەخوارد، بێباوەڕ لە حەوت ریخۆڵەدا نان دەخوات و باوەڕداریش لە یەک ریخۆڵەدا نان دەخوات).

ئەم فەرموودەیە بە گێڕانەوەی تر لە هاوەڵی تریشەوە هاتووە کە بە صەحیح دانراوە، لەوانەش ئەو فەرموودەی کە ئەبوهورەیرە دەیگێڕێتەوە، بەڵام ناوی کەسەکە نابات.[1]

بەمەدا دەردەکەوێت جەهجاهی غیفاری شەوی یەکەم کە چووەتەوە بۆ ماڵ پێغەمبەر(ﷺ) تازە لە وەفدەکەدا بووەو بە بێباوەڕی چووەتەوە بۆ ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) و شەو لەوێ ماوەتەوەو بۆ بەیانیەکەی باوەڕی هێناوە، هەروەک ئیبن ئەثیر بە روونی ئەوە دەڵێت: (حەوت شیرەکەی پێش موسڵمانبوونی خوارد، بەڵام کە باوەڕی هێنا شیری یەک دانەشیانی تەواو نەکرد).[2]

هەروەها چەند هاوەڵی تر هەبون کە ئەو فەرموودەیان لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بیستووە، لەوانە نافیع دەڵێت: ئیبن عومەر نانی نەدەخوارد تا هەژارێک نەهاتایە بۆ لای و نانی لەگەڵ نەخواردایە، ئەوەبوو جارێک کەسێکم برد بۆ لای تا نانی لەگەڵدا بخوات، دوایی ئیبن عومەر وتی: ئەی نافیع ئەو کابرایە نەهێنیتەوە بۆ لام، چونکە من بیستوومە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (المؤمن يأكل في معاء واحد و الكافر يأكل في سبعة أمعاء)،[3] (باوەڕدار لە یەک ریخۆڵەدا نان دەخوات و بێباوەڕیش لە حەوت ریخۆڵەدا نان دەخوات).

هەریەک لە ئەبووهورەیرە و ئەبوسەعیدی خودری و ئەبی نەضرەی غیفاری و جەهجاهی غیفاری و ئەبوو مووسا و مەیموونەو عەبدوڵای کوڕی عەمر ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە.

ئەم هاوەڵە لە بەیعەتی ریضواندا بەشدار بوو.[4]

[1] صحيح البخاري - كتاب الأطعمة - باب المؤمن يأكل في معى واحد، الرقم ٥٣٩٧.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤٥١.
[3] صحيح البخاري - كتاب الأطعمة - باب المؤمن يأكل في معى واحد، الرقم ٥٣٩٣.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٨.

جەهجاهی غیفاری لە غەزای مورەیسیعدا بەشدار بوو، ئەوەبوو لەگەڵ سینانی کوڕی وەبرەدا لەسەر ئاو کێشەو دەمەقاڵەیەکی بۆ دروست بوو، جەهجاهی غیفاری بە دەستی دای لە سینان، سینان هاواری کرد ئەی پشتیوانان فریا کەون، جەهجاهیش هاواری کرد ئەی قورەیش ئەی کینانە فریا کەون، هەردوولا خێرا هاتن و شمشێریان هەڵکێشا، خێرا بڕێک لە کۆچەران و پشتیوانان قسەی خێریان کرد، سینان وازی هێنا لە مافەکەی خۆی و لێی خۆش بوو و کێشەکە کۆتایی هات.[1]

جەهجاهی غیفاری دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا، لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا جەهجاه تووشی هەڵەیەک بوو، کاتێک خەلیفە عوثمانی کوڕی عەففان وتاری دەدا جەهجاهی کوڕی سەعید هەستا و دارەکەی دەستی لەدەست سەندو بە ئەژنۆی دارەکەی شکاند، خەڵکی هاواریان لێکرد و عوثمانیش لە مینبەر دابەزیە خوارەوە و چوویەوە ماڵەوە و دواتر شەهید کرا، ئەوەبوو ئەژنۆی جەهجاهی غیفاری تووشی نەخۆشی بوو و ساڵێکی بەسەر شەهیدبوونی عوثماندا تێپەڕ نەبوو کە جەهجاهی غیفاری بەو نەخۆشیەشەوە مرد.[2]

ئیسلام وەک چۆن بۆ هەر مەسەلەیەکی ژیان ڕێنمایی و ڕێسای تایبەتی خۆی هەیە وەک لە بواری هاوسەرگیریدا، لە بواری سەربازیدا، لە مەیدانی ئابووریدا...هتد، ڕێنمایی تایبەتیشی هەیە سەبارەت بە شێوازی خواردن و خواردنەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (**ما ملأ آدمي وعاء شرا من بطن بحسب ابن آدم أكلات يقمن صلبه، فإن كان لا محالة فثلث لطعامه وثلث لشرابه وثلث لنفسه**).[3] (ئادەمیزاد هیچ بۆشایی و قاپێکی پڕنەکردووە هێندەی پڕکردنی

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٦٥.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٩.

[3] جامع الترمذي - أبواب الزهد عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء في كراهية كثرة الأكل، الرقم ٢٣٨٠، المستدرک على الصحيحين - كتاب الأطعمة - كان أحب الفاكهة إلى النبي البطيخ ، الرقم ٧٢٣٢، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص، صححه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن

سکی خراپ بێت، ئەوەندە بۆ ئادەمیزاد بەسە چەند پاروویەک بخوات تا پشتی راست راگرێت، ئەگەر هەر چار نەبوو و ویستی زیاتر بخوات ئەوا با سێ یەکی بۆ خواردنی و سێ یەکی بۆ خواردنەوەی و سێ یەکیشی بۆ نەفسی بێت).

## ٦٨٨. جەهدەمە(رضي الله عنها)

ئەم ئافرەتە ناوی جەهدەمەیەو هاوسەری بەشیری کوڕی خەصاصیەیە،[١] ئەم ژنە سێ فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[٢]

## ٦٨٩. جەهر(رضي الله عنه)

ناوی جەهرەو کونیەکەی ئەبووعەبدولایە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدولا کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٣]

جەهر دەڵێت: لە دوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) قورئانم دەخوێند، پێغەمبەریش(ﷺ) کە لای کردەوە فەرمووی: (یا جهر أسمع ربک ولا تسمعنی)،[٤] (ئەی جەهر ئەوە بخوێنە تا خوا بیبیستێت نەک من بیبیستم).

## ٦٩٠. جەهمی کوڕی سەعد(رضي الله عنه)

ناوی جەهمی کوڕی سەعدەو یەکێک بووە لە نووسەرەوەکانی خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، جەهم و زوبەیر هەردووکیان سامانی زەکاتیان تۆمار دەکرد.[٥]

---

الترمذي، الرقم ٢٣٨٠.

[١] أسد الغابة، ج٧، ص ٦٢.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٤.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٢٠.

[٤] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢١٥٧، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٦٢٢.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٢٢.

## ٦٩١. جەهمی کوڕی قەیس(رضي الله عنه)

ناوی جەهمی کوڕی قەیسی کوڕی عەبدشەرحەبیلە و وەک بچووککردنەوەی ناوەکەی بە جوهەیمیش بانگ کراوە،[١] دایکی ناوی روهەیمە بوو و لەو دایکەشیەوە برایەکی هەبوو بە ناوی جوهەیمی کوڕی صەلت،[٢] جەهم یەکێک بووە لەوانەی کە کۆچی کردووە بۆ حەبەشە.[٣]

ژنەکەی ناوی حورەیملەی کچی عەبدولئەسوەد بوو، ئەم ژن و مێردە دوو منداڵیان هەبوو بە ناوەکانی عومەر و خوزەیمە، کاتێک کۆچی دووەمی حەبەشە روویدا ئەم خێزانە هەموویان پێکەوە کۆچیان کرد بۆ حەبەشەو لەوێ حورەیملەی ژنی لە حەبەشە کۆچی دوایی کرد.[٤]

## ٦٩٢. جەهمی کوڕی قوثەم(رضي الله عنه)

ناوی جەهمی کوڕی قوثەمەو وەک وەفد هاتووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).[٥]

مشتومڕێک لەو بارەوە هەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) خوشکەکەی ماریەی پێشکەشی جەهم کردبێت، بۆ ئەوەش واقیدی گێڕانەوەیەکی هێناوە، بەڵام رای زیاتر لەسەر ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) خوشکەکەی ماریەی داوە بە حەسسانی کوڕی ثابت.[٦]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٢١.

[٢] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ١٢٢.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٢١.

[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ١٢٢.

[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٤٥٤.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٢٠.

## ٦٩٣. جرمووزی کوڕی ئەوس(ﷺ)

ناوی جرمووزی کوڕی ئەوسی کوڕی عەبدوڵای کوڕی جەریری هوجەیمیە، دواتر لە بەصرە نیشتەجێ بوو.[١]

جرمووز کوڕێکی هەبوو بە ناوی حارث کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێراوەتەوە.[٢]

جرمووز دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئامۆژگاریم بکە، ئەویش فەرمووی: (أوصیك ألا تكون لعانا)،[٣] (وەسیەتت بۆ دەکەم-ئامۆژگاریت دەکەم-کەسێ نەبیت نەفرەت بکەیت-نەفرەت نەبەخشیتەوە بەرامبەر خەڵک-).

بۆیە جرمووز هەتا ئەو ڕۆژەی وەفاتی کرد نەفرەتی لە یەک کەس نەکرد.[٤]

## ٦٩٤. جوبەیبی کوڕی حارث(ﷺ)

لە فەرموودەیەکدا باسی هاتووە کە دایکی باوەڕداران عائیشە دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: جوبەیبی کوڕی حارث هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: من تەواو تاوانم لەسەر کەڵەکە بووە، ئەویش فەرمووی: (دەی بگەڕێرەوە بۆ لای خوا ئەی جوبەیب)، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من تەوبە دەکەم و دواتر دەگەڕێمەوە سەر تاوانەکە، ئەویش فەرمووی: (دەی هەرکات تاوانت کرد تەوبە بکە)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەی تاوانەکانم زیاد دەبن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (عفو الله أكثر من ذنوبك يا جبيب بن الحارث)، (لێخۆشبوونی خوا زۆر زیاترە لە تاوانەکانی تۆ ئەی

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧١.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٥.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧١، صححه الألباني في صحيح و ضعيف الجامع الصغير و زيادته، الرقم ٤٣٠٧.

[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٧٩.

جوبەیبی کوڕی حارث).[1]

## ٦٩٥. جوبەیری کوڕی حوباب(ﷺ)

ناوی جوبەیری کوڕی حوبابی کوڕی مونذیرە،[2] لە پشتیوانانە.[3]

لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا لە ناو ریزەکانی سوپای عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا لە جەنگی صفیندا بەشداری کرد.[4]

## ٦٩٦. جوبەیری کوڕی مالیک(ﷺ)

ناوی جوبەیری کوڕی مالیکە، بەڵام زیاتر بە جوبەیری کوڕی بوحەینە ناسراوە، بوحەینە دایکی بوو،[5] برایەکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا، ئەم هاوەڵە لە ئەزدیەکانە، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە جەنگی یەمامەدا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[6]

## ٦٩٧. جوبەیری کوڕی موطعیم(ﷺ)

ناوی جوبەیری کوڕی موطعیمی کوڕی عەددی کوڕی نەوفەلی کوڕی عەبدمەنافی قورەیشی نەوفەلیە،[7] سەبارەت بە کونیەکەی دەوترێت ئەبوومحەممەدە، دەشوترێت بەڵکو کونیەکەی ئەبووعەددی بووە.[8]

دایکی ناوی ئوممحەبیبی کچی سەعید بوو، یان دەوترێت دایکی ناوی ئوممو جەمیلی کچی سەعید بوو.[9]

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٦٠٣، أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٥.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٦.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦٠.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٦.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٦.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦٠.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦٢.
[8] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٧.
[9] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦٢.

جوبەیر کوڕێکی هەبوو بە ناوی موحەممەد کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە،[1] کوڕێکی تریشی هەبوو بە ناوی نافع کە ئەویش فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە،[2] هەروەها کچێکی هەبوو بە ناوی ئومموحەبیب.[3]

ژنەکەی جوبەیر ناوی قتیلەی کچی عەمر بوو کە لەم ژنەی موحەممەدی بوو، ژنێکی تریشی هەبوو بە ناوی ئومموقیتالی کچی نافع کە لەم ژنەی نافیعی بوو.[4]

جوبەیر یەکێک بوو لە کەسە ژیر و خانەدانەکانی ناو قورەیش و سەبارەت بە رەچەڵەکی عەرەبیش پرسیاری لێ دەکرا چونکە شارەزایی زۆری هەبوو بە رەچەڵەکی عەرەب.[5]

جوبەیر سەرقاڵی کاری بازرگانی بوو و هەندێ جار کەسی رادەسپارد تا کاری بازرگانی بۆ بکات.[6]

کاتێک بێباوەڕانی قورەیش ماوەی چەند ساڵێک پەیوەندییان لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) و داروەدەستەکەی پچڕاند و لە پەڕەیەکدا ئەوەیان نووسی، جوبەیر لەو ماوەدا بە نهێنی سەردانی پێغەمبەر(ﷺ) و خەڵکەکەی دەکرد و دواتریش یەکێک بوو لەوانەی بەشدار بوو لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو رێککەوتنەدا.[7]

جوبەیر لە جەنگی بەدردا بە بێباوەڕی بەشداری کرد، خۆی دەڵێت: پێش ئەوەی شکست بخۆین شتانێکم دەبینی لە ئاسمانەوە وەک مێروولەی سپی دادەبەزین، گومانم نیە ئەوانە فریشتە بوون.[8]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٨.
[2] أسد الغابة، ج٢، ص ٤٩.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٣٠.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٢٠٥.
[5] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ٩٥.
[6] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ١٦٥.
[7] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ٩٥.
[8] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٢٨٢.

کاتێک جەنگی بەدر تەواو بوو و بەندیەکانی بێباوەڕان لای پێغەمبەر(ﷺ) بوون، جوبەیر هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و سەبارەت بە بەندکراوانی بەدر قسەی لەگەڵ کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لوكان المطعم بن عدي حيا ثم كلمني في هؤلاء النتنى لتركتهم له)، (ئەگەر موطعیمی کوڕی عەددی زیندوو بوایە و سەبارەت بەو بۆگەنانە بیدواندمایە-داوای بکردایە ئازادیان بکەم- ئازادم دەکردن).[1]

جوبەیر کۆیلەیەکی هەبوو بە ناوی وەحشی کە کۆیلەیەکی حەبەشی بوو، کاتێک طوعەیمەی کوڕی عەددی کە مامی جوبەیر بوو لە جەنگی بەدردا کوژرا، جوبەیر پێی وتم: ئەگەر حەمزە بکوژیت ئەوا ئازادت دەکەم،[2] رمێکیشت دەدەمێ کە کەم جار لە وەشاندنیدا هەڵەی پێ کراوە و هەمیشە ئامانج دەپێکێت، ئەوەبوو وەحشی لە جەنگی ئوحوددا حەمزەی شەهید کرد.[3]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە طائیف گەڕایەوە جوبەیر پەنای پێغەمبەری خوای(ﷺ) دا تا طەوافی عومرەی کرد.[4]

سەبارەت بە کاتی موسڵمانبوونی جوبەیر دوو را هەیە، رایەک دەڵێت: پێش فەتحی مەککە موسڵمان بووە، رایەکی تریش دەڵێت: پاش فەتحی مەککە موسڵمان بووە.[5]

بەڵام ذەهەبی دەڵێت: یەکێک بووە لە طولەقاء کە بە چاکی موسڵمان بووە، واتە لە پاش فەتحی مەککە موسڵمان بووە.[6]

جوبەیر دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژی ئێوارەدا سوورەتی (الطور) ی دەخوێند.[7]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب حدثني خليفة، الرقم ٤٠٢٤.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١١.

[3] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص ١٧٥.

[4] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ٩٥.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٨.

[6] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ٩٥.

[7] متفق عليه.

جوبەیر لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)لە غەزای حونەیندا بەشداری کرد، جوبەیر دەڵێ لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووم کە لە حونەین دەگەڕایەوە و خەڵکی لەگەڵیدا بوون، ئەعرابەکان زۆر دەئاڵان بە پێغەمبەرەوە(ﷺ) تا عەباکەی برا، پێغەمبەر(ﷺ) ناچار لای دارێک وەستا و فەرمووی: (أعطوني ردائي، فلو كان عدد هذه العضاه نعما لقسمته بينكم ثم لا تجدوني بخيلا ولا كذوبا ولا جبانا)،[1](عەباکەمم بدەنەوە، ئەگەر بە هێندەی ژمارەی ئەو دارە (عضاه)-جۆرێک داری دڕکاوی گەورە بوو- وشتر بوایە بە دڵنیاییەوە دابەشم دەکرد لەنێوانتاندا و نەشتاندەبینی پیسکە و درۆزن و ترسنۆک بم).

ئەو سێ سیفەتەی پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردن نابێت هەرگیز لە سەرکردەدا هەبن (پیسکەیی، درۆزنی، ترسنۆکی)، چونکە هەر سێیان هۆکاری لەناوچوونی تواناو هێزی سەرکردەو نەمانی متمانەی خەڵکن بە سەرکردەکەیان، کاتێک سەرکردە پیسکە بوو هەمیشە ژێردەستەکانی برسی دەبن، سەرکردە کە درۆزن بوو هاوڵاتیان متمانەیان پێی نامێنێت، سەرکردەش کە ترسنۆک بوو لەسەر ئەو ترسەی بڕیاری خێرای وادەدات کە وڵات بەرەو هەلاکەت و نوشستی دەبات.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) دەستکەوتی غەزای حونەینی دابەش کرد بەسەر تازە موسڵمان بواندا، سەد وشتریشی دا بە جوبەیر.[2]

جارێک جوبەیر لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە ئافرەتەکە جارێکی تر بێتەوە بۆ لای، ئافرەتەکە وتی: ئەی ئەگەر هاتمەوەو تۆم نەبینی؟ وەک ئەوەی بڵێت ئەگەر مردبوویت، ئەویش فەرمووی: (إن لم تجديني فأتي أبابكر)،[3] (ئەگەر منت بەدی نەکرد وەرە بۆ لای ئەبووبەکر).

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب من طلب الولد للجهاد، الرقم ٢٨٢١.

[2] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ٩٦.

[3] صحيح البخاري - كتاب الأحكام - باب الاستخلاف، الرقم ٧٢٢٠.

جوبەیر ژنێکی هێنابوو، بەڵام پێش ئەوەی بیگوازێتەوە تەڵاقی دا، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە (إلا أن يعفون أو يعفو الذي بيده عقدة النكاح)، جوبەیر وتی: جا من لەو شیاوترم بە لێبوردەیی، بۆیە لە هەموو مارەییەکە خۆش بوو بۆ ئافرەتەکە.[1]

جوبەیر دەڵێت: جارێک لەگەڵ عوثمانی کوڕی عەففان چووین بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، عوثمان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تۆ بەخششت داوە بە بەنی موطەللیب و ئێمەت پشتگوێ خستووە، مەگەر ئێمەو ئەوان بۆ تۆ لە یەک ئاستدا نین؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إنما بنو هاشم وبنو المطلب شيء واحد)،[2] (بەراستی بەنووهاشیم و بەنوموطەللیب یەک شتن).

جوبەیر لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا ماوەیەک والی کووفە بوو و پێش ئەوەی موغیرەی کوڕی شوعبە ببێتە والی کووفە جوبەیر لەوێ والی بوو.[3]

جوبەیر دەڵێت: لە کۆتا حەجی عومەری کوڕی خەططابدا بەشدار بووم ، ئێمە لە عەرەفە وەستابووین ... کەسێکی لیهبی دەیوت: بەخوا عومەرساڵێکی تر لەم شوێنەدا ناوەستێت، جوبەیر دەڵێت: منیش چووم و چەند قسەیەکم وت: بەو کابرایە.[4]

رایەک دەڵێت: کاتێک عوثمانی کوڕی عەففان شەهید کرا جوبەیری کوڕی موطعیم نوێژی لەسەر کرد، هەندێکیش دەڵێن بەڵکو حەکیمی کوڕی حیزام بووە، هەندێکیش دەڵێن بەڵکو میسوەری کوڕی مەخرەمە نوێژی لەسەر کردووە.[5]

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٩٨.
[2] صحيح البخاري - كتاب المناقب - باب مناقب قريش، الرقم ٣٥٠٢.
[3] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص ٩٧.
[4] أسد الغابة، ج٤، ص ١٨٥.
[5] أسد الغابة، ج٣، ص ٦١٦.

جوبەیر لە سەردەمی دەوڵەتی ئومەوی و لەساڵی پەنجاو حەوت[1] یان پەنجاو هەشت یان پەنجاو نۆی کۆچیدا وەفاتی کرد.[2]

## ٦٩٨. جوبەیری کوڕی نەوفەل(ﷺ)

ناوی جوبەیری کوڕی نەوفەلەو فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، جوبەیر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ما تقرب عبد إلى الله بأفضل مما خرج منه)،[3] (بەندە بە هیچ شتێک هێندەی ئەوە لە خوا نزیک نابێتەوە کە لێی دەرچووە-واتە قورئان-).

## ٦٩٩. جوبەیری کوڕی ئیاس(ﷺ)

ناوی جوبەیری کوڕی ئیاسی کوڕی خەلدەی کوڕی موخەللەدی کوڕی عامرە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[4] لە غەزای بەدر و ئوحودیشدا بەشداری کرد.[5]

گێڕانەوەی فەرموودەیەک هاتووە کە تیایدا باسی جوبەیر کراوە، ئەویش ئەوەیە کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە حودەیبیە گەڕایەوە، ئەو گەورانەی جوولەکە کە لە مەدینە مابوونەوەو خۆیان بە موسڵمان نیشاندابوو بەڵام دووڕوو بوون هاتن بۆ لای لوبەیدی کوڕی ئەعصەم کە جوولەکە بوو، لوبەید هاوپەیمانی بەنی زریق بوو و جادووگەریش بوو، ئەو جوولەکانە داوایان لە لوبەید کرد تا جادوو بکات لە پێغەمبەر(ﷺ) و بەرامبەر بەوە سێ دیناریان پێدا، ئەویش جادوویەکی ئامادە کرد و دواتر لەناو بیردا داینا، ئیتر باری پێغەمبەر(ﷺ) وای لێهات وای دەزانی شتێکی کردووە کەچی نەشیکردبوو تا

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٨.

[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٩٨.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦٣.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦٠.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٩٢.

ئەوەبوو خوای گەورە ئاگاداری کردەوە کە جادووی لێکراوەو جادووەکەش لە کوێیە، پێغەمبەر(ﷺ) جوبەیری کوڕی ئیاسی بانگ کرد کە یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەدر، شوێنی جادووەکەی لە بیرەکەدا پێ نیشان دا تا بڕوات ئەو جادووە دەربکات، جوبەیر چوو و جادووەکەی دەرکرد، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بە شوێن لوبەیددا و فەرمووی: (چی وایکرد ئەوە بکەیت، وا خوا ئاگاداری کردمەوە لە جادووەکەت و هەواڵی پێدام چیت کردووە)، ئەویش وتی: ئەی ئەبولقاسم خۆشەویستی دینار وایکرد ئەو کارە بکەم.[1]

بەڵام لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا جادووەکەت دەرهێنا؟ فەرمووی: نا، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد و بیرەکە پڕ کرایەوە.[2]

## ٧٠٠. جومیریەی عەصری(رضي الله عنه)

بە جوەیریەی عەصری ناسراوەو دەڵێت: لەگەڵ وەفدی عەبدولقەیس هاتمە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و مونذیرمان لەگەڵدا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو (دوو ئاکارت تێدان کە خوا خۆشی دەوێن، لەسەرخۆیی و نەرمونیانی).[3]

## ٧٠١. جومیریەی کچی حارث(رضي الله عنها)

ناوی جوەیریەی کچی حارثی کوڕی ئەبی ضیراری خوزاعی موصطەلەقیە،[4] جوەیریە دایکی باوەڕداران و ژنی پێغەمبەری خوایە(ﷺ). جوەیریە برایەکی هەبوو بە ناوی عەمر کە ئەویش دواتر موسڵمان بوو

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٩٧.
[2] صحيح البخاري - كتاب الطب - باب السحر، الرقم ٥٧٦٣.
[3] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٥٥٦.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٥.

و فەرموودەشی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[١]

ئەم ئافرەتە ژنی موسافیعی کوڕی صەفوان بوو کە لە غەزای مورەیسیعدا کوژرا، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە غەزای مورەیسیعدا هێرشی بردە سەر بەنیلموصطەلەق جوەیریە بە کەنیزەک گیرا، بوو بە پشکی ثابتی کوڕی قەیس.[٢]

جوەیریە دەڵێت: کاتێک سوپاکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەرەو روومان هات، باوکم وتی: وا سوپایەکی بێ سەر و بن هات، منیش سوپایەکم بەرچاو دەکەوت کە لە زۆریدا لەباس نەدەهات، کەچی کاتێک موسڵمان بووم و پێغەمبەر(ﷺ) بەهاوسەری گرتم و موسڵمانانم بینی زانیم ئەوە هەمووی ترس و شکۆیەک بوو کە خوا بەخشیبووی بە موسڵمانان.[٣]

جوەیریە دەڵێت: سێ شەو پێش ئەوەی موسڵمانان هێرش بێنن بۆمان خەوم بینی مانگ لە مەدینەوە هات و کەوتە ناو ژوورەکەمەوە، بەڵام حەزم نەکرد ئەو خەوە بۆ کەس بگێڕمەوە.[٤]

جوەیریە ئافرەتێکی زۆر جوان و خوێن شیرین بوو و هەرکەس بیبینیایە دڵی دەچوویە سەری.[٥]

جوەیریە بۆ ئەوەی نەبێتە کۆیلەی ثابت هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و داوای یارمەتی کرد، دایکمان عائیشە دەڵێت: سوێند بەخوا هەر کە بینیم رق بەرامبەری دایگرتم، جوەیریە کە هاتە ژوورەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من جوەیریەی کچی حارثم کە گەورەی هۆزەکەی خۆیەتی، دەبینیت تووشی چی بوم، جا من لەگەڵ ثابت پەیمانی خۆکڕینەوەم داوە، دەی یارمەتیم بدە تا خۆم بکڕمەوەو خۆم ئازاد بکەم، پێغەمبەریش(ﷺ)

---

[١] صحيح البخاري، الرقم.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٥-٥٦٦.

[٣] تأريخ الإسلا للذهبي، ج٢، ص ٢٦٠.

[٤] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٥٩.

[٥] الطبقات الكبرى، ج٨ ص ١١٦.

فەرمووی: (ئایا لەوە چاکترت پێ ببەخشم و بە هاوسەرت بگرم؟) ئەویش وتی: بەڵێ، ئەوەبوو پێغەمبەریش(ﷺ) وایکرد، ئینجا خەڵکی بیستیانەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) جوەیریەی بەهاوسەر گرتووە وتیان: چۆن دەکرێت خزمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لای ئێمە کۆیلەو کەنیزەک بن، بۆیە چی کۆیلەو کەنیزەکی بەنیلموصطەلەقیان لا بوو هەموویان ئازاد کردن، بەوە بەهۆی ئەم ئافرەتەوە خوای گەورە نزیکەی سەد ماڵی بەنیلموصطەلەقی ئازاد کرد. [1]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) جوەیریەی بە هاوسەر گرت باوکی جوەیریە هات و وتی: کچی وەک کچی من نابێت بە کەنیزەک بگیرێت، دەی وازی لێ بهێنەو ئازادی بکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پێت چۆنە من جوەیریە خۆی سەرپشک بکەم بۆ بڕیاردان؟ باوکی پرسیاری کرد لە جوەیریە هاتنەوەت پێ باشە یان مانەوە؟ جوەیریە لە وەڵامدا وتی: من خواو پێغەمبەرم(ﷺ) هەڵبژاردووە.[2]

جوەیریە دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) بەهاوسەری گرتم من تەمەنم بیست ساڵان بوو.[3]

جارێک پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ لای جوەیریەو ڕۆژی هەینی بوو و ئەوکات جوەیریە بەڕۆژوو بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا دوێنێ بەڕۆژوو بوویت؟ وتی: نا، فەرمووی: بەیانیش ڕۆژوو دەگریت؟ وتی: نا، فەرمووی دەی ڕۆژووەکەت بشکێنە.[4]

سەرەتا ناوی بەڕرە بوو و پێغەمبەر(ﷺ) ناوی گۆڕی بە جوەیریە.[5]

---

[1] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٦٣.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٦.

[3] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ١٩٠.

[4] صحيح البخاري – كتاب الصوم – باب صوم يوم الجمعة، الرقم ١٩٨٦.

[5] صحيح ابن حبان – كتاب الحظر والإباحة – باب الأسماء والكنى – ذكر خبر ثان قد يوهم من لم يحكم صناعة العلم أنه مضاد للأخبار التي ذكرناها قبل، الرقم ٥٨٢٩.

جوەیریـە زۆر جـار سـەرقاڵی پەرسـتش و خواپەرسـتی بـوو، جارێـک پێغەبمەر(ﷺ) دای بە لای جوەیریەدا بینی سـەرقاڵی نزاکردنە، دوای ماوەیەکی تـر هەمـدی دای بـە لایدا تەماشـای کـرد سـەرقاڵی پەرستشـە، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: هێشـتا سـەرقاڵیت بـەو حاڵەتـەوە؟ (سـەرقاڵی نـزا کردنیت؟) وتـی: بەڵێ، فەرمـووی: (لقد قلت بعدك أربع كلمات ثلاث مرات، لو وزنت بما قلت منذ اليوم لوزنتهن: سبحان الله وبحمده، عدد خلقه ورضا نفسه وزنة عرشه ومداد كلماته)،[1] (مـن دوای تـۆ سـێ جـار چـوار وشـەم وت: ئەگـەر کێشـانە بکرێن لەگـەڵ ئـەوەی ئەمـڕۆ تـۆ دەتوتـن قورسـایی ئـەوەی تۆیـان دەبێـت: سبحان الله وبحمده ، عدد خلقه ورضا نفسه وزنة عرشه ومداد كلماته).

سـەبارەت بـە کاتـی مردنـی جوەیریـە ڕاجیایـی هەیـە، ڕایـەک دەڵێـت: لـە سـاڵی پەنجـای کۆچیـدا وەفاتـی کـردووە، ڕایەکـی تریـش دەڵێـت: لـە مانگـی ڕەبیعولئەوەلـی سـاڵی پەنجـاو شـەش کۆچیـدا وەفاتـی کـرد، دەوترێـت کاتێـک وەفاتـی کـردووە تەمەنـی شەسـت و پێنـج سـاڵ بـوو،[2] مەڕوانـی کـوڕی حەکەمیـش نوێـژی لەسـەر کـرد.[3]

## ٧٠٢. جومیریەی کچی ئەبووجەهل(ﷺ)

نـاوی جوەیریـەی کچـی ئەبووجەهلـی کـوڕی هیشـامە، دایکـی نـاوی ئـەروای کچـی عەیصـە، جوەیریە موسـڵمان بوو و بەیعەتـی دا بە پێغەمبـەر(ﷺ).[4]

عەلـی کـوڕی ئەبووطالیب کاتێـک کـە فاطیمـەی کچـی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ژنـی بـوو، چـووە داوای جوەیریـەی کچـی ئەبووجەهـل، بەنوموغیـرە بـۆ ئـەو مەسـەلەیە هاتـن داوای مۆڵەتیـان کـرد لـە پێغەمبـەر(ﷺ)، پێغەمبەریـش(ﷺ)

---

[1] صحيح مسلم - كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار - باب التسبيح أول النهار وعند النوم، الرقم ٢٧٢٦.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٦.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد ، ج٨، ص ١٢٠، تاريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ١٩٠.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢٦٢.

مۆڵەتی نەدان و فەرمووی: (فاطیمە بەشێکە لە من و ئەو شتەی ئەو ئازار دەدات منیش ئازار دەدات).[1]

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەخوا کچی پێغەمبەری خوا و کچی دوژمنی خوا لای یەک پیاو کۆ نابنەوە)، عەلی کوڕی ئەبووطالیب کە ئەمەی بیست کشایەوە و نەیهێنا.[2]

دواتر عیتابی کوڕی ئەسید چووە داوای جوەیریەو بەهاوسەری گرت،[3] لەم مێردەی کوڕێکی بوو بە ناوی عەبدوڕەحمان.[4]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە (إِنَّ فَاطِمَةَ مِنِّي ، وَأَنَا أَتَخَوَّفُ أَنْ تُفْتَنَ فِي دِينِهَا ثُمَّ ذَكَرَ صِهْرًا لَهُ مِنْ بَنِي عَبْدِ شَمْسٍ ، فَأَثْنَى عَلَيْهِ فِي مُصَاهَرَتِهِ إِيَّاهُ . قَالَ : حَدَّثَنِي فَصَدَقَنِي ، وَوَعَدَنِي فَوَفَّى لِي ، وَإِنِّي لَسْتُ أُحَرِّمُ حَلَالًا ، وَلَا أُحِلُّ حَرَامًا ، وَلَكِنْ وَاللهِ لَا تَجْتَمِعُ بِنْتُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبِنْتُ عَدُوِّ اللهِ أَبَدًا)[5]

## ٧٠٣. جومینی کوڕی نابیغە(ﷺ)

ناوی جوەینی کوڕی نابیغەیە، هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، دواتر کۆچی کرد بۆ شام و لەوێ لەگەڵ سەرکردەکاندا بوو، دواتر لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیاندا گەڕایەوە بۆ ناوچەی هۆزەکەی خۆی.[6]

## ٧٠٤. جودەی کوڕی موورە(ﷺ)

ناوی جودەی کوڕی موورەی کوڕی سوراقەی بەلویە، هاودەم بە باوکی لە غەزای خەیبەردا بەشداری کرد و هەردووکیان لەو غەزایەدا شەهید بوون.[7]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢٦٢.
[2] صحيح البخاري - كتاب فضائل الصحابة - باب ذكر أصهار النبي(ﷺ)، الرقم ٣٧٢٩.
[3] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٥٣١.
[4] أسد الغابة، ج٣، ص ٤٨٧.
[5] صحيح البخاري - كتاب فرض الخمس - باب ما ذكر من درع النبي، الرقم ٣١١٠.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٢٦.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦٩.

## ٧٠٥. جودمیع(رضي الله عنه)

ناوی جودەیعی کوڕی سەبرەیەو لە فەتحی میصردا بەشداری کرد،[١] بەڵام ئیبن ئەثیر بە جوذرە ناوی هێناوە.[٢]

## ٧٠٦. جودمیعی کوڕی نوذمیر(رضي الله عنه)

ناوی جودەیعی کوڕی نوذەیری موڕادی کەعبیە، یەکێک بوو لە خزمەتکارەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام گێڕانەوەی لێوە تۆمار نەکراوە.[٣]

## ٧٠٧. جودمیمەی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

ناوی جودەیمەی کوڕی عەمری عەصریە، یەکێک بووە لە ئەندامانی وەفدی عەبدولقەیس.[٤]

## ٧٠٨. جوذامەی کچی جەندەل(رضي الله عنها)

ناوی جوذامەیەو کچی جەندەلە،[٥] ئیبن ئەثیر دەڵێت: ناوی جودامەیە،[٦] یان دەوترێت کچی وەهبە، لە دەستەی یەکەمینی موسڵمانبوانی ناو مەککە بوو، کۆچی کرد بۆ مەدینە.[٧]

جوذامە ژنی ئونەیسی کوڕی قەتادەی ئەوسی بوو، ئەو پیاوە ژنێکی تریشی هەبوو بە ناوی خەنسائی کچی خذام، ئەم پیاوەش لە غەزای

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦٨.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٢.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٢.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦٩.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥١.
[٦] أسد الغابة، ج٧، ص ٥٣.
[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥١

ئوحـوددا شـەهید بـوو.[1]

جوذامە فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[2]

## ٧٠٩. جورمیجی ئیسرائیلی(رضي الله عنه)

نـاوی جورەیجـە و سـەرەتا جوولەکـە بـووو موسـڵمان بـووەو چوویـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا(ﷺ).[3]

ئیبن ئەثیریش نـاوی هاوەڵێکی هێنـاوە بـە نـاوی جورەیج کـە کونیەکـەی ئەبووشـاتەو کوڕی سـەلامەی کوڕی ئەوسـە و دەڵێت: لـە بەیعەتی عەقەبـەدا بەشـدار بـوو و تیایـدا بەیعەتی داوە بـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ).[4]

## ٧١٠. جوعالی حەبەشی(رضي الله عنه)

ئـەم هاوەڵـە حەبەشـی بـوو، هەرچەنـدە ئەبوموسـا دەڵێـت: نازانـم ئـەوە جوعالـی کـوڕی سـوراقەیە یـان جوعالێکـی جیـاوازە، بـەڵام هەریـەک لـە ئیبـن ئەثیـر و ئیبـن حەجـەر بـە جیـا لـە جوعالـی کـوڕی سـوراقەی دەزانـن.

ئیبـن حەجـەر دەڵێـت: صەففـار لـە کتـاب الانسـابدا وتوویەتـی حەبەشـی بـووە.[5]

ئیبـن ئەثیریش دەڵێـت: ئەمەیـان لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا(ﷺ) کـوژراوە، بـەڵام جوعالی کـوڕی سـوراقە دواتر فەرموودەی لێوە بیستراوە، واتـە دوای پێغەمبـەر(ﷺ) وەفاتـی کـردووە.[6]

ئیبـن عومـەر دەڵێـت: کەسـێک هـات بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ) و وتـی: ئـەی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥١.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢٤٣.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٧٤.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠٨.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٨٢.
[6] أسد الغابة، ج١، ص ٤١٧.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر من لەبەردەستتدا بجەنگم تا دەکوژرێم ئایا پەروەردگارم دەمخاتە بەهەشتەوەو بە کەمم ناگرێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ)، ئەویش وتی: ئەی چۆن وا دەبێت لە کاتێکدا من بۆنم ناخۆشەو رەنگم رەشە و بنەماڵەم هیچ نیە، کابرا چوو جەنگا تا شەهید بوو، پێغەمبەر(ﷺ) دای بە لای تەرمەکەیدا و فەرمووی: (الآن طيب الله ريحك يا جعال وبيض وجهك)،[1] (ئەی جوعال ئێستا خوا بۆن خۆش و رووسپی کردیت).

## ٧١١. جوعالی کوڕی سوراقە(رضي الله عنه)

ناوی جوعالە، یان دەوترێت ناوی جوعەیلە،[2] کوڕی سوراقەیە، هاوەڵە لە غیفاریەکانە، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو لە ضەمریەکانە،[3] ئیبن حەجەر رای راستتر بەوە جیا دەکاتەوە کە لەوانەیە ئەوە دوو هاوەڵی جیاواز بووبن و یەکێکیان غیفاری بێت و ئەوی تریان ضەمری بێت، چونکە لە غەزای بەنیلموصتەلەقدا پێغەمبەر(ﷺ) جوعالی ضەمری لەسەر مەدینە دانا، هەروەها جوعالێکی تریش لە غەزاکەدا بەشداری کردووە.[4]

جوعال دەموچاوێکی ناشیرینی هەبوو، لە موسڵمانبووە یەکەمینەکان بوو و لە ئەهلی صوففەش بوو، لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو.[5]

جوعال دەڵێت: کاتێک بەرەو غەزای ئوحود دەچووین وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێم وترا تۆ سبەینێ دەکوژرێیت، ئینجا جوعالی کوڕی سوراقە لەگەڵیشیدا ئاهی هەڵدەکێشا، پێغەمبەریش بە دەستی دای بەسەر سنگیدا و فەرمووی: (أوليس الدهر كله غدا)،[6] (مەگەر هەموو زەمانەو ژیان سبەینێ

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٤١٧.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤١٦.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٤٥.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٨١.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٤١٦.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٤٥.

ناکات؟) واتە سبەینێ بەیانی ناکات و تا ڕۆژی دوایی سبەینێ دەگریتەوە.

هەروەها جوعال لە غەزای خەندەقیشدا بەشداری کردو لەگەڵ موسڵماناندا سەرقاڵی هەڵکەندنی خەندەقەکە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) لەو ڕۆژەدا ناوی گۆڕی بە عومەر، موسڵمانانیش دەیانوت خۆی ناوی جوعەیل بوو ناوی نا عومەر، ئەویش خۆی لەگەڵ موسڵمانان دەیوتەوەو پێدەکەنی.[1]

بەڵام دیارە ئەم ناوگۆڕینە بۆ ئەوە نەبووە ئیتر ناوەکەی تری جوعال نەمێنێت، بەڵکو وەک ناوێکی زیادە بووە، چونکە دەبینین دوای ئەو غەزایەش جوعال یان جوعەیل هەر بەو ناوانەی خۆی بانگ کراوە وەک چۆن لە غەزای خەیبەر و تەبووکیشدا کە باسی کراوە هاوەڵان و پێغەمبەریش(ﷺ) هەر بە جوعال و جوعەیل ناویان بردووە، واتە مەرج نیە پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نابێت لە هەر کەسێک ئیتر ناوەکەی تری نەمابێت، بەڵکو ئەگەر ناوی پێشووی ناشیرین بووبێت ئەوە ئەو ناوەی نەماوە، ئەگەریش واتاکەی ئاسایی بووبێت هەندێ جار ئەو ناوەشی ماوەتەوە وەک ئەمەی جوعال، هەندێ جاریش هاوەڵە ناولێنراوەکە لە خۆشی فەرمایشتی پێغەمبەر(ﷺ) هەر ناوە پێشووەکەی خۆی بە یەکجارەکی وازلێهێناوە.

جوعال لە هەموو غەزاکانی تردا بەشداری دەکرد و لە غەزای خەیبەریشدا بەشداری کرد، لە غەزای بەنی قورەیضەشدا بەشداری کرد و لەو غەزایەشدا چاوێکی لەدەستدا.[2]

لە غەزای بەنیلموصتەلەقدا کە لە شەعبانی ساڵی شەشەمی کۆچیدا ڕوویدا، پێغەمبەر(ﷺ) جوعالی کوڕی سوراقەی لە مەدینە هێشتەوە تا لەکاتی ڕۆیشتنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەو غەزایە بەرپرسیارێتی ئەوێ بگرێتە ئەستۆ، لە هەمان کاتدا هاوەڵێکی تر هەبوو بە ناوی جوعالی کوڕی سوراقە

---

[1] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٤، ص ٢٤٦.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤١٦.

که لەو غەزایەدا بەشداری کرد.[1]

لە غەزای ذاتوریقاعیشدا بەشداری کرد و کاتێک بڕیار بوو بگەڕێنەوە، پێغەمبەر(ﷺ) جوعالی بە نوێنەر نارد تا زوو مزگێنی سەلامەتی پێغەمبەر(ﷺ) بدات بە خەڵکی مەدینە.[2]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) جارێک دەستکەوتی دابەش دەکرد کەسێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تۆ سەد وشترت دا بە ئەقرەعی کوڕی حابیس و عویەینەی کوڕی حوصەین، کەچی هیچت نەدا بە جوعەیل(جوعال)، ئەویش فەرمووی: (والذي نفسي بيده لجعيل خير من طِلَاع الأرض كلهم مثل عيينة والأقرع ولكني تألفتهما ليسلما ووكلت جعيلاً إلى إسلامه)،[3] (سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە جوعەیل زۆر باشترە لە پڕی دنیا نموونەی عویەینەو ئەقرەع، بەڵام من دڵی ئەو دوانەم ڕاگرت تا موسڵمان بن و جوعەیلیشم ڕاسپارد بە موسڵمانێتیەکەی).

ئەو غەزایەش غەزای خەیبەر بوو و ئەو کەسەش کە ئەو پرسیارەی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بوو.[4]

ئەبووذەر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکردم جوعەیل چۆن دەبینیت؟ وتم: وەک ئەو خەڵکەی تر هەژارە، فەرمووی: ئەی فڵانەکەس چۆن دەبینیت؟ وتم: گەورەیەکی ناو خەڵکە، فەرمووی: (دەی جوعەیل چاکترە لە پڕی ئەم دنیا نموونەی ئەو کەسە)، ئەبووذەر دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فڵانەکەس کە وایە بۆ وا چاکەی لەگەڵ دەکەیت؟ فەرمووی: ئەو گەورەی هۆزەکەیەتی و من دڵیان ڕادەکێشم.[5]

هەروەها جوعال لە غەزای تەبووکیشدا بەشداری کرد، عیرباضی کوڕی ساریە بەسەرهاتی خۆی لەگەڵ جوعال دەگێڕێتەوەو دەڵێت: من لە هەموو

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٨١.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٤٦.

[3] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٩٣٣.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٤٦.

[5] حلية الأولياء لأبي نعيم الأصبهاني، ج١، ص ٣٥٣.

کات لەبەر دەرگای ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) دەبووم هەم لە ماڵەوەو هەم لە سەفەریش، شەوی تەبووک پێغەمبەر(ﷺ) ویستی بچێتە ناو خێوەتەکەی و ئوممومسەلەمەی خێزانیشی لەگەڵدا بوو، من بۆ پێویستیەک چووبووم و هاتمەوە، کە هاتمە خزمەتی فەرمووی: (لە شەوەوە لە کوێ بوویت؟) منیش مەسەلەکەم بۆ باس کرد، جوعالی کوڕی سوراقەو عەبدوڵای کوڕی موغەففەلی موزەنی و من هەرسێکمان تەواو برسی بووین و لەبەر دەرگای ماڵی پێغەمبەریش(ﷺ) دەژیاین، پێغەمبەر(ﷺ) چوویە ژوورەوە تا شتێکمان بۆ بهێنێت بیخۆین، کەچی هیچی شک نەبرد و هیچیان نەبوو، بۆیە هاتە دەرەوەو بیلالی بانگ کرد و فەرمووی: هیچ خواردنێ نیە بۆ ئەم چەند کەسە؟ بیلال وتی: سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە کۆڵەکانمان تەکاندون هیچیان تێدا نیە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سەیرێ بکەرەوە بەڵکو شتێک پەیدا بکەیت، ئەویش یەک یەک توێشووەکانی دەتەکاند تا یەک دوو خورمایەک کەوتن تا حەوت خورمای کۆکردەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) داوای قاپێکی کرد و خورماکانی خستە ناوی و دەستی لەسەر خورماکان داناو ناوی خوای لێ هێنا و فەرمووی: (بە ناوی خواوە بخۆن)، ئێمە لێمان خوارد، من پەنجاو چوار خورمام ژمارد کە ناوکەکەشیان لە دەستەکەی ترمدا بوو و دوو هاوڕێکەشم هەروایان دەرکد، هەرکاممان پەنجا خورمای خوارد و تێر بووین، کە دەستمان لادەبرد حەوت خورماکە هەروەک خۆیان بوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (یا بلال ارفعها فإنه لا یأکل منها أحد إلا نهل منها شبعا)، (ئەی بیلال هەڵیانگرە چونکە هەرکەس لێیان بخوات تێر دەبێت)، ئینجا ئێمە لای خێوەتەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بووین و ئەویش شەونوێژی دەکرد، دواتر نوێژی سوننەتی کرد، ئینجا بیلال بانگی فەرموو و پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی کرد بۆ خەڵکەکەو دواتر گەڕایەوە بەرەو لای خێوەتەکەی‌و دانیشت و ئێمەش لە دەوری دانیشتین، پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری نانی بەیانی لێکردین،

منیش لە دڵی خۆمدا وتم: نانی بەیانی چی؟ ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) داوای کرد لە بیلال خورماکان بهێنێت، ئەویش خورماکانی هێنا، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) خورماکانی خستە ناو قاپەکەو دەستی خستە سەر خورماکان و فەرمووی: بخۆن بە ناوی خواوە، سوێند بەخوا دەکەس بووین تێرمان خوارد، ئینجا دەستمان هەڵگرت دەبینین خورماکان وەک خۆیان ماونەتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لولا أني أستحي من ربي لأكلنا من هذه التمرات حتى نرد المدينة من آخرنا)، (ئەگەر لەبەر شەرمم لە پەروەردگارم نەبوایە لەو خورمایانەمان دەخوارد تا دواجار هەموومان دەگەڕاینەوە مەدینە)، ئینجا مێردمنداڵێک هات، پێغەمبەر(ﷺ) خورماکانی دا بەو مێردمنداڵەو ئەویش خورماکانی دەمژی.[1]

**پەندو وانە**

ڕێزو گەورەیی لای خوای گەورە بە پلەو پایەو ناوبانگ نیە، یان بە ئاستی ڕێزی ئەو کەسە لای خەڵک نیە، بەڵکو تاکە ڕێز و پلەبەرزی لای خوای گەورە بریتیە لە ئاستی تەقوا، هەر بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو وانەی فێری هاوەڵان کرد کە هەموو سەر زەوی پڕ بێت لە نموونەی کەسانێکی ئیمان لاوازی لای خەڵک ڕێزلێگیراو هێندەی هەژارێکی دەموچاوناشیرینی لەخواترس بەهایان نیە، بەڵکو تەنها جوعال بەرامبەر ملیارەها ئیمان لاوازی دڵراگیرکراو لای خوا گەورەترە.

هەروەها ئەوەش فێر دەبین کە پشکی دنیا پێوەر نیە بۆ خەڵات کردنی کەسێک، دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) بە سەد وشتری دەدا بە تازە موسڵمان بوان، کەچی هیچی نەدا بە جوعال کە لەخواترسێکی هەژار بوو، هەروەک پێغەمبەر(ﷺ) لە حونەینیشدا دەستکەوتەکانی دا بە تازە موسڵمانبوانی مەککەو پشتیوانانی بێبەش کرد، لە هەردوو بارەکەدا موسڵمانان خۆیان نەگرت و ئەوەیان پێ نائاسایی بوو، بۆیە پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ)،

[1] دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٤٣٤، تاريخ دمشق لابن عساكر، ج٤٠، ص ١٨٩، البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ١١٨.

لـە وەڵامـدا پێغەمبـەر(ﷺ) بـە پشـتیوانانی فەرمـوو ئێـوەش ئـەو سـامانەتان دەوێـت یـان پێغەمبـەری خواتـان دەوێـت لەگەڵتـان بێتـەوە؟ هەروەهـا بـە هاوەڵانی فەرموو ئەگەر ئەوەم داوە بەو کەسانە ئەوا جوعەیل گەورەترە لە پڕی دنیا لـە نموونـەی لەوانـەو ئیمـان و موسڵمانێتیم هێشتوەتەوە بۆ جوعال.

هەروەهـا ئـەوەش وەردەگرین کە پێغەمبـەر(ﷺ) تەنانـەت لـە کاتی سـەفەرو لە غەزاکانیشدا شـەونوێژی لەبیر نەکردووە، ئـەوەش وانەیەکە بۆ موسڵمان تـا بزانێت خۆپەروەردەکردنی شـەو زۆر گرنگەو دەبێت تاکی موسڵمان بە گشتی و تاکی بانگخواز بە تایبەتی بەردەوام گرنگی بدات بە شـەونوێژ.

## ٧١٢. جوعشـەمولخـەیر(ﭬ)

نـاوی جوعشـەمولخەیری کوڕی خولەیبـەی کوڕی شـاجی کوڕی مەوهیبی صـەدەفـی حورەیمیـە، یەکێـک بـوو لـە بەشـداربوانی بەیعەتـی ڕیضـوان، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) جلەکـەی خـۆی کـردە بـەری و نەعلەکانـی خـۆی پێدا و لـە قـژی خۆیشـی پێدا.[1]

جوعشەمولخەیر ئامینەی کچی طلیقی بەهاوسەرگرت.[2]

جوعشـەمولخەیر دوای سـەردەمی پێغەمبـەر(ﷺ) ژیـاو لە سـەردەمی فەتحی میصـردا بەشداری کرد.[3]

## ٧١٣. جولاسی کوڕی صولەیت(ﭬ)

نـاوی جولاسـی کـوڕی صولەیتی یەربووعیە، کچێکی هەبوو کە ناسـرابوو بـە ئوممومونقیذ فەرمـوودەی لـە باوکیـەوە گێڕاوەتەوە،[4]کـوڕان و نەوەکانـی

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٤١٩.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٧٧.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٨٤.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٩٤.

جولاس خزمەتێکی گەورەیان پێشکەش بە ئیسلام کرد.[1]

جولاس چوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و سەبارەت بە دەستنوێژ پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد.[2]

## ٧١٤. جولاسی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

ناوی جولاسی کوڕی عەمری کیندیە، جولاس دەڵێت: لەگەڵ دەستەیەک لە هۆزەکەم لە کیندە هاتین بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێک ویستمان بگەڕێینەوە بۆ ناوچەی خۆمان پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئامۆژگاری کردین (إن لكل ساع غاية وغاية ابن آدم الموت)،[3] (هەموو هەوڵدەرێک پێگەیشتنێکی هەیە، پێگەیشتنی ئادەمیزادیش مەرگە).

ئیبن حەجەر دەڵێت: سەنەدی فەرموودەکە لاوازە.[4]

جولاس فەرموودەی لە ئەبووهورەیرەوە گێڕاوەتەوە.[5]

جولاس دەڵێت: عومەری کوڕی خەططاب ڕۆژی هەینی دەستنوێژی گرت و لەسەر گوێرەوی و نەعلەکانی مەسحی کرد.[6]

## ٧١٥. جولەیحەی کوڕی عەبدولا(رضي الله عنه)

ناوی جولەیحەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی موحاریبە، یەکێک بوو لە بەشداربوانی غەزای طائیف و لەو غەزایەشدا شەهید بوو.[7]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٩٤.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤٢٨.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤٢٨.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٩٥.
[5] مسند الشاميين للطبراني، الرقم ٨٨٩.
[6] مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ١٩٥٧.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٩٦.

## ٧٧٦. جوللاسی کوڕی سوەید(ﷺ)

ناوی جوللاسی کوڕی سوەیدی کوڕی صامیتی کوڕی خالیدەو لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[١] سەرەتا لە دووڕووەکان بوو و پاشان تەوبەیەکی دروست و تەواوەتی کرد.[٢]

جولاس لە جەنگی تەبووکدا[٣] دەیوت: ئەگەر ئەوەی موحەممەد دەیڵێت حەق بێت ئەوە ئێمە لە گوێدرێژ خراپترین، عومەیر کە لەوێ بوو وتی: سوێند بەخوا ئەوەی ئەو دەیفەرموێت حەقەو ئێوەش لە کەر کەمترن، ئینجا ئەو مەسەلەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد، جولاس هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و حاشای کرد لەو قسەو سوێندی خوارد وای نەوتووە، خوای گەورە ئایەتی لەو بارەوە دابەزاند(يحلفون بالله ما قالوا ولقد قالوا كلمة الكفر وكفروا بعد إسلامهم)، ئینجا جولاس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو ڕاست دەکات و من ئەوەم وت، خوای گەورە تەوبەو گەڕانەوەی بۆ خستوومەتەڕوو، من لەوەی وتم: لای خوا تەوبە دەکەم.[٤]

## ٧٧٧. جومانەی کچی حەسەن(ﷺ)

ناوی جومانەی کچی حەسەنەو لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) لەدایک بوو و حوذەیفەی کوڕی یەمان ئەم ئافرەتەی بەهاوسەرگرت.[٥]

## ٧٧٨. جومانەی کچی ئەبووطالیب(ﷺ)

ناوی جومانەی کچی ئەبووطالیبە، ئەم ئافرەتە شووی کرد بە ئەبووسوفیانی کوڕی حارث و عەبدوڵای لێ بوو، جومانە خوشکی

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٤٢٧.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٩٣.

[٣] مصنف عبدالرزاق الصنعاني، الرقم ١٧٦٤١.

[٤] تأريخ المدينة لابن أبي شبة، الرقم ٦٥٢.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٧.

ئومموهانیئیش بوو، پێغەمبەر(ﷺ) لە دەستکەوتی فەتحی خەیبەردا پشکی سی کۆڵ خواردنی بۆ جومانە بڕیەوە.[1]

دایکی جومانە ناوی فاطیمەی کچی ئەسەد بوو.[2]

هەروەها کوڕێکی هەبوو بە ناوی جەعفەر.[3]

## ٧١٩. جومەیلی کچی یەسار(رضي الله عنها)

ناوی جومەیلی کچی یەسارە، خوشکی مەعقیلی کوڕی یەسارە.[4]

مەعقیلی کوڕی یەساری موزەنی دەڵێت: من خوشکێکی خۆم لە پیاوێک مارە کرد، ئەویش تەڵاقی دا، کە عیددەی خوشکەکەم تەواو بوو کابرا هاتەوەو خوازبێنی کردەوە، منیش پێم وت: خوشکەکەمم لێ مارە کردیت و رێزم لێنایت کەچی تۆ تەڵاقت دا، ئێستایش هاتوویتەتەوەو هەمتر خوازبێنی دەکەیت؟ نا سوێند بەخوا جارێکی تر نایبینیتەوە، ئەو کابرایش کابرایەکی خراپ نەبوو، ئافرەتەکەش دەیویست بچێتەوە بۆ لای، ئەوەبوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند(فلا تعضلوهن أن ينكحن أزواجهن....) منیش چووم و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێستا رازیم، ئەوەبوو خوشکەکەمم مارە کردەوە لێی.[5]

## ٧٢٠. جومەیمەی کچی حومام(رضي الله عنها)

ناوی جومەیمەی کچی حومامی کوڕی جەمووحە، ئەم ئافرەتە لە پشتیوانانەو یەکێکە لەوانەی کە بەیعەتیان دا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ).[6]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٥٣.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ١٢٢.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤٢٠.

[4] أسد الغابة، ج٧، ص ٥٧.

[5] صحيح البخاري - كتاب النكاح - باب من قال لا نكاح إلا بولي، الرقم ٥١٣٠.

[6] أسد الغابة، ج٧، ص ٦٢.

## ٧٢١. جوناده(رضي الله عنه)

سەبارەت بە رەچەڵەکی ئەم هاوەڵە زانیاری نیە، بەڵام ناوی لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە تیایدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) نامەی نووسیوە بۆ جەنادە، نامەکەش بەم جۆرەیە (ئەمە نووسراوی موحەممەدی پێغەمبەری خوایە بۆ جەنادەو هۆزەکەی و ئەوانەی شوێنی کەوتون بە نوێژبەجێگەیاندن و زەکات دان، وە ئەوەش گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بێت ئەوە پەنای خوا و پەنای پێغەمبەرەکەی بۆ هەیە).[1]

بەپێی ئەو زانیاریەی کە ئیبن سەعد هێناویەتی جونادە ئەزدی بووە، چونکە ئەو نامە دێنێ کە پێغەمبەر(ﷺ) نووسیویەتی و دەڵێت: بۆ جەنادەی ئەزدی نووسیوە.[2]

## ٧٢٢. جونبوذی کوڕی سەبع(رضي الله عنه)

ناوی جونبوذی کوڕی سەبع یان کوڕی سەبوعەو کونیەکەی ئەبوو جومعەیە.[3]

جونبوذ دەڵێت: دەمەو بەیانی ڕۆژ بێباوەڕ بووم و دژ بە پێغەمبەر(ﷺ) دەجەنگام، کەچی دەمەو ئێوارەکەی بە موسڵمانی لە ڕیزی سوپای پێغەمبەردا(ﷺ) دەجەنگام، ئێمە سێ پیاو و شەش ژن بووین-کە موسڵمان بووین- ئەم ئایەتەش لەسەر ئێمە دابەزی(لولا رجال مؤمنون ونساء مؤمنات...)،[4] لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە دەڵێت: ئێمە نۆ کەس بووین، حەوت پیاو و دوو ژن.[5]

---

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٥٦١.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٢٧٠.

[3] ()- الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠٦.

[4] مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ١٥٢٥، المطالب العالية لابن حجر العسقلاني، الرقم ٣٧٩٥.

[5] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٥٥٧، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢١٦١.

ئیبن قەییم سەبارەت بەو ئایەتە دەڵێت: ئەو کەسانە لەناو هۆزەکەیاندا ئیمانی خۆیان دەشاردەوەو نەیاندەتوانی ئاشکرای بکەن.[١]

قورطوبی دەڵێت: واتە ئەو باوەڕدارانەی ناو مەککە کە لەنێوەندی بێباوەڕاندا بوون.[٢]

## ٧٣٣. جوندوب(ﷺ)

فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەیفەرموو (اللهم استر عورتي وآمن روعتي واقض ديني).[٣]

## ٧٣٤. جوندوبی کوڕی جونادە (ئەبووذەری غیفاری)(ﷺ)

ناوی جوندوبی کوڕی جونادەی کوڕی سوفیانی کوڕی عوبەیدی کوڕی حەرامی کوڕی غیفارە، کونیەکەی ئەبووذەری غیفاریە[٤] و زیاتر بەوەش ناسراوە، لە دەستەی یەکەمی موسڵمان بوانەو پێغەمبەر(ﷺ) چەندین وەسفی کردووە.

رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو ناوی بورەیری کوڕی جونادە بووە،[٥]بەڵام ذەهەبی دەڵێت: رای راست ئەوەیە ناوی جوندوبی کوڕی جونادەیە،[٦] هەروەک ئیبن ئەثیریش دەڵێت: رای راستتر و زیاتر ئەوەیە ناوی جوندوبە.[٧]

دایکی ناوی رەملەی کچی وەقیعەی غیفاری بوو،[٨] ئەبووذەر برایەکی هەبوو کە ناوی ئونەیسی کوڕی جەنادەی غیفاری بوو و برا گەورەی ئەبووذەر بوو.[٩]

[١] التفسير القيم لابن القيم، ج١، ص ١٩٠.
[٢] الجامع لأحكام القرآن للقرطبي، دار عالم الكتب(الرياض-٢٠٠٣)، ج١٦، ص ٢٨٥.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٤.
[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٤٤٠.
[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢١٩.
[٦] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٤٠٥.
[٧] أسد الغابة، ج٦، ص ١٠٦.
[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص١٠٧.
[٩] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٣٦.

ئەبووزەر کوڕێکی هەبوو بە ناوی عیمارە کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[1]

ئەبووزەر لە سەردەمی نەفامیشدا بڕوای بە بتەکان نەبوو و باسی بوونی خوایەکی تاک و تەنهای دەکرد.[2]

ئیبن سەعد گێڕانەوەیەکی هێناوە کە ئەبووزەر پێش موسڵمانبوونی کەسێکی ڕێگر بوو و لەگەڵ ئەوەشدا ئازا بوو و بەتەنها خۆی ڕێگری دەکرد، دواتر خوا دڵی راکێش کرد بۆ ئیسلام و وازی هێنا لە ڕێگری.[3]

ئونەیس لەگەڵ ئەبووزەری برای و دایکیدا پێکەوە دەژیان، دواتر نەبوونی و وشکەساڵی ناچاری کردن شوێنی خۆیان جێ بهێڵن و بچن بۆ لای خاڵوانیان لە نەجد، دواتریش ئەوێیان جێهێشت بەرەو مەککە، ئەبووزەر چوویە مەککەو هەواڵی هاتنی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیست و دواتر چوویە خزمەتی و موسڵمان بوو، دواتر گەڕایەوە بۆ لای ئونەیسی برای و دایکی وبانگهێشتی کردن بۆ ئیسلام، ئەوانیش موسڵمان بوون و گەڕانەوە بۆ لای هۆزەکەیان تا پەیامی ئیسلام بگەیەنن بەهۆزەکەشیان، لەوەشدا سەرکەوتوو بوون.[4]

ئەبووزەر دەڵێت: ئێمە کە لەناو هۆزەکەمان چووینە دەرەوە ئەوان لە مانگە حەرامەکاندا شەڕیان ڕەوا کردبوو، من و دایکم و ئونەیسی برام دەرچووین و چووین بۆ لای خاڵۆمان، ئەویش ڕێزی گرتین و چاکەی لەگەڵ نواندین، بەڵام هۆزەکەی حەسوودییان لەڕووماندا نواند و کەوتنە درۆهەڵبەستن بۆمان، نێوانی ئێمەو خاڵمیان تێکدا، بۆیە بڕیارماندا بچین و بارگەو بنەمان پێچایەوە، خاڵۆیشمان سەیری دەکردین و دەگریا، چووین تا لە نزیک مەککە دابەزین، ئونەیس وتی: من لە مەککە بڕێ ئیشم هەیە بۆیە

[1] المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٤٩٦١.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٢٢.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٢٢.
[4] المستدرک علی الصحيحين، الرقم ٥٤٣٠، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٧٧٢.

چاوەڕێم بە تا دێمەوە بۆ لات، ئەوەبوو ئونەیس چوو و ماوەیەکی زۆری پێ چوو، دواتر هاتەوە، وتم: بۆچی هێندە دواکەوتیت؟ وتی: کەسێکم لە مەککە بینی لەسەر ئایینی تۆ بوو و بانگەشەی ئەوەی دەکرد پێغەمبەری خوایە، منیش وتم: ئەی خەڵکی چییان پێ دەوت؟ وتی خەڵکی پێیان دەوت شاعیر و کاهین و جادووگەر، ئونەیس خۆیشی شاعیر بوو، ئونەیس وتی: سوێند بەخوا قسەی کاهینانم بیستووە قسەکانی ئەو لە قسەی کاهینان ناچێت، قسەکانیشی لەئاست گەورەترین شاعیراندا زۆر بەرزترن و هی شاعیر نین، سوێند بەخوا ئەو راستگۆیەو خەڵکی مەککە درۆزنن، منیش وتم: دەی لێرە چاوەڕێم کە تا بڕۆم و تەماشایەک بکەم، وتی: باشە بەڵام بەرامبەر خەڵکی مەککە وریابە چونکە ئەوان هێرشی دەکەنەسەر، منیش چوومە مەککەو و لای پیاوێکیان خۆم بێناز و نەناس نیشاندا و وتم: ئەرێ ئەو کابرا لەدین هەڵگەڕاوەی باسی دەکەن لەکوێیە؟ ئەویش ئیشارەتی کرد و وتی: ئەوەیە، منیش خۆم داپۆشی و چوومە لای ئاوی زەمزەم و لە ئاوەکەم خواردەوەو خوێنی دەموچاوم شۆرد و لەوێ نزیکەی شەو و رۆژێک مامەوە و هیچ خواردنێکم نەبوو جگە لە ئاوی زەمزەم، برسێتی زۆری بۆ هێنام، دوو ئافرەتیش لەوێ بوون تەوافیان دەکرد، دواتر پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبووبەکر هاتن و لە شاخەوە دابەزیبوون، وتم: ئەوە چیتانە؟ وتیان: لەدین هەڵگەڕاوە، پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵەکەی هاتن و پاش تەواف کردن نوێژی کرد، کە لە نوێژەکەی بوویەوە منیش چووم بۆ لای، یەکەم کەس بووم سەلامی ئیسلامم لێکرد، ئەویش فەرمووی: (وعلیک رحمة الله)، (رەحمەتی خوا لە تۆش) تۆ لە کێیت؟ وتم: لە هۆزی غیفارم، دەستی هێنا بەسەر تەوێڵیدا، منیش لە ناخی خۆمدا وتم: ئەوە حەزی نەکردووە من لە غیفاریەکانم، ئینجا دەستیم گرت، پرسیاری لێکردم لە کەیەوە لێرەیت؟ وتم: نزیکەی شەو و رۆژێکە، پرسیاری کرد ئەی

کێ نانی پێدەدایت؟ وتم: تەنها خۆراکم ئاوی زەمزەم بووە، ئیتر هێندە لاواز بوم خەریکە سکم دێتەوەیەک، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إنها مباركة إنها طعام طعم)، (ئەو ئاوە موبارەکە، ئەو ئاوە خۆراکی و خواردنە)، ئەبووبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) مۆڵەتم بدە ئەمشەو من نانی پێ بدەم، ئەویش رێی دا، پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبووبەکر چوون و منیش لەگەڵیان چووم، ئەبووبەکر دەرگایەکی کردەوەو لە مێوژی طائیفی بۆ هێناین، ئەوە یەکەم خواردن بوو خواردم، دواتر کە گەیشتمەوە بە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (زەویەکم پێ نیشان دراوە تا بۆی بچم کە خورمای هەیە و وادەزانم هەر یەثریب بێت، جا ئایا تۆ پەیامم دەگەیەنیت بە هۆزەکەت بەڵکو خوا بەهۆی تۆوە سوودمەندیان بکات و لەسەر ئەوانیش پاداشتی تۆ بداتەوە)، منیش چوومەوە تا گەیشتم بە ئونەیسی برام، وتی: چیت کرد؟ وتم: من موسڵمان بووم و باوەڕم پێ هێنا، ئونەیسیش وتی: منیش موسڵمان بوم و باوەڕم پێ هێناوە، ئینجا هەردووکمان چووین بۆ لای دایکمان و ئەویش هەمان قسەکەی ئونەیسی کرد، ئینجا هەرسێکمان چووینەوە بۆ ناو خۆزەکەمان و بانگەوازمان کردن، پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بێت بۆ مەدینە نیوەیان موسڵمان بوون، ئیمائی کوڕی رخصەش بەرنوێژی دەکرد بۆیان، ئەو گەورەی هۆزەکەش بوو، ئەو نیوەکەی تریش وتیان: هەرکات پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ مەدینە موسڵمان دەبین، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ مەدینە ئەو نیوەکەی تریش موسڵمان بوون، ئینجا ئەسلەمیەکانیش هاتن و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمەش وەک براکانمان موسڵمان دەبین، ئەوانیش موسڵمان بوون، پێغەمبەریش(ﷺ) نزای کرد بۆ غیفار و سەلەمەش.[1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کاتێک ئەبووزەڕ چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەبووبەکری لا بوو کە هێشتا رۆژێ یان دوو رۆژ بوو موسڵمان بووبوو، دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەخوا ئاوا ئایینەکەمان ناشارینەوەو

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢١٩-٢٢٢.

ئاشکرای دەکەین، پێغەمبەریش(ﷺ) وەڵامی نەدەدایەوە، منیش وتم: ئەی موحەممەد تۆ بانگەواز بۆ چی دەکەیت؟ ئەویش فەرمووی: (بۆ لای خوای تاک و تەنهای بێ هاوەڵ و وازهێنان لە بتەکان و شایەتی ئەوەش بدەیت من پێغەمبەری خوام)، منیش وتم: شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێک نیە جگە لە خوا و تۆش پێغەمبەری خوایت.[1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە ئەبووزەر دەڵێت: لە مەککە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) مامەوەو ئەویش ئیسلامی فێر کردم و شتێ لە قورئانم لە خزمەتیدا خوێند، ئینجا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەمەوێت ئایینەکەم ئاشکرا بکەم، فەرمووی: (من دەترسم بکوژرێیت)، وتم: هەر دەبێت وابکەم با تەنانەت بشکوژرێم، پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ بوو، چووم بینیم قورەیشیەکان بازنەیان بەستبوو و لای کەعبەوە قسەیان دەکرد، منیش وتم: (أشهد ان لا اله الا الله و أشهد أن محمدا رسول الله)، هەموو دابارین بەسەرمدا و کەوتنە لێدانم، لە هۆش خۆم چووم و ئەوانیش وایان زانی منیان کوشتووە، دواتر هاتمەوە هۆش و هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش حاڵی منی بینی و فەرمووی: مەگەر ئاگادارم نەکردیتەوە شتی وا نەکەیت؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا حەز و ویستێکی دەروونم بوو بەجێم هێنا، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردم بگەڕێمەوە ناو هۆزەکەم تا هەرکات هەواڵی دەرکەوتنی پێغەمبەرم(ﷺ) بیست بچمەوە بۆ لای.[2]

کاتێک کە لێیان دەدا عەبباس دای بە لایاندا و وتی: ئەی گرۆی قورەیشیەکان ئێوە بازرگانن و ڕێگەکەشتان بەناو غیفاریەکاندایە، ناترسن ڕێتان پێ ببڕن و بەرتان پێ بگرن؟ ئەوانیش بڵاوەیان لێکرد، کەچی بۆ بەیانی ئەبووزەر هەمان شتی دووبارە کردەوە، ئەوانیش هەمان شتیان لەگەڵدا کردەوە، دووبارە عەبباس دایەوە بە لایاندا و هەمان شتی وتەوە

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٢٢.

[2] حلية الأولياء، ج١، ص ١٥٨.

پێیان، ئەوانیش وازیان لێهێنا.[1]

گێڕانەوەیەک لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە وردەکاری موسڵمان بوونەکەی ئەبووزەر دەخاتەڕوو، ئەبووزەر بە براکەی وت: بڕۆ بۆ ئەو دۆڵە و هەواڵی ئەو کابرایەم بۆ وەربگرە کە بانگەشەی ئەوە دەکات پێغەمبەرەو لە ئاسمانەوە هەواڵ و پەیامی بۆ دێت، گوێ لە وتەکانی بگرەو دواتر وەرەوە بۆ لام، براکەی چوو تا چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و قسەکەی بیست و گەڕایەوە بۆ لای ئەبووزەر و پێی وت: بینیم فەرمانی دەکرد بە ڕەوشتی بەرز و قسەیەکی دەکرد کە شیعر نەبوو، ئەبووزەر وتی: ئەوەی من دەمویست بۆت نەهێناومەتەوە، بۆیە خۆی بارگەی پێچایەوەو ئاوی هەڵگرت و چوو تا گەیشتە مەککەو چوو بۆ لای کەعبە و بەدوای پێغەمبەردا(ﷺ) دەگەڕا و ئەویشی نەدەناسی، حەزیشی نەدەکرد لای خەڵک هەواڵی بپرسێت، بۆیە بەو حاڵەوە مایەوە تا نزیکەی شەو، ئینجا ڕاکشا، عەلی کە ئەوی بینی زانی کەسێکی بێگانەیە، کاتێک بینی شوێنی کەوت و هیچکام پرسیاریان لەهیچکام نەکرد تا بەیانی، دواتر ئەبووزەر لە ماڵی عەلیەوە توێشووەکەی هەڵگرتەوەو چوویەوە بۆ لای کەعبە و سێ ڕۆژ ئەم شتە دووبارە بوویەوە، لە ڕۆژی سێیەمدا عەلی کە بردیەوە لەگەڵ خۆی پرسیاری لێکرد ئەرێ پێم ناڵێیت بۆچی هاتویت بۆ ئێرە؟ ئەویش وتی: ئەگەر بەڵێنم پێ بدەیت ڕێنموونیم بکەیت پێت دەڵێم، ئەویش بەڵێنی دا، ئەبووزەریش پێی وت: بۆچی هاتووە، عەلیش وتی: ئەو پێغەمبەرە ڕاست دەکات، کە ڕۆژ بوویەوە شوێنم بکەوە، ئەگەر من شتێکی مەترسیدارم بینی واهەڵدەستم وەک ئەوەی ئاو بڕژم، ئەگەریش بەردەوام چووم شوێنم بکەوە تا دەتبەم بۆ لای، ئەوەبوو بەیانی ئەبووزەر شوێنی کەوت تا چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و گوێی لێگرت و هەر لەوێ موسڵمان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو (بگەڕێرەوە ناو هۆزەکەت و هەواڵی-

[1] حلية الأولياء، ج١، ص ١٥٩.

ئایینەکەیان- پێبدە تا فەرمانی منت پێدەگات) ئەبووزەر وتی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە لە نێوەندی ئەم بێباوەڕانەدا هاواری ئەم ئایینە دەکەم، بۆیە چوویە کەعبەو بەوپەڕی توانایەوە هاواری کرد (أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أن محمدا رسول الله) ئەوەبوو خەڵکەکە هەستان و کەوتنە لێدانی تا لەهۆش خۆی چوو، عەبباس هات و خۆی دا بەسەر ئەبووزەردا و وتی: قوڕتان بەسەر مەگەر نازانن ئەو لە غیفاریەکانەو ڕێی بازرگانیشتان بەو ڕێیەدایە، ئەوانیش وازیان لێهێنا، بۆ بەیانیەکەشی هەمان شت ڕوویدایەوە و دووبارە عەبباس ڕزگاری کرد.[1]

سەبارەت بەوەی ئەبووزەر چەندەم کەس بووە موسڵمان بووە رایەک دەڵێت: چوارەم کەس بووە، رایەکی تریش دەڵێت: پێنجەم کەس بووە موسڵمان بووە.[2]

ئەبووزەر لەناو هۆزەکەیدا مایەوەو لە ماوەی جەنگی بەدرو ئوحود و خەندەقیشدا هەر لەناو هۆزەکەیدا بوو و دوای ئەوە هات بۆ مەدینە،[3] ئیتر لەوێ مایەوە تا وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) لە مەدینە بوو و لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکریشدا لە مەدینە بوو، بەڵام دوای وەفاتی ئەبووبەکر چوو بۆ شام و لەوێ مایەوە تا سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففان، ئیتر لە سەردەمی عوثماندا خەلیفە داوای لێکرد بێت بۆ مەدینە و ئەویش هاتە مەدینەو دواتر لە ناوچەی رەبذە مایەو لەوێ کۆچی دوایی کرد.[4]

پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە ئەبووزەر دەیفەرموو (ما أقلت الغبراء ولا أظلت الخضراء من رجل أصدق لهجة من أبي ذر).[5]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب مناقب الأنصار - باب إسلام أبي ذر الغفاري(رضي الله عنه)، الرقم ٣٨٦١.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٥٢.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٢٦.

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٥٢-٢٥٣.

[5] سنن ابن ماجه - أبواب السنة - باب في فضائل أصحاب رسول الله(ﷺ) - فضل أبي ذر ، الرقم ١٦٢،

ئەبووزەر خزمەتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەکرد، کاتێک لە خزمەتکردنی دەبوویەوە دەچوو بۆ مزگەوت و لەوێ دەخەوت، شەوێک ئەبووزەر لە سەر زەوی ناو مزگەوت راکشابوو کە پێغەمبەر(ﷺ) هاتەوە، بە نووکە پێیەک رایچڵەکاند و فەرمووی: (بۆ دەبینم خەوت لێ ناکەوێت؟) ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) لە کوێ بخەوم، مەگەر لەم شوێنە زیاتر شوێنی ترم هەیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) لەلای دانیشت و پێی فەرموو (ئەی چۆنە ئەگەر لێرە دەرت بکەن؟) وتی: ئەوکات دەچم بۆ شام، چونکە شام خاکی کۆچ و خاکی مەحشەر و زەوی پێغەمبەرانە و منیش دەبم بە هاوڵاتیەکی ئەوێ، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو (ئەی چی دەکەیت ئەگەر لە شامیش دەریانکردیت؟) وتی: جا دەگەڕێمەوە بۆ ئێرە و ئێرە دەبێتە ماڵ و مەنزڵم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی چی دەکەیت ئەگەر هەمتر دەریانکردیت؟) وتی: ئەوکات شمشێر هەڵدەگرم و بە بەرگری لە خۆم دەجەنگم تا دەمرم، پێغەمبەر(ﷺ) زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و بە دەستی سوکناییەکی پێدا و فەرمووی: (ئایا لەوە چاکترت پێ نیشان بدەم؟) وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (تنقاد لهم حيث قادوك وتنساق لهم حيث ساقوك حتى تلقاني وأنت على ذلك)،[1] (چی فەرمانیان پێکردیت ملکەچیان بیت و بۆ کوێیان ناردیت بڕۆیت تا دەگەیتەوە بە من هەر بەو جۆرە بە).

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) پێی دەفەرموو ( يا أباذر إني أراك ضعيفا، وإني أحب لك ما أحب لنفسي، لا تأمرن على إثنين ولا تولين مال يتيم)[2] (ئەی ئەبووزەر من تۆ بە لاوازی دەبینم، ئەوەشی بۆ خۆم خۆشم دەوێت بۆ تۆیش حەزم پێیە، دەی بەرپرسیارێتی دوو کەسیش مەگرە ئەستۆ و ماڵ و سامانی هەتیویش مەگرە ئەستۆ)

صححه الألباني.

[1] مسند أحمد بن حنبل - من مسند القبائل - من حديث أسماء بنت يزيد(ﷺ)، الرقم ٢٨٢٣٦، ضعفه شعيب الأرناؤوط لوجود شهر بن حوشب في السند و هو ضعيف.

[2] صحيح مسلم - كتاب الإمارة - باب كراهة الإمارة بغير ضرورة، الرقم ١٨٢٦.

لە جەنگی تەبووکدا کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان کەوتنەڕێ ژمارەیەک کەس دواکەوتن، جا کە کەسێک دوابکەوتایە و نەچوایە هاوەڵان دەیانوت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فلانەکەس نەهاتووە، ئەویش دەیفەرموو (وازی لێبهێنن ئەگەر خێری تیا بێت ئەوا خوا پەیوەستی ئێوەی دەکات، ئەگەریش نا ئەوا خوا لەدەست ئەو حەساوەتان دەکات)، تا ئەوەی وترا ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەبووزەر دواکەوتووە، چونکە وشترەکەی ئەبووزەر نەدەچوو، بۆیە ئەبووزەر بارەکەی دا بە شانیدا و خۆی بە پێ کەوتەڕێ، پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕێدا دابەزی و موسڵمانێک تەماشای کرد کەسێک دێت، وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە کەسێکە بە پیادە دێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵکو ئەبووزەر بێت)، کاتێک خەڵکەکە لێی رامان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوێند بەخوا ئەوە ئەبووزەرە، ئەویش فەرمووی: (رحم الله أباذر يمشي وحده و يموت وحده و يبعث وحده)،[1] (ڕەحمەتی خوا لە ئەبووزەر بێت، بە تەنها هات و بەتەنهاش دەمرێت و بەتەنهاش زیندوودەکرێتەوە).

لە فەرموودەیەکدا کە بورەیدە گێڕاویەتیەوە هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (فەرمانم پێکراوە بە خۆشەویستی چوار لە هاوەڵانم و خوا هەواڵی پێداوم کە ئەوانی خۆش دەوێت)، بورەیدە دەڵێت: وتم: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی: (عەلی و ئەبووزەری غیفاری و سەلمانی فارسی و میقدادی کوڕی ئەسوەدی کیندی).[2]

مەعرووری کوڕی سوەید دەڵێت: ڕۆژێک ئەبووزەری غیفاریم بینی کە دووجلی یەکرەنگی لەبەردا بوو، کۆیلەکەشی دوو جلی یەکڕەنگی لەبەردا بوو، ئێمەش پرسیارمان لێکرد بۆچی هەردووکیان یەک جۆرە جلیان لەبەرکردووە؟[3] ئەبووزەر وتی: جارێک من لەگەڵ برایەک بووم بە کێشەم

[1] المستدرک علی الصحیحین - کتاب المغازي والسرايا - ذكر وفاة أبي ذر(ﷺ) ودفنه بأيدي رهط من الكوفة ، الرقم ٤٣٩٨و قال الذهبي فيه إرسال، ضعفه الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة، الرقم ٥٥٣١.
[2] جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) -، الرقم ٤٠٩٣ و قال حسن غريب.
[3] صحيح البخاري - كتاب الإيمان - باب المعاصي من أمر الجاهلية ولا يكفر صاحبها بارتكابها إلا

کە دایکی عەجەمی بوو، منیش بە تانەدان لە دایکی شکاندمەوە، ئەویش لای پێغەمبەر(ﷺ) شکاتی کردم،[1] ئینجا کە گەیشتم بە پێغەمبەر(ﷺ)پێی فەرمووم (أعيرته بأمه)،[2] (ئایا بە تانەدان لە دایکی شکاندت؟)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا هەرکەس قسە بڵێت بە پیاوان قسە بە دایک و باوکی دەڵێن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی ئەبووذەر تۆ کەسێکیت باری نەفامیت تێدا ماوەتەوە)،[3] پاشان فەرمووی: (إن إخوانكم خولكم جعلهم الله تحت أيديكم، فمن كان أخوه تحت يده فليطعمه مما يأكل و ليلبسه مما يلبس و لا تكلفوهم ما يغلبهم فإن كلفتموهم ما يغلبهم فأعينوهم)،[4] (براکانتان خزمەتکاری ئێوەن و خوا ئەوانی خستوەتە ژێر دەستی ئێوە، دەی با هەرکامتان براکەی لەژێر دەستیدا بوو لەو خواردنەی دەرخوارد بدات کە خۆی دەیخوات و لەو جلەی بپۆشێت کە خۆی دەیپۆشێت و لە توانای خۆیشیان زیاتریان بەسەردا مەدەن، ئەگەر کارێکتان بەسەردا دان کە لە توانای خۆیان زیاتر بوو و ماندووی دەکردن ئەوا خۆتان یارمەتییان بدەن).

**ئەبووذەر لە سەردەمی ئەبووبەکری صدیقدا:**

مشتومڕێکی مێژوویی هەیە سەبارەت بەوەی ئایا ئەبووذەر بەیعەتی داوە بە ئەبووبەکری صدیق یان دواتر بەیعەتی داوە.

مێژوونووسی شیعە یەعقووبی دەقێکی هێناوەو دەڵێت: دەستەیەک لە کۆچەران و پشتیوانان لە بەیعەت دان بە ئەبووبەکر دواکەوتن و هەواداری عەلی کوڕی ئەبووطالیب بوون، لەوانە عەبباسی کوڕی عبدولموطەلیب و فەضلی کوڕی عەبباس و زوبەیری کوڕی عەووام و خالیدی کوڕی سەعید و میقدادی کوڕی عەمر و سەلمانی فارسی و ئەبووذەری غیفاری

بالشرك، الرقم ٣٠.

[1] صحيح مسلم – كتاب الأيمان – باب إطعام المملوك مما يأكل وإلباسه مما يلبس، الرقم ١٦٦١.

[2] صحيح البخاري – كتاب الإيمان – باب المعاصي من أمر الجاهلية ولا يكفر صاحبها بارتكابها إلا بالشرك، الرقم ٣٠.

[3] صحيح مسلم – كتاب الأيمان – باب إطعام المملوك مما يأكل وإلباسه مما يلبس، الرقم ١٦٦١.

[4] صحيح البخاري – كتاب العتق – باب قول النبي(ﷺ) العبيد إخوانكم، الرقم ٢٥٤٥.

و عەممارى كوڕى ياسر و بەررائى كوڕى عازب و ئوبەى كوڕى كەعب.[1]

ئەم مەسەلەيە پەيوەست كراوە بە ناكۆكى نێوان شيعەو سوننە لەسەر مەسەلەى خيلافەت و ئيمامەت، شيعە پێيان وايە ئيمامەت لە دواى پێغەمبەر(ﷺ) بە ميراتى بۆ عەلى و نەوەكانى ماوەتەوە تا ڕۆژى دوايى و ئەبووبەكر و هاوەڵانى تر ئەو مافەيان لێ زەوت كردووە، سوننەش پێيان وايە هيچ بنەڕەتێک نيە بۆ مەسەلەى ئيمامەتى عەلى و خيلافەتى ئەبووبەكريش دروست بووە و هەموو موسڵمانانيش لەسەرى كۆدەنگ بون.

پرسيارەكە لێرەدا ئەوەيە ئەگەر ئيمامەت بەشێكى چەسپاوى بيروباوەڕەو مافى عەلى كوڕى ئەبووطاليب و نەوەكانيەتى:

يەكەم: ئەو بنەرەتە كە بڕيارە بەهەشت ودۆزەخ يەكلا بكاتەوەو ريشەى قەڵەمڕەوى هەموو كۆمەڵگەى ئيسلاميە تا ڕۆژى دوايى، بۆچى بە ئايەتێک راشكاوانە باسنەكراوە، ئايا ئەمە ناراستى ئەو بانگەشەيە نيە؟ يان ئەوەيە ئەبووبەكر و عومەر و عوثمان لە كۆكردنەوەى قورئاندا راستيگەلێكى ناو قورئانيان لابردووە؟ جا ئەگەر بڵێين يەكەميان راستە، ئيتر بنەرەتى بانگەشەى ئيمامەت بە دەليلى قورئانى لەكاردەكەوێت، ئەگەريش بڵێين دووەميان راستە، ئەوە هيچ بنەرەتێكى دروست بۆ ئيسلام نامێنێتەوە كە لەسەرى بڕۆين، چونكە ئەگەر ئەوان و هاوەڵانى تر قورئانيان ناتەواو تۆمار كردبێت، كەوابوو هەم قورئان تەواوى پەيامى خوا نيە، هەم چى فەرموودەيە لەكاردەكەوێت، هەم خوێندكارەكانى پێغەمبەر(ﷺ) دەبنە خوێندكارانێكى باش پەروەردە نەكرا و و ناپاک و هەلپەرست (دوور لەوان).

دووەم: چۆن دەكرێت عەلى كوڕى ئەبووطاليب كە موژدەپێدراوى بەهەشت و زاواى پێغەمبەر(ﷺ)و ميراتگرى دين و دنيايى پێغەمبەر(ﷺ) بێت، كەچى ئامادە نەبێت لەسەر ئەو مافە خودايیە شەڕ بكات و دەرفەت بدات كەسانێكى تر رێرەوى بڕيارى خوا و ئايينى خوا بگۆڕن، لە كاتێكدا

[1] تاريخ اليعقوبي، دار صادر، بيروت، ج٢، ص ١٢٤.

ئەو لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) چەندین جار لە غەزاکاندا چووەتە گەرمەی جەنگەوەو باکی نەبووە لە مان و نەمانی لە دنیادا.

سەبارەت بە مەسەلەی بەیعەتدانی هاوەڵان بە ئەبووبەکری صدیق و دواکەوتنی چەند هاوەڵێک، ئەگەر لێرەدا بمانەوێت بە وردی لەسەری بدوێین، پێویست بەوە دەکات بەرگێکی بۆ تایبەت بکەین، بەڵام بە کورتی چەند خاڵێک دەخەینەڕوو:

یەکەم: دوو گێڕانەوەی جیاواز هەن سەبارەت بە بەیعەتدانی عەلی کوڕی ئەبوو تالیب:

لەوەی لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە کە عەلی کوڕی ئەبووطالیب پاش شەش مانگ لە خیلافەتی ئەبووبەکر و لە دوای وەفاتی فاطیمە بەیعەتی داوە بە ئەبوبەکری صدیق و پێشتر بەیعەتی نەداوە.

لە گێڕانەوەیەکی تردا کە حاکم و بەیهەقی هێناویانە هاتووە عەلی و زوبەیر لە ڕۆژی پاش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) بەیعەتیان داوە بە ئەبووبەکری صدیق.

ئەهلی سوننە پێیان وایە هەردوو فەرموودەکە تەواوکەری یەکدین، عەلی لە ڕۆژی پاش وەفاتدا بەیعەتی داوە، دواتریش کە بەهۆی دڵرەنجانی فاطیمە لە ئەبووبەکر، دەنگۆیەک پەیدا بوو لەسەر ناکۆکی ئەبووبەکر و عەلی، عەلی بەیعەتی دووبارە کردەوە بۆ ئەبووبەکر تا ئەو گومانە نەهێڵێت.

بەپێی ئەو گێڕانەوەی بوخاری و موسلیم کە پێشتر وتمان، عەلی ئاشکرا دەڵێت: چاوەڕێی ئەوەبووە لەو مەسەلەدا راوێژ و پشکێکی هەبێت، بۆیە ئەوەی بە قۆرخکردنی دەسەڵات زانیوەو لە دڵی گرتووە، دواتر بەیعەتی داوە بە ئەبووبەکر.

هەر لەو ماوەش کە بەیعەتی نەداوە بەردەوام ئامادەی نوێژەکان بووە لە مزگەوت و لە دوای ئەبووبەکرەوە، دواتریش کەسی نزیک و راوێژ پێ کراوی ئەبووبەکر بووە.

**چوونی ئەبووذەر بۆ ناوچەی رەبذە:**

یەکێک لەو مەسەلانەی کە کراوە بە رەخنە لەسەر عوثمانی کوڕی عەففان و تانەدان لە خیلافەتەکەی، مەسەلەی چوونی ئەبووذەر بوو بۆ ناوچەی رەبذە، چونکە ئەو تۆمەتەی ئاڕاستە کراوە کە ئەو بە زۆر و بە فەرمان ئەبووذەری دوورخستوەتەوە بۆ ناوچەی رەبذە، سەبارەت بەم مەسەلەش وردەکاریەکی پێویست دەخەینە ڕوو:

ئیبنولعەرەبی لە کتێبەکەیدا (العواصم من القواصم) سەبارەت بەم مەسەلەیە دەڵێت:

سەبارەت بەوەی گوایە ئەبووذەری دوورخستبێتەوە بۆ ناوچەی رەبذە ئەوە راست نیەو وای نەکردووە، ئەبووذەر کابرایەکی دنیانەویست و زاهید بوو و سەرکۆنەی کاربەدەستەکانی عوثمانی دەکرد و ئەم ئایەتەی بەسەریاندا دەخوێندەوە (والذين يكنزون الذهب والفضة ولا ينفقونها في سبيل الله فبشرهم بعذاب أليم).

ئەبووذەر پێی وابوو ئەوان لە سوار و جلوبەرگدا زێدەڕۆیی دەکەن، بۆیە لەسەر ئەوە نارەزایی بەرامبەریان دەردەبڕی و سەرکۆنەی دەکردن، دەیویست چی لەو ماڵ و سامانەی بەردەستیان هەیە دابەش بکرێت، ئەوەش شتێکی پێویست نەبوو.

ئیبن عومەر و هاوەڵانێکی تریش دەیانوت هەرچیەک زەکاتەکەی بدەیت ئیتر بریتی نیە لە کۆکردنەوەی -زێڕ و زیو- ئەوەبوو لە شام دەمەقاڵەیەک لەنێوان ئەبووذەر و موعاویەدا روویدا، ئیتر ئەبووذەر هات بۆ مەدینە، خەڵکی لە دەوری کۆبوونەوە، ئەویش هەمان ڕێی خۆی دەگرتەبەر- دنیانەویستی و ویستی ئەوەی هەموان بەوجۆرە بن- عوثمان پێی وت: خۆزگە کەنارت بگرتایە، مەبەستی ئەوەبوو تۆ لەسەر ڕێبازێکیت کە بۆ تێکەڵی خەڵک نابێت، چونکە تێکەڵی مەرجی خۆی هەیە و کەنارگرتنیش

مەرجی خۆی هەیە، هەرکەسیش بیەوێت وەک ئەبووزەر بژی دەبێت بە تەنها بژی، یان تێکەڵی خەڵک بکات بەڵام وازبهێنێت خەڵکی لەو بارەدا بژین کە لە شەریعەتدا حەرام نەکراوە، ئەوەبوو بۆ پشتگوێخستنی دنیا، ئەبووزەر بە سەربەرزی چوو بەرەو ناوچەی رەبذە، حاڵی ئەبووزەر باشتر بوو، بەڵام ئەو حاڵە بۆ هەموو خەڵک نابێت، چونکە ئەگەر لەسەر ئەو رێبازە بچوونایە بەدڵنیاییەوە لەناودەچوون، سوپاس و ستایش بۆ خوا کە هەموو حاڵەکانی رێکخستووە.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەو رەخنە لە عوثمان دەگیرێت لەسەر کارێک کە عومەر -پێشتر- کردبووی، دەگێردرێتەوە کە عومەری کوڕی خەططاب ماوەی یەک ساڵ ئیبن مەسعوودو چەند هاوەڵێکی تری لە مەدینە بەند کرد تا ئەو کاتەی شەهید بوو، ئەوکات عوثمان ئازادی کردن، عومەر لەبەرئەوە بەندی کردن چونکە ئەوانە فەرموودەی زۆریان لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕایەوە.

دەمەقاڵەیەک لەنێوان ئەبووزەرو موعاویەدا روویدا، ئاخۆ ئەبووزەر بڕێ قسەی دەکرد کە لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا ئەوانەی نەدەوت، بۆیە موعاویە ئەم مەسەلەی باس کرد بۆ عوثمان و ترسا ئاشووبێک لەنێو خەڵکیدا دروست بێت، چونکە ئەبووزەر هانیان دەدات بۆ دنیانەویستی و بڕێ حاڵ کە هەموو خەڵکی بەرگەی ناگرن، بەڵکو بە تایبەت بۆ هەندێ کەس دەبێت و کەمینەیەک دەتوانن بەرگەی بگرن، بۆیە وەک پێشتر باسمان کرد عوثمان نامەی بۆ نووسی تا ئەبووزەر بێت بۆ مەدینە، کاتێک هاتە مەدینە خەڵکی لە دەوری کۆبوونەوە، ئەبووزەر بە عوثمانی وت: بەنیازم بچم بۆ ناوچەی رەبذە، عوثمانیش وتی: وابکە، ئەبووزەریش وایکرد، تەنها ئەو هەنگاوەش بۆ ئەو گونجاو بوو.[1]

---

[1] العواصم من القواصم، تحقيق محب الدين الخطيب و محمود مهدي الأستانبولي، ط٢، دار الجيل (بيروت-١٩٨٧)، ص ٨٥- ٨٨

ئیبن تەیمیەش پێی وایە چوونی ئەبووزەر بۆ رەبذە لەبەر نەگونجانی ئەو ئیجتیهادەی بوو کە کردبووی، لەو بارەوە دەڵێت:

ئەبووزەر لە رەبذە نیشتەجێ بوو و لەوێش مرد، ئەمەش لەبەر هۆکارێک کە کێشە کەوتە نێوان ئەو و خەڵکەوە، چونکە ئەبووزەر کەسێکی صالحی دنیانەویست بوو، پەیامیشی وابوو کە دنیانەویستی واجبە و مرۆڤ چی لێ زیادە پێویستی خۆی هەڵبگرێت ئەوە کەنز و سامانێکە کە لە رۆژی دواییدا پێی داخ دەکرێت، هەروەها پشتی دەبەست بە شتێک کە لە قورئان و سوننەتدا بەڵگەی لەسەر نیە، ئەو پشتی دەبەست بە فەرمایشتی خوا (والذين يكنزون الذهب والفضة ولا ينفقونها في سبيل الله...)، بۆیە چی زیاد لە پێویست بوایە بە کەنزی دادەنا، بۆ ئەوەش پشتی دەبەست بەوەی لە پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیستبوو کە فەرمووبووی(يا أبا ذر ما أحب أن لي مثل أحد ذهبا يمضي عليه ثالثة وعندي منه دينار إلا دينارا أرصده لدين)، (ئەی ئەبووزەر حەز ناکەم هێندە کێوی ئوحود زێرم هەبێت و سیانەی بەسەردا تێپەڕ بێت و دینارێ لەو زێرە لای من مابێت مەگەر بۆ قەرزم دانابێت).... کاتێک عەبدورەحمانی کوڕی عەوف مرد و سامانێکی جێهێشت ئەبووزەر ئەوەی بەو کەنزە دانا کە لەسەری سزا دەدرێت، عوثمانیش سەبارەت بەو مەسەلە دانوستان و مشتومڕی لەگەڵ ئەبووزەر دەکرد تا ئەوەی کەعب هاتەژوورەوەو هاوڕای عوثمان بوو، ئەبووزەر لێیدا، هەر لەسەر ئەوەش ئەبووزەر لە شام کێشەی لەگەڵ موعاویە هەبوو، دەستەیەکیش هەبوون هاوڕای ئەبووزەر بوون... خۆ خوای گەورە لە قورئاندا میراتی دیاری کردووەو دابەشی کردووە، دەی میراتیش بۆ کەسێک دەبێت کە دوای خۆی سامانێک جێبهێڵێت، چەندین هاوەڵ لە پشتیوانان و بگرە لە کۆچەرانیش هەبون کە لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) سامانیان هەبووە، چەندین پێغەمبەریش هەبون کە سامانیان هەبووە، ئەبووزەر دەیویست شتێک لەسەر خەڵک واجب بکات

کە خوا واجبی نەکردبوو لەسەریان، لەسەر شتێک سەرکۆنەیان بکات کە خوا لەسەر ئەوە سەرکۆنەی نەدەکردن، ئەو لەو رایەیدا موجتەهید بوو و وەک هەموو موجتەهیدانی تر لەسەر گوێڕایەڵیەکەی پاداشت وەردەگرێت...
لە سەردەمی خیلافەتی عوثماندا -ماڵ و سامان زۆر بوو- و دەوڵەمەندان خوویان دایە زۆر بواری دنیا کە هەیانبوو لە رووی رێژە و جۆرەوە دەچوونە مەیدانی موباحەوە، ئەبووزەریش هێندە نکووڵی دەکرد لێیان تا ئەوەی رێی موباحیشی لێ دادەخستن، ئەمەش هۆکارێکی کێشەی نێوان دوو تاقمەکە بوو، بۆیە کەنارگرتنی ئەبووزەر لەبەر ئەو هۆکارە بوو، ئەگەرنا عوثمان هیچ کێشە و مەرامێکی بەرامبەر بە ئەبووزەر نەبوو، ئەوەش کە دەڵێت: ئەبووزەر ڕاستگۆترین کەسە واتای ئەوە نییە لە هەموویان باشتر بێت، بەڵکو کەسێکی باوەڕداری لاواز بوو، وەک لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی ( یا أباذر إني أراك ضعيفا، وإني أحب لك ما أحب لنفسي، لا تأمرن على إثنين ولا تولين مال يتيم) (ئەی ئەبووزەر من تۆ بە لاوازی دەبینم، ئەوەشی بۆ خۆم خۆشم دەوێت بۆ تۆیش حەزم پێیە، دەی بەرپرسیارێتی دوو کەسیش مەگرە ئەستۆ و ماڵ و سامانی هەتیویش مەگرە ئەستۆ)، یان لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە (المؤمن القوي خير وأحب إلى الله من المؤمن الضعيف وفي كل الخير) ئەهلی شوورایش باوەڕدارانی بەهێز بوون، ئەبووزەرو هاووێنەکانیشی باوەڕدارانی لاواز بوون، باوەڕدارانی چاکی نێو خیلافەت وەک عوثمان و عەلی و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف باشتر بوون لە ئەبووزەر و هاووێنەکانی.[1]

عەسکەری دەڵێت: ئەبووزەر خۆی لەبەر زوهد و دوورگرتنی لەو سامانەی لە دەستی خەڵکدایە چوون بۆ رەبذەی هەڵبژارد.[2]

ئیبن خەلدوون دەڵێت: ئەبووزەر داوای مۆڵەتی کرد لە عوثمان تا لە

---

[1] منهاج السنة النبوية لابن تيمية، تحقيق د.محمد رشاد سالم، ط١، مؤسسة قرطبة، ج٦، ص ١٧٣- ١٧٤.
[2] الأوائل للعسكري، ج١، ص ٥٥.

مەدینە بچێتە دەرەوە، عوثمانیش مۆڵەتی دا و ئەبووذەریش چوو لە رەبذە دابەزی و لەوێ مزگەوتێکی بنیاد نا و عوثمانیش وشتری پێدا و دوو مەملووکی-خزمەتکاری- بۆ دانا و مووچەشی بۆ بڕیەوە،[1]هەروەها عوثمان پەیامی نارد بۆ ئەبووذەر و پێی وت: جارجارە سەردانی مەدینە بکە تا نەریتی دەشتەکی وەرنەگریت، ئەویش وایدەکرد.[2]

**مردنی ئەبووذەر**

مردنی ئەبووذەر لە ساڵی سی و دووی کۆچی و لە مانگی ذیلحیججەدا بوو،[3] ئیبن مەسعوودیش نوێژی مردووی لەسەر کرد، چونکە ئەوکات ئیبن مەسعوود لە مەدینەوە بەرەو کووفە دەچوو، داوا کرا لە ئیبن مەسعوود نوێژی لەسەر بکات، ئەویش وتی: ئەوە کێیە؟ وترا ئەبووذەرە، ئەویش گریانێکی زۆر گریا و وتی: برا و کەسی خۆشەویستم بە تەنها ژیا و بە تەنها مرد و بە تەنهاش زیندوو دەکرێتەوە، خۆشبەختی بۆ خۆی.[4]

کاتێک ئەبووذەر لەسەرەمەرگدا بوو ژنەکەی دەستی کرد بە گریان، ئەبووذەر وتی: بۆچی دەگریت؟ وتی: لەبەرئەوەی کە هەر دەبێت من کفنت بکەم و هیچ جل و بەرگێکم لا نیە تا پێی کفنت بکەم، ئەویش وتی: مەگری چونکە بیستوومە لە پێغەمبەر(ﷺ) رۆژێک کە لەگەڵ چەند کەسێکی تر لەلای بووم دەیفەرموو (ليموتن رجل منكم بفلاة من الأرض تشهده عصابة من المؤمنين)، (کەسێک لە ئێوە لە چۆڵەوانیەکی زەویەکدا دەمرێت، دەستەیەک لە موسڵمانان ئامادەی مەرگی دەبن)، دەی هەرکام لەوانەی ئەو رۆژە لەگەڵم بوون لە ناو کۆمەڵ و قەرەباڵغیدا مردن، ئیتر ئەوە منم کە لە چۆڵەوانیدا دەمرم، سوێند بەخوا درۆم نەکردووەو درۆشم لەگەڵ نەکراوە، دەی سەیرێکی رێگەکە بکە، ژنەکەشی وتی: جا سەیری چی بکەم

---

[1] تاريخ ابن خلدون، ط٥، دار القلم (بيروت-١٩٨٤)، ج٢، ص ٥٨٨.

[2] تأريخ الطبري، ج٢، ص ٦١٦.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٦٥.

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٥٣.

کە حاجییان چوون و ڕێگەش بڕاوە، ئەویش وتی: بڕۆ و جوان سەیر بکە، ژنەکەی زوو زوو دەچوو سەیرێکی ڕێگەکەی دەکرد و دەهاتەوە بۆ خزمەت کردنی ئەبووزەر، ئینجا تاوە تاوە دەچوویەوە سەیرێکی دەوروبەری دەکرد، تا جارێک خەڵکێکی بینی بە بارگەو بنەو وڵاخەوە دەهاتن، کە گەیشتنە لای وتیان: ئەوە چیتە لێرە ئەی ئافرەت؟ ئەویش وتی: کەسێکی موسڵمانان دەمرێت، وتیان: کێیە؟ وتی: ئەبووزەر، وتیان: ئەبووزەری هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ)؟ وتی بەڵێ، ئەوانیش هەموو دەیانوت بە دایک و باوکمانەوە بەقوربانی بین، خێرا چوون بەرەو لای و چوونە لای، ئەویش بەخێرهاتنی ئەوانی کرد و وتی: کاتێک من و چەند کەسێکی تر لای پێغەمبەر(ﷺ) بووین بیستم پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (کەسێک لە ئێوە لە چۆڵەوانیەکی زەویەکدا دەمرێت، دەستەیەک لە موسڵمانان ئامادەی مەرگی دەبن)، دەی هەرکام لەوانەی ئەو ڕۆژە لەگەڵم بوون لە ناو کۆمەڵ و قەرەباڵغیدا مردن، ئیتر ئەوە منم کە لە چۆڵەوانیدا دەمرم، ئێوە گوێبیستی منن کە ئەگەر خۆم یان ژنەکەم پۆشاکێکمان هەبوایە بۆ کفن کردنم ئەوا بەو پۆشاکەی خۆم یان ژنەکەم کفن دەکرام، ئێوە گوێبیستمن کە من بەشایەتتان دەگرم یەکێک لە ئێوە کفنم بکات کە ئەمیر یان عەریف یان پۆستەچی یان نەقیب نەبووبێت، هەرکامیان یەکێک لەو سیفەتانەی تێدا بوو جگە لە گەنجێکی پشتیوانان کە وتی: مامە گیان من کفنت دەکەم و هیچکام لەوانەشم نیە کە باست کرد، لەم عەبایەی خۆمدا کفنت دەکەم، هەروەها لە دوو پۆشاکی تریشمدا کە دایکم بۆی ئامادە کردبووم.[1]

دوای ئەوەی نوێژی مردووی لەسەر کرا و ئەسپەردە کرا، ئینجا ئەو دەستەی موسڵمانان خێزانەکەی ئەبووزەریان بردەوە بۆ لای عوثمانی کوڕی

[1] المستدرک علی الصحیحین - کتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذکر مناقب أبي ذر الغفاري(ﷺ) - وفاة أبي ذر في فلاة من الأرض ومجيء جماعة ، الرقم ٥٥١٣، حسنه شعيب الأرناؤوط، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف الترغيب و الترهيب، الرقم ٣٣١٤.

عەففـان،[1] عوثمانیـش ژن و منداڵەکانـی ئەبـووذەری لەگـەڵ ژن و منداڵەکانـی خـۆی دانـا.[2]

ئەبووذەر یەکێک بوو لەو کەسانەی کە زۆر فەرمانی دەکرد بە چاکەو رێگری دەکرد لە خراپە، لەبەر رەزامەندی خوا گوێی نەدەدا بە لۆمەی هیچ کەسێک.[3]

ئەبوونوعەیمی ئەصبەهانی سەرەتای دەستپێکردنی ژیاننامەی ئەبووذەری غیفـاری بـە وەسـفێکی نـاوازە دێنێـت و دەڵێـت: (العابد الزهيد، القانت الوحيد، رابع الإسلام، ورافض الأزلام قبل نزول الشرع والأحكام، تعبد قبل الدعوة بالشهور والأعوام، وأول من حيا الرسول بتحية الإسلام، لم يكن تأخذه في الحق لائمة اللوام، ولا تفزعه سطوة الولاة والحكام، أول من تكلم في علم البقاء، وثبت على المشقة والعناء، وحفظ العهود والوصايا، وصبر على المحن والرزايا، واعتزل مخالطة البرايا إلى أن حل بساحة المنايا، أبو ذر الغفاري(ﷺ)، خدم الرسول، وتعلم الأصول، ونبذ الفضول).[4]

**ئایا ئەبووذەر لە ئاشووبخوازەکان بوو؟**

بێگومـان ئەبـووذەری غیفـاری لـە ئاشـووبخوازەکان نەبـوو، بەڵکـو موجتەهیدێک بوو کە لە بوارێکی ئیجتیهادەکانیدا نەیپێکا، بەڵام ئەوەی کە کێشە بوو ئەوەبوو ئاشـووبخوازان ئەو بانگەوازەی ئەبووذەریان قۆستەوە بۆ مەرامی پیسی خۆیـان و توانییـان بیکەنـە چەکێک بـۆ دژایەتی خیلافەتی عوثمانـی کـوڕی عەففـان و دواجـار رەواکردنـی خوێنـی، هیچکام لـە هـاوەڵان و تابعیـەکان و زانایانـی ئەهلـی سـوننەو جەماعـەش گومانیـان نیـە لـەوەی ئەبـووذەر هیـچ پەیوەنـدی و هاوکاریەکـی نەبـووە لەگـەڵ ئاشـووبخوازان، بەڵکـو نیازێکـی چاکسـازی هەبـووەو ئیجتیهادێکـی کـردووەو ئیجتیهادەکـەی نەیپێـکاوەو پشـت بەخـوا یـەک پاداشـتی دەسـت کەوتـووە.

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٤٤٢.
[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٦٥.
[3] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٤٠٦.
[4] حلية الأولياء لأبي نعيم الأصبهاني، ج١، ص ١٥٦-١٥٧.

## ٧٣٥. جوندوبی کوڕی عەبدوڵای بەجلی(ﷺ)

ناوی جوندوبی کوڕی عەبدوڵای کوڕی سوفیانی بەجلیە، کونیەکەی ئەبوو عەبدوڵایە، جوندوب دەڵێت: من لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) مێردمنداڵێک بووم.[1]

جوندوب دەڵێت: ئێمە کۆمەڵێک گەنجی تازە پێگەیشتوو و تازە بازوو بووین لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) بووین، پێغەمبەر(ﷺ) پێش ئەوەی فێری قورئانمان بکات ئیمانی فێر کردین، ئینجا دوای ئەوە قورئان فێر دەبووین و بە قورئان ئیمانمان زیادی دەکرد،[2] کەچی ئەمڕۆ ئێوە پێش فێربوونی ئیمان قورئان فێر دەبن.[3]

هەروەها جوندوب دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەشداریم کرد لە جەژنی قورباندا، هەواڵی پێگەیشت کە پێش نوێژ هەندێ کەس قوربانییان سەربڕیوە، بۆیە فەرمووی: (من كان ذبح أضحيته قبل أن يصلي - أو نصلي -، فليذبح مكانها أخرى، ومن كان لم يذبح، فليذبح باسم الله)،[4] (هەرکامتان پێش ئەوەی نوێژ بکات-یان نوێژ بکەین- ئاژەڵی سەربڕیوە ئەوا با دووبارە ئاژەڵێکی تر سەرببڕێت، ئەوەش سەری نەبڕیوە با لەسەر ناوی خوا سەری ببڕێت).

جوندوب دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (كان فيمن كان قبلكم رجل به جرح فجزع، فأخذ سكينا فحز بها يده، فما رقأ الدم حتى مات، قال الله تعالى بادرني عبدي بنفسه، حرمت عليه الجنة)،[5] (لەپێش ئێوەدا پیاوێک هەبوو کە برینێکی هەبوو و ئازاری زۆر بوو، چەقۆیەکی هەڵگرت و دەستی خۆی پێ بڕی، ئەوەندە خوێنی لێ ڕۆیشت تا مرد، خوای گەورە فەرمووی: بەندەکەم پێش من کەوت بە کوشتنی خۆی، بۆیە بەهەشتم لەسەر حەرام کرد).

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠٩.

[2] سنن ابن ماجه - أبواب السنة - باب في الإيمان ، الرقم ٦١، صححه الألباني.

[3] السنن الكبرى للبيهقي - كتاب الصلاة - جماع أبواب صلاة الإمام وصفة الأئمة - باب البيان أنه إنما قيل يؤمهم أقرؤهم، الرقم ٥٣٧٥.

[4] صحيح مسلم - كتاب الأضاحي - باب وقتها، الرقم ١٧١٤.

[5] صحيح البخاري - كتاب أحاديث الأنبياء - باب ما ذكر عن بني إسرائيل، الرقم ٣٤٦٣.

جوندوبی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (من قتل تحت راية عمية يدعو عصبته أو ينصر عصبته فقتلة جاهلية)،[1] (هەرکەس لەژێر ئاڵایەکی ناڕووندا بجەنگێت کە نەزانرێت ئایا حەقە یان ناحەقە و بانگەواز بکات بۆ دەمارگیری خۆی یان دەمارگیری خۆی سەربخات ئەوە جەنگ و کوژرانەکەی جەنگ و کوژرانی نەفامیە).

دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) لە کووفە سەقامگیر بوو، دواتر لەگەڵ موصعەبی کوڕی زوبەیردا چوو بۆ بەصرە.[2]

لە سەردەمی شۆڕشەکەی عەبدوڵای کوڕی زوبەیردا جوندوب هەواڵی نارد بۆ لای عەسعەسی کوڕی سەلامەو وتی: بڕێ لە براکانت کۆبکەرەوە بۆم تا قسەیان بۆ بکەم و فەرموودەیان بۆ بگێڕمەوە، کاتێک هاتن و قسە کرا جوندوب بەسەرهاتێکی گێڕایەوە بۆیان و وتی: پێغەمبەر(ﷺ) دەستەیەکی سوپای موسڵمانانی نارد بۆ سەر بڕێ لە بێباوەڕەکان، کاتێک جەنگ روویدا یەکێک لە بێباوەرەکان دەچوو بۆ موسڵمانێک، موسڵمانێکیان بێئاگایی ئەو کەسەی قۆستەوەو هەڵیکوتایە سەری-ئەو هاوەڵە ئوسامەی کوڕی زەید بوو- شمشێری لێ هەڵکرد و کابراش وتی: لا إله إلا الله، بەڵام ئەو کوشتی، کە موژدەبەر هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی ئەوەی پێدا، پێغەمبەر(ﷺ) ئەو هاوەڵەی بانگ کرد و فەرمووی: بۆچی کوشتت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆری لە موسڵمانان دا و فلانەکەس و فلانەکەسی کوشت، -ناوی چەند هاوەڵێکی برد کە ئەو کابرا شەهیدی کردبوون- منیش هەڵمکوتایە سەری، کە شمشێرەکەی منی بینی وتی: لا إله إلا الله، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئیتر کوشتت؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: (ئەی کە رۆژی دوایی هات چی دەکەیت بە لا إله إلا الله؟) ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە، پێغەمبەریش(ﷺ)

---

[1] صحيح مسلم - كتاب الإمارة - باب وجوب ملازمة جماعة المسلمين عند ظهور الفتن، الرقم ١٨٥٠.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤٤٤.

فەرمووی: (ئەی کە رۆژی دوایی هات چی دەکەیت بە لا إلە إلا اللە؟)، بەردەوام پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو شتەی پێ دەفەرموو.[1]

## ٧٣٦. جوندوبی کوڕی عەمر(ﷺ)

ناوی جوندوبی کوڕی عەمری کوڕی حوممەی دەوسیە،[2] کچێکی هەبوو بە ناوی ئوم ئەببان، یەکێک بوو لە هاوەڵانی بەشداربووی جەنگی ئەجنادەین، بەڵام هیچ فەرموودەیەکی لێوە نەگێردراوەتەوە.[3]

کاتێک جوندوب بەرەو شام کۆچی کرد ئوم ئەببانی کچی لای عومەری کوڕی خەططاب داناو پێی وت: ئەگەر کەسێکی چاکت بەدیکرد بۆ کچەکەم ئەوا مارەی بکە لێی با تەنانەت مارەییەکەی قایشی نەعلەکەی بێت، ئەگەریش کەسی چاک نەهاتە داوای ئەوا لای خۆت بیهێڵەوە تا دەیگەیەنیتەوە بە هۆزەکەی، ئیتر ئوم ئەببان لای عومەر بوو و بە باوکی خۆی ناوی دەبرد تا ئەو کاتەی عومەر ئوم ئەببانی لە عوثمان مارە کرد، ئەوەبوو هەر لە سەردەمی خیلافەتی عومەردا عەمری لێ بوو.[4]

جوندوب لە جەنگی ئەجنادەیندا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[5]

## ٧٣٧. جوندوبی کوڕی عەممار(ﷺ)

ناوی جوندوبی کوڕی عەمماری کوڕی نوعەیمی کوڕی شەهابی طائیە، یەکێک بوو لە شاعیرە دیارەکان، وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، دواتریش لە جەنگی قادسیەدا بەشداری کرد و لەو بارەشەوە شیعری هۆنیوەتەوە.[6]

---

[1] صحيح مسلم – كتاب الإيمان – باب تحريم قتل الكافر بعد أن قال لا إله إلا الله، الرقم ٩٧.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤٤٥.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٠.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٠.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ٤٤٥.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٠.

## ٧٢٨. جوندوبی کوڕی کەعب(رضي الله عنه)

ناوی جوندوبی کوڕی کەعبی کوڕی عەبدوڵای ئەزدی غامیدیە، بە جوندوبولخەیر ناسراوە،[١] ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە.[٢]

پێغەمبەر(ﷺ) نامەیەکی نووسی بۆ ئەبووظبیانی ئەزدی کوڕی غامید و تیایدا خۆی و هۆزەکەی بانگ کرد بۆ ئیسلام، ئەوەبوو دەستەیەک لە هۆزەکەی چوون بەدەم بانگەوازەکەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، لەوانە موحنەف و عەبدوڵا و زوهەیر و عەبدشەمس، ئەمانە هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و لە مەککە چوونە خزمەتی، بەڵام جوندوبی کوڕی زوهەیر و جوندوبی کوڕی کەعب و حیجر لە مەدینە چوونە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ).[٣]

جوندوب فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (حد الساحر ضربة بالسيف)،[٤] (حەدد و سزای جادووگەر لەگەردن دانیەتی بە شمشێر).

کاتێک وەلیدی کوڕی عوقبە لە عێراق والی بوو، کەسێک لەلای بوو کە جادووی دەکرد، ئەو جادووگەرەش ناوی بوستانی بوو، بوستانی مرۆڤێکی هێنا و سەری بڕی و دواتر سەری لکاندەوە پێیەوە، خەڵکەکە سەرسام بوون بە کارەکەی، بۆ بەیانی جوندوب هاتەوە و شمشێری هەڵکێشاو ئەو جادووگەرەی کوشت، دواتر مەسەلەکە باس کرا بۆ عوثمانی کوڕی عەففان کە خەلیفەی موسڵمانان بوو، ئەویش پێی وت: لە ئیسلامدا شمشێرێکت هەڵکردووە کە ئەگەر لە پێغەمبەری خوام(ﷺ)

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٤٤٦.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٢.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٢.

[٤] المستدرک علی الصحيحين – كتاب الحدود – حد الساحر ضربة بالسيف ، الرقم ٨١٦٦، وقال هذا حديث صحيح الإسناد وإن كان الشيخان تركا حديث إسماعيل بن مسلم فإنه غريب صحيح وله شاهد صحيح على شرطهما جميعا في ضد هذا.

نەبیستایە سەبارەت بە تۆ چی فەرموو ئەوا بە چاکترین شمشێری مەدینە دەمدا لە گەردنت.[1]

## ٧٢٩. جوندوبی کوڕی مەکیث(ﷺ)

ناوی جوندوبی کوڕی مەکیثی کوڕی عەمری کوڕی جەرادی جوهەنیە، برایەکی هەبوو بە ناوی رافیع کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، جوندوب لە هاوەڵانی دانیشتووی مەدینە بوو.[2]

جوندوب لە حودەیبیە و بەیعەتی ریضواندا بەشداری کرد.[3]

جوندوب دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) عەبدولای کوڕی غالیبی لەیثی کردە بەرپرسی سریەیەک و منیش لە سریەکەدا بەشدار بووم، سریەکەی نارد و فەرمانی کرد هێرش ببەنە سەر بەنیلمولەوویح لە ناوچەی کەدید، ئەوەبوو چووین تا گەیشتینە ئەوێ، لەوێ گەیشتین بە حارثی کوڕی بەرصائی لەیثی، ئێمەش ئەومان گرت، حارث وتی: من هاتوم تا موسڵمان بم و بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەچووم، ئێمەش وتمان: ئەگەر موسڵمان بیت ئەوە سەنگەرنشینی شەو و رۆژێکمان زیانت پێ ناگەیەنێت، ئەگەریش موسڵمان نەبیت ئەوا جوان دەتبەستینەوە، بۆیە جوان بەستمانەوە.[4]

هەروەها کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کورزی کوڕی جابیری فەهری کردە بەپرسی سریەیەک تا هێرش ببەنە سەر ناوچەی عرنین لەبەرئەوەی هێرشیان بردبووە سەر رانەوڵاخەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، جوندوبیش لەو سریەدا بەشداری کرد.[5]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٢.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤٤٧.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٤٦.

[4] سنن أبي داود - كتاب الجهاد - باب في الأسير يوثق ، الرقم ٢٦٧٣، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٢٥٨٦ و قال الحاكم صحيح على شرط مسلم و لم يخرجه، و وافقه الذهبي، ضعفه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داوود، الرقم ٢٦٧٨.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٤٦.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ویستی هێرش بکاتە سەر مەککە، جوندوب و رافیعی نارد بۆ لای جوهەینەو فەرمانی کرد جوهەنیەکان رەمەزان لە مەدینە ئامادە بن، هەروەها بۆ غەزای تەبووکیش دووبارە ئەو دوو برایەی نارد بۆ لای جوهەینە تا پێیان بڵێن خۆ ئامادە بکەن بۆ جیهاد و لە غەزای تەبووکدا بەشداری بکەن.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) جوندوبی کوڕی مەکیثی دانابوو بە بەرپرسی کۆکردنەوەی زەکاتی جوهەینە.[2]

جوندوب دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی هاتنی وەفدەکاندا جوانترین و باشترین جلی خۆی دەپۆشی، فەرمانیشی دەکرد بە هاوەڵانی تا وا بکەن، جا ئەو رۆژەی وەفدی کیندە هات، من پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی جلێکی یەمانی لەبەردا بوو و ئەبووبەکر و عومەریش هەروایان کردبوو.[3]

## ٧٣٠. جوندوبی کوڕی نوعمان(ﷺ)

ناوی جوندوبی کوڕی نوعمانەو لە ئەزدیەکانە، کونیەکەی ئەبووعەزیزە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی سەعید کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[4]

جوندوب هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) کردی بە عەریفی هۆزەکەی خۆی.

جوندوب لە خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا کۆچی کرد بۆ شام و لە دیمەشق نیشتەجێ بوو، خانووەکەشی ناسرابوو بە دارونتەخلە، کە وەفاتیشی کرد هەر لەوێ خۆیشی و سەعیدی کوڕیشی ئەسپەردە کران.[5]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٤٦.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤٤٧.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٤٦، معرفة الصحابة لأإي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٤٩٧.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٤.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٤.

## ٧٣١. جوندوبی کوڕی ئەدلەع(رضي الله عنه)

ناوی جوندوبی کوڕی ئەدلەعەو لە فەتحی مەککەدا بەشدار بوو، بەڵام لەگەڵ حرراسی کوڕی ئومەییەدا کێشەیەکی کۆنی هەبوو، بۆیە حرراس جوندوبی کوشت.[١]

## ٧٣٢. جوندوبی کوڕی ئەعجەم(رضي الله عنه)

ناوی جوندوبی کوڕی ئەعجەمە و لە ئەسلەمیەکانە، لە غەزای حونەیندا بەشدار بوو و تیایدا ئاڵاهەڵگر بوو، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ئاڵاکانی دابەش کرد دوو ئاڵای بەخشی بە ئەسلەمیەکان، ئاڵایەکیان بە بورەیدە بوو و ئەوی تریان بە جوندوبی کوڕی ئەعجەم بوو.[٢]

## ٧٣٣. جوهەیشی کوڕی ئوەیس(رضي الله عنه)

ناوی جوهەیشی کوڕی ئوەیسی نەخەعیە،[٣] ئیبن سەعد دەڵێت: ناوە ئەسڵیەکەی رەقەمە،[٤] وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[٥]

ئەبووهورەیرە دەڵێت: جوهەیشی کوڕی ئوەیسی نەخەعی لەگەڵ دەستەیەک لە هاوەڵانی لە هۆزی مەذحیج هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)،[٦] کە هاتنە خزمەتی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێشنیازی موسڵمانبوونی کرد بۆیان و ئەوانیش رازی بوون و بەیعەتیان پێدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەرسام بوو بە هەڵکەوتەییان و فەرمووی: ئایا لە هۆزەکەتاندا کەسی وەک خۆتان

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠٦.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠٦.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٤٥٥.

[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٣٤٦.

[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٤٥٥.

[٦] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٦١٨، قال ابن الأثير (في إسناد حديثه نظر)، انظر: أسد الغابة، ج١، ص ٤٥٥.

هەیە؟ ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە لە هۆزەکەماندا حەفتا کەسمان هەیە کە هەموویان لە ئێمە باشترن، پێغەمبەریش(ﷺ) نزای کرد بۆ هەردووکیان و بۆ هۆزەکانیان و فەرمووی: (خوایە بەرەکەت بخەرە ناو نەخەعەوە).[1]

## ٧٣٤. جوهەیمی کوڕی صەلت(رضي الله عنه)

ناوی جوهەیمی کوڕی صەلتی کوڕی مەخرەمەیە،[2] دایکی ناوی روهەیمەیە، جوهەیم لە دایکیەوە برایەکی هەبوو بە ناوی جەهمی کوڕی قەیس کە لە دەستەی یەکەمی موسڵمان بوان بوو،[3] سەبارەت بە کاتی موسڵمانبوونی راجیایی هەیە، رایەک دەڵێت: لە فەتحی خەیبەردا موسڵمان بووەو لە دەستکەوتیشیدا پشکی هەبووەو پێغەمبەری خوا(ﷺ) سی کۆڵ خواردنی پێدا، رایەکی تر دەڵێت: لە شەڕی تەبووکدا پێغەمبەر(ﷺ) کە رێککەوتنی بەست لەگەڵ بەحنەی کوڕی روئبەدا، نووسەرەوەی رێککەوتنەکە جوهەیم بوو، واتە لەو سوپایەدا بەشدار بووەو موسڵمان بووە، رایەکیش دەڵێت: دوای فەتحی مەککە موسڵمان بوو.[4]

ئیبن ئەثیر پێی وایە موسڵمانبوونەکەی لە ساڵی فەتحی خەیبەردا بووە،[5] هەروەها ناوی جوهەیمی کوڕی صولەیتی لە لیستی ئەو ناوانەدا هێناوە کە نووسەرەوەی خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) بون.[6]

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) نامەی نووسی بۆ یەزیدی کوڕی طوفەیل، نووسەرەوەی نامەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) جوهەیم بوو.[7]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٣٤٦.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٢٤.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ١٢٢.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٢٤.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٤٥٥.
[6] أسد الغابة، ج١، ص ٨٠.
[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٢٦٨.

## ٧٣٥. جیبارەی کوڕی زورارە(ﷺ)

ناوی جیبارەی کوڕی زورارەی بەلویە، هاوەڵی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کردو دوای ئەویش ژیا و لە فەتحی میصردا بەشداری کرد، بەڵام هیچ فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) نەگێڕاوەتەوە.[1]

## ٧٣٦. جیددار(ﷺ)

ناوی جیدداری ئەسلەمیە، فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوەو دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە غەزادا بووین، کە گەیشتین بە دوژمن پێغەمبەر(ﷺ) هەستا و سوپاس و ستایشی خوای کرد، دواتر فەرمووی: (أيها الناس إنكم قد أصبحتم وعليكم من الله نعم...)،[2] (ئەی خەڵکینە ئێوە کە وا ڕۆژتان کردووەتەوە بەخششی خواتان بەسەرەوەیە...).

سەنەدی ئەم فەرموودەیە لاوازە وەک چۆن ئیبن حەجەر دەقی زانایانێکی لەو بارەوە هێناوە کە هەموویان بە لاوازیان داناوە.[3]

## ٧٣٧. جیسر(ﷺ)

ناوی جیسری کوڕی وەهبی کوڕی سەلەمەی ئەزدیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی زەهران، جیسر دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (الخيل في نواصيها الخير إلى يوم القيامة)، (ئەسپ تا ڕۆژی دوایی خێر بە یاڵەکانیەوەیەتی)، ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەم سەنەدە مەجهولە.[4]

⌘ ⌘ ⌘

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٨٩.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤٠١-٤٠٢.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦٦.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٨٠.

## ٧٣٨. حابیسی کوڕی دوغنه(ﷺ)

ناوی حابیسی کوڕی دوغنەی کەلبیە، بەسەرهاتێکی خۆی دەگێڕێتەوە کە لە شێوێک بووەو دەنگێک بە وتنی چەند دێڕە شیعرێک پێی وتووە (ئایینی خوا دابەزیوەو باوەڕ بهێنە)، حابیسیش موسڵمان بوو.[١]

## ٧٣٩. حابیسی کوڕی رەبیعه(ﷺ)

ناوی حابیسی کوڕی رەبیعەی تەمیمیە، لە بەصرە نیشتەجێ بوو.[٢]

حابیسی کوڕی رەبیعەی تەمیمی دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (العين حق)،[٣] (چاو حەقە).

بەپێی ئەو شیکاریەی ئیبن حەجەر بۆ سەنەدی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: حابیس کوڕێکی هەبووە بە ناوی حەییە کە ئەم فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.

## ٧٤٠. حابیسی کوڕی رەبیعەی یەمانی(ﷺ)

ناوی حابیسی کوڕی رەبیعەی یەمانیە، لە جەنگی صفیندا لەناو سوپای موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیاندا کوژرا.[٤]

## ٧٤١. حابیسی کوڕی سەعد(ﷺ)

ناوی حابیسی کوڕی سەعدی یەمانیە، دواتر چوو لە حیمص نیشتەجێ بوو، ئینجا لەوێوە چوو بۆ میصر.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٥٨..

[٢] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٨٠.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٥٩.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٥٩.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦١.

## ٧٤٢. حاجیبی کوڕی زوراره(ﷺ)

ناوی حاجیبی کوڕی زورارەی کوڕی عەدەسی تەمیمیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عوطارید کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو و پاش فەتحی مەککە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).[1]

حاجیب دوو برای هەبوو بە ناوەکانی میعبەد و وەکیع.[2]

حاجیب کەسێکی زۆر ژیر و نەرمونیان بوو، تەنانەت ئەو سیفەتەی وا ناسرابوو کە ژیری و نەرمونیانی قەعقاعی کوڕی میعبەدیان دەچواند بە ژیری و نەرمونیانی حاجیبی مامی.[3]

کاتێک حاجیبی کوڕی زوراره لە مەدینە بوو صەفوانی کوڕی ئەسیدیش هاتە مەدینە، کابرایەکی بەنی لەیث لەوێ بوو و بەدوای کەسێکی تەمیمیدا دەگەڕا تا بیکوژێت، کە صەفوانی بینی کوشتی، خێرا حاجیب لەگەڵ وەکیعی برایدا ئەو کەسەیان گرت و بردیان بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتیان ئەم کەسە هاوەڵەکەی ئێمەی کوشتووە، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ئەو کەسەی نەدەناسی چونکە هێشتا موسڵمان نەبووبوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێشنیاری خوێن بایی کرد بۆیان و ئەوانیش وتیان جگە لە ئێمە کەسی تر هەیە شیاو بێ بەو خوێن باییە، مەبەستیان هاوڕێکانیان بوو، کاتێ کەسوکارەکەی هەواڵیان پێ گەیشت کە پێغەمبەر(ﷺ) حەزی کردووە لەبری کوشتنەوەی خوێن بایی وەربگرن، لەو کەسە خۆش بوون و وازیان هێنا.[4]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) حاجیبی نارد تا زەکاتی هۆزەکەی خۆی کۆبکاتەوە، بەڵام هێندەی نەبرد حاجیب مرد، ئەمجار عوطاردی کوڕی حاجیب و زوبرقانی کوڕی بەدر چوون بۆ ئەو ئەرکە.[5]

---

[1] أسد الغابة، ج٤، ص ٤٧.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٨ و ج٣، ص ٤٣٢.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٨.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ٤٣٢.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ٤٣٢.

## ٧٤٣. حاجیبی کوڕی زەید(رضي الله عنه)

ناوی حاجیبی کوڕی زەیدی کوڕی تیمی کوڕی ئومەییەیە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[١] ئبن ئەثیر دەڵێت: لە خەزرەجیەکانە،[٢] لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو.[٣]

## ٧٤٤. حاجیبی کوڕی یەزید(رضي الله عنه)

ناوی حاجیبی کوڕی یەزید یان دەوترێت کوڕی زەیدە، لە پشتیوانانە لە ئەشهەلیەکان، لە جەنگی یەمامەدا بەشدای کردو تیایدا شەهید بوو.[٤]

## ٧٤٥. حارثەی کوڕی جابیر(رضي الله عنه)

ناوی حارثەی کوڕی جابیری عەبدیە، لە بەنی عەبدولقەیسە، وەک وەفد هاتوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[٥]

## ٧٤٦. حارثەی کوڕی جەبلە(رضي الله عنه)

ناوی حارثەی کوڕی جەبلەی کوڕی حارثەی کوڕی شەراحیلی کەلبیە، خۆیشی و باوکیشی لە هاوەڵانن،[٦] لە پیتی جیم دا باسی باوکیمان کردووە.

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦١.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٤٦١.

[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٨١.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٤٦١.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦١٣.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦١٣.

## ٧٤٧. حارثەی کوڕی خومەیر(ﷺ)

ناوی حارثەی کوڕی خومەیر[١] یان کوڕی جومەیری ئەشجەعیە،[٢] یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر.[٣]

## ٧٤٨. حارثەی کوڕی زمید(ﷺ)

ناوی حارثەی کوڕی زەیدی کوڕی ئەبی زوهەیرە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر.[٤]

## ٧٤٩. حارثەی کوڕی سەهل(ﷺ)

ناوی حارثەی کوڕی سەهلی کوڕی حارثەی کوڕی قەیسە، لە پشتیوانانە، یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای ئوحود و لەو غەزایەشدا شەهید بوو.[٥]

## ٧٥٠. حارثەی کوڕی سوراقە(ﷺ)

ناوی حارثەی کوڕی سوراقەی کوڕی حارثی کوڕی عەدی کوڕی مالیکە، لە پشتیوانانە لە بەنی نەجار،[٦] دایکی ناوی رەبیعی کچی نەضرە.[٧]

حارثە پوورزای ئەنەسی کوڕی مالیک بوو، چونکە دایکی پووری ئەنەس بوو.[٨]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، هەریەک لە سائیبی کوڕی عوثمان و حارثەی کوڕی سوراقەی کرد بە برای یەک.[٩]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٥١٩.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦١٤.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٥١٩.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦١٤.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦١٥.
[٦] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٠٧.
[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦١٤.
[٨] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥١٠.
[٩] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٠١.

حارثەی کوڕی سوراقە یەکێک بوو لە بەشداربوانی غەزای بەدر و لەو غەزایەشدا شەهید بوو،[1] کوژرانەکەشی بە تیرێکی وێڵ بوو.[2]

حارثە یەکەم کوژراوی ناو پشتیوانان بوو.[3]

دوای جەنگ رەبیعی دایکی حارثە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی حارثەم پێ بدە، ئەگەر لە بەهەشتە خۆڕاگر دەبم، ئەگەرنا گریانێ بۆی دەگریم خۆمی بۆ ماندوو بکەم، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (يا أم حارثة إنها جنان في الجنة، وإن ابنك أصاب الفردوس الأعلى)،[4] (ئەی دایکی حارثە لە بەهەشتدا چەند پلەو بەهەشتێک هەن، کوڕەکەی تۆیش فیردەوسی ئەعلای بەدەستهێنا).

## ٧٥١. حارثەی کوڕی شەراحیل(رضي الله عنه)

ناوی حارثەی کوڕی شەراحیلی کوڕی کەعبە،[5] کوڕێکی هەبوو بە ناوی زەید کە خۆشەویستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، باپیری ئوسامەی کوڕی زەید بوو،[6] کوڕێکی تریشی هەبوو بە ناوی جەبەلە.[7]

حارثە ئافرەتێکی لە هۆزی (طيء) بەهاوسەر گرت، لەو ئافرەتە سێ منداڵی بوو کە بریتی بوون لە جەبەلەو ئەسما و زەید، پاش ماوەیەک ئەو ژنەی مرد، ئینجا ئەو منداڵانە لای باپیرەیان مانەوە، حارثە ویستی بیانبات لەگەڵ خۆیدا، بەڵام باپیرەی هات و وتی: با لای ئێمە بن باشترە بۆیان، ئەویش هەریەک لە جەبەلەو ئەسمائی برد و زەیدی لەوێ جێهێشت، پاش ماوەیەک سوارەیەکی تیهامە

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦١٤.

[2] صحيح البخاري، الرقم ٢٦٧٤.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٧.

[4] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب من أتاه سهم غرب فقتله، الرقم ٢٨٠٩.

[5] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، ط١، دار الوطن (الرياض-١٩٩٨)، ج٢، ص ٧٤٦، أسد الغابة، ج١، ص ٥٢٢.

[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٥٤٢.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥٦.

هـات و دای بەسـەر ناوچـەی هۆزەکـەی دایکـی زەیـددا و زەیدیـان بـە کۆیلـە گـرت و بردیانـە بـازاڕی مەککـەو لـەوێ پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەوی بینـی و وەسـفی کـرد بـۆ خەدیجـەو خەدیجـەش زەیـدی کـڕی و لـەوێ لەگـەڵ پێغەمبـەر(ﷺ) مایـەوە و دواتـر کۆچـی کـرد بـۆ مەدینـە، کاتێـک حارثـە هـات بـۆ مەدینـەو زەیدی بینی زەیـد لەبـەر ڕێزی پێغەمبـەر(ﷺ) لەبـەری هەڵنەسـا، حارثـەو دەسـتەکەی بانگـی زەیدیـان کـرد بـەڵام ئـەو وەڵامـی نەدایـەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: ئـەی زەیـد ئەوانـە کێـن؟ وتـی: ئـەی پێغەمبـەر(ﷺ) ئەوەیـان باوکمـەو ئەوەشـیان ماممـەو ئەوەشـیان برامـەو ئـەوەش هۆزەکەمـن، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (دەی هەسـتەو سـەلامیان لـێ بکـە) ئەوانیـش سـەلامیان لێکـرد، ئینجـا وتیـان ئـەی زەیـد لەگـەڵ ئێمـە وەرەوە، زەیـد وتـی: بـەس لای پێغەمبـەری خـوام دەوێـت و نایگـۆڕمـەوە بـە کـەس، ئەوانیش وتیان ئـەی موحەممـەد چەنـد بەرامبـەر خوێـن بابیـت پـێ دەدەیـن لەبـری ئـەم کۆیلەیـە تـا بیدەیتـەوە پێمـان، چەنـدەت دەوێـت دەتدەینـێ، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: داواتـان لـێ دەکـەم شـایەتی بـدەن هیـچ پەرسـتراوێ نیـە جگـە لـە خـوا و مـن کۆتـاو سـەرمۆری پێغەمبەرانـی خـوام ئینجـا دەینێـرم لەگەڵتـان، بـەڵام ئـەوان بـەوە ڕازی نەبـوون، دواتـر پێغەمبـەر(ﷺ) ڕێـی دا بیبـەن، بـەڵام زەیـد ئامـادە نەبـوو لەگەڵیـان بـڕوات، دواتـر حارثـە وتـی: مـن خـۆم ئامـادەم موسـڵمان بـم، ئەوەبـوو شـایەتومانی هێنـا و ئەوانـی تـر ئامـادە نەبـوون موسـڵمان بـن.[1]

ئوسـامەی کـوڕی زەیـد لـە باوکیـەوە دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەر(ﷺ) بانگهێشـتی حارثـەی کوڕی شـەراحیلی کـرد بـۆ ئیسـلام و ئەویش موسـڵمان بـوو.[2]

---

[1] المستدرک علی الصحیحین، الرقم ٤٨٩٩.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٥٢٢.

## ٧٥٢. حارثەی کوڕی عەددی(رضي الله عنه)

ناوی حارثەی کوڕی عەددی کوڕی ئومەییەیە، دواتر لە شام نیشتەجێ بوو، وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو، فەرموودەیەکیشی گێڕاوەتەوەو دەڵێت: من و براکەم لەو وەفدەدا بووین کە چووینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) -نزای بۆ کردم- و فەرمووی: (اللهم بارك لحارثة في طعامه)،[1] (خوایە بەرەکەت بخەرە خۆراکی حارثەوە).

## ٧٥٣. حارثەی کوڕی قەطەن(رضي الله عنه)

ناوی حارثەی کوڕی قەطەنی کوڕی زابیری کەلبیە، وەک ئەندامێکی وەفدی کەلبیەکان هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)،[2] پێغەمبەری خواش(ﷺ) نامەی بۆ نووسی، هاوکات لەگەڵ خۆیدا براکەشی هێنابوو.[3]

## ٧٥٤. حارثەی کوڕی قەعین(رضي الله عنه)

ناوی حارثەی کوڕی قەعینی طائیە، وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمان بوو.[4]

## ٧٥٥. حارثەی کوڕی نوعمان(رضي الله عنه)

ناوی حارثەی کوڕی نوعمانی کوڕی نەفعی کوڕی زەیدە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان لە بەنی نەججار، کونیەکەی ئەبوو عەبدوڵایە.[5]

حارثە یەکێک بوو لە هاوەڵە زۆر خواناسەکان و لەگەڵ دایکیدا زۆر

---

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، ط١، دار الوطن (الرياض-١٩٩٨)، ج٢، ص ٧٤٦.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٣٣٤.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٥٢٣.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦١٧.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ٥٢٥.

چاکەکار بوو و لەناو مەدینەدا ناسرابوو بە چاکەکاری بەرامبەر بە دایکی.[1]

دایکی ناوی جەعدەی کچی عوبەیدە.[2]

ژنەکەی حارثە ناوی ئومموخالیدی کچی خالید بوو، ژنێکی تریشی هەبوو بە ناوی کەبشەی کچی ثابت کە خوشکی حەسسانی کوڕی ثابت بوو.[3]

منداڵەکانی حارثە بریتی بوون لە عەبدوڵا و عەبدورەحمان و سەودەو عومرە و ئومموهیشام، ئەمانە دایکیان ئومموخالید بوو.[4]

هەروەها کچێکی تریشی هەبوو بە ناوی ئومموکلثوم کە دایکی لە بەنی عەبدوڵا بوو، کچێکی تری هەبوو بە ناوی ئەمەتوڵا کە لە ژنێکی تری بوو.[5]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە بەشێکی زۆری کەسە نزیکەکانی خۆی لە ماڵی حارثەی کوڕی نوعماندا دانا تا لەوێ بمێننەوە تا شوێنێکیان بۆ دروست بکات، لەو ماوەدا پێغەمبەر(ﷺ) سەرقاڵ بوو بە دروستکردنی مزگەوتی مەدینەو ژوورەکانی دەوری.[6]

هەروەها کاتێک عەلی کوڕی ئەبوطالیب فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بە هاوسەر گرت، بۆ ماڵێک دەگەڕا تا تیایدا نیشتەجێ بێت، بەڵام خانوویەکی دوور لە ماڵی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەست کەوت و لەوێ گواستیەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ ماڵیان و پێی فەرموون دەیەوێت نزیکیان بکاتەوە لە ماڵی خۆی، فاطیمەش وتی: داوا لە حارثە بکە تا شوێنەکەی بگۆڕێتەوە لەگەڵمان تا نزیک بینەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (حارثە هێندە شوێنی خۆی بۆ چۆڵکردوین ئیتر رووم نایەت پێی بڵێم)،

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٣٧٨.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٨٧.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٤٤٩.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٨٧

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٨٧-٤٨٨.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ١٦٦.

حارثە ئەوەی بیستەوەو و هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیستوومە دەتەوێت فاطیمە لێتەوە نزیک بێت و ئەوەش خانووەکانی منن، من خۆم و ئەوەشی هەمە بۆ خوا و پێغەمبەری خوایە، سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەی تۆ لێم وەردەگریت لام زۆر خۆشترە لەوەی وازی لێ دێنیت بۆم، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (راست دەکەیت، خوا بەرەکەت برژێت بەسەرتدا)، ئەوەبوو فاطیمە هاتە ناو خانوویەکی حارثە کە نزیک مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، حارثە لە نزیک مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) چەند خانوویەکی هەبوو، هەر جارەو یەکێک لەو خانووانەی چۆڵ دەکرد بۆ خۆشەویستێکی پێغەمبەر(ﷺ) تا هەموو خانووەکانی ئەو شوێنەی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوسەرەکانی.[1]

هەروەها کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ماریەی پێشکەش کرا ئەوی بردە ماڵی حارثەی کوڕی نوعمان و حارثە ئەو خانووەی چۆڵکرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە ئەو خانووەی نزیک بوو لە مزگەوتەکەی پێغەمبەر(ﷺ).[2]

حارثە لە غەزای بەدر و ئوحودو خەندەق و هەموو غەزاکانی تریشدا بەشدار بوو.[3]

حارثەی کوڕی نوعمان دوو جار جبرەئیلی فریشتەی خوای دیوە، جارێکیان کە لە جەنگی بەنی قورەیضەدا جبرەئیل لە شێوەی دحیەی کوڕی خەلیفەی کەلبیدا خۆی نیشاندا و فەرمانی کرد چەک هەڵگرن و بچن بۆ جەنگی بەنی قورەیضە، جاری دووەمیش کاتێک لە جەنگی حونەین گەڕانەوە حارثە دای بە لای پێغەمبەردا(ﷺ) و بینی کەسێکی لەگەڵە، ئەو کەسەش جبرەئیل بوو، جبرەئیل وتی: ئەی موحەممەد ئەوە کێ بوو؟ فەرمووی حارثەی کوڕی نوعمان، ئەویش فەرمووی: ئەو یەکێکە

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ١٦٦.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢١٢.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٥٢٥.

لە سەد خۆراگرەکەی رۆژی حونەین کە خوا کەفیلی کردووە لە بەهەشتدا رۆزییان پێ بدات، ئەگەریش سەلامی بکردایە وەڵامی سەلامەکەیمان دەدایەوە.[1]

حارثە دەڵێت: دام بەلای پێغەمبەردا(ﷺ) کە جبرەئیل لەگەڵی دانیشتبوو، منیش سەلامم لێکرد و ئینجا تێپەڕ بووم، کاتێک گەڕامەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئایا ئەوەت بینی کە لەگەڵم بوو؟) وتم: بەڵێ، فەرمووی: (دەی ئەوە جبرەئیل بوو و وەڵامی سەلامەکەشی دایتەوە).[2]

ئومموهاشمی کچی حارثە دەڵێت: نزیکەی دوو ساڵ یان زیاتر تەنووری ماڵی ئێمەو ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) یەک تەنوور بوو، منیش سوورەتی (ق و القرآن المجید)م لە زمانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەرگرت کە هەموو رۆژێکی هەینی کاتێک وتاری دەفەرموو بۆ خەڵک لەسەر مینبەر دەیخوێند.[3]

حارثە لەسەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ) مژدەی بەهەشتی پێدراوە، ئەوەتا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (دخلت الجنة فسمعت قراءة، فقلت من هذا؟ قیل هذا حارثة بن النعمان، كذاكم البر، كذاكم البر)،[4] (چوومە بەهەشت لەوێ گوێم لە قورئان خوێندنێک بوو، وتم: ئەوە کێیە؟ وترا ئەوە حارثەی کوڕی نوعمانە، دەی چاکە ئاوا بکەن، دەی چاکە ئاوا بکە).

کاتێک غەزای خەیبەر تەواو بوو و پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان گەڕانەوە، پێغەمبەر(ﷺ) صەفییەی لەگەڵدا بوو، صەفییەی بردە ماڵێکی حارثەی کوڕی نوعمان و لەوێ دایناً، ژنانی مەدینەش هەواڵی جوانی صەفییەیان بیستبوو،

---

[1] سیر أعلام النبلاء، ج٢، ص ٣٧٨-٣٧٩.

[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار(ﷺ) - حدیث حارثة بن النعمان(ﷺ) ، الرقم ٢٤١٦٧، صححه شعیب الأرناؤوط.

[3] صحیح مسلم - كتاب الجمعة - باب تخفیف الصلاة والخطبة، الرقم ٨٧٣.

[4] صحیح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله علیهم أجمعین - ذكر حارثة بن النعمان رضوان الله علیه، الرقم ٧٠١٤، صححه الذهبي في التلخیص، صححه الألباني في صحیح و ضعیف الجامع الصغیر و زیادته، الرقم ٥٦٨٣، صححه شعیب الأرناؤوط في تعلیقه على مسند احمد بن حنبل.

بۆیە هاتن تا تەماشای بکەن، دایکی باوەڕداران عائیشەش چوو بینی، ئەو کات صەفییە موسڵمان بووبوو.[1]

لە غەزای حونەیندا کاتێک موسڵمانان سەرەتا تووشی تێکشکانێک بوون و بەشی هەرە زۆریان رایانکرد، ژمارەیەک لە هاوەڵان لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) مانەوە کە نزیکەی سەد کەس دەبوون، حارثە یەکێک بوو لەوانەو لە دەوری پێغەمبەری خوا(ﷺ) مایەوە.[2]

حارثە دوای سەردەمی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و بینایی لەدەستدا، بەڵام ئەوە رێی چاکەی لێ نەگرت و لە ماڵەوە لە شوێنی نوێژەکەیەوە پەتێکی راکێشابوو تا بەردەرگای ماڵەکەی، بەوە دەچوویە بەردەرگا، کاتێک هەژارێک تێدەپەڕی و سەلامی دەکرد حارثە بڕێک خورمای پێ بوو بەو پەتە خۆی دەگەیاندە بەردەرگا و لەو خورمای دەدا بەدەست هەژارەکانەوە، جا ژن و منداڵەکانی دەیانوت تۆ دانیشە ئێمە لە بری تۆ خورماکەی پێ دەدەین، بەڵام حارثە دەیوت من بیستوومە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (إن مناولة المسكين تقي ميتة السوء)،[3] (شت دان بەدەست هەژارەوە دەتپارێزێت لە مردنی خراپ).

لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا حارثە بەشدار بوو لە فتووحاتی ئیسلامیدا، دەبینین کاتێک ئەحنەفی کوڕی قەیس ناوچەی مەرو شاهجانی فەتح کرد و بڕیاری دا بکەوێتە دوای یەزدگورد، حارثەی کوڕی نوعمانی لەسەر مەرو شاهجان کردە بەرپرس.[4]

حارثە تا سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان ژیا و لە سەردەمی ئەودا کۆچی دوایی کرد، ئەوەش لە ساڵی پەنجاو یەکی کۆچیدا بوو.[5]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ١٢٦.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٣٣٠.

[3] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣١٥٤، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٨٤٢، ضعفه الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة، الرقم ٤٦٦٧.

[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٢٧.

[5] المنتظم في تاريخ الملوك و الأمم لابن الجوزي، ط١، دار صادر(بيروت-١٣٥٨هـ)ج٥، ص ٢٤٦.

**پەندو وانە**

خۆبەخشی و فیداکاری هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لە سەدان نموونەدا بەدیدەکەین کە چۆن خۆیان و ماڵ و گیانیان داناوە بۆ خزمەتی دین و هەر هەنگاوێکیشیان گرتوەتەبەر بۆ دڵخۆشکردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دەبینین کەسایەتیەکی وەک حارثەی کوڕی نوعمان لە روانگەی ماددیەوە ئامادە بووە خۆشەویستترین خانووەکانی ببەخشێت بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و کەسانی خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) تەنها بۆ ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) دڵخۆش بێت بە نزیکی خۆشەویستەکانی لێیەوە، لە روانگەی خۆبەخشیشەوە لە جەنگی حونەیندا لەو ساتەوەختەدا کە ئەگەری زۆری کوژران هەبوو، حارثەی کوڕی نوعمان لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) مایەوەو بەرگری لێ دەکرد، جا ئەمە هەمان فەرمایشتی خوایە کە وەسفی باوەڕداران دەکات بەوەی ماڵو گیانیان لە رێی خوادا دەبەخشن.

مەسەلەی بینینی جبرەئیل لەلایەن هاوەڵانەوە شتێکی روونە و لە چەند فەرمووەدەیەکدا هاتووە کە هاوەڵان جبرەئیلیان بینیوە، جار هەبووە بینینەکە بە کۆمەڵ بووە، جاریش هەبووە بینینەکە بە تەنها بووە، بینینە بە کۆمەڵەکە وەک ئەو فەرموودەی کە جبرەئیل هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) کاتێک لەناو هاوەڵاندا بوو و بە برێک پرسیار سەبارەت بە ئیسلام و ئیمان و ئیحسان و رۆژی دوایی گرنگترین رێنماییەکانی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بە هاوەڵان گەیاند و فەرموودەکەش بە صەحیحی لە صەحیحی بوخاری و کتێبەکانی تری فەرمـوودەدا هاتووە، بینینیش بە شێوەی تەنها وەک ئەم نموونەی حارثەی کوڕی نوعمان کە تەنها هاوەڵ بووە ئەوی بینیوە و دواتریش پێغەمبەر(ﷺ) خۆی هەواڵی پێداوە کە ئەو جبرەئیلی بینیوەو جبرەئیلیش وەڵامی سەلامەکەی ئەوی داوەتەوەو وەسفیشی کردووە.

## ٧٥٦. حارثەی کوڕی وەهب(رضي الله عنه)

ناوی حارثەی کوڕی وەهبی خوزاعیە، دایکی ناوی ئومموکلثومی کچی جەروەلی خوزاعیە، حارثە لە سەری دایکیەوە برای عوبەیدوڵای کوڕی عومەرە.[١]

حارثەی کوڕی وەهب دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیست دەیفەرموو (تصدقوا، فإنه يأتي عليكم زمان يمشي الرجل بصدقته فلا يجد من يقبلها، يقول الرجل لو جئت بها بالأمس لقبلتها، فأما اليوم فلا حاجة لي بها)،[٢] (خێر و صەدەقە بکەن، چونکە سەردەمێک دێت بەسەرتاندا کە پیاو صەدەقەی خۆی دەبات بۆ خەڵک کەچی کەسی دەست ناکەوێت لێی وەربگرێت، دەچێت بۆ لای کەسێک و ئەو کەسەش دەڵێت: ئەگەر دوێنێ بتهێنایە بە دڵنیاییەوە وەرمدەگرت، بەڵام ئەمڕۆ هیچ پێویستیەکم پێی نیە).

حارثەی کوڕی وەهب دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (ألا أخبركم بأهل الجنة؟ كل ضعيف متضعف، لو أقسم على الله لأبره، ألا أخبركم بأهل النار، كل عتل جواظ مستكبر)،[٣] (ئایا هەواڵی ئەهلی بەهەشتتان پێ بدەم؟ هەموو لاوازێکی بەلاواز دانراو کە ئەگەر سوێندی خوا بدات خوا سوێندەکەی ناخات، ئایا هەواڵی ئەهلی دۆزەختان پێ بڵێم؟ هەموو نەفامێکی دژکار و پیسکەیەکی پارە کۆکەرەوەی خۆبەزلزان).

## ٧٥٧. حارثی سەهمی(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی ئەبی قاربی قورەیشی سەهمیە، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە جەنگی ئەجنادەیندا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[٤]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦١٩.

[٢] صحيح البخاري - كتاب الزكاة - باب الصدقة قبل الرد. الرقم ١٤١١.

[٣] صحيح البخاري - كتاب تفسير القرآن - سورة ن والقلم - باب عتل بعد ذلك زنيم، الرقم ٤٩١٨.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٩٢.

## ٧٥٨. حارثی کوڕی ئەبی هالە(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی ئەبی هالەیە، برای هیندی کچی ئەبی هالەیە.

یەکەم هاوەڵ بوو لە مەککە لەلای بەیتدا شەهید بوو، کاتێک خوا فەرمانی کرد بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) تا پەیامەکەی ئاشکرا بگەیەنێت پێغەمبەر(ﷺ) لە لای کەعبە وەستا و فەرمووی: بڵێن لا إلە إلا الله براوە دەبن، ئەوەبوو بێباوەڕان بەرەو رووی چوون تا ئازاری بدەن، خێرا حارثی کوڕی ئەبی هالە چوو و کەوتە لێدانیان و دوورخستنەوەیان، ئەوانیش کەوتنە لێدانی تا کوشتیان.[١]

## ٧٥٩. حارثی کوڕی بیلال(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی بیلالی موزەنیە، لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بەرپرسیارێتی هەبوو، دوای سەردەمی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاوەو خالیدی کوڕی وەلید لە کاتی فتووحاتی عێراقدا لەگەڵ موثەننای کوڕی حارثەدا دایناوە.[٢]

## ٧٦٠. حارثی کوڕی تەمیم(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی تەمیمی کوڕی ئەبی عەمری ئومەویە، لە جەنگی بەدردا لەناو سوپای بێباوەڕاندا بەشدار بوو و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ئەوی بەدیل گرت.

حارث دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و هێندە پیر بوو تا لەپێ کەوت.[٣]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٥.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٥.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٨.

## ٧٦١. حارثی کوڕی توبەیع(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی توبەیع یان کوڕی تەبیعە، وەک وەفد هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)،[١] دوای پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاو لە فەتحی میصردا بەشداری کرد.[٢]

## ٧٦٢. حارثی کوڕی ثابت(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی ثابتی کوڕی سەعیدە، لە پشتیوانانە، لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.

## ٧٦٣. حارثی کوڕی ثابتی ئەنصاری(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی ثابتی کوڕی عەبدولایە، لە پشتیوانانە، لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو، هەرچەندە ئیبن ئەثیر پێی وایە ئەو دوو حارثە یەک بن بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: ئیبن ئەثیر نەیپێکاوە چونکە رەچەڵەکی ئەو دوانە جیایە.[٣]

## ٧٦٤. حارثی کوڕی جەمماز(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی جەممازی کوڕی مالیکە، برایەکی هەبوو بە ناوی کەعب، برایەکی تریشی هەبوو بە ناوی سەعد.[٤]حارث کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدولا.[٥]

حارثی کوڕی جەمماز لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو.[٦]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٥.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٤٦٧.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٥.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٤٦٨.

[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٧٢.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٦.

## ٧٦٥. حارثی کوڕی جوندوب(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی جوندوبی عەبدیە، یەکێک بووە لە ئەندامانی وەفدی عەبدولقەیس و هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمان بوو.[١]

## ٧٦٦. حارثی کوڕی حارث(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی حارثی ئەشعەری شامیە، کونیەکەی ئەبوو مالیکە، لەو هاوەڵانەیە کە لە شام نیشتەجێ بوو.[٢]

## ٧٦٧. حارثی کوڕی حارثی سەهمی(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی حارثی کوڕی قەیسی قورەیشی سەهمیە، ئەم هاوەڵە دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ژیاو لە جەنگی ئەجنادەین بەشداری کرد، دەوترێت لە ئەجنادەیندا شەهید بووە، رایەکی تریش دەڵێت: لە جەنگی یەرمووکدا شەهید بووە.[٣]

## ٧٦٨. حارثی کوڕی حارثی غامیدی(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی حارثی غامیدیەو کونیەکەی ئەبولمەخاریقە، لە هاوەڵانی دانیشتووی حیمصدا ئەژمار کراوە، حارث دەڵێت: ئێمە لە (منی) بووین لەگەڵ باوکم، وتم: باوکە ئەو خەڵکە بۆچی کۆبوونەتەوە؟ ئەویش وتی: ئەوانە لە دەوری لەدین دەرچوویەک کۆبوونەتەوە، منیش سەرکەوتم بینیم پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و خەڵکی بانگ دەکات بۆ یەکخواپەرستی.[٤]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٦.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٤٦٨.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٧.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٧.

## ٧٦٩. حارثی کوڕی حارثی کوڕی کیلده(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی حارثی کوڕی کیلدەی ثەقەفیە،[١] لەو کەسانەیە کە دوای فەتحی مەککە موسڵمان بوون.[٢]

## ٧٧٠. حارثی کوڕی حارثی ئەزدی(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی حارثی ئەزدیە، فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە،[٣] حارث دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەر(ﷺ) کە لە خواردن دەبوویەوە دەیفەرموو (اللهم لك الحمد طعمت وسقيت وأرويت لك الحمد غير مكفور ولا مودع ولا مستغنى عنك ربنا).[٤]

## ٧٧١. حارثی کوڕی حاطیب(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی حاطیبی کوڕی حارثی قورەیشی جومەحیە، باوکیشی لە هاوەڵانە، برایەکی هەبوو بە ناوی موحەممەد، حارث لە مەککە لەدایک بوو و لەگەڵ باوک و دایکیدا کۆچی کرد بۆ حەبەشە و لەوێ موحەممەدی برای لەدایک بوو.[٥]

دایکی ناوی حارثی کچی موجەللیلە.[٦]

حارث فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.

حارث دەڵێت: کەسێک لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) دزی کرد و هێنرا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: بیکوژن، هاوەڵانیش وتیان دەی ئەو

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٤٧١.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٧.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٦.

[٤] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣٢٩١.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٨.

[٦] أسد الغابة، ج١، ص ٤٧١.

تەنها دزی کردووە، فەرمووی: دەی دەستی ببڕن، ئەوەبوو دەستی بڕا، ئینجا هەمتر دزی کرد و دەستەکەی تریشی بڕا، ئینجا لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکردا دزی کرد و قاچێکی بڕا، ئینجا هەمتر دزی کرد و قاچەکەی تریشی بڕا، بۆ جاری پێنجەم کە دزی کرد ئەبووبەکر وتی: پێغەمبەر(ﷺ) شارەزاتر بوو بەمە کاتێک فەرمانی کرد بکوژرێت، بیبەن و بیکوژن.[1]

حارث دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە سەردەمی موعاویەدا مەروانی کوڕی حەکەم کە والی مەدینە بوو بەرپرسیارێتی دا بە حارث، دواتریش لە سەردەمی شۆڕشەکەی عەبدوڵای کوڕی زوبەیردا عەبدوڵا لە ساڵی شەست و شەشدا حارثی کرد بە والی مەککە.[2]

## ٧٧٢. حارثی کوڕی حاطیب(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی حاطیبی کوڕی عەمرە،[3] لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، کونیەکەی ئەبووعەبدوڵایە،[4] دایکی ناوی ئومامەی کچی صامت بوو، دایکیشی لە هاوەڵان بوو و بەیعەتی دابوو بە پێغەمبەر(ﷺ).[5]

حارث برای ئەعلەبەی کوڕی حاطیبە.[6]

خوشکێکی هەبوو بە ناوی حەفصە کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[7]

حارث ژنێکی هەبوو بە ناوی ئومموعەبدوڵا کە خوای گەورە منداڵێکی پێدان بە ناوی عەبدوڵا.[8]

---

[1] المستدرک علی الصحیحین، الرقم ٨٢٢٣، قال الذهبي في التلخیص إسناده منكر.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤٧١.
[3] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص ٥٦٨.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٤٧٢.
[5] الطبقات الكبری لابن سعد، ج٨، ص ٣٤٩.
[6] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص ٥٦٨.
[7] أسد الغابة، ج٧، ص ٧٤.
[8] الطبقات الكبری لابن سعد، ج٣، ص ٤٦١.

حارث لەگەڵ ثەعلەبەی برایدا لە غەزای بەدردا بەشدار بوو،[1] هەرچەندە رایەکی تر دەڵێت: کاتێک حارث ویستی بەشداری بکات پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی گێڕایەوەو دواتریش بەشداری پشک و پاداشتیشی کرد.[2]

دواتر حارث لە هەریەک لە غەزاکانی ئوحود و خەندەق و حودەیبیە و خەیبەریشدا بەشدار بوو و لە خەیبەردا شەهید بوو.[3]

ئیبن کەثیر هێناویەتی کە حارثی کوڕی حاطیب لە غەزای خەیبەردا شەهید بووە،[4] بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: بە سەنەدی لاواز هاتووە کە حارث تا سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیب ماوە و لە جەنگەکاندا بەشدار بووە.[5]

بەڵام رای یەکەم راستترە، ئیبن سەعد دەڵێت: حارث لە خەیبەردا بەشدار بوو و کەسێکی جوولەکە لەسەر قەڵاکەوە حارثی فڕێ دایە خوارەوە، بەوە حارث شەهید بوو.[6]

## ٧٧٣. حارثی کوڕی حەسسان(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی حەسسانی ذهیلە، یان بە بچووککراوەییش ناوی هاتووە بە حورەیث، ئەم کەسە لە دەرەوەی مەدینە نیشتەجێ بوو و وەک وەفدا هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێک ژنی هێنا وا باو بوو ئەوەی ژنی دەهێنا چەند رۆژێک لە نوێژی جەماعەتی بەیانی دوادەکەوت، ئەو وتی: بەخوا ژنێک لە جەماعەتی نوێژی بەیانیم بکات بە دڵنیاییەوە ژنێکی خراپ دەبێت.[7]

---

[1] البدايةوالنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٢٣٨.

[2] البدايةوالنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٣١٧.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٦١.

[4] البدايةوالنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢١٤.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٨.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٦١.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٩.

حارث دەڵێت: کاتێک ویستم بچم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بە ناوچەی رەبذەدا تێپەڕ بووم، لەوێ پیرەژنێکم بینی کە لە بەنی تەمیم بوو و لە چۆڵەوانیەکدا بوو،[1] وتی: بۆ کوێ دەچن؟ وتم: دەچم بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش وتی: دەی منیش لەگەڵ خۆتان بەرن ئیشم پێیەتی،[2] منیش لەگەڵ خۆمدا بردم تا چووینە مزگەوت، بینیم ئاڵایەکی رەش هەڵکرابوو و خەڵکی لە دەوری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوون، وتم: ئەوە چیە؟ وتیان پێغەمبەر(ﷺ) دەیەوێت عەمری کوڕی عاص بنێرێت بۆ هێرش بردن، بیلالیش شمشێرێکی بەدەستەوە بوو و لە بەردەم پێغەمبەردا(ﷺ) وەستابوو، منیش لە مزگەوتدا دانیشتم تا پێغەمبەر(ﷺ) هاتەوە مزگەوت، مۆڵەتی دام و منیش چوومە خزمەتی، فەرمووی: (هیچ لەنێوان ئێوەو بەنی تەمیمدا هەبووە؟) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئێمە دامان بەو ناوچەدا و پیرەژنێکی بەنی تەمیمم بینی و هێنام لەگەڵ خۆم و وا ئێستاش لەبەر دەرگای مزگەوتە، پێغەمبەر(ﷺ) داوای کرد بێتە ژوورەوە، ئەویش هاتەژوورەوە، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێت چۆنە (دهناء) بکەیتە دیواری نێوان ئێمەو بەنی تەمیم چونکە ئەو ناوچە هی ئێمە بوو، پیرەژنەکەش بەوە تووڕە بوو و نیوەئەژنۆ دانیشت و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی موضەرەکەت ناچار بە کوێ بن؟[3] منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە ئەم پیرەژنەمان هێناو نەماندەزانی نەیاری ئێمە دەبێت، پەنا دەگرم بە خوا و بە پێغەمبەری خوا کە من وەک وەفدی عاد بم، فەرمووی: ئێ نوێنەری عاد چیە؟ (لەویش شارەزاتر بوو بە مەسەلەکە، بەڵام ویستی رای وەرگرێت)، وتم: عاد کە تووشی وشکەساڵی بوون نوێنەری خۆیان نارد، نێردراوەکەیان پێی دەوترا قەیل، دای بە لای موعاویەی کوڕی بەکردا و مانگێک لای مایەوە و مەی لا

[1] مسند أحمد بن حنبل – مسند المكيين(ﷺ) – حديث الحارث بن حسان البكري(ﷺ)، الرقم ١٦٢٠٠.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤٧٣.
[3] مسند أحمد بن حنبل – مسند المكيين(ﷺ) – حديث الحارث بن حسان البكري(ﷺ)، الرقم ١٦٢٠٠.

دەخواردەوەو دوو کەنیزەکیش گۆرانییان بۆ دەوت کە پێییان دەوترا دوو جەرادەکە (دوو گۆرانی بێژی ناسراوی ئەوکات بوون)، کاتێک مانگەکە تەواو بوو چوو بۆ شاخی تیهامەو هاواری کرد خوایە تۆ دەزانیت من نەهاتوم تا نەخۆشێک تیمار بکەم و نەهاتوم بۆ ئازادکردنی دیلێک، خوایە بارانت برژە بەسەر عاددا، ئەوەبوو کۆمەڵێک هەوری رەش هات و دەنگی لێوە دەهات هەڵبژێرە، ئەویش ئاماژەی دا بە هەورێکی رەشیان، دەنگی لێوە هات بەخوڕ ببارەو کەس لە عاد مەهێڵە،[1] دەڵێت: کاتێک بیستم رەشەبایان بۆ چووە هەموویانی لەناوبردووە)، بۆیە هەرکات پیاوێک یان ژنێک بە وەفد بچوایە دەیانوت وەک نێردراوەکەی عاد مەبە.[2]

ئەم هاوەڵە دواتر لە کووفە نیشتەجێ بوو.[3]

## ٧٧٤. حارثی کوڕی حوباب(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی حوبابی کوڕی ئەرقەمە، لە پشتیوانانە، برای حارثەی کوڕی نوعمان بووە لە سەری دایکەوە،[4] چونکە دایکیان ناوی جەعدەی کچی عوبەید بووە،[5] کونیەکەی ئەبوومولعاذی قاریە.[6]

حارث لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو، بەردەوام لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بووەو دوای سەردەمی پێغەمبەری خواش(ﷺ) ژیا و لە غەزای جسر ئەبی عوبەیددا بەشداری کردو تیایدا شەهید بوو.[7]

---

[1] جامع الترمذي - أبواب تفسير القرآن عن رسول الله(ﷺ) - باب ومن سورة الذاريات، الرقم ٣٢٧٣، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٣٢٧٣.

[2] () مسند أحمد بن حنبل - مسند المكيين(ﷺ) - حديث الحارث بن حسان البكري(ﷺ)، الرقم ١٦٢٠٠، حسنه شعيب الأرناؤوط.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤٧٣.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٩.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٨٧.

[6] أسد الغابة، ج١، ص ٤٧٢.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٩.

## ٧٧٥. حارثی کوڕی حیبال(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی حیبالی کوڕی ڕەبیعەیە، لە پشتیوانانە لە ئەسلەمیەکان، لە حودەیبیەدا بەشدار بوو.[١]

## ٧٧٦. حارثی کوڕی خالید(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی خالیدی کوڕی صەخری کوڕی عامیری قورەیشی تەمیمیە، یەکێک بوو لە کۆچەرانی حەبەشە کە لەگەڵ جەعفەری کوڕی ئەبوو تالیبدا کۆچی کرد بۆ حەبەشە، هاودەم بە خۆی ژنەکەشی کۆچی کرد بۆ حەبەشە کە ناوی ڕەیطەی کچی حارث بوو، لەوێ خوای گەورە ئەم منداڵانەی پێ بەخشین (مووسا، عائیشە، زەینەب، فاطیمە).[٢]

ڕایەک دەڵێت: هەموو منداڵەکانی حارث لە حەبەشە مردن، ڕایەکی تریش دەڵێت: بەڵکو کاتێک حارث هاودەم بە ژن و منداڵەکانی ویستی بێتەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕێدا لە ئاوێکیان خواردەوە کە بەو هۆیەوە هەموو منداڵەکانی مردن و تەنها خۆی بە سەلامەتی دەرچوو.[٣]

کاتێک حارث هاودەم بە هاوەڵانی تری حەبەشە لە فەتحی خەیبەر گەڕایەوە بۆ مەدینە پێغەمبەر(ﷺ) کچی عەبدیەزیدی لێ مارە کرد.[٤]

هەرچەندە منداڵێکی حارث بە ناوی ئیبراهیم مابوو، بەڵام ئیبن ئەثیر دەڵێت: لەوانەیە منداڵێکی تری دوای ئەو منداڵانە بوو بێت و ناوی نابێتەوە ئیبراهیم.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٩.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٠.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٤٧٥.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٠.
[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٤٧٦.

## ٧٧٧. حارثی کوڕی خەزمە(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی خەزمەی کوڕی عەددیە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە تەمەنی حارث سی و حەوت ساڵ دەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) کە برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانان هەریەک لە حارثی کوڕی خەزمەو ئیاسی کوڕی بکیری کرد بە برای یەک.[1]

یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدری گەورە، دواتریش لە هەموو غەزاکانی تردا بەشداری کرد، لە غەزای خەیبەریشدا بەشدار بوو، کاتێک وشترەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ون بوو دووڕووەکان دەیانوت موحەممەد هەواڵی وشترەکەی خۆی پێ نیە چ جای هەواڵی ئاسمان؟!! پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (من تەنها ئەوە دەزانم کە خوا فێرم دەکات، شوێنی وشترەکەشی فێرکردوم و لە فلانە دۆڵە)، خێرا حارثی کوڕی خەزمە چوو وشترەکەی هێنایەوە.[2]

حارث دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە ساڵی چلی کۆچی و لە تەمەنی شەست و حەوت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

## ٧٧٨. حارثی کوڕی خوفاف(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی خوفافی کوڕی ئیمائی غیفاریە، حارث هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، بەلام موخەللەدی برای تابعی بووە.[3]

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٠.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤٧٦.
[3] الإصابة في تمييز الصحاب، ج١، ص ٥٧٢.

## ٧٧٩. حارثی كوڕی رافیع(ﷺ)

ناوی حارثی كوڕی رافیعه، له غه‌زای ئوحوددا شه‌هید بوو.[١]

## ٧٨٠. حارثی كوڕی ره‌بیع(ﷺ)

ناوی حارثی كوڕی ره‌بیعی كوڕی زیادی كوڕی سوفیانی عه‌به‌سیه، یه‌كێك بووه له‌و نۆ ئه‌ندامه‌ی وه‌فدی به‌نی عه‌به‌س كه هاتنه خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) و موسڵمان بوون و پێغه‌مبه‌ری خوایش(ﷺ) نزای خێری كرد بۆیان.[٢]

## ٧٨١. حارثی كوڕی زه‌ید(ﷺ)

ناوی حارثی كوڕی زه‌یدی كوڕی حارثه‌ی عه‌بدیه، دایكی ناوی ذه‌ومه‌له‌ی كچی روه‌یمه، كونیه‌كه‌ی ئه‌وبوو عیتابه، له ساڵی بیست و یه‌كی كۆچیدا كوژرا.[٣]

## ٧٨٢. حارثی كوڕی زه‌یدی ئه‌وسی(ﷺ)

ناوی حارثی كوڕی زه‌یدی كوڕی عه‌ططافه، له پشتیوانانه له ئه‌وسیه‌كان.[٤]

## ٧٨٣. حارثی كوڕی زوهه‌یر(ﷺ)

ناوی حارثی كوڕی زوهه‌یری كوڕی ئوقه‌یشی عه‌كلیه، چووه‌ته خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) و پێغه‌مبه‌ریش(ﷺ) نامه‌یه‌كی نووسی بۆ خۆی و هۆزه‌كه‌شی كه تیایدا نووسراوه (به‌ناوی خوای به‌خشنده‌ی میهره‌بان، ئه‌مه نووسینێكه

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٢.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٢.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٤٨١.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٥.

لە موحەممەدی پێغەمبەر نێردراوی خواوە بۆ بەنی ئوقەیش...).[1]

ئیبن ئەثیر دەڵێت: گومانم نیە ئەم هاوەڵە لەگەڵ حارثی کوڕی ئوقەیش هەر یەک کەسایەتیە،[2] بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: ئیبن ئەثیر لەوەدا نەیپێکاوە.[3]

## ٧٨٤. حارثی کوڕی زیاد(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی زیادە، لە پشتیوانانە لە بەنی ساعیدە، لەو هاوەڵانەیە کە تا کۆتایی ژیانیان لە مەدینە بوون، هەرچەندە ئەبوو ئەحمەدی عەسکەری دەڵێت: دواتر چووە لە کووفە نیشتەجێ بووە،[4] هەروەها ئیبن سەعدیش هەمان رای هەیە و دەڵێت: چووەتە کووفە.[5]

حارث لە غەزای بەدر و غەزاکانی تردا بەشداری کرد، لە غەزای خەندەقیشدا بەشدار بوو و کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) بەیعەتی لە خەڵک وەردەگرت لەسەر هیجرەت، حارثیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەیعەت لەم کەسە وەربگرە، ئەویش فەرمووی: ئەوە کێیە؟ حارث وتی: ئەوە حەوطی کوڕی یەزیدی ئامۆزامە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لا أبايعك، إن الناس يهاجرون إليكم ولا تهاجرون إليهم، والذي نفس محمد(ﷺ) بيده لا يحب رجل الأنصار حتى يلقى الله تبارك وتعالى إلا لقي الله وهو يحبه، ولا يبغض رجل الأنصار حتى يلقى الله إلا لقي الله وهو يبغضه)،[6] (بەیعەتت لێ وەرناگرم -لەسەر هیجرەت-، چونکە خەڵکی کۆچ دەکەن بۆ لای ئێوەو ئێوە کۆچ ناکەن بۆ لای خەڵکی، سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٣.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٤٨٠.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٣.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٤٨١.
[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٦، ص ١٨.
[6] مسند أحمد بن حنبل - مسند المكيين(ﷺ) - حديث الحارث بن زياد(ﷺ) ، الرقم ١٥٧٨٠، قال شعيب الأرناؤوط إسناده قوي، حسنه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ١٦٧٢.

هەرکەسێک پشتیوانانی خۆش بوێت تا دەگاتەوە بە خوای گەورە ئەوا کە دەگاتەوە بە خوا خوای گەورە خۆشی دەوێت، هەرکەسیش رقی لە پشتیوانان بێت تا دەگاتەوە بە خوا کاتێک دەگاتەوە بە خوا خوای گەورە رقی لێیەتی).

## ٧٨٥. حارثی کوڕی سەعید(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی سەعیدی کوڕی قەیسی کیندیە، وەک وەفد هاتووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).[١]

## ٧٨٦. حارثی کوڕی سەلەمە(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی سەلەمەی عەجلانیە، لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو، هیچ فەرموودەیەکی لێوە نەگێردراوەتەوە.[٢]

## ٧٨٧. حارثی کوڕی سەلیم(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی سەلیمی کوڕی ثەعلەبەی عەدویە، ئەم هاوەڵە بەشدار بوو لە غەزای بەدر و ئوحوددا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[٣]

## ٧٨٨. حارثی کوڕی سەهل(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی سەهلە، یان دەوترێت ناوی حوبابە، ئیبن حەجەر دەڵێت: پێدەچێت دوو کەسایەتی جیا بن و برای یەک بن، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە، لە غەزای طائیفدا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[٤]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٤٨٣.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٤٨٤.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٦.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٦.

## ٧٨٩. حارثی کوڕی سواد(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی سـوادە، لـە پشـتیوانانەو یەکێکـە لـە بەشـداربوانی غـەزای بـەدر.[١]

## ٧٩٠. حارثی کوڕی سومید(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی سوەیدی کوڕی صامتە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، برایەکی هەبوو بە ناوی جولاس.[٢]

حارث لە غەزای بەدردا بەشدار بوو.[٣]

حارثـی کـوڕی سـوەید بـاوەڕی هێنـا و دواتـر هەڵگەڕایـەوە، دواتـر کەسێک خۆی گەیاند بە حارث و ئـەم ئایەتـەی بـۆ خوێنـدەوە (کیف یهدی الله قوما کفروا...) ئەویش وتـی: بەخـوا راسـت دەکەیت و خـواش راسـتگۆترینە، بۆیـە موسـڵمان بوویـەوەو گەرایـەوە، دواتـر لـە غـەزای ئوحـوددا بکوژەکـەی باوکـی بینـی و کوشـتی، پێغەمبـەر(ﷺ) سـزای ئیسـلامی بەسـەردا جێبەجـێ کـرد و کوشـتیەوە، چونکـە ئـەو کەسـە پێش هاتنـی ئیسـلام باوکـی حارثـی کوشـتبوو.[٤]

طەبـەری دەڵێت: هەنـدێ دەڵێـن ئـەم ئایەتـە سـەبارەت بـە حارثـی کـوڕی سـوەید دابەزیـوە (کیف یهدي الله قوما کفروا بعد إیمانهم وشهدوا أن الرسول حق وجآءهم البینات والله لا یهدي القوم الظالمین أولئك جزآؤهم أن علیهم لعنة الله والملائکة والناس أجمعین خالدین فیها لا یخفف عنهم العذاب ولا هم ینظرون إلا الذین تابوا من بعد ذلك وأصلحوا فإن الله غفور رحیم)، بۆیـە حـارث کـە مورتـەد بوویـەوە دواتـر هەواڵـی نـارد بـۆ هۆزەکـەی وتـی: بـە پێغەمبـەر(ﷺ) بڵێـن بزانـن تەوبـەم بـۆ هەیـە؟ ئەوەبوو ئـەو ئایەتـە

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٤٨٤.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٦.

[٣] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٢٨.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٦-٥٧٧.

دابەزی، هۆزەکەی بە کەسێکدا ئەو ئایەتەیان بۆ نارد و ئەویش هەمدی موسڵمان بوو.[1]

موجەذەری کوڕی زیاد لە سەردەمی نەفامیدا لە جەنگی بوعاثدا سوەیدی کوڕی صامتی کوشت، دواتر موجذەر موسڵمان بوو، لە غەزای ئوحودیشدا بەشداری کرد، حارثی کوڕی سوەیدیش لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو، حارث دەمێک بوو بۆ دەرفەت دەگەڕا تا موجذەری دەست بکەوێت و بیکوژێت، بۆیە کە لەوێ ئەوی دەست کەوت لە پشتەوە چوو بۆی و کوشتی، ئەوەبوو جبریل سەلامی خوای لێ بێت هەواڵی دا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە حارث موجەذەری کوشتووەو فەرمانی کرد بکوژرێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد حارث بکوژرێتەوە، بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) عوەیمی کوڕی ساعیدە لەبەردەرگای مزگەوتی قوبائدا حارثی کوشت.[2]

کاتێک جبریل فەرمانی کرد بە کوشتنی حارث پێغەمبەر(ﷺ) سواری وشترەکەی بوو و هات بۆ لای مزگەوتی قوبا، حارث هات بۆ لای، پێغەمبەر(ﷺ) کە حارثی بینی عوەیمی کوڕی ساعیدەی بانگ کرد و فەرمووی: بەرامبەر بە کوشتنی مجذەر بدە لە گەردنی حارث ، حارثیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوێند بە خوا من لەبەر هەڵگەڕانەوەم لە ئیسلام ئەوم نەکوشتووە، بەڵکو لەبەر دەمارگیری کوشتم، وە من دەگەڕێمەوە بۆ لای خواو خوێن بابیەکەشی دەدەم و ڕۆژوو دەگرم و کۆیلە ئازاد دەکەم، دەستیشی گرتبوو بە سوارەکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) تا هەموو قسەکانی تەواو کرد، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی عوەیم ببیە بدە لە گەردنی، ئەویش بردی و لەبەر دەرگای مزگەوتدا دای لە گەردنی.[3]

---

[1] تفسير الطبري، ج٣، ص ٣٣٩-٣٤٠.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٥٢.

[3] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٢٨.

وەستانێک:

سەبارەت بە حارث دوو رای جیاواز هەیە:

ذەهەبی دەڵێت: دەستەیەک لە ئەوسی و خەزرەجیەکان لەبەر هۆزەکانیان بە رووکەش موسڵمان بوون بەڵام دووڕوو بوون، لەوانەش حارثی کوڕی سوەیدی کوڕی صامت.[1]

بەڵام طەبەری گێرانەویەکی هێناوە کە کاتێک حارث تەوبەی کردووە موسڵمان بووەتەوەو بە چاکیش موسڵمان بووە.[2]

لێرەدا پرسیارێک دەکرێت ئایا حارثی کوڕی سوەید مەرجی هاوەڵبوونی تێدایە؟ چونکە جارێک مورتەد بوەتەوەو لەسەر فەرمانی پێغەمبەری خوایش(ﷺ) کوژراوە.

لە وەڵامدا دەڵێین:

مەرجی هاوەڵبوون ئەوەیە کەسێک پێغەمبەری خوای(ﷺ) بە واقیعی دیبێت و باوەڕی پێ هێنابێت و لەسەر ئەوەش مردبێت، بۆیە ئەگەریش مورتەد بوویەوەو باوەڕی هێنایەوەو پێغەمبەری خوای(ﷺ) بینیەوەو بە باوەرداری مرد ئەوە هیچ خیلافێک نیە لە هاوەڵبوونی.

سەبارەت بەوەی لەسەر فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) کوژراوە، ئەمە نابێتە بەڵگەی بێباوەڕبوونی، بەڵکو حەددێکی ئیسلامی بەسەردا جێبەجێ کراوە کە کوژرانەوەیە لەبری کوشتنی کەسێک، چونکە دەبینین ئافرەت هەبووە لەسەر زینا رەجم کراوە لەکاتیکدا پێغەمبەر(ﷺ) شایەتی داوە بۆ تەوبەکردنی و وەرگیرانی تەوبەکەشی.

ئەوەی ذەهەبی دەڵێت: لە مونافیقان بووە، ئەوەیان پێویستی بە بەڵگە هەیەو ئەگەر بچەسپێت ئەوە لە مەرجی هاوەڵبوونی دەکات، چونکە دووروەوان لە هاوەڵان نین.

---

[1] تاريخ الإسلام، ج٢، ص ٣٨.

[2] تفسير الطبري، ج٣، ص ٣٤٠.

بەڵام ئەمەش بەڵگەی لەسەر نیە، بەڵکو بەڵگەی هاوەڵبوونی زیاترە:
**یەکەم:** ذەهەبی خۆی هێناویەتی کە حارث لە غەزای بەدردا بەشداری کردووە، جا ئێمە لە بەرگی یەکەمدا باسمان کردووە کە بەشداربوانی بەدر چ تایبەتمەندیەکیان هەیە.
**دووەم:** طەبەری دەڵێت: کە تەوبەی کردووە زۆر بە چاکی تەوبەی کردووە.
**سێیەم:** حارث خۆی لە پێش جێبەجێکردنی حەدد بەسەریدا بە پێغەمبەری خوای(ﷺ) وت: (ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوێند بە خوا من لەبەر هەڵگەڕانەوەم لە ئیسلام ئەوم نەکوشتووە، بەڵکو لەبەر دەمارگیری کوشتم، وە من دەگەڕێمەوە بۆ لای خواو خوێن باییەکەشی دەدەم و رۆژوو دەگرم و کۆیلە ئازاد دەکەم).[1]

## ٧٩١. حارثی کوڕی سوراقە(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی سوراقەی کوڕی حارثە، لە پشتیوانانە لە بەنی نەججار، لە غەزای بەدردا بەشدار بوو و تیایدا شەهید بوو.[2]

## ٧٩٢. حارثی کوڕی سوفیانی قوڕەیشی(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی سوفیانی کوڕی مەعمەری قوڕەیشیە، هاوەدەم بە سوفیانی باوکی لە خاکی حەبەشەوە هات بۆ مەدینە.[3]

## ٧٩٣. حارثی کوڕی سوفیانی مەخزوومی(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی سوفیانی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزوومیە، برایەکی هەبوو بە ناوی ئەبووسەلەمە.[4]

---
[1] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٢٨.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٥.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤٨٣-٤٨٤.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٦.

## ٧٩٤. حارثی کوڕی عەتیک(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی ئەوسی کوڕی عەتیکە.[١]

حارث برایەکی هەبوو بە ناوی ئەنەس کە لە جەنگی ئوحوددا بەشداری کردووە، لە جەنگی خەندەقیشدا بەشداری کرد.[٢]

حارث بەشدار بووە لە غەزای ئوحوددا، لە غەزاکانی دواتریشدا بەشدار بووە،[٣] دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە ڕۆژی ئەجنادەیندا لە بیست و هەشتی جەمادیلئوولای ساڵی سیانزەی کۆچی لە شام کوژرا.[٤]

## ٧٩٥. حارثی کوڕی عەتیکی کوڕی نوعمان(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی عەتیکی کوڕی نوعمانە، لە پشتیوانانە لە بەنی نەججار، کونیەکەی ئەبوحەزمە، لە غەزای ئوحود و هەموو غەزاکانی تردا بەشداری کرد، دوای سەردەمی پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ژیا و لە جەنگی جسر ئەبوعوبەیددا بەشدار بوو و تیایدا شەهید بوو.[٥]

## ٧٩٦. حارثی کوڕی عەددی کوڕی مالیک(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی عەددی کوڕی مالیکی کوڕی حەرامە، ئەم هاوەڵەش لە پشتیوانانە، لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد.[٦]

سەبارەت بە کاتی مردنی دوو را هەیە، رایەک دەڵێت: لە غەزای ئوحوددا شەهید بووە، رایەکی تریش دەڵێت: لە ساڵی پانزەی کۆچی لە جەنگی جسردا شەهید بووە.[٧]

---

[١] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٨١.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢١.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٦٣.
[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٤٦٤.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٦.
[٦] أسد الغابة، ج١، ص ٤٩٦.
[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٦.

## ٧٩٧. حارثی کوڕی عەددی(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەددی کوڕی خەرشەیە، لە پشتیوانانە، لە جەنگی ئوحوددا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[١]

## ٧٩٨. حارثی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەمری کوڕی حەرامی کوڕی عەمرە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان.

حارث برایەکی هەبوو بە ناوی سەعد، هەردووکیان پێکەوە لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوون، هەردووکیشیان مانەوە تا لە جەنگی صفیندا لەناو سوپای عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا بەشدارییان کرد.[٢]

## ٧٩٩. حارثی کوڕی عەمری باهیلی(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەمری کوڕی ثەعلەبەی باهیلی سەهمیە، کونیەکەی ئەبوومسبەقەیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، کوڕێکی تریشی هەبوو بە ناوی کەریم.[٣]

حارث دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر(ﷺ)لە عەرەفە بوو چووم بۆ لای، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە خوا لێم خۆش بێت، ئەویش فەرمووی: (خوا لێتان خۆش بێت)، منیش چوومە ئەولاترەوە تا جیا لەو خەڵکەی تر بە تایبەت ئەو نزایەم بۆ بکات و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای لێخۆشبوونم بۆ بکە خوا لێم خۆش بێت، ئەویش فەرمووی: (خوا لێتان خۆش بێت).[٤]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٤٩٥.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٧.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٨.

[٤] السنن الكبرى للنسائي - كتاب عمل اليوم والليلة - ما يقول إذا أذنب ذنبا بعد ذنب ، الرقم ١٠١٨١،

## ٨٠٠. حارثی کوڕی عەمری طائی(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەمری طائیە دواتر لە شام نیشتەجێ بوو، دواجاریش چوو بۆ غەزا لە ئەرمینیا و ئەمیری سوپا بووە و لەوێ لە سەنگەردا وەفاتی کرد.[١]

## ٨٠١. حارثی کوڕی عەمری عەدەوی(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەمری کوڕی موئەممەلی کوڕی حەبیبە، قورەیشیەو لە عەدەویەکانە، واتە لە کۆچەرانە.[٢]

حارث یەکێکە لەو حەفتا کەسەی لە فەتحی خەیبەردا کۆچیان کرد بۆ مەدینە.[٣]

## ٨٠٢. حارثی کوڕی عەمری کوڕی غەزیە(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەمری کوڕی غەزیەیە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان.[٤]

## ٨٠٣. حارثی کوڕی عەمری ئەنصاری(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەمرە، لە پشتیوانانە، خاڵۆی یان دەوترێت مامی بەررائی کوڕی عازبە.[٥]

پێغەمبەر(ﷺ) بیستبووی پیاوێک چووە ژنەکەی باوکی بەهاوسەر گرتووە، بۆیە حارثی کوڕی عەمری نارد تا بیکوژێت، کاتێک دەیویست

ضعفه الألباني في سنن النسائي، الرقم ٤٢٢٦.

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٨.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٤٩٩.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٧.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٧

[٥] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٩٤.

بڕوات، بەڕراء وتی: مامە گیان بۆ کوێ دەچیت؟ ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناردوومی تا بچم بدەم لە گەردنی ئەو پیاوەی باوەژنەکەی بە هاوسەر گرتووەتەوە.[1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە بەڕراء وتی: ئەرێ خاڵۆ بۆ کوێ دەچیت.[2]

## ٨٠٤. حارثی کوڕی عورفجە(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی عورفجەی کوڕی حارثە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، بەشداربوویەکی غەزای بەدر بوو.[3]

## ٨٠٥. حارثی کوڕی عوقبە(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی عوقبەی کوڕی قابووسی موزەنیە.[4]

حارث لەگەڵ وەهبی مامیدا بە بڕێک مەڕەوە هات بەرەو مەدینە، کەچی بینییان مەدینە چۆڵە، بۆیە چون بەرەو ئوحود و چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمان بوون و دەستیان کرد بە جەنگ دژ بە بێباوەڕان تا هەردووکیان شەهید بوون، عومەری کوڕی خەططاب دەیوت خۆشترین مەرگ لەلام مەرگی موزەنیەکانە.[5]

## ٨٠٦. حارثی کوڕی عومەیری ئەزدی(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی عومەیری ئەزدیە، نێردراوی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو بۆ لای پاشای بوصرا تا نامەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) پێ بگەیەنێتە

---

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٩٠٥.

[2] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٢٧٠٧.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤٩٦.

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٩٧.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٧.

دەست،[1] کاتێک گەیشتە ناوچەی موئتە، شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسانی ڕێی پێ گرت و بەستیەوەو دای لە گەردنی و کوشتی، کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو هەواڵەی پێ گەیشت سوپای نارد بەرەو موئتە.[2]

## ٨٠٧. حارثی کوڕی فەروە(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی فەروەی کیندیە، وردەکاری سەبارەت بە ژیانی نەهاتووە.[3]

## ٨٠٨. حارثی کوڕی قەیس(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی قەیسی کوڕی خەلدەیە، کونیەکەی ئەبووخالیدە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان.[4]

دایکی ناوی کەبشەی کچی فاکیهە، هەروەها ژنەکەی ناوی ئەنیسەی کچی نەسرە، لەم ژنەی چەند منداڵێکی هەبوو (موخەللەد و خالید و خولدە).[5]

حارث لە بەیعەتی عەقەبە و غەزای بەدر و زۆربەی غەزاکانی تریشدا بەشدار بوو، پاش وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە جەنگی یەمامەشدا بەشداری کرد و تیایدا بریندار بوو، بە هۆی ئەو برینەیەوە لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا کۆچی دوایی کرد.[6]

## ٨٠٩. حارثی کوڕی کورز(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی کورزە، دواتر لە حیمص نیشتەجێ بوو.[7]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٤٩٩.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٤٣.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٩٢.

[4] أسد الغابة، ج١، ص ٥٠٢.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٩١.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ١٠٣.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٩٤.

## ٨١٠. حارثی کوڕی مالیکی کینانی(ﭬ)

ناوی حارثی کوڕی مالیکی کوڕی قەیسی کینانیە، ناسراوە بە ئیبنولبەرصاء، بە ناوی دایکیەوە یان دەوترێت بە ناوی نەنکیەوە ناسراوە، نیشتەجێی مەککە بوو و دواتر چوو لە مەدینە نیشتەجێ بوو.[1]

چەند فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[2]

حارث دەڵێت: ڕۆژی فەتحی مەککە بیستم پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (لا تغزى هذه بعد اليوم إلى يوم القيامة)،[3] (ئەم شارە لەمڕۆ بەدواوە تا ڕۆژی دوایی هێرشی ناکرێتە سەر).

لە سەردەمی ئەمیرایەتی مەروانی کوڕی حەکەمدا حارث دەچوو سەردانی مەڕوانی دەکرد و لە کۆڕیدا دادەنیشت، جارێک وترا فەیء هی خوایەو عومەری کوڕی خەططابیش لە شوێنی خۆیدا دایناوە، مەڕوانیش وتی: فەیء هی ئەمیری باوەڕداران موعاویەیەو چۆن بیەوێت وا دایدەنێت، حارث چوویە دەرەوەو گەیشت بە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و مەسەلەکەی بۆ باس کرد، سەعیدی کوڕی موسەیب دەڵێت: دەمویست بچمە مزگەوتەوە کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بانگی کردم و وتی: وەرە لەگەڵم، منیش لەگەڵی چووم تا چووینە لای مەڕوانی کوڕی حەکەم، سەعد لێی تووڕە بوو کە بۆ قسەی وای کردووە، دواتر مەڕوان پرسیاری کرد کێ پێی وت، وترا حارث پێی وت، مەڕوان بڕیاری دا کراسەکەی حارث لاببەن و لێی بدەن، لەو کاتەدا دەرگاوانەکەی مەڕوان هات و وتی: حەکیمی کوڕی حیزام-کە هاوەڵێکی گەورەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو- داوای هاتنە ژوورەوە دەکات، خێرا

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٩٦.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠٥.

[3] جامع الترمذي - أبواب السير عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء ما قال النبي(ﷺ) يوم فتح مكة إن هذه لا تغزى بعد اليوم ، الرقم ١٦١١ وقال حسن صحيح.

مەڕوان وتی: جلەکانی بکەنەوە بەر و بیبەنە دەرەوە با ئەم پیاوەشمان لێ هان نەدات.[1]

## ٨١١. حارثی کوڕی مالیکی ئەنصاری(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی مالیکە و لە پشتیوانانە.

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: ڕۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) گەیشت بە حارث و پێی فەرموو (ئەی حارث چۆن بەیانیت کردەوە؟) ئەویش وتی: بە بڕوای حەقم بۆ خوا بەیانیم کردەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بزانە چی دەڵێیت چونکە هەر شتێک ڕاستیەکی هەیە ئەی ڕاستی ئیمانەکەی تۆ چیە؟)، ئەویش وتی: دەروونم تۆراند لە دنیا و بۆ ئەوەش شەو بێدار بووم و ڕۆژم بە ڕۆژوو بووم و حاڵێکم هەبوو وامدەزانی بە ڕوونی تەماشای عەرشی پەروەردگارم دەکەم و دەبینم بەهەشتیەکان سەردانی یەکتریان دەکرد، باری نارەحەتی دۆزەخیەکانیشم دەهاتە پێش چاو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی حارث چاک ناسیوتە دەی دەستی پێوە بگرە).[2]

دوای چوونی حارث پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (من سره أن ینظر إلی من نور الله قلبه فلینظر إلی الحارث بن مالك)،[3] (کێ حەز دەکات سەیری کەسێک بکات کە خوا دڵی ڕووناک کردووە ئەوا با سەیری حارثی کوڕی مالیک بکات).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە دواتر حارث وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای شەهیدیم بۆ بکە، ئەویش نزای شەهیدی بۆ کرد، ئەوەبوو جارێک هێرشێک براو حارث چوو و جەنگا و توانی نزیکەی هەشت کەس لەو هێرش بەرانە بکوژێت و دواجاریش خۆی شەهید بوو.[4]

[1] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص ٥٩٦.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٥٠٦، قال ابن حجر في الإصابة إسناده ضعیف جدا.
[3] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص ٥٩٨.
[4] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص ٥٩٨.

## ٨١٢. حارثی کوڕی مەعمەر(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی مەعمەری کوڕی حەبیبە،[١] ژنەکەشی ناوی قوتەیلەی کچی مەظعوون بوو،[٢] کوڕێکی هەبوو بە ناوی حاطب، کوڕێکی تریشی هەبوو بە ناوی حەططاب، کوڕێکی تریشی هەبوو بە ناوی مەعمەر، ئەمانە هەر سێکیان برای حەق و دا بوون.[٣]

عوثمانی کوڕی مەظعوون ژنبرای حارث بوو.[٤]

حارث برایەکی هەبوو بە ناوی جەمیل، برایەکی تریشی هەبوو بە ناوی سوفیان.[٥]

حارث لەگەڵ حاطبی کوڕیدا لە کۆچی حەبەشەدا بەشدار بوو، ئینجا لەوێ حاطبی کوڕی منداڵێکی بوو کە ناوی نا حارث، هەروەها منداڵێکی تری بوو ناوی نا موحەممەد، بەڵام حاطب خۆی لە حەبەشە کۆچی دوایی کرد.[٦]

## ٨١٣. حارثی کوڕی نوبەیە(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی نوبەیهە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی ئەنەس کە ئەویش هاوەڵ بووەو فەرموودەشی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، ئەم هاوەڵە لە ئەهلی صوففە بووە.[٧]

حارث دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیست کاتێک حوسەینی لا بوو دەیفەرموو (ئەم کوڕەم لە زەویەک دەکوژرێت کە پێی دەوترێت عێراق، جا هەرکەس پێی گەیشت با پاڵپشتی بێت و سەری بخات).

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٥١٠.

[٢] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٠٢.

[٣] أسد الغابة، ج٥، ص ٢٤٧.

[٤] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٢٩٤.

[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٤٣٣.

[٦] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٤٣٥.

[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠١.

ئەوەبوو ئەنەسی کوڕی گەیشت بەو سەردەمەو لە سوپای حوسەینی کوڕی عەلیدا بەشداری کرد و کوژرا.[1]

## ٨١٤. حارثی کوڕی موسلیم(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی موسلیمی حیجازیەو کونیەکەی ئەبوومو غیرەی مەخزوومیە.[2]

## ٨١٥. حارثی کوڕی موضرەس(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی موضرەسی کوڕی عەبدرەزاحە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە، لە بەیعەتی ریضوانندا بەشدار بوو، دوای وەفاتی پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ژیا و لە جەنگی قادسیەدا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[3]

## ٨١٦. حارثی کوڕی موعاذ(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی موعاذی کوڕی نوعمانە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان لە ئەشهەلیەکان،[4] برای سەعدی کوڕی موعاذە،[5] دایکی ناوی کەبشەی کچی رافیعە.[6]

حارث لە غەزای بەدردا بەشدار بوو.[7]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٥١١.
[2] التأريخ الكبير للبخاري، ج٢، ص ٢٦٣.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٩٩.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٥٠٩.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٠.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٢٠.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٠.

## ٨١٧. حارثی کوڕی موعاویە(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی موعاویەی سکوونیە، دوای سەردەمی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ژیا و لە ڕۆژانی ڕێککەوتنی نێوان موعاویەو حەسەنی کوڕی عەلیدا لە کووفە کۆچی دوایی کرد.[1]

## ٨١٨. حارثی کوڕی نەضر(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی نەضری سەهمیە، یان دەوترێت کوڕی سەهمە، لە پشتیوانانە.

کاتێک کۆچەران و پشتیوانان لە کەپری بەنی ساعیدە سەبارەت بە مەسەلەی خیلافەت مشتومڕیان هەبوو حارثی کوڕی نەضری ئەنصاری هەستا و بە دێڕە شیعرێک هاوەڵانی دواند، دواتر وتی: ئەی گرۆی ئەوس و خەزرەج لە خوا بترسن و داهاتووتان لەبەرچاو بێت.[2]

## ٨١٩. حارثی کوڕی نەضری ئەنصاری(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی نەضری کوڕی حارثی ئەنصاریە، یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەیعەتی ڕیضوان، هەم خۆی و هەم باوکیشی هاوەڵی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بون.[3]

## ٨٢٠. حارثی کوڕی نەوفەل(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی نەوفەلی کوڕی حارثی کوڕی عەبدولموطەلیبە، دایکی ناوی ظریبەی کچی جوندوبە.[4]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٠.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠١.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٢.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٥٦.

حارث لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) کوڕێکی بوو و ناوی نا عەبدوڵا،[1] پێغەمبەر(ﷺ) خورمای لە لێوی سوی و نزای بۆ کرد.[2]

هەروەها ئەم منداڵانەی تریشی هەبوو (موحەممەدی گەورە، ڕەبیعە، عەبدوڕەحمان، ڕەملە، ئومموزوبەیر، ظریبە)، ئەمانەی لەو ژنەی بوو کە خوشکی ئوممو‌حەبیبە بوو واتە لە کچەکەی ئەبووسوفیان، هەروەها ژنێکی تری هەبوو بە ناوی ئوممو عەمری کچی موطەلیب کە لەمیش ئەم منداڵانەی هەبوو (عوتبە، موحەممەدی بچووک، حارث، ڕەیطە، ئومموحارث)، هەروەها کەنیزەیەکیشی هەبوو کە لەو کەنیزەیە منداڵێکی لێی بوو بە ناوی سەعید.[3]

پێغەمبەر(ﷺ) هەندێ لە کاروباری مەککەی بەم هاوەڵە سپارد، دواتریش هەریەک لە ئەبووبەکر و عومەر و عوثمان ئەویان لەو پۆستەدا هێشتەوە، ئینجا خۆی چوو بۆ بەصرەو تا مردن لەوێ مایەوە. [4]

بەڵام ئیبن ئەثیر دەڵێت: ڕاست نیە ئەبووبەکر ئەوی بە بەرپرسی مەککە هێشتبێتەوە، چونکە لە سەردەمی ئەبووبەکردا عەتتابی کوڕی ئەسید والی مەککە بوو، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی وەک بەرپرسی جوددە دانا و دواتر ئەبووبەکر لایبرد، دواتر لە سەردەمی عوثماندا سەرلەنوێ ئەو کارەی پێ سپێردرا تا ئەو کاتەی خۆی چوو بۆ بەصرە.[5]

هەروەها حارث ئاوزاوای پێغەمبەر(ﷺ) بوو، چونکە ژنەکەی ناوی هیندی کچی ئەبووسوفیان بوو، لەکاتێکدا ئوممو‌حەبیبەی کچی ئەبوسوفیان ژنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[6]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٥١٣.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٥٦.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٥٦.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة ، ج١، ص ٦٠٣-٦٠٤.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ٥١٣.

[6] أسد الغابة، ج١، ص ٥١٣..

دەوترێت لە کۆتاییەکانی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتتابدا مردووە،[1] رایەکی تر دەڵێت: لە کۆتاییەکانی سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا لە بەصرە کۆچی دوایی کرد، رایەکیش دەڵێت: لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیاندا مرد،[2] کاتێک مرد تەمەنی حەفتا ساڵ بوو.[3]

## ٨٢١. حارثی کوڕی نوعمانی کوڕی ئومەییە(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی نوعمانی کوڕی ئومەییەیە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان.[4]

حارث لە غەزای بەدر و ئوحوددا بەشدار بوو، بە دڵنیاییەوە لە غەزاکانی تریشدا بەشداری کردووە، چونکە تا دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ژیاوە.[5]

حارث تا سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیب ژیا و لەناو سوپای عەلیدا لە جەنگی صفیندا بەشداری کرد.[6]

## ٨٢٢. حارثی کوڕی نوعمانی کوڕی ئیساف(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی نوعمانی کوڕی ئیسافە، لە پشتیوانانە لە بەنی نەججار، لە غەزای موئتەدا بەشدار بوو و تیایدا شەهید بوو.[7]

## ٨٢٣. حارثی کوڕی نوعمانی ئەنصاری(ﷺ)

حارثی کوڕی نوعمانی کوڕی رافیعە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان.[8]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٥١٣.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة ، ج١، ص ٦٠٤.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٥١٣.

[4] أسد الغابة، ج١، ص ٥١١.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ٥١١.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٢.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٢.

[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٢.

## ٨٢٤. حارثی کوڕی هانیء(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی هانیئی کیندیە، وەک وەفد هاتوەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە جەنگی ساباط لە مەدائیندا بەشدار بوو.(١)

کاتێک سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لە قادسیەوە بەرەو مەدائین چوو لە رێدا گەیشتنە ناوچەی ساباط و لەوێ جەنگێکی قورس روویدا، حارثیش نەبەردیەکی ناوازەی نیشاندا، دوژمن چواردەوریان گرت، حارث هاواری کرد(یا حکر یا حکر) کە بە شێوەزاری یەمەنی دەیوت و مەبەستی حیجری کوڕی عەدی بوو، حیجر چوو بەدەمیەوەو رزگاری کرد.(٢)

## ٨٢٥. حارثی کوڕی هیشام(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی هیشامی جوهەنیە،(٣) کونیەکەی ئەبوو عەبدوڕەحمانە، لە میصر نیشتەجێ بوو.(٤)

ئەبووعەبدوڕەحمان دوو فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێراوەتەوە.(٥)

ئەم هاوەڵە لە غەزای خەندەقدا بەشدار بوو.(٦)

## ٨٢٦. حارثی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرە(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی کوڕی عەبدوڵای مەخزوومیە، برای ئەبووجەهل و ئامۆزای خالیدی کوڕی وەلیدە.(٧)

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٥.

(٢) أسد الغابة، ج١، ص ٥١٣.

(٣) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٥.

(٤) أسد الغابة، ج٦، ص ٢٠٩.

(٥) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص ١٧٠٧.

(٦) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٢٦١.

(٧) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٥.

ژنەکەی ناوی فاتیمەی کچی وەلیدە کە دایکی عەبدورەحمانی کوڕی حارثە،[1]دایکی ناوی ئوممولجلاس ئەسمائی کچی موخەررییەیە.[2]

حارث کچێکی هەبوو بە ناوی ئوممولحەکیم،[3] کوڕێکیشی هەبوو بە ناوی عەبدوڕەحمان.[4]

حارث لە جەنگی بەدردا لە ریزی بێباوەڕاندا بەشداری کرد و شکستی خوارد، دواتر لە جەنگی ئوحودیشدا هەر بە بێباوەڕی بەشداری کرد، بەوجۆرە بە بێباوەڕی مایەوە تا لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو، بەڵام بە جوانی موسڵمان بوو و موسڵمانبوونەکەی رووکەش نەبوو، هاوکات چەند فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.

لە رۆژی فەتحی مەککەدا حارث داوای پەنای کرد لە ئوممومهانیێ، جا عەلی برای ویستی بیکوژێت، بەڵام ئوممومهانی رازی نەبوو و ئەوەی لای پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) فەرمووی: (ئێمەش پەنای ئەوەمان داوە کە تۆ پەنات داوە)، رایەکی تر دەڵێت: ئوممومهانی پەنای حارثی نەداوە، بەڵکو پەنای کەسێکی تری داوە بە ناوی هوبەیرە.[5]

حارث لە غەزای حونەیندا بەشداری کرد و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) لە دەستکەوتەکانی غەزای حونەیندا سەد وشتری پێ بەخشی.[6]

حارث لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا لە مەککەوە بەرەو شام کەوتەڕێ و ژن و منداڵیشی لەگەڵ خۆی برد، خەڵکێکی زۆری مەککە شوێنی کەوتن، ئەویش بەوانی وت: کە مەبەستی ئەوە نیە شوێن بگۆڕێت بەڵکو تەنها لەپێناو خوادا مەککە جێ دێڵێت، تا کۆتایی ژیانی لە شام جیهادی

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٥.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٥١٤.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٦٦.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٥.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ٥١٤.

[6] أسد الغابة، ج١، ص ٥١٤.

دەکرد، دواجار حارث لەوێ بە نەخۆشی تاعوون کۆچی دوایی کرد،[1] کاتی کۆچەکەشی لە ساڵی هەژدەی کۆچیدا بوو.[2]

## ٨٢٧. حارثی کوڕی وەهب(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی وەهب یان وەهبانە لە بەنی عەددی،[3] وەک وەفد هاتوەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).[4]

## ٨٢٨. حارثی کوڕی ئەبی سەبرە(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی ئەبی سەبرەیە، رایەک دەڵێت: برایەکی هەبووە بە ناوی سەبرە، رایەکی تریش دەڵێت: بەڵکو کورەکەی ناوی سەبرە بووە.[5]

## ٨٢٩. حارثی کوڕی ئەبی قارب(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی ئەبی قاربی قورەیشی سەهمیە، لە جەنگی ئەجنادەیندا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[6]

## ٨٣٠. حارثی کوڕی ئەنەس(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی ئەنەسی کوڕی رافیعە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان لە ئەشهەلیەکان.[7]

حارث لە غەزای بەدردا بەشدار بوو، لە غەزای ئوحودیشدا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[8]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٥-٦٠٨.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٤٤٤.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٨.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ١٣٨.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٤٨٢.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٩٢.
[7] أسد الغابة، ج١، ص ٤٦٢.
[8] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٨١.

## ٨٣١. حارثی کوڕی ئەنەس(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی ئەنەسی کوڕی مالکیە، ئەم هاوەڵەش لە پشتیوانانەو یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر،[١] ئەبووعومەر دەڵێت: دەترسم ئەمە هەر حارثی کوڕی ئەنەسی کوڕی رافیع بێت، ئیبن حەجەر دەڵێت: نەخێر ئەمە کەسێکی جیایە.[٢]

## ٨٣٢. حارثی کوڕی ئەوس(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی ئەوسی کوڕی رافیعە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان لە ئەشهەلیەکان، لە غەزای بەدردا بەشدار بوو.[٣]

## ٨٣٣. حارثی کوڕی ئەوسی کوڕی عەتیک(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی ئەوسی کوڕی عەتیکی کوڕی عەمرە،[٤] لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، لە غەزای ئوحود و غەزاکانی تریشدا بەشداری کرد، لە جەنگی ئەجنادەیندا شەهید بوو،[٥] ئەمەش لە بیست و هەشتی مانگی جەمادیلئوولای ساڵی سیانزەی کۆچی و لە شامدا بوو.[٦]

## ٨٣٤. حارثی کوڕی ئەوسی ئەنصاری(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی ئەوسی کوڕی موعاذی کوڕی نوعمانە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، برازای سەعدی کوڕی موعاذی گەورەی ئەوسیەکانە،[٧]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٤٦٣.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٦٣.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٨.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٤٦٤.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٨.

[٦] أسد الغابة، ج١، ص ٤٦٤.

[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٨.

کونیەکەی ئەبوو ئەوسە.[1]

دایکی ناوی هیندی کچی سەمماکی کوڕی عەتیکە.[2]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان پشتیوانان و کۆچەران هەریەک لە عامری کوڕی فهیرەو حارثی کوڕی ئەوسی کرد کرد بە برای یەک.[3]

حارث لە جەنگی بەدر و ئوحودیشدا بەشدار بوو، رایەک دەڵێت: لە ئوحوددا شەهید بووە، بەڵام راستتر وایە لە جەنگی ئوحوددا شەهید نەبووە، چونکە دایکمان عائیشە دەڵێت: لە غەزای خەندەقدا سەعدی کوڕی موعاذ و حارثی برازایم بینی.[4]

حارث لە کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەفدا بەشدار بوو.[5]

کاتێک سەعدی کوڕی موعاذ وەفاتی کرد حارثی کوڕی ئەوسی برازای تەرمی سەعدی شۆرد و یەکێکیش بوو لەوانەی کە تەرمەکەیان خستە ناو گۆڕەکەوە.[6]

## ٨٣٥. حارثی کوڕی ئوقەیش(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی ئوقەیش یان کوڕی وۆقەیشی عوکلی عەوفیە، هاوپەیمانی پشتیوانان بوو.[7]

حارث چەند فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.

حارثی کوڕی ئوقەیش دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ما من مسلمين يموت لهما أربعة أفراط إلا أدخلهما الله الجنة بفضل رحمته)، (هەر ژن و مێردێک چوار منداڵیان بمرێت خوای گەورە بە فەزڵ و رەحمەتی خۆی هەردووکیان

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٤٦٤.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٣٧.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٣١.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠٨.
[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٣٧.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٣٢.
[7] أسد الغابة، ج١، ص ٤٦٢.

دەخاتە بەهەشتەوە) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەی ئەگەر سیانیان بمرێت هەر ئەوەی بۆ هەیە؟ فەرمووی: ئەگەر سیانیشیان بمرێت، وتیان ئەی ئەگەر دوانیان بمرێت؟ فەرمووی: ئەگەر دوانیشیان بمرێت.[1]

حارثی کوڕی ئوقەیش دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إن الرجل من أمتي ليدخل الجنة، فيشفع لأكثر من مضر، وإن من أمتي من يعظم للنار حتى يكون أحد زواياها)،[2] (کەسی وا هەیە لە ئوممەتەکەمدا دەچێتە بەهەشت و شەفاعەت دەکات بۆ خەڵکێک زیاتر لە ژمارەی هۆزی موضەر، لە ئوممەتەکەشم کەسی وا هەیە گەورە دەکرێت بۆ ناو دۆزەخ تا ئەوەی کونجێکی دۆزەخ دەگرێت).

## ٨٣٦. حارثی کوڕی شورەیح(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی شورەیحی کوڕی ذوئەیبی نومەیریە،[3] وەک وەفدی بەنی مینقەر هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو، فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.

حارثی کوڕی شورەیح دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چووم تا لەگەڵیدا لەو مزگەوتە نوێژم کرد کە لە نێوان مەککەو مەدینەدا بوو، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إن المسلم أخو المسلم، إذا لقيه رد عليه من السلام بمثل ما حياه به أو أحسن من ذلك، وإذا أستأمره نصح له، وإذا استنصره على الأعداء نصره ...)،[4] (موسڵمان برای موسڵمانە، ئەگەر پێی گەیشت بەو جۆرەی سەلامی لێکردووە یان بە جوانتر لە سەلامکردنەکە وەڵامی سەلامی دەداتەوە وەڵامی دەداتەوە، ئەگەر راوێژی پێ کرد ئامۆژگاری دەکات، ئەگەر داوای کرد دژ بە دوژمن پاڵپشتی بێت سەری دەخات).

---

[1] مسند أحمد بن حنبل - مسند الشاميين(ﷺ) - حديث الحارث بن أقيش(ﷺ)، الرقم ١٨٠٧١.
[2] سنن ابن ماجه - أبواب الزهد - باب صفة النار ، الرقم ٤٣٢٣، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ٤٣٢٣.
[3] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص ١٨٣.
[4] شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ٧٣٦٩.

## ٨٣٧. حارثی کوڕی صەممە(ﭫ)

ناوی حارثی کوڕی صەممەی کوڕی عەمری کوڕی عەتیکە،[١] لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[٢]دایکی ناوی تەماضوری کچی عەمری کوڕی عامیرە، ژنەکەشی ناوی خەولەی کچی عوقبە بوو کە دایکی سەعدی کوڕی بوو، ژنێکی تریشی هەبوو بە ناوی عتیلەی کچی کەعب کە دایکی ئەبولجوهەیمی کوڕی بوو.[٣]

کوڕێکی هەبوو کە ناسرابوو بە ئەبوو عوثمان،[٤] کوڕێکی تری هەبوو بە ناوی سەعد کە لە جەنگی صفیندا لە سوپای عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا کوژرا.[٥]

حارث خوشکێکی هەبوو بە ناوی سخیلە کە ئەویش هاوەڵ بوو.[٦]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەر و پشتیوانان هەریەک لە حارثی کوڕی صەممەو صوهەیبی کوڕی سینانی کرد بە برای یەک.[٧]

ئەم هاوەڵە خۆی ئامادە کرد بۆ غەزای بەدر و لە ناوچەی رەوحا پێغەمبەر(ﷺ) گێرایەوە چونکە بریندار بووبوو، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دواتر پشکی دەستکەوتی بۆ دانا وەک ئەوەی بەشداربووی غەزاکە بووبێت.[٨]

حارث لە غەزای ئوحودیشدا بەشداری کرد، ئەوەتا حارث دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە شیوەکە بوو سەبارەت بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف پرسیاری لێکردم و هەواڵی ئەوی پرسی، منیش وتم: وا لە لاپاڵی شاخەکەوەیە،

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٨.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٤٨٧، تأريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٥٢.

[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٠٨.

[٤] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١١٢.

[٥] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٥٤٦.

[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥١٢.

[٧] أسد الغابة، ج١، ص ٤٨٧.

[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٨.

بینیم دەستەیەکی دوژمن هاتبوون بۆی و منیش ویستم بچم بۆ پاڵپشتی ئەو، بەڵام کە تۆم بینی هاتم بۆ لای تۆ، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (ألا إن الملائكة تقاتل معه)، (چاک بزانە فریشتەکان لەگەڵ ئەودا دەجەنگن و پاڵپشتی دەکەن)، حارث دەڵێت: منیش گەڕامەوە بۆ لای عەبدوڕەحمان و بینیم لە نێو حەوت لاشەی کوژراودایە، پێم وت: نەناڵیت هەموو ئەمانەت کوشت؟ وتی: ئەمەیان ئەرگەئەی کوڕی شورەحبیل کوشتی، ئەم دوانەش من کوشتنم، بەڵام ئەمانەی تر بەدەستی کەسانێک کوژران نەمدەبینین، منیش وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی راستیان فەرموو.[1]

حارث لە غەزای ئوحوددا لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) مایەوەو بەیعەتی مانەوە تا مەرگی پێدا.[2]

حارث لە غەزای ئوحوددا عوثمانی کوڕی عەبدوڵای کوشت (کە لە بێباوەڕەکان بوو) و چەک و شتەکەی برد، پێغەمبەریش(ﷺ) هیچی لێ نەسەندەوەو دای بە خۆی، ئەوەش تەنها بۆ ئەم هاوەڵە وابوو.[3]

حارث لە بیئر معوونەشدا بەشدار بوو و تیایدا لەگەڵ ئەو دەستەی تری موسڵمانانەدا کە ناپاکییان لێکرا شەهید بوو،[4] ئەو کات کە هاورێکانیان کوژران حارث و عەمری کوڕی ئومەییە ئامادە نەبوون، سەیریان کرد باڵندە بەسەر ماڵیانەوەیە، کە هاتن دەبینن هاوەڵەکانیان کوژراون، حارث بە عەمری وت: دەڵێیت چی بکەین؟ وتی: من پێم باشە بچینەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام حارث وتی: لە شوێنێ کە تیایدا موندیر کوژراوە دەرناچم، بۆیە لێنەوی و خۆی گەیاند بە دوژمن و جەنگا تا کوژرا، ئەویش چ کوشتنێک، بە چەند رمێک تێیکەوتن تا کوشتیان.[5]

---

[1] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣٣٠٤، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٩٠٨.

[2] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٥٢.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤٨٧.

[4] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٣٦-٢٣٧.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ٤٨٧-٤٨٨.

وەستانێک

مەسەلەی ناردنی فریشتە بۆ هاوکاری باوەڕداران لە جیهاددا مەسەلەیەکی دروستەو موسڵمان دەبێت بڕوای بەوە هەبێت، چونکە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بەوە داوەو هیچ گومانێکی لەو بارەوە نەهێشتوەتەوە، جا کە دەبینین کەسانێک لە بابەتی توێژینەوەی مێژووییدا ئەم بابەتە لادەدەن و دەڵێن ئەوە شتێکی بیروباوەڕیەو هیچ پەیوەندیەکی نیە بە رووداوی مێژووییەوە، ئەوانە کەوتوونەتە هەڵەوە، چونکە هەر ئەو سەرچاوانەی وردەکاریەکانی تریان باس کردون هەمان ئەو شتانەشیان باس کردون، جا لێرەدا گومانێکی تر دروست دەکەن و دەڵێن ئەو گێڕانەوانە هاوشێوەی ئەفسانەی جەنگەکانی یۆنان و رۆمان و جەنگەکانی مێژووی کۆنن کە باس دەکەن خواوەندەکان هاتون بۆ هاوکاری سوپاکان، لەمەوە سەبارەت بە راستی یارمەتی فریشتەکان بۆ موسڵمانان گومان بۆ موسڵمان دروست دەکەن و دەڵێن ئەوە خەیاڵاتە، لەوانەشە هەندێ موسڵمانی سادە بەوە قەناعەت بکەن، نازانن ئەمە لە لایەکەوە واتە بەدرۆخستنەوەی قورئان، ئەمەش واتە ناراستبوونی ئیسلام، بەمەش ئەو کەسە مایەپووچ دەردەچێت، لەلایەکی تریشەوە گومان خستنە سەر هەر زانیاریەکە کە بە دڵی دەستەیەک نەبێت، جا زانیاریەک کە لە قورئاندا هاتبێت و لە فەرموودەشدا باس کرابێت و لە کتێبەکانی مێژووشدا لە زاری موسڵمانان و هەروەها قورەیشیە بێباوەڕەکانیشەوە باس کرابێت، هی ئەوەیە لەبەر نەگونجانی لەگەڵ بیری دنیابینی دەستەیەکی ماددیگەرادا بەرپەرچ بدرێتەوە؟ ئەمە بەرهەمێکی راڤەی ماددیگەراییە بۆ مێژوو کە هەموو شتێک دەبەنەوە سەر لایەنی ماددی و هەر شتێکیش لە دنیای ماددە دەربچێت و نەبینراو بێت بە ئەفسانەی مێژوویی ناوزەدی دەکەن.

خوای گەورە سەبارەت بە ناردنی فریشتەکان بۆ هاوکاری موسڵمانان دەفەرموێت (إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَنْ يَكْفِيَكُمْ أَنْ يُمِدَّكُمْ رَبُّكُمْ بِثَلَاثَةِ آلَافٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُنْزَلِينَ، بَلَى إِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُمْ مِنْ فَوْرِهِمْ هَذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُمْ بِخَمْسَةِ آلَافٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُسَوِّمِينَ، وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلا بُشْرَى لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُمْ بِهِ وَمَا النَّصْرُ إِلا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ).[1]

هەروەها دەفەرموێت (إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ، وَمَا جَعَلَهُ اللّهُ إِلاَّ بُشْرَى وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللّهِ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ، إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّن السَّمَاء مَاء لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَى قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الأَقْدَامَ، إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلآئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُواْ الرَّعْبَ فَاضْرِبُواْ فَوْقَ الأَعْنَاقِ وَاضْرِبُواْ مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ).[2]

## ٨٣٨. حارثی کوڕی طوفەیل(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسیە، باوکی یەکێک بوو لە شاعیرە گەورەکانی عەرەب و یەکێک بووە لە گەورە هاوەڵان.[3]

برایەکی هەبوو بە ناوی ذابیل کە فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە.[4]

## ٨٣٩. حارثی کوڕی عەبدشەمس(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەبد شەمسی خەثعەمیە،[5] منداڵێکی هەبوو بە ناوی حمیەری کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، هەروەها حارث فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[6]

حارث دواتر لە شام نیشتەجێ بوو و لەوێ مایەوە.[7]

[1] آل عمران: ١٢٤-١٢٦.
[2] الأنفال: ٩ – ١٢.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٠٨.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤٠٢.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٤٩٣.
[6] معرفة الحصابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٩٦٧.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٢.

## ٨٤٠. حارثی کوڕی عەبدولا(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەوسی ثەقەفیە،[١] لە طائیف نیشتەجێ بوو.[٢]

حارث تا سەردەمی خیلافەتی عومەرەی کوڕی خەططابیش ژیا، وەک لە فەرموودەیەکدا دەڵێت: هاتم بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب و سەبارەت بە ژنێک پرسیارم لێکرد کە لە ڕۆژی سەربڕینی قوربانیدا تەواف بکات و دواتر بکەوێتە سووڕی مانگانەوە، ئەویش لە وەڵامدا وتی: با کۆتا شت تەوافی کەعبە بێت، حارثیش وتی: دەی پێغەمبەریش(ﷺ) هەر وا فەتوای بۆ دام، عومەریش وتی: داوەشێیت لەسەر شتێک پرسیارت لێ کردم کە پێشتر ئەو پرسیارەت لە پێغەمبەر(ﷺ) کردووە.[٣]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە عومەر پێی وت: ئەمەت لە پێغەمبەر(ﷺ) بیستووەو بۆ ئێمەت نەگێڕاوەتەوە؟[٤]

## ٨٤١. حارثی کوڕی عەبدوڵای دەوسی(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەبدوڵای دەوسیە، وەک ئەندامێکی وەفدی دەوسیەکان هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، دواتر کە وەفدەکە گەڕانەوە باوکی حارثیش گەڕایەوە بەڵام حارث لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) مایەوە.[٥]

دواتر حارث هەر لەوێ بوو تا پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد، دوای وەفاتی ئەویش ژیا و لە جەنگی یەرمووکدا بەشداری کرد، تا سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبیش ژیاو لە جەنگی صفیندا لە ناو سوپای موعاویەی

---

[١] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٥١٢.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٤٦٣.

[٣] سنن أبي داود - كتاب المناسك - باب الحائض تخرج بعد الإفاضة ، الرقم ٢٠٠٤، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٢٠٠٤.

[٤] جامع الترمذي - أبواب الحج عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء من حج أو اعتمر فليكن آخر عهده بالبيت، الرقم ٩٤٦ وقال حديث غريب.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٢.

کوڕی ئەبووسوفیاندا بەشداری کرد، دواتر لە سەردەمی دەسەڵاتی موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیاندا وەفاتی کرد.[1]

## ٨٤٢. حارثی کوڕی عەبدوڵای ئەنصاری(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەبدوڵای کوڕی سەعدی کوڕی عەمرە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە، لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو و تیایدا شەهید بوو.[2]

## ٨٤٣. حارثی کوڕی عەبدوڵای ئەوسی(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەبدوڵای کوڕی کەعبە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان.

لە حودەیبیەدا و غەزاکانی تردا بەشدار بوو و دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە ڕووداوی (الحرة) دا شەهید بوو.

## ٨٤٤. حارثی کوڕی عەتیک(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەتیک یان کوڕی عەتیقە، یان دەوترێت کوڕی قەیسە، لە پشتیوانانە، حارث لە غەزای بەدر و ئوحوددا بەشداری کرد و لە ئوحوددا شەهید بوو.[3]

## ٨٤٥. حارثی کوڕی عەتیکی کوڕی نوعمان(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەتیکی کوڕی نوعمانە، لە پشتیوانانە لە بەنی نەجار، کونیەکەی ئەبووحەزمە،[4] دایکی ناوی جەمیلەی کچی عەلقەمەیە، برایەکیشی هەبوو بە ناوی سەهل کە ئەمیان فریای بەشداری غەزای بەدر کەوت.[5]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٤٩٣.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨١.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٥.

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٩٧.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥١٠.

حارث لە غەزای ئوحود و هەموو غەزاکانی تردا بەشدار بوو، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە جەنگی جسر ئەبی عوبەیددا شەهید بوو.[1]

## ٨٤٦. حارثی کوڕی عەددی(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەددی کوڕی خەرەشەیە، لە پشتیوانانە لە خەطمیهکان، لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو و تیایدا شەهید بوو.[2]

## ٨٤٧. حارثی کوڕی عەددی موعاوی(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەددی کوڕی مالیکی کوڕی حەرامە، لە پشتیوانانە لە موعاویەکان، لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو، دواتریش لە غەزاکانی تردا دەبێت بەشدار بووبێت چونکە تا دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ژیاوە، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە جەنگی جسردا لە ساڵی پانزەی کۆچی بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[3]

## ٨٤٨. حارثی کوڕی عەرفەجە(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەرفەجەی کوڕی حارثی کوڕی مالیکە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[4] لە غەزای بەدر و ئوحوددا بەشداری کرد.[5]

## ٨٤٩. حارثی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی عەمری کوڕی حەرامی کوڕی زەیدە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، برایەکی هەبوو بە ناوی سەعدی کوڕی عەمر کە

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٥.

[2] أسد الغبة، ج١، ص ٥٩٥.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤٩٦.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٦.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٨٣.

هەردووکیان پێکەوە لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوون، لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا بەشدار بوون لە جەنگی صفیندا و لەناو سوپای عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا بوون.[1]

## ٨٥٠. حارثی کوڕی عەمری خەزرەجی(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی عەمری کوڕی غەزیەیە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان.

## ٨٥١. حارثی کوڕی عەمری سەهمی(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی عەمری کوڕی حارثی کوڕی ئیاسی باهیلی سەهمیە، کونیەکەی ئەبومەسقەبەیە،[2] کوڕێکی هەبوو بە ناوی کەریم، زورارەی کوڕەزاشی فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە،[3] کوڕێکیشی هەبوو بە ناوی عەبدولا کە فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[4]

حارث دواتر لە بەصرە نیشتەجێ بوو.[5]

زورارە دەڵێت: حارثی کوڕی عەمری سەهمی بۆی گێڕامەوە دەیوت چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) کاتێک لە مینا بوو و خەڵکیش سەردانیان دەکرد، ئینجا ئەعرابیەکان دەهاتن بۆ لای، کاتێک دەموچاوی پێغەمبەریان(ﷺ) دەبینی دەیانوت ئەمە دەموچاوێکی پیرۆزە.[6]

حارث دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە، ئەویش فەرمووی: خوایە لێمان خۆش بە، منیش چووم لەولایەوە

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٧.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٨.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤٩٨.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٨.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٨.
[6] سنن أبي داود - كتاب المناسك - باب في المواقيت، الرقم ١٧٤٢، حسنه الألباني في صحيح أبي داود، الرقم ١٥٢٩.

وەستام و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە، ئەویش فەرمووی: خوایە لێمان خۆش بە، ئینجا فەرمووی: (أيها الناس، أي يوم هذا؟ وأي شهر هذا؟ فإن دماءكم وأموالكم وأعراضكم عليكم حرام كحرمة يومكم هذا، وبلدكم هذا، وشهركم هذا، اللهم هل بلغت؟ وليبلغ الشاهد الغائب)، (ئەی خەڵکینە ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە، چ مانگێکە؟ دەی خوێن و سامان و ئابڕووتان لە یەکتر حەرامە وەک حەرامی ئەمڕۆتان و ئەم خاکەتان و ئەم مانگەتان، خوایە ئایا گەیاندم؟ با ئەوەی ئامادەیە بیگەیەنێت بەوەی ئامادە نیە)، ئینجا فەرمانی کرد بە صەدەقەو فەرمووی: (صەدەقە بکەن چونکە من نازانم لەوانەیە ئیتر لەمڕۆ بەدواوە نەمبیننەوە).[1]

حارث دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر وشترەکەی بوو هەرجارەو لە لایەکەوە دەچووم و داوام لێدەکرد داوای لێخۆشبوونم بۆ بکات، ئەویش دەیفەرموو: خوا لێتان خۆش بێت، منیش هەوڵمدەداو حەزم دەکرد بە تایبەت نزام بۆ بکات کەچی هەر دەیفەرموو خوا لێتان خۆش بێت.[2]

ئەم گێڕانەوەش نیشانەی پاکی نیاز و ڕاستگۆیی دڵ و زمانی هاوەڵانە لە گواستنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) و چی ویست و حەزێکی شەخصی خۆیان دوور گرتووە لە تێکەڵکردن بە فەرموودە، هەرچەندە ئەم چەند جارێک داواکەی دووبارە کردوەتەوە بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی نەبووە، کەچی ئەم هاوەڵە نەک هەر ئەوەی فەرموودەکەی دەستکاری نەکردووە، بەڵکو ئامادەش نەبووە بیشارێتەوە، لەکاتێکدا ئەم گێڕانەوەیە بەڵگەیە لەسەر ڕازینەبوونی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە داواکەی، هەروەک ئاماژەشە بە لەبەرچاو گرتنی باری دەروونی هاوەڵان و هەوڵی کپکردنەوەی حەزی خۆجیاکردنەوە.

---

[1] الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ١١٣٣.
[2] السنن الكبرى للنسائي - كتاب الفرع والعتيرة -، الرقم ٤٥٤١.

## ٨٥٢. حارثی کوڕی عەمری طائی(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی عەمری طائیە، دواتر چوو لە شام نیشتەجێ بوو، یەکێک بوو لە موجاهیدانی ڕێی خوا و تا کاتی وەفاتی بەردەوام لە مەیدانی جیهاددا بوو، ئەوەبوو کاتێک بۆ غەزا چوو بوو بۆ ناوچەی ئەرمینیا لەوێ کۆچی دوایی کرد.[١]

## ٨٥٣. حارثی کوڕی عەمری عەدوی(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی عەمری قورەیشی عەدویە، یەکێکە لەو حەفتا کەسەی کە لە ساڵی فەتحی خەیبەردا کۆچیان کرد بۆ مەدینە.[٢]

## ٨٥٤. حارثی کوڕی عەمری ئەنصاری(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی عەمرە، لە پشتیوانانە، ئەم هاوەڵە مام یان خاڵۆی بەرائی کوڕی عازبە.[٣]

بەرائی کوڕی عازب دەڵێت: حارثی کوڕی عەمر (کە بڕوا وایە مامی یان خاڵی بێت) منی لەگەڵ خۆیدا برد کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ئەرکێکی پێ ڕاسپاردبوو، وتم: مامە گیان پێغەمبەر(ﷺ) تۆ بۆ کوێ دەنێرێت؟ وتی: ناردوومی تا بڕۆم بدەم لە گەردنی پیاوێک کە باوەژنەکەی خۆی مارە کردووە.[٤]

## ٨٥٥. حارثی کوڕی عوبەید(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی عوبەیدی کوڕی ڕەزاحە، لە پشتیوانانە، کوڕێکیشی هەبوو بە ناوی نەصر، هەم خۆی و هەم کوڕەکەشی هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بون.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٨.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٧.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٤٩٧.
[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٤٩٧.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٥.

## ٨٥٦. حارثی کوڕی عوبەیدە(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی عوبەیدەی کوڕی حارثی قورەیشیە، عوبەیدەی باوکی لە جەنگی بەدردا شەهید بوو.[١]

## ٨٥٧. حارثی کوڕی عوقبە(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی عوقبەی کوڕی قابووسی موزەنیە، ئەم هاوەڵە لەگەڵ وەهبی مامیدا بە بڕێک مەڕو ماڵاتەوە هاتە مەدینە، کاتێک سەیریان کرد مەدینە چۆڵە هەواڵیان پرسی، وتیان پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان لە ئوحود دەجەنگن، ئەوانیش هاتن بۆ ئوحود و لەوێ موسڵمان بوون و هەر لەوێش جەنگان تا کوژران،[٢] عومەر دەیوت خۆشەویستترین مەرگێک حەزی پێ بکەم مەرگی موزەنیەکانە.[٣]

## ٨٥٨. حارثی کوڕی عومەیری ئەزدی(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی عومەیری ئەزدیە،[٤] نێردراوی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بۆ لای پاشای بوصرا تا نامەی بۆ بەرێت، بەڵام کە گەیشتە ناوچەی موئتە لەوێ شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسانی ڕێی پێ گرت و بەستیەوەو کوشتی، کاتێکیش پێغەمبەر(ﷺ) ئەو هەواڵەی بیست سوپایەکی سێ هەزار کەسی ئامادە کرد و ناردی بۆ موئتە و وەسیەتی کرد یەکەمجار خەڵکی موئتە بانگ بکەن بۆ ئیسلام، ئەگەر وەڵامیان نەبوو ئینجا لەگەڵیان بجەنگن.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٥.
[٢] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٩٧.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٨٧.
[٤] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٩٧.
[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٢٨.

## ٨٥٩. حارثی کوڕی فەروە(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی فەروەی کوڕی شەیتانە، باپیری لەبەر زۆری جوانیەکەی پێی دەوترا شەیتان، ئەم هاوەڵە وەک وەفد هاتوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[1]

## ٨٦٠. حارثی کوڕی قەیس(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی قەیسی غەسسانیە، یەکێک بوو لە کەسایەتیە دیارەکان و شاعیر بوو، وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).[2]

## ٨٦١. حارثی کوڕی قەیسی ئەنصاری(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی قەیسی کوڕی خەلدەیە، کونیەکەی ئەبوو خالیدە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان لە زورقیەکان،[3] لە بەیعەتی عەقەبە وغەزای بەدر و غەزاکانی تریشدا بەشدار بوو، لە جەنگی یەمامەدا بەشداری کرد، لەو جەنگەدا برینێکی سەختی تووش بوو، لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا وەفاتی کرد.[4]

## ٨٦٢. حارثی کوڕی کەعب(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی کەعبی کوڕی عەمری کوڕی عەوفە، لە پشتیوانانە لە بەنی نەججار لە مازنیەکان، لە جەنگی یەمامەدا بەشداری کرد و لەو جەنگەدا شەهید بوو.[5]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٩٢.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٩٢.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٥٠٢.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ١٠٣.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٩٤.

## ٨٦٣. حارثی کوڕی کورز(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی کورزە، دواتر لە حیمص نیشتەجێ بوو.[١]

## ٨٦٤. حارثی کوڕی مەسعوود(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی مەسعوودی کوڕی عەبدەیە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە جەنگی جسردا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[٢]

## ٨٦٥. حارثی کوڕی موخاشین(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی موخاشینەو یەکێکە لە هاوەڵە کۆچەرەکان.

حارثی کوڕی موخاشین دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ژیا و چوویە بەصرەو لەوێ نیشتەجێ بوو و گۆڕەکەشی لەوێیە.[٣]

## ٨٦٦. حارثی کوڕی موڕرە(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی موڕرەی جوهەنیە، خالیدی کوڕی وەلید لە کاتی هێرش بردنە سەر عێراقدا حارثی کوڕی موڕرەی کرد بە بەرپرسی سوپای قوضاعە.[٤]

## ٨٦٧. حارثی کوڕی موضرەس(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی موضرەسی کوڕی عەبدریزاحە، لە بەیعەتی ریضواندا بەشداری کرد، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە جەنگی قادسیەدا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٩٤.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٩٩.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٥٠٧.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٩٩.

[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٥٠٩.

## ٨٦٨. حارثی کوڕی موعەللا(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی موعەللایە، یان دەوترێت ناوی رافیعە، یان دەوترێت ناوی ئەوسە، بەڵام ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: راستترین را ئەوەیە کە ناوی حارثی کوڕی نفیعە.[١]

ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو کونیەکەی ئەبووسەعیدە، چونکە کوڕێکی هەبوو بە ناوی سەعید.[٢]

دایکی حارث ناوی ئومەیمەی کچی قرطە، ئەم هاوەڵە هەر لە حیجاز مایەوە.[٣]

حارث دەڵێت: من لە مزگەوت بووم و نوێژم دەکرد کە پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردم، منیش وەڵامم نەدایەوە، دواتر کە تەواو بووم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من نوێژم دەکرد، ئەویش فەرمووی: (مەگەر خوا نافەرموێت (استجيبوا لله وللرسول إذا دعاكم لما يحييكم)، (بچن بە دەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەکەیەوە کاتێک بانگتان دەکەن بۆ شتێک کە زیندووتان دەکاتەوە))، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم (پێش ئەوەی بچیتە مزگەوتەوە سوورەتێکت فێر دەکەم کە گەورەترین سوورەتی قورئانە)، پاشان دەستی گرتم و کاتێک ویستی لە مزگەوت بچێتە دەرەوە پێم وت: مەگەر تۆ نەتفەرموو سوورەتێکت فێر دەکەم کە گەورەترین سوورەتی قورئانە؟ ئەویش فەرمووی: (الحمد لله رب العالمين هي السبع المثاني و القرآن العظيم الذي أوتيته)،[٤] (سورەتی فاتیحە سەبعولمەثانیەو قورئانی پیرۆزە کە بۆم هاتووە).

ئیبن حەجەر سەبارەت بە حوکمی وەڵامدانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی نوێژدا دەڵێت: لەوانەیە وەڵامدانەوەکەی واجب بووبێت بە رەهایی، چ

---

[١] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص ١٦٧٠.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٥١٠.

[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص ١٦٧٠.

[٤] صحيح البخاري - كتاب فضائل القرآن - باب فضل فاتحة الكتاب، الرقم ٥٠٠٦.

بانگکراوەکە لە نوێژدا بێت یان نا، سەبارەت بەوەش ئایا بەو وەڵامدانەوەیە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە یان نا ئەوا دەقێکی روون لە فەرموودەکەدا لەو بارەوە نەهاتووە، لەوانەیە وەڵامدانەوە واجب بووبێت با تەنانەت نوێژەکەش بەتاڵ بکاتەوە.[1]

ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: حارث لە ساڵی حەفتا و چواری کۆچی و لە تەمەنی شەست و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کرد،[2] بەڵام ئەمە جێی گومانە، چونکە حارث باسی ئەوە دەکات نوێژی کردووەو پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردووە، جا بەو پێیە بێت تەمەنێکی هەبووە، بەڵام بەپێی ئەو مێژووە بێت کە ئیبن عەبدولبەر باسی کردووە حارث لە ساڵی دەی کۆچی لەدایک بووە، واتە ساڵێک پێش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ)، ئیبن حەجەریش ئاماژەی داوە بەم وردەکاریە.[3]

## ٨٦٩. حارثی کوڕی موعەممەر(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی موعەممەری کوڕی حەبیبی جومەحیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی حاطب کە ئەویش کوڕێکی هەبوو بە ناوی حارث، باپیرەو باوک و کوڕ هەرسێیان پێکەوە لە کۆچەرانی حەبەشەن.[4]

## ٨٧٠. حارثی کوڕی نوبەیە(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی نوبەیهەو لە هاوەڵانی ئەهلی صوففەیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی ئەنەس کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، ئەنەسی کوڕی لەگەڵ حوسەینی کوڕی عەلیدا کوژرا.[5]

---

[1] فتح الباري بشرح صحيح البخاري، ج٨، ص ١٥٨-١٥٩.
[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص ١٦٧٠.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ١٧٥.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٠١.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٥١١.

## ٨٧١. حارثی کوڕی ئەبی ضیرار(ﷺ)

ناوی حارثی کوڕی ئەبی ضیراری کوڕی حەبیبی خوزاعی موصطەلەقیە، کونیەکەی ئەبوو مالیکە، باوکی دایکی باوەڕداران جوەیریەیە.[1]

حارث کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەمر کە ئەویش دواتر موسڵمان بوو و فەرموودەشی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.

کاتێک لە ساڵی پێنجی کۆچیدا پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی جوولەکەی زانی زانرا حارثی کوری ئەبی ضیراری سەرکردەی بەنی موصطەلەق وا خەریکە خەڵک بۆ جەنگی دژ بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆدەکاتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) بوەریدەی ئەسلەمی نارد تا ئەو هەواڵە پشتراست بکاتەوە، بورەیدەش چوو و حارثی دواند و زانی مەسەلەکە وایە، بۆیە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەویش خەڵکی راسپارد بۆ جیهاد و دەستەیەکی زۆر لە کۆچەران و پشتیوانان بەشداری ئەو غەزایە بوون، حارث هەواڵی هاتنی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیست و زانی هەواڵگرەکەشی کوژراوە، حارث و دەستەو تاقمەکەی ترس دایگرتن، پێغەمبەر(ﷺ) توانی سەرکەوێت و ژمارەیەکی زۆریان لێ بەدیل و کەنیزەک بگرێت، بەڵام حارث و دەستەیەکی تر رایانکردبوو، یەکێک لە کەنیزەکەکانیش جوەیریەی کچی حارث بوو کە پشکی ثابتی کوڕی قەیس بوو و بە یارمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆی کڕیەوەو بوو بە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ).[2]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) جوەیریەی بە هاوسەر گرت باوکی جوەیریە هات و وتی: کچی وەک کچی من نابێت بە کەنیزەک بگیرێت دەی وازی لێ بهێنەو ئازادی بکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پێت چۆنە من جوەیریە خۆی سەرپشک بکەم بۆ بڕیاردان؟ ئەوەبوو باوکی پرسیاری کرد لە جوەیریە

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٩.

(٢) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٦٣-٦٤.

هاتنەوەت پێ باشە یان مانەوە؟ جوەیریە لە وەڵامدا وتی: من خواو پێغەمبەری خوام(ﷺ) هەڵبژاردووە.[1]

حارث دەڵێت: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەویش منی بانگهێشت کرد بۆ ئیسلام، منیش موسڵمان بووم و دانم نا بە موسڵمانێتیمدا، ئینجا بانگهێشتی کردم بۆ زەکات و منیش دانم پێدا نا و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەگەڕێمەوە بۆ ناو هۆزەکەم و بانگیان دەکەم بۆ ئیسلام و زەکات دان، هەرکەس هات بەدەم داواکەمەوە ئەوە زەکاتەکەی کۆ دەکەمەوە و با لە فلانە کاتدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) نێردراوی خۆی بنێرێت بۆ لام تا چی زەکاتم کۆکردەوەتەوە بیهێنێت بۆت، ئەوە بوو حارث چوو و خەڵکەکەی بانگ کرد و زەکاتەکەی کۆکردەوەو کاتی ئەوە هات کەسێک بچێت زەکاتەکە بهێنێت، کەچی نوێنەر نەهات، حارثیش وایزانی تووڕەیی خوا و پێغەمبەری خوای بەرکەوتووە، بۆیە پیاوماقوڵانی هۆزەکەی بانگ کرد و وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ من وادەیەکی هەبوو تا نێردراوی خۆی بنێرێت بۆ وەرگرتنی زەکاتەکەی لای من، کەچی وا دەنگی نەبوو و وادەزانم ئەمەش تووڕەیی خوا و پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، دەی وەرن با بچین بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەوکات پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەلیدی کوڕی عوقبەی ناردبوو بۆ لای حارث تا ئەو زەکاتەی کۆی کردوەتەوە وەریبگرێت، کاتێک وەلید چووبوو و گەیشتبوویە نیوەی رێ گەڕابوویەوە و وتبووی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)حارث ئامادە نەبوو زەکاتەکەم بداتە دەست و ویستی بمکوژێت، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەستەیەکی وەک نێردراو نارد بۆ لای حارث، ئەوەبوو حارث هاودەم بە هاوەڵەکانی رێی کەوتە دەستەکە، دەستەکە وتیان ئەوە حارثە، ئەویش کە نزیک بوویەوە لێیان وتی: بۆ کوێ نێردراون؟ ئەوانیش وتیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەلیدی کوڕی عوقبەی ناردبوو بۆ لات و وەلیدیش دەڵێت: تۆ زەکاتت پێ نەداوەو ویستووتە بیکوژیت، حارث وتی: نا سوێند بەوەی موحەممەدی بە حەق ناردووە بە هیچ جۆرێک وەلیدم نەدیوەو

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٦.

نەهاتووە بۆ لام، ئەوەبوو کاتێک حارث چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئامادە نەبویت زەکات بدەیت و ویستووتە نێردراوی من بکوژیت؟) ئەویش وتی: نا سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە ئەوم نەدیوەو نەهاتووە بۆ لام و منیش تەنها لەبەر ئەوە هاتم کە نێردراوی پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی خۆیدا نەهات بۆ لام و ترسام ئەوە توورەییەکی خواو پێغەمبەرەکەی بووبێت، ئیتر ئەوە بوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاند[1](يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ ، وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ أُولَئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ، فَضْلاً مِنَ اللَّهِ وَنِعْمَةً وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ).[2]

## ٨٧٢. حارثی کوڕی یەزید(رضي الله عنه)

ناوی حارثی کوڕی یەزیدی عامیریە، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە فتووحاتدا بەشداری کرد، کاتێک هێرش دەکرایە سەر هیت، عومەری کوڕی خەططاب نامەی نووسی بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و داوای لێکرد عەمری کوڕی مالیک بکاتە پێشڕەوی ئەو هێرشە تا گەمارۆی هیت بدات، عەمر گەمارۆی ئەوێی دا و حارثی کوڕی یەزیدی عامیری لای نیوەکەی تری سەربازگەکە دانا.[3]

## ٨٧٣. حازم(رضي الله عنه)

ناوی حازمە، بەڵام ناوی باوکی و ڕەچەڵەکی نەزانراوە، فەرموودەیەکی لێوە گێردراوەتەوە.[4]

---

[1] مسند أحمد بن حنبل – أول مسند الكوفيين(ﷺ) – حديث الحارث بن ضرار الخزاعي(ﷺ) ، الرقم ١٨٧٥٠، قال الحافظ ابن كثير إنه من أحسن طرق الحديث(تفسير ابن كثير ج٤، ص ٢١٠).

[2] الحجرات: ٦-٨.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦١١.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤.

## ٨٧٤. حازمی کوڕی حەرام(رضي الله عنه)

ناوی حازمی کوڕی حەرامی جذامیە، دانیشتوویەکی گوندنشینی ناو شام بووە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی شەبیب کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[١]

حازم دەڵێت: لە ئەردەن راوێکم کردبوو، بە دیاری بردم بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەویش لێی وەرگرتم و مێزەرێکی عەدەنی کردە خەڵاتم، هەروەها فەرمووی: ناوت چیە؟ وتم: ناوم حازمە، فەرمووی: (بل أنت مطعم)،[٢] (بەڵکو تۆ ناوت موطعیمە).

## ٨٧٥. حازمی کوڕی حەرمەلە(رضي الله عنه)

ناوی حازمی کوڕی حەرمەلەی کوڕی مەسعوودی غیفاریە،[٣] فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوەو دەڵێت: دام بە لای پێغەمبەری خوادا(ﷺ)، پێی فەرمووم:(یا حازم أكثر من قول لا حول ولا قوة إلا بالله، فإنها من كنوز الجنة)،[٤] (ئەی حازم زۆر بڵێ لا حول و لا قوە إلا بالله، چونکە ئەوە لە کەنزەکانی بەهەشتە).

## ٨٧٦. حاصری جنۆکە(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵە جنۆکە بووەو ناوی حاصر بووە، یەکێک بووە لەو وەفدی جنۆکانەی کە لە نصیبینەوە هاتوونەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[٥]

سەبارەت بە هاوەڵبوونی جنۆکە لە سەرەتای بەرگی یەکەمدا باسمان کردووە.

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٥٢٧.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣.

[٤] سنن ابن ماجه - أبواب الأدب - باب ما جاء في لا حول ولا قوة إلا بالله ، الرقم ٣٨٢٦، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ٣٨٢٦.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤.

## ٨٧٧. حاطیبی کوڕی ئەبی بەلتەعە(ﷺ)

ناوی حاطیبی کوڕی عەمری کوڕی عومەیری کوڕی سەلەمەیە، باوکی زیاتر بە ئەبوو بەلتەعە ناسراوە،[١] رایەکیش دەڵێت: بەڵکو باوکی هەر بە ئەبووبەلتەعە ناسراوەو باپیری ناوی عەمری کوڕی عومەیرە.[٢]

ئەم هاوەڵە لە کۆچەرانەو هاودەم بە سەعدی مەولای کۆچی کرد بۆ مەدینە و کاتێک چوویە مەدینە لای مونذیری کوڕی موحەممەد دابەزی.[٣]

کونیەکەی ئەبووعەبدولّایە، یان دەوترێت کونیەکەی ئەبوو موحەممەدە.[٤]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڕەحمان کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٥]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، هەریەک لە حاطیبی کوڕی ئەبی بەلتەعەو عوەیمی کوڕی ساعیدەی کرد بە برای یەک،[٦] بەڵام رایەکی تر دەڵێت: حاطیب و رخیلەی کوڕی خالیدی کرد بە برای یەک.[٧]

حاطیب بازرگانی خواردەمەنی دەکرد، هەروەک یەکێک بوو لە تیرهاوێژە زۆر بەناوبانگەکان.[٨]

حاطیب لە غەزای بەدرو ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی تردا بەشدار بوو،[٩] هەروەها لە رێککەوتنی حودەیبیەشدا بەشدار بوو.[١٠]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٥٢٨.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤.

[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١١٤.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٥٢٨

[٥] أسد الغابة، ج٢، ص ٣٥٣.

[٦] أسد الغابة، ج٤، ص ٣٣٧، سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٥٠٣.

[٧] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١١٤.

[٨] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٣.

[٩] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١١٤.

[١٠] أسد الغابة، ج١، ص ٥٢٨

لـه غـەزای ئوحـوددا حاطیـب دەنگێکی بیسـت هـاواری دەکرد موحەممـەد کوژرا، حاطیب تـەواو شـڵەژا و گـەڕا بـەدوای پێغەمبـەردا(ﷺ) تـا بینی لەگـەڵ عەلـی کـوڕی ئەبـی طالیبدایـەو دەموچـاوی دەشـوات، وتـی: ئـەوە کـێ وای لێکردیت؟ وتـی: عوتبـەی کـوڕی ئەبی وەقاص، ئینجـا وتـی: ئـەی عوتبـە بـەرەو کوێ چـوو؟ ئەویـش ئامـاژەی بـۆ کـرد بـەرەو کوێ چـوو، ئەوەبـوو حاطیب خێـرا چـوو تـا خـۆی گەیانـد بـە عوتبـە و دای لـە گـەردنـی و سـەری و چـەک و ئەسـپەکەی عوتبـەی هێنـا بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ)، پێغەمبەریـش(ﷺ) شـتەکانی بەخشـی بـە حاطیـب و نـزای خێـری بـۆ کـرد و دوو جـار پێـی فەرمـوو خـوا لێـت رازی بێـت.[1]

لـە سـاڵی شـەشـی کۆچیدا پاش گەڕانـەوە لـە حودەیبیە لـە مانگی ذیلقەعدەدا پێغەمبـەر(ﷺ) حاطیبـی وەک نوێنـەر نـارد بـۆ لای مقوقسـی بەرپرسـی ئەسـکەندەریە،[2] مقوقـس بانگـی کـرد و وتـی: سـەبارەت بـەو هاورێیـەت قسـەم بـۆ بکـە، مەگـەر ئـەو پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نیـە؟ حاطیب وتـی: بـا ئـەو نێردراوی خوایـە، وتـی: ئـەی بۆچـی کاتێک هۆزەکـەی دەریانکرد نزای نەکرد لـە هۆزەکـەی خـۆی؟ ئەویـش وتـی: ئـەی تـۆ شـایەتی دەدەیت عیسـای کـوڕی مەریـەم نێردراوی خوایـە؟ ئـەی کاتێک هۆزەکـەی ویسـتیان لەخاچـی بدەن بۆچـی نـزای نەکرد لێیـان تـا ئـەوەی خـوای گـەورە بـەرزی کـردەوە بـۆ لای خـۆی، مقوقس وتـی: زۆر جوانـە، تـۆ کەسـێکی دانایـت و لـەلای دانایەکـەوە هاتویت، ئەوەبوو بـە حاطیبدا برێـک دیاری نـارد بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ)، لەنـاو ئـەو دیاریانـەدا ماریـەی قیبطـی و سـیرینی قیبطـی نـارد کـە هەردووکیـان خوشـک بـوون.[3]

حاطیب لـەوێ کەوتـە باسـی ئیسـلام بـۆ ماریـەو هانـی دا تـا موسـڵمان بێـت،

---
[1] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٤، قال الذهبي إسناده مظلم.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ١٣٤.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٥٢٩.

ماریەش موسڵمان بوو، ئینجا سیرینی خوشکیشی موسڵمان بوو.[1]

عەلی کوڕی ئەبوو طالیب دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) من و زوبەیری کوڕی عەووام و میقدادی نارد و فەرمووی: (انطلقوا حتى تأتوا روضة خاخ، فإن بها ظعينة معها كتاب ، فخذوا منها)، (بڕۆن تا دەگەنە باخچەی خاخ لەوێ ئافرەتێکی لێیە کە نامەیەکی پێیە، ئەو نامەی لێ وەربگرن)، ئێمەش خێرا چووین تا گەیشتینە ئەوێ و بینیمان ئافرەتێکی لێیە، پێمان وت: نامەکە دەرکە، ئەویش وتی: نامەم پێ نیە، وتمان: یان نامەکە دەردەکەیت یان بەرگت پێوە ناهێڵین-واتە بەزۆر خۆمان لێت دەسەنین-.[2] ئافرەتەکە وتی: مەگەر ئێوە موسڵمان نین؟ چۆن شتی وا دەکەن؟ ئەوانیش وتیان با موسڵمانین، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێداوین کە تۆ نامەیەکت پێیە، ئافرەتەکە نامەکەی لە پرچەکانی دەرهێنا،[3] بینیمان لە نامەکەدا نووسرابوو: (لە حاطیبی کوڕی ئەبی بەلتەعەوە)، نامەکەی نووسیبوو بۆ بێباوەڕانێکی ناو مەککەو هەندێ زانیاری پێغەمبەری خوای(ﷺ) پێگەیاندبوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی حاطیب ئەمە چیە؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەلەم لێ مەکە، من لەناو قورەیشدا کەسێکی پاشکۆ و بێدەسەڵات بووم، چونکە کەسێک نەبوم لە خودی قورەیشیەکان، تۆ کۆچەرانێکت لەگەڵە کە خزم و کەسیان هەیە لە مەککەو ئەو خزمانەیان ژن و منداڵ و ماڵ و سامانیان دەپارێزن، منیش وتم: مادەم هیچ کەس و پشتێکم نیە لەوێ، با بەمە پارێزگاری لە خۆم بکەم، ئەمەشم هەرگیز لەوەوە نەکردووە کە وازم هێنابێت لە ئایینەکەم و لە رازیبوونم نەبووە بە کوفر پاش ئەوەی خوا ئیسلامی پێ بەخشیم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (أما إنه قد صدقكم)، (ئەو راستی پێ وتن)، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) رێم بدە بدەم لە گەردنی ئەو دووڕووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إنه قد شهد بدرا وما يدريك لعل

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢١٢.

[2] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب الجاسوس، الرقم ٣٠٠٧.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٥، قال الذهبي إسناده صالح و أصله في الصحيحين.

الله اطلع على من شهد بدرا فقال اعملوا ما شئتم قد غفرت لكم)، (ئەو بەشداربووی بەدرە، تۆ چووزانیت خوا ئاگادارە بە بەشداربوانی بەدر و فەرموویەتی چی دەکەن بیکەن من لێتان خۆش بوم)، ئەوەبوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند(يا ايها الذين امنوا لا تتخذوا عدوي وعدوكم اولياء تلقون اليهم بالمودة وقد كفروا بما جاءكم من الحق يخرجون الرسول واياكم ان تؤمنوا بالله ربكم ان كنتم خرجتم جهادا في سبيلي وابتغاء مرضاتي تسرون اليهم بالمودة وانا اعلم بما اخفيتم وما اعلنتم ومن يفعله منكم فقد ضل سواء السبيل)،[1] ئەمەش هۆکاری دابەزینی ئەو ئایەتە بوو.[2]

حاطیب بۆیە ئەم نامەی نارد چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ویستی هێرش ببات بۆ مەککە تا فەتحی مەککە بکات، ئەوەبوو حاطیب ئەو هەواڵەی نارد، بەڵام خوای گەورە ئەو نهێنیەی بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاشکرا کرد.[3]

جارێک کۆیلەیەکی حاطیب هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و سکاڵای دژی حاطیب کرد و وتی: بە دڵنیاییەوە حاطیب دەچێتە دۆزەخەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (كذبت لا يدخلنها، فإنه شهد بدرا والحديبية)، [4] (درۆت کرد، هەرگیز ناچێتە دۆزەخەوە، چونکە ئەو بەشداربووە لە بەدرو حودەیبیەدا).

لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکری صدیقدا حاطیبی کوڕی ئەبی بەلتەعە دووبارە نێردراوی ئەبووبەکری صدیق بوو بۆ لای مقوقس.[5]

لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا چەند کۆیلەیەکی حاطیب هاتن و سکاڵایان لە حاطیب کرد کە خەرجی کەمیان پێ دەدات، ئەوەبوو عومەری کوڕی خەططاب حاطیبی بانگ کرد و لەسەر ئەو کارەی سەرکۆنەی کرد.[6]

---

[1] الممتحنة: ١.

[2] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب من فضائل أهل بدر(ﷺ)، الرقم ٢٤٩٤.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٥٢٩.

[4] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب من فضائل أهل بدر(ﷺ)، الرقم ٢٤٩٥.

[5] أسد الغابة، ج٢، ص ٢٤١.

[6] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٥.

حاطیب لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا کۆچی دوایی کرد، ئەمەش لە ساڵی سی کۆچیدا بوو،[١] ئەو کات تەمەنی شەست و پێنج ساڵ بوو، عوثمانی کوڕی عەففانی خەلیفەی باوەڕداران نوێژی مردووی لەسەرکرد.[٢]

حاطیب کاتێک کۆچی دوایی کرد چوارهەزار دینار و درهەمی لەگەڵ خانوویەک و بڕێک شتی تردا جێهێشتبوو، چونکە ئەو بازرگانی دەکرد و خواردەمەنی و شمەکی تری دەفرۆشت.[٣]

## ٨٧٨. حاطیبی کوڕی حارث(رضي الله عنه)

ناوی حاطیبی کوڕی حارثی کوڕی موعەممەری قورەیشی جومەحیە، لە کۆچی دووەمی حەبەشەدا بەشدار بوو و لەوێ مایەوە و هەر لەوێیش کۆچی دوایی کرد، برایەکیشی هەبوو بە ناوی حەطاب کە ئەویش هەر لە کۆچەرانی حەبەشە بوو و ئەویش هەر لە حەبەشە کۆچی دوایی کرد.[٤]

## ٨٧٩. حاطیبی کوڕی عەبدولعوززا(رضي الله عنه)

ناوی حاطیبی کوڕی عەبدولعوززای کوڕی ئەبی قەیسی قورەیشی عامیریە، یەکێک بوو لە دڵراگیرکراوانی دوای فەتحی مەککە.[٥]

## ٨٨٠. حاطیبی کوڕی عەمری عامیری(رضي الله عنه)

ناوی حاطیبی کوڕی عەمری کوڕی عەبدشەمسی قورەیشی عامیریە،[٦]

---

[١] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١١٤.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٥٢٩.
[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١١٤.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦.

برای سوهەیلی کوڕی عەمرە،[1] دایکی ناوی ئەسمائی کچی حارثی کوڕی نەوفەلە، کوڕەکەی حاطیب ناوی عەمر بوو کە رەیطەی کچی عەلقەمە دایکیەتی.[2]

حاطیب یەکێک بوو لە یەکەمین موسڵمان بوان،[3] هەروەها یەکەم کەس بوو کۆچی کرد بۆ حەبەشە،[4] دواتر لە حەبەشەوە گەڕایەوەو ئینجا کۆچی کرد بۆ مەدینە و لەوێیش لە غەزای بەدردا بەشداری کرد.[5]

حاطیب برایەکی هەبوو بە ناوی سوهەیل کە کەسایەتیەکی دیاری ناو مەککە بوو، برایەکی تری هەبوو بە ناوی سولەیط کە لەگەڵ حاطیبی برایدا لە غەزای بەدردا بەشداری کرد.[6]

پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بچێتەماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم، حاطیب موسڵمان بوو.[7]

ئیبن ئەثیر دەڵێت: حاطیب لە هەردوو کۆچەکەی حەبەشەدا بەشدار بوو،[8] ئیبن حەجەریش دەڵێت: بەو بەڵگەی کە سەودەی کچی زمعەی مارە کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) بەڵگەیە کە پێش کۆچکردن بۆ مەدینە حاطیب لە حەبەشەوە گەڕاوەتەوە.[9]

کاتێک سەودەی کچی زمعە لەگەڵ سکرانی کوڕی عەمری مێردیدا لە حەبەشەوە گەڕایەوە، مێردەکەی مرد، دوای تەواوبوونی ماوەی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناردی بۆ داوای، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) قسەم

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٥٣٠.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٠٥.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢،ص٦.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٠٥.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢،ص٦.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٠٥.
[7] أسد الغابة، ج١، ص ٥٣٠.
[8] أسد الغابة، ج١، ص ٥٣٠.
[9] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦.

بەدەست تۆیە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەی با کەسێکی هۆزەکەت مارەت بکات لێم، سەودەش حاطیبی کوڕی عەمری بۆ ئەو کارە راسپارد، حاطیبیش ئەو کارەی ئەنجامدا، ئەمەش لە ساڵی دەی کۆچی و لە مانگی رەمەزاندا بوو،[1] ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی حاطیب لە حەبەشەوە.

## ٨٨١. حامیەی کوڕی سوبەیع(ﷺ)

ناوی حامیەی کوڕی سوبەیعی ئەسەدیە، لە ساڵی یانزەی کۆچیدا پێغەمبەر(ﷺ) کردی بە بەرپرسی کۆکردنەوەی صەدەقاتی هۆزەکەی خۆی.[2]

## ٨٨٢. حەببانی کوڕی مونقیذ(ﷺ)

ناوی حەببانی کوڕی مونقیذی کوڕی عەمرە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان لە مازنیەکان.[3]

ژنەکەی ناوی زەینەبوصصوغرای کچی رەبیعەیە، لەم ژنەی دوو منداڵی هەبوو بە ناوەکانی یەحیا و واسیع،[4] کوڕێکی تری ناوی سەعد بوو، سەعد و واسیعی کوڕی هەردووکیان لە رۆژی (الحرة)دا کوژران.[5]

حەببان کەسێکی لاواز و سادە بوو و لە کڕین و فرۆشدا زوو هەڵدەخەڵەتا، بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێشنیاری بۆ کرد لە کڕین و فرۆشدا ماوەی سێ رۆژ مۆڵەتی پاشگەزبوونەوە دابنێت، هەروەها زمانی کەمێک فس بوو و بە قورسی قسەی دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) پێی دەفەرموو (قل لا خلابة)،(لە کڕین و فرۆشدا بڵێ بێ هیچ فێڵ و خەڵەتاندنێک)، کەچی ئەو نەیدەتوانی و دەیوت (لا خذابة).[6]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٥٣.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٥٣٤.

[4] أسد الغابة، ج١، ص ٥٣٤.

[5] أسد الغابة، ج٢، ص ٤٠٨.

[6] معرفة السنن و الآثار للبيهقي،الرقم ٣٣٩٣.

شـەوکانی سـەبارەت بـەم فەرموودەیـە دەڵێت: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ئـەو دەربڕینـەی فێرکـرد تـا لەکاتـی کڕینـدا بیڵێت تـا کەسـی بەرامبـەر بزانێت ئـەم کەسـە لـە ناسینی کاڵا و زانینـی نرخـدا بەرچـاو روون و شـارەزا نیـە تـا ئـەو کەسـە چـی بـۆ خـۆی بـە بـاش دەزانێت بـۆ ئەویش وای بوێت، سـەبارەت بـە مەرجـی سـێ رۆژەکـەش زانایـان راجیـان، ئایـا ئـەو مەرجـە تایبـەت بـووە بـەم کابرایەوە-حەببـان- یـان هەرکـەس دەگرێتـەوە کـە ئـەو مەرجـە دابنێت.[1]

ئەم هاوەڵە لە غەزای ئوحود و غەزاکانی دواتریشدا بەشدار بوو.[2]

لـە سـەردەمی خیلافەتـی عوثمانـی کـوڕی عەففانـدا حەببـان ژنەکـەی تـەڵاق دا، ئەوکات ژنەکـەی شـیری دەدا، مـاوەی حەڤـدە مانـگ تێپـەڕ بـوو و ئـەو ژنـە لەبـەر شیردانەکە نەدەکەوتە حەیزەوە، دوای چەند مانگێک لەو تەڵاقدانە حەببان نەخۆش کەوت، پێـی وتـرا ئەگـەر بمریت ژنەکەت میراتی بەردەکەوێت، ئەویش وتی: بمبەن بـۆ لای عوثمـان، بـرا بـۆ لای عوثمـان و هەریـەک لـە عەلـی کـوڕی ئەبـوو تالیـب و زەیـدی کـوڕی ثابـت لای عوثمـان بـوون، کاتێـک مەسـەلەکەی باسـکرد، عوثمـان بـەو دوو هاوەڵـەی لای خـۆی وت: راتـان چیـە؟ ئەوانیـش وتیـان رامـان وایـە ئەگـەر بمرێت ژنەکەی میراتی بەردەکەوێت، ئەگەریش ژنەکە بمرێت ئەوا حەببان میراتی بەردەکەوێت، چونکـە لـەو ئافرەتانـە نیـە کـە ئیتـر قـەت تووشـی حەیـز نەبـن، لـەو ئافرەتانـەش نیـە کـە هەرگیـز تووشـی حەیـز نابـن، ئەوەبـوو حەببـان گەڕایـەوە بـۆ ماڵـەوەو کچـە شـیرەخۆرەکەی لای ژنەکـەی بردەوە، ئیتر ژنەکە کە شـیردانی نەما کەوتـە حەیـزەوە، بـەڵام دوو جـار کەوتـە حەیـزەوە تـا ئـەوەی حەببـان مـرد هێشـتا ژنەکـەی حەیـزی نەبـوو، بۆیـە ژنـە تەڵاقدراوەکـەی حەببـان میراتـی بەرکـەوت،[3] حەببـان دوو ژنـی هەبـوو، یەکێکیـان قورەیشـی بـوو و ئـەوی تریان پشـتیوانی بوو، ئـەوەی کـە حەببـان تەڵاقـی دابـوو ژنـە پشـتیوانیەکە بـوو.[4]

[1] نیل الأوطار للشوکاني، ج٥، ص ٢٨٨.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٥٣٤.

[3] مصنف عبدالرزاق الصنعاني، الرقم ١٠٧٥٤، السنن الکبری للبیهقي، الرقم ١٤٣٦٣.

[4] مصنف ابن أبي شیبة، الرقم ١٥٤٣٠.

## ٨٨٣. حەببەی كچی عەمر(ﷺ)

ناوی حەببەی كچی عەمری كوڕی حیصنە، لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[١]

## ٨٨٤. حەبتە(ﷺ)

ناوی حەبتەیە و دایكی سەعدی كوڕی عومەیرە، واتە هاوسەرەكەی ناوی عومەیر بوو.[٢]

## ٨٨٥. حەبتەی كچی جوبەیر(ﷺ)

ئەم ئافرەتە هاتوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو و بەیعەتی پێدا.[٣]

## ٨٨٦. حەبحابی ئەنصاری(ﷺ)

ناوی حەبحابەو بە ئەبوو عەقیل ناسراوە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە.[٤]

جارێك عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف نیوەی سامانی خۆی هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوە نیوەی سامانەكەمەو هێناومە بۆت و نیوەكەی تریم بۆ ماڵ و منالّم هێشتوەتەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (بارك الله لك فيما أعطيت و ما أبقيت)، (خوا بەرەكەت بخاتە ئەوەی بەخشیوتەو ئەوەشی هێشتووتەتەوە)، دووڕووەكان بە لاچاو و تانەوە سەیریان دەكرد و دەیانوت بەس لەبەر رووپامایی و حەزی ناوبانگ بەخشیویەتی، ئینجا یەكێك لە موسڵمانە هەژارەكان هات كە ناوی

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٢.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٢.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٢.
[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٥٣٦.

حەبحاب بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ئەمڕۆ بە دوو بەش خورما کرێکاریم کردووە، بەشێکیم (مشتێک) داناوە بۆ ماڵ و منداڵم و ئەم مشتەشم هێناوە، دووروووەکانیش بە لاچاو سەیریان دەکرد و تانەیان لێدەدا و وتیان خوا و پێغەمبەرەکەی پێویستیان نیە بە مشتەکەی ئەبی عەقیل، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاند(الذين يلمزون المطوعين من المؤمنين في الصدقات والذين لا يجدون الا جهدهم فيسخرون منهم سخر الله منهم ولهم عذاب اليم)،[1] ئەوەش وەڵامێک بوو بۆ دووروووەکان.[2]

**پەندو وانە**

هەوڵدان بۆ رازیکردنی خوا بە هەر هەنگاوێکی شەرعی دەبێت کە مرۆڤ لە توانایدا بێت، جا کەسی وا هەیە توانای هەیە شەوو رۆژ بەردەوام بێت، هەیە توانای ئەوەی هەیە چارەکێکی شەو و رۆژ لێنەوێت، هەیە توانای هەیە بە ملیۆنەها دۆلار بخاتەکار، هەیە توانای ئەوەی هەیە بە دۆلارێک بەشداری خێر بێت، هەرکام لەوانە لای خوا پاداشتی خۆیان هەیەو گاڵتەکردنیش بەوانە تاوانە.

## ٨٨٧. حەبیبەی کچی جەحش (رضي الله عنها)

ناوی حەبیبەی کچی جەحشە، خوشکی دایکی باوەڕداران زەینەبی کچی جەحشە، بەڵام زیاتر بە ئوممو حەبیبە ناسراوە، ژنی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بوو.[3]

حەبیبە خوشکێکی تریشی هەبوو بە ناوی حەمنە کە ژنی موصعەبی کوڕی عومەیر بوو و دوای کوژرانی موصعەب شووی کرد بە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا.[4]

---

[1] التوبة: ٧٩.

[2] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢٠٧٨.

[3] أسد الغابة، ج٧، ص ٣٣٩.

[4] أسد الغابة، ج٧، ص ٧٨.

هەریەک لە حەبیبەو حەمنە تووشی حەیز دەبوون و حەیزیان درێژخایەن بوو، ئوممو حەبیبە هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و سەبارەت بە حەیز پرسیاری لێکرد، چونکە حەوت ساڵ حەیزی لەگەڵ بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (هذا عرق)، (ئەوە خوێن ڕۆیشتنە) نەک حەیز، فەرمانیشی پێ کرد خۆی بشوات،[1] دایکی باوەڕداران عائیشە دەڵێت: ئیتر هەموو جارێک بۆ هەموو نوێژێک خۆی دەشۆرد و دەچووە ناو تەشتێکی گەورە دادەنیشت و سووری خوێنەکەی زاڵ دەبوو بەسەر ڕەنگی ئاوەکەدا، ئینجا دەچوو نوێژی دەکرد،[2] لە ماڵی زەینەبی خوشکیدا خۆی دەشۆرد.[3]

شافیعی سەبارەت بەو خۆشۆردنەی بۆ هەموو نوێژێک دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ نەکرد بۆ هەموو نوێژێک خۆی بشوات، بەڵکو ئوممو حەبیبە خۆبەخشانە و بە ویستی خۆی ئەوەی دەکرد.[4]

بەڵام بێدەنگبوونی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ئاست ئەو خۆشۆردنەی ئومموحەبیبە بۆ هەموو جارێک بەڵگەیە لەسەر ڕەوایی ئەو خۆشۆردنە، ئەگەرنا پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی پێ نەدەدا بە تایبەت کە بۆ خۆشۆردنەکە دەچوویە ماڵی زەینەبی خوشکی کە ماڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو.

## ٨٨٨. حەبیبەی کچی حوصەین (رضي الله عنها)

ناوی حەبیبەی کچی حوصەینی کوڕی عەبدوڵایە، مێردەکەی ناوی سائیبی کوڕی ئەبی سائیب بوو، کوڕەکەشی ناوی عەبدوڵا بوو، هەریەک لە حەبیبەو سائیب و عەبدوڵای کوڕیان هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوون.[5]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الحيض - باب عرق الاستحاضة، الرقم ٣٢٧.

[2] صحيح ابن حبان - كتاب الطهارة - باب الحيض والاستحاضة - ذكر الأمر بالاغتسال للمستحاضة عند كل صلاة، الرقم ١٣٥١.

[3] مستخرج أبي عوانة، الرقم ٧١٨.

[4] فتح الباري بشرح صحيح البخاري، ج١، ص ٤٢٧.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٤.

## ٨٨٩. حەبیبەی کچی خاریجە (رضي الله عنها)

ناوی حەبیبەی کچی خاریجەیە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، دایکی ناوی هوزەیلەی کچی عوتبەیە،[١] حەبیبە هاوسەری خەلیفەی یەکەمی باوەڕداران و نزیکترین هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) و موژدەپێدراوی بەهەشت ئەبووبەکری صدیقە.[٢]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد و بەیعەت درا بە ئەبووبەکری صدیق، ئەبووبەکر لە ماڵی حەبیبەی ژنی لە ناوچەی سونح بوو و لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوور بوو، ئەوەبوو ماوەی شەش مانگ لە خیلافەتی رۆژانە بە پێ یان هەندێ جار بە سوارێک دەچوو بۆ لای مزگەوت و دواتر دەگەڕایەوە بۆ ماڵی ئوممو حەبیبە.[٣]

کاتێک ئەبووبەکر لە سەرەمەرگدا بوو حەبیبە سکی پڕ بوو بە ئوممو کلثومی کچی ئەبووبەکرەوە، ئەبووبەکر وتی: هەرچی سەیر دەکەم ئەم سکەیان کچ دەبێت، هەر وایش بوو.[٤] دوای وەفاتی ئەبووبەکری صدیق شووی کرد بە خوبەیبی کوڕی ئەساف.[٥]

## ٨٩٠. حەبیبەی کچی سەهل(رضي الله عنها)

ناوی حەبیبەی کچی سەهلی کوڕی ثەعلەبەیە،[٦] لە پشتیوانانە،[٧] خوشکێکی هەبوو بە ناوی روعەینە، دایکیان ناوی عەمرەی کچی مەسعوودە.[٨]

---

[١] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٢٤.
[٢] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٦٩.
[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٨٦.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٥.
[٥] أسد الغابة، ج٢، ص ١٤٦.
[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٤٤٥.
[٧] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص ١٨٠٩.
[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٦.

پێغەمبەر(ﷺ) ویستی ئەم ئافرەتە بەهاوسەر بگرێت، بەڵام بە هاوسەری نەگرت، دواتر ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس بە هاوسەری گرت.[1]

ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس هاوەڵی دیاری ناو پشتیوانان و وتاربێژیان بووە، هەروەک وتاربێژی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[2]

بەرەبەیانێک کە پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو بۆ نوێژی بەیانی، لە بەردەرگاکەیدا حەبیبەی کچی سەهلی بینی، فەرمووی: (چیتە؟) کێشەت چیە؟ ئەویش وتی: نە من و نە ثابتی کوڕی قەیس-یانی پێکەوە نامانکرێت- دواتر ثابت هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ئەوە حەبیبەی کچی سەهلە هاتووەو چی روویداوە باسی کردووە، حەبیبە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چی پێداوم لام ماوە، پێغەمبەریش(ﷺ) بە ثابتی فەرموو (لێی وەربگرەوە)، ئەویش لێی وەرگرتەوە، ئینجا حەبیبە چوویەوە بۆ ماڵە باوانی خۆی.[3]

لە گێڕانەویەکی تردا هاتووە ثابتی کوڕی قەیس کەسێکی ناشیرین بوو، حەبیبە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوێند بەخوا ئەگەر لە ترسی خوا نەبوایە کە دەهاتە ژوورەوە تفم دەکردە ناوچاوی، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (ئایا باخەکەی بۆ دەگێڕیتەوە؟) وتی: بەڵێ، ئەوەبوو باخەکەی گێڕایەوە بۆ ثابت و پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە یەکی جیاکردنەوە.[4]

شەوکانی دەڵێت: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر هاتوو ئافرەتەکە حەزی نەکرد لەگەڵ پیاوەکە بمێنێتەوە، پیاو بۆی هەیە لە ئافرەتەکە بریتی وەربگرێت.[5]

---

[1] أسد الغابة، ج٧، ص ٦٩.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٩.

[3] سنن النسائي - كتاب الطلاق - باب ما جاء في الخلع، الرقم ٣٤٦٢، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن النسائي، الرقم ٣٤٦٢.

[4] سنن ابن ماجه - أبواب الطلاق - باب المختلعة تأخذ ما أعطاها ، الرقم ٢٠٥٧، ضعفه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ٢٠٥٧.

[5] نيل الاوطار للشوكاني، ج٧، ص ٣٧.

## ٨٩١. حەبیبەی کچی ضەحاک(ﵵ)

ناوی حەبیبەی کچی ضەحاکی کوڕی سوفیانە، ژنی عەبباسی کوڕی میرداسە.[١]

## ٨٩٢. حەبیبەی کچی عەمر(ﵵ)

ناوی حەبیبەی کچی عەمری کوڕی حیصنە، ئەم ئافرەتە موسڵمان بوو و بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ).[٢]

## ٨٩٣. حەبیبەی کچی قەیس(ﵵ)

ناوی حەبیبەی کچی قەیسی کوڕی زەیدە، لە پشتیوانانە، موسڵمان بوو و بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ).[٣]

## ٨٩٤. حەبیبەی کچی مەسعوود(ﵵ)

ناوی حەبیبەی کچی مەسعوودی کوڕی خالیدە، موسڵمان بوو و چوویە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێدا.[٤]

## ٨٩٥. حەبیبەی کچی موعتیب(ﵵ)

ناوی حەبیبەی کچی موعتیبی کوڕی عوبەیدە، ئەم ژنە خێزانی بیسری کوڕی حارث بوو و دایکی بورەیرە بوو.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٨.

[٢] أسد الغابة، ج٧، ص ٧٠.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٩

[٤] أسد الغابة، ج٧، ص ٧١.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٩.

## ٨٩٦. حەبیبەی کچی مولەیل(رضي الله عنها)

ناوی حەبیبەی کچی مولەیلی کوڕی وەبرەیە، ئەم ئافرەتە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، ژنی فەروەی کوڕی عەمرە، ئەم ئافرەتە چوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[١]

## ٨٩٧. حەبیبەی کچی نەبیهـ(رضي الله عنها)

ناوی حەبیبەی کچی نەبیهی کوڕی حەججاجە، ژنی موطەلیبی کوڕی ئەبی وداعەیە، کچێکی هەبوو کە ناوی نا حەبیبە.[٢]

## ٨٩٨. حەبیبەی کچی ئەبوو سوفیان(رضي الله عنها)

ناوی حەبیبەی کچی ئەبوو سوفیانە، کچی ئەبووسوفیانی کوڕی حەرب نیە، چونکە هەندێ کەس کەوتوونەتە ئەو هەڵەوە و وا دەزانن بە کچی ئەبووسوفیانی کوڕی حەربە دەڵێن خۆ ئەو کچی نەبووە بە ناوی حەبیبە، ئیبن حەجەر ئەوە یەکلا دەکاتەوەو دەڵێت: ئەم ئافرەتە کچی ئەبوسوفیانێکی ترە کە ڕەچەڵەکی باس نەکراوە، لە ماڵی عائیشە بووەو خزمەتی کردووە.[٣]

حەبیبە دەڵێت: من لە ماڵی عائیشە دانیشتبووم کە پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ژوورەوەو فەرمووی: (ما من مسلمين يموت لهما ثلاثة أطفال لم يبلغوا الحنث إلا أدخلهما الله الجنة بفضل رحمته إياهم)،[٤] (هەر ژن و پیاوێکی موسڵمان سێ منداڵی باڵغ نەبوویان بمرن ئەوا بە هۆی ڕەحمەتی خواوە بۆ ئەو منداڵانەیان خوای گەورە ئەو ژن و پیاوە دەخاتە بەهەشتەوە).

---

[١] أسد الغابة، ج٧، ص ٧١-٧٢.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٩.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٥.
[٤] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٠٤١٢.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە حەبیبە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ما من مسلمين يموت لهما ثلاثة من الولد أطفال لم يبلغوا الحنث إلا جيء بهم حتى يوقفوا على باب الجنة فيقال لهم ادخلوا الجنة أنتم وآباؤكم).[1] ( هەر ژن و پیاوێکی موسڵمان سێ منداڵیان بمرن کە نەگەیشتبوونە تەمەنی باڵغی، ئەوا لە ڕۆژی دواییدا دەهێنرێنە بەردەرگای بەهەشت و پێیان دەوترێت بچنە بەهەشتەوە خۆتان و دایک و باوکتان).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە (منداڵەکان دەهێنرێنە بەردەرگای بەهەشت و پێیان دەوترێت بچنە بەهەشتەوە، ئەوانیش دەڵێن ئێمە بچینە بەهەشت و باوک و دایکمان نەیەنە بەهەشت؟ ئێنجا پێیان دەڵێت: بچنە بەهەشتەوە خۆتان و باوک و دایکیشتان).[2]

## ٨٩٩. حەبیبەی کچی ئەبی تجرات(رضي الله عنها)

ناوی حەبیبەی کچی ئەبی تەجراتی عەبدەریە.[3]

ئەم ئافرەتە دەگێڕێتەوە دەڵێت: لە شوێنێ بووم لە نێوان صەفا و مەروەدا، پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی کە خێرا دەڕۆیشت و بە هاوەڵانی دەفەرموو:

(اسعوا فإن الله كتب عليكم السعي)، (پەلە بڕۆن چونکە خوا سەعی-پەلەڕۆیشتنی کاتی صەفاو مەروە-ی لەسەر نووسیون)

ئیتر پێغەمبەرم(ﷺ) دەبینی لەتاو خێرا ڕۆیشتنی قوماشەکەی بەری بە دەوری سکیدا دەسووڕا تا سپیایی بن باڵ و هەردوو رانیم بینی.[4]

---

[1] المطالب العالية، الرقم ٣٨٤٩.

[2] مسند إسحاق بن راهويه، الرقم ١٨٥٩، قال محقق المسند د.عبدالغفور البلوشي في إسناده صدوق تغير بآخره و لكنه يتقوى بشواهده و الحديث صحيح.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٣.

[4] مسند أحمد بن حنبل، حتى (كتب عليكم السعي)، قال شعيب الأرناؤوط حسن بشواهده، صحيح ابن خزيمة - كتاب المناسك - باب ذكر البيان أن السعي بين الصفا والمروة واجب، الرقم ٢٧٦٤.

## ٩٠٠. حەبیبەی کچی ئەبی عامر(ﷺ)

ناوی حەبیبەی کچی ئەبی عامری راهیبە، خوشکی حەنظەلەیە، ئەو حەنظەلەی کە کاتێک شەهید بوو فریشتەکان ئەویان شۆرد، حەبیبە یەکێکە لەو ئافرەتانەی کە بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ).[١]

## ٩٠١. حەبیبەی کچی ئەسعەد(ﷺ)

ناوی حەبیبەی کچی ئەسعەدی کوڕی زورارەیە، ئەم ئافرەتە چوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بووەو بەیعەتی پێداوە.[٢]

ئەسعەدی باوکی کە بە ئەبوو ئومامە ناسراوە یەکەم کەسی پشتیوانان بوو موسڵمان بوو،[٣] دایکی ناوی عومەیرەی کچی سەهل بوو.[٤]

ئەم ئافرەتە ژنی سەهلی کوڕی حونەیف بوو،[٥] سەهل هاوەڵێکی دڵسۆزی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، بەشداری غەزای بەدر و غەزاکانی تری کرد، لە غەزای ئوحوددا کە خەڵکی بڵاوەیان تێکەوت، سەهل لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) مایەوە و بەرگری لێکرد.[٦]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی ئەسعەدی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف کە لە پشتیوانانە،[٧] ئەسعەد لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لەدایکبوو، دوو ساڵ پێش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) لەدایکبوو، سەهلی باوکی بردی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش دەمی بە خورما شیرین کرد و بەناوی

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٨.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٢.
[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٦٠٨.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٢.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٢.
[٦] أسدالغابة، ج٢، ص٥٤٥.
[٧] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٢.

ئەسعەدی باپیریەوە-باوکی دایکی- ناوی نا.[1]

حەبیبە خوشکێکی هەبوو بە ناوی فاریعە کە ژنی نوبەیطی کوڕی جابیر بوو، ئەم خوشکەی کچێکی هەبوو بە ناوی زەینەب.

جا زەینەب کە خوشکەزای حەبیبەیە ژنی ئەنەسی کوڕی مالیک بوو، زەینەب دەڵێت: ئەبوو ئومامە پێش مردنی وەسیەتی کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تا ئاگای لە دایکم و پوورم بێت (فاریعەو حەبیبە)، ئەوەبوو جارێک بڕێ خشڵ و بەردی گرانبەها هێنرا بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش بڕێک لەوەی دا بە دایکم و پوورم.[2]

## ۹۰۳. حەبیبەی کچی ئوممو حەبیبە(رضي الله عنها)

ناوی حەبیبەی کچی ڕەملەی کچی ئەبوسوفیانە، ڕەملەی دایکی بە ئومموحەبیبە ناسرابوو، باوکی ناوی عەبدوڵا بوو، دەوترێت پێش کۆچ بۆ حەبەشە لەدایک بووەو لەگەڵ دایکی کۆچی کردووە بۆ حەبەشە، ڕایەکیش دەڵێت: لە حەبەشە لەدایک بوو، دواتر لەگەڵ دایکیدا کۆچی کرد بۆ مەدینە.[3]

ئومموحەبیبەی دایکی کە دایکی باوەڕداران و هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) بوو، پێش ئەوەی کۆچ بکات بۆ حەبەشە هاوسەری عوبەیدوڵای کوڕی جەحش بوو، کاتێ کۆچیان کرد بۆ حەبەشە مێردەکەی لە حەبەشە لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە و بوو بە مەسیحی و هەر لەوێیش مرد، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ئافرەتەی بەهاوسەرگرت.[4]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص١١٢.

[2] أسد الغابة، ج٧، ص ٦٦.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٧٨.

[4] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٤١.

## ٩٠٣. حەبیبی کوڕی بودەیل(ﷺ)

ناوی حەبیبی کوڕی بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعیە، هەم خۆی و هەم باوکی و هەم عەبدوڵای برایشی هەرسێیان هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوون.[١]

## ٩٠٤. حەبیبی کوڕی حارث(ﷺ)

ناوی حەبیبی کوڕی حارثە، حەبیب هاودەم بە ئەبیلغادیە پێکەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، حەبیب دەڵێت: دایکی ئەبیلغادیەشمان لەگەڵدا بوو، هەموو موسڵمان بووین، کە چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) ژنەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: (إياك وما يسوء الأذن)،[٢] (وریابە دوور بە لە بیستنی شتێک کە گوێ پێی بێزار دەبێت).

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: جارێک حەبیبی کوڕی حارث هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من کەسێکم تاوانم زۆرە، ئەویش فەرمووی: ئەی حەبیب لای خوا تەوبە بکە، حەبیب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من تەوبە ئەکەم و هەمدی ئەگەڕێمەوە سەر تاوانەکە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (دەی هەرکات تاوانت کرد تەوبە بکە)، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) جا ئەوکات تاوانەکانم زۆر دەبن، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (ئەی حەبیبی کوڕی حارث لێخۆشبوونی خوا لە تاوانەکانی تۆ زۆرترە).[٣]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٤.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٥٤٠.

[٣] المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٤٩٥٥، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٦٠٣، إسناده ضعيف.

## ٩٠٥. حەبیبی کوڕی حەبیب(رضي الله عنه)

ناوی حەبیبی کوڕی بەغیضی کوڕی مەروانی کوڕی عامیری مازنیە، وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرموو تۆ حەبیبی کوڕی حەبیبیت.[١]

ئەمە ئاماژەیە بەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەوەک تەنها ناوی ناشیرینی کەسەکانی گۆڕیوە، بەڵکو ناوی ناشیرینی باوکی کەسەکانیشی گۆڕیوە.

## ٩٠٦. حەبیبی کوڕی حەمامە(رضي الله عنه)

ناوی حەبیبی کوڕی حەمامەیەو لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بوو.[٢]

## ٩٠٧. حەبیبی کوڕی حوباشە(رضي الله عنه)

ناوی حەبیبی کوڕی حوباشەیە،[٣] لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[٤] لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بە هۆی برینێکەوە کە تووشی بوو کۆچی دوایی کرد، کاتی مردنەکەشی لە شەودا بوو و هەر بە شەویش ئەسپەردە کرا، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) نوێژی لەسەر کرد.[٥]

## ٩٠٨. حەبیبی کوڕی خیراش(رضي الله عنه)

ناوی حەبیبی کوڕی خیراشی کوڕی حورەیثی کوڕی صامتی تەمیمیە، لە غەزای بەدردا بەشدار بوو.[٦]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٧.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٨.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٥٤٠.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٦.
[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٥٤٠.
[٦] أسد الغابة، ج١، ص ٥٤١.

## ٩٠٩. حەبیبی کوڕی خیراشی عەصەری(ﷺ)

ناوی حەبیبی کوڕی خیراشی عەصەریە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی موحەممەد کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، دواتر لە بەصرە نیشتەجێ بوو.[١]

حەبیب فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی (المسلمون إخوة لا فضل لأحد على أحد إلا بالتقوى)،[٢] (موسڵمانان بران، هیچ کەس فەزڵی بەسەر کەسی تردا نیە تەنها بە تەقوا نەبێت).

## ٩١٠. حەبیبی کوڕی رەبیعە(ﷺ)

ناوی حەبیبی کوڕی رەبیعەیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی ئەبووعەبدورەحمان، لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)لە غەزاکاندا بەشداری کرد.[٣]

## ٩١١. حەبیبی کوڕی زەید(ﷺ)

ناوی حەبیبی کوڕی زەیدی کوڕی تەمیمە، لە پشتیوانانە، لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو و تیایدا شەهید بوو.[٤]

## ٩١٢. حەبیبی کوڕی زەیدی خەزرەجی(ﷺ)

ناوی حەبیبی کوڕی زەیدی کوڕی عاصمە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، ئەم هاوەڵە یەکێک بووە لە بەشداربوانی بەیعەتی عەقەبە.[٥]

دایکی ناوی نەسیبەی کچی کەعب بوو، برایەکیشی هەبوو بە ناوی

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٥٤١.

[٢] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣٤٦٣، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢٠٠٥، قال الحافظ ابن حجر في الإصابة إسناده متروك.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٩.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٥٤٢.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٩.

عەبدوڵا، هەریەک لە حەبیب و عەبدوڵای برای و زەیدی باوکی و نەسیبەی دایکی بەشدار بوون لە بەیعەتی عەقەبەدا، هەروەک هەرچواریان پێکەوە لە غەزای ئوحودیشدا بەشدارییان کرد.[1]

دایکی حەبیب کە بە ئوممو عمارە ناسرابوو لە غەزای ئوحوددا دوانزە جار بریندار بوو، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) لە جەنگی یەمامەدا بەشداری کرد و دەستیشی برا، کاتێک دوای جەنگەکە گەڕایەوە بۆ مەدینە هێندە ڕێز و گەورەیی هەبوو ئەبووبەکری خەلیفەی باوەڕداران دەچوو بۆ لای و پرسیاری لێدەکرد.[2]

کاتێک دەنگۆی دەرکەوتنی موسەیلەمەی درۆزن هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) حەبیبی نارد بۆ لای موسەیلەمە، موسەیلەمە پرسیاری لێکرد ئایا شایەتی ئەدەیت موحەممەد نێردراوی خوایە؟ حەبیب دەیوت بەڵێ، کاتێک موسەیلەمە دەیوت ئەی شایەتی دەدەیت من پێغەمبەری خوام؟ حەبیب دەیوت من کەڕم و هیچ نابیستم، چەند جارێک حەبیب ئەمەی دووبارە کردەوە، بۆیە موسەیلەمە کوشتی و پارچە پارچەی کرد،[3] دوای ئەوە دایکی و عەبدوڵای برایشی مانەوەو لە جەنگی یەمامەدا کە دژ بە موسەیلەمە کرا بەشدارییان کرد.[4]

## ٩١٣. حەبیبی کوڕی عەبد شەمس(رضي الله عنه)

ناوی حەبیبی کوڕی عەبد شەمسی کوڕی موغیرەیە، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە جەنگی یەمامەدا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[5]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٥٤٢.

[2] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٨١.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٢٠.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٩.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢١.

## ٩١٤. حەبیبی کوڕی عەمری سەلامانی(رضي الله عنه)

ناوی حەبیبی کوڕی عەمری سەلامانیە.[١]

حەبیب دەڵێت: ئێمە حەوت کەس بووین لە وەفدی سەلامان کە چووین بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، کاتێک گەیشتین بە پێغەمبەر(ﷺ) دەمانبینی لە مزگەوت دەچوویە دەرەوەو بۆ لای تەرمێک دەچوو، وتمان: سەلاموعەلەیک ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: (وعلیکم)ئێوە کێن؟ وتمان: ئێمە لە هۆزی سەلامانین و هاتوین تا لەسەر ئیسلام بەیعەتت پێبدەین، ئێمە خەڵکێکی زۆری هۆزەکەمان جێهێشتووە و ئەوانیش هاوڕای ئێمەن، پێغەمبەر(ﷺ) لای کردەوە بە لای ثەوبانی خزمەتکاریدا و فەرمووی: ئەوانە ببەرە شوێنی مانەوەی وەفدەکان، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) کە نوێژی نیوەڕۆی کرد لەنێوان مینبەر و ماڵەکەی خۆیدا دانیشت، ئێمەش چووینە پێشەوە بۆ لای و سەبارەت بە نوێژ و شەریعەتی ئیسلام و روقییە پرسیارمان لێکرد، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هەر کاممان پێنج ئۆقیەی پێ بەخشین، پاشان گەڕاینەوە بۆ خاکی خۆمان، ئەم چوون و مانەوەو هاتنەوەشمان لە مانگی شەوالی ساڵی دەی کۆچیدا بوو.[٢]

حەبیب دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چاکترین کار چیە؟ فەرمووی: (نوێژ لە کاتی خۆیدا)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەی ئەگەر حەوزی ئاوێک چاک بکەم تا وشترەکەم تینوێتی بشکێت ئایا پاداشتم بۆ هەیە؟ فەرمووی: (نعم فی کل کبد حری أجر)،[٣] (بەڵێ بۆ هەر خاوەن جەرگێکی تینوو پاداشت هەیە).

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢.
[٢] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٣٣٢.
[٣] الجزء المتمم لطبقات ابن سعد، الرقم ٤١١.

## ٩١٥. حەبیبی کوڕی عەمری ئەجەئی(﵁)

ناوی حەبیبی کوڕی عەمری ئەجەئیە، وەک وەفد هاتووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) نووسراوێکی بۆ نووسی کە تیایدا نووسرابوو: (هذا كتاب من محمد رسول الله لحبيب بن عمرو أخي بني أجأ ولمن أسلم من قومه وأقام الصلاة وآتى الزكاة أن له ماله وماءه ما عليه حاضره وباديه على ذلك عهد الله وذمة رسوله)،[1] (ئەم نووسینە لە موحەممەدی پێغەمبەری خواوەیە بۆ حەبیبی کوڕی عەمر برای بەنی ئەجەء و ئەوانەی لە هۆزەکەی موسڵمان بون و نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن، سامان و ئاوی شوێنی نیشتەنی و دەشتیان بۆ هەیە، بۆ ئەمەش بەڵێنی خوا و زیممەی پێغەمبەری خوایان بۆ هەیە).

## ٩١٦. حەبیبی کوڕی عەمری ئەنصاری(﵁)

ناوی حەبیبی کوڕی عەمری کوڕی میحصەنە، لە پشتیوانانە، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە رێدا بوو بەرەو یەمامە تا لەو جەنگەدا بەشدار بێت، بەڵام لە رێدا شەهید کرا.[2]

## ٩١٧. حەبیبی کوڕی عومەیر(﵁)

ناوی حەبیبی کوڕی عومەیری کوڕی حماشەیە، لە پشتیوانانە.[3]

حەبیب رۆژێک منداڵەکانی کۆکردەوەو وتی:

لە کۆڕی گەمژەکاندا دامەنیشن، چونکە دانیشتن لەگەڵیاندا دەردە،

هەرکەس دەروونی خۆی رابگرێت بەرامبەر بە گەمژە ئەوە بە خۆڕاگریەکەی خۆشحاڵ دەبێت،

هەرکەس گەمژەی خۆش بوێت پەشیمان دەبێتەوە،

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٢٨٠.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٢١.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢.

هەرکەس لەسەر ئازاری کەمی گەمژە خۆڕانەگریَ لەبەردەم ئازاری زۆریشیدا خۆی ڕاناگرێت،

ئەوەی لەسەر ناخۆشیەکان خۆڕاگر بێت بەوە دەگات کە حەزی لێیە،

هەرکامتان ویستی فەرمان بکات بە چاکەو ڕێگری بکات لە خراپە ئەوا با ئەوە نەکات تا خۆی لەسەر خۆڕاگرتن لەسەر ناڕەحەتی ڕادەهێنێت و بڕوای تەواوی هەبێت بە پاداشتی خوا، چونکە هەرکەس متمانەی بە خوا هەبێت هەست بە ئازار ناکات.[1]

## ٩١٨. حەبیبی کوڕی مەڕوان(ﷺ)

ناوی حەبیبی کوڕی مەڕوانی تەمیمی مازنیە، سەرەتا ناوی بەغیض بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ناوی گۆڕی بە حەبیب.[2]

بەغیض کوڕێکی هەبوو بە ناوی حەبیب، کاتێک حەبیبی کوڕی چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تۆ کێیت؟ وتی: حەبیبی کوڕی بەغیض، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵکو تۆ حەبیبی کوڕی حەبیبیت.[3]

## ٩١٩. حەبیبی کوڕی ئەبولیوسر(ﷺ)

ناوی حەبیبی کوڕی ئەبولیوسری کوڕی عەمرە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە،[4] دوو برای هەبوو بە ناوەکانی یەزید و عومەیر، یەزید لەگەڵ حەبیبی برایدا کوژرا، عومەیریش لە جەنگی جیسردا کوژرا.[5]

حەبیب و هەردوو براکەی تا دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ژیاون و دواجار لە سەردەمی دەوڵەتی ئومەوی لە ڕووداوی (الحرة) دا شەهید بوو.[6]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٥٤٦.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٧.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٥٥٠.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦.

## ٩٢٠. حەبیبی کوڕی یەزید(رضي الله عنه)

ناوی حەبیبی کوڕی یەزیدەو لە پشتیوانانە لە بەنی عەمر، لە جەنگی یەمامەدا بەشداری کرد و لەو جەنگەشدا شەهید بوو.[١]

## ٩٢١. حەبیبی کوڕی ئەسلەم(رضي الله عنه)

ناوی حەبیبی کوڕی ئەسلەمە، لە پشتیوانانە و یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر.[٢]

## ٩٢٢. حەبیبی کوڕی ئەسید(رضي الله عنه)

ناوی حەبیبی کوڕی ئەسیدی کوڕی جاریەی ثەقەفیە، لە جەنگی یەمامەدا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[٣]

## ٩٢٣. حەبیبی کیلاعی(رضي الله عنه)

ناوی حەبیبی کلاعیەو بە ئەبوو ضەمرە ناسراوە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی ضەمرە کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٤]

عەبدولعەزیز لە ضەمرەی باوکیەوە و ئەویش لە حەبیبی باوکیەوە گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (نوێژی بە کۆمەڵ بیست و پێنج بەرامبەر فەزڵی هەیە بەسەر نوێژی کەسێکدا کە بە تەنها دەیکات).[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٤.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٤.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦.

## ٩٢٤. حەججاجی کوڕی حارث(ﷺ)

ناوی حەججاجی کوڕی حارثی کوڕی قەیسی قورەیشی سەهمیە،[١] حارثی باوکی یەکێک بوو لەوانەی کە گاڵتەیان دەکرد بە پێغەمبەری خوا(ﷺ).[٢]

برایەکی هەبوو بە ناوی تەمیم کە ئەویش هاوەڵ بوو و لە جەنگی ئەجنادەیندا شەهید بوو، چەند برایەکی تریشی هەبوو بە ناوەکانی سەعید و ئەبی قەیس و عەبدولڵا و سائیب کە هەموویان لە جەنگی ئەجنادەیندا شەهید بوون.[٣]

سەبارەت بە کاتی موسڵمانبوونی رای جیاواز هەیە، رایەک دەڵێت: لە مەککە موسڵمان بوو و کۆچی کرد بۆ حەبەشە کە ئەمە رای ئیبن ئیسحاق و چەندێکی ترە، بەڵام ئیبنولکەلبی دەڵێت: دوای کۆچی حەبەشە موسڵمان بووە، زوبەیری کوڕی بەککار دەڵێت: بەڵکو لە غەزای بەدردا لە ریزی بێباوەڕاندا بەشداری کرد و بەدیل گیرا و دوای ئەوە موسڵمان بوو.[٤]

ئیبن ئەثیر دەڵێت: لە کۆچەرانی حەبەشە بووە،[٥] کەچی پێشتر کە باسی پێنج براکەی تری دەکات دەڵێت: یەک برایان هەبوو کە لە جەنگی بەدردا بەدیل گیرا.[٦]

دوای ئەوەی حەججاج ئازاد کرا و چوویەوە بۆ مەککە، دوای جەنگی ئوحود کۆچی کرد بۆ مەدینەو لەوێ مایەوە.[٧]

سەبارەت بە کاتی وەفاتیشی دوو را هەیە، رایەک دەڵێت: لە جەنگی

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٠.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢١.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢١.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٠.
[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٥٥٧.
[٦] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢١.
[٧] أسدالغبة، ج١، ص ٥٥٧.

ئەجنادەیندا لەگەڵ براو کەسەکانیدا شەهید بووە، رایەکیش دەڵێت: لە ساڵی پانزەی کۆچی لە جەنگی یەرمووکدا شەهید بووە.[1]

## ٩٢٥. حەججاجی ئەحمەسی(ﷺ)

ناوی حەججاجی کوڕی ذیلعونوقی ئەحمەسیە، فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، دوای وەفاتی پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ژیا و لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلیددا چوو بۆ فتووحاتی عێراق و کاتێک لە ساڵی دوانزەی کۆچیدا خالید پەیمانێکی نووسی یەکێک لە شاهیدەکان حەججاج بوو.[2]

## ٩٢٦. حەججاجی کوڕی عامیر(ﷺ)

ناوی حەججاجی کوڕی عامیری ثومالیە،[3] دواتر لە حیمص نیشتەجێ بوو، چەند فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[4]

خالیدی کوڕی مەعدان دەڵێت: بیستم لە هەریەک لە عەبدوڵای کوڕی عوبەیدی ثومالی و لە حەججاجی کوڕی عامیری ثومالی کە هەردووکیان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوون، هەردووکیان نوێژی بەیانییان لە دوای عومەری کوڕی خەتتابەوە کرد و ئەویش ئەم سوورەتەی خوێند (إذا السماء انشقت) تیایدا سوجدەی برد.[5]

هەروەها حەججاج دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إياكم وكثرة السؤال، وإضاعة المال، وقيل وقال، وأن يعطي أحدكم الفضل خير له، وإن يمسك شر له، ولا يلوم الله على الكفاف، وابدأ بمن تعول)، (وریابن خۆتان دووربگرن لە زۆر پرسیار کردن و لە ماڵ و سامان بەفیڕۆدان و وتی: و تیان، هەرکام لە ئێوەش ئەوەی لە خۆی

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٠.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣١.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٢٧.

[4] أسد الغابة، ج١، ص ٥٥٧.

[5] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣١٤٣، المطالب العالية لابن حجر العسقلاني، الرقم ٤٥٣.

زیادەیە ببەخشێت باشترە بۆی، ئەگەریش ئەو زیادەیە بهێڵێتەوە خراپە بۆی، خوای گەورە سەرکۆنەی لەسەر پێویستی بێ کەم و زیاد نیە_واتە ئەوەی پێویستە بیکەیت بێ کەمی و بێ زیادیش-، سەرەتاش بەوە دەست پێ بکە کە گرنگ و پێویستە).[١]

شورەحبیلی کوڕی موسلیم دەڵێت: من پێنج لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی کە سمێڵیان کورت دەکردەوەو ریشیان بەردەدایەوەو زەردیان دەکرد-خەنەییان دەکرد-: ئەبو ئومامەی باهیلی و عەبدوڵای کوڕی بوسر و عوتبەی کوڕی عەبدی سولەمی و حەججاجی کوڕی عامیری ثومالی و میقدادی کوڕی مەعدی یەکریبی کیندی، سمێڵیان کورت دەکردەوەو بەرسمێڵیشیان دەکرد.[٢]

## ٩٢٧. حەججاجی کوڕی عەبدولا(رضي الله عنه)

ناوی حەججاجە، سەبارەت بە ناوی باوکی رایەک دەڵێت: کوڕی عەبدوڵایە، رایەکیش دەڵێت: باوکی ناوی عەتیکە، لە ثەقەفیەکانە، دواتر لە بەصرە نیشتەجێ بوو، دوای ئەوەش لەوێوە چوو بۆ کووفە.

ژنەکەی ناوی ئوmموجەمیلی هیلالی بوو.[٣]

## ٩٢٨. حەججاجی کوڕی عیلاط(رضي الله عنه)

ناوی حەججاجی کوڕی عیلاطی کوڕی خالیدی فەهریە، سەبارەت بە کونیەکەی هەریەک لە ئەبوو کیلاب و ئەبوو موحەممەد و ئەبوو عەبدوڵا هاتووە، ئەم هاوەڵە لە کۆچەریەکانە.[٤]

[١] مسند الشاميين للطبراني، الرقم ٥٣٤، جامع بيان العلم، الرقم ١٢٧٥.

[٢] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣١٤٤، قال الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة (٧٩٧/١١-٧٩٨) قلت: و إسناده جيد كما قال الهيثمي.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٣.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٣.

حەجاج برایەکی هەبوو بە ناوی صالح کە لە سەردەمی نەفامیدا مرد،[1] برایەکی تریشی هەبوو بە ناوی کیلاب کە شاعیر بوو،[2] سێ کوڕیشی هەبوو وبە ناوەکانی عەبدوڵا و نەصر و میعرەض، عەبدوڵای کوڕی لە سەردەمی دەسەڵاتی موعاویەدا والی حیمص بوو، میعرەضی کوڕیشی لە جەنگی جەمەلدا کوژرا.[3]

نەصری کوڕی کەسێکی زۆر کەشخە بوو، ئەوەبوو جارێک ئافرەتێک لەتاو شەیدابوونی بۆ نەصر گۆرانی دەوت و دەیوت

بۆ نۆشینی مەی دەرفەتێ مابێ

یان بۆ گەیشتن بە نەصر هەبێ رێ چارێ

کە عومەری کوڕی خەططاب ئەوەی بیست بڕیاری دا بە دوورخستنەوەی نەصر.[4]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە خەیبەر بوو ئەم هاوەڵە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمان بوو، دواتر لە مەدینە نیشتەجێ بوو ولەوێ خانوویەک و مزگەوتێکی بۆ خۆی درووست کرد.[5]

سەبارەت بە هۆکاری موسڵمان بوونەکەی هاتووە کە حەجاج هاودەم بە کاروانێکی هۆزەکەی بەرەو مەککە گەڕایەوە، جا کاتێک شەو داهات ترس و بیم دایگرت، لە سەرەی پاسەوانیەکەیدا شیعری دەوت و تیایدا داوای پەنای دەکرد تا خۆی و هاوەڵانی بە سەلامەتی بگەڕێنەوە، لەو کاتەدا گوێی لە دەنگێک بوو ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە (يا معشر الجن والإنس إن استطعتم أن تنفذوا من أقطار السموا والأرض فانفذوا لا تنفذون إلأا بسلطن)، جا کە رۆژ بوویەوەو دواتر گەیشتنە مەککە، سەبارەت بەو ئایەتە پرسیاری کرد و وتی: کەستان شتی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤.

[2] الطبقات اكبرى لابن سعد، ج٥، ص ١٦.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤.

[4] أسد الغابة، ج١، ص ٥٥٨.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٣.

واتان بیستووە؟ پێی وترا ئەوە بەشێکە لە قسەکانی موحەممەد کە دەڵێت: بۆم دابەزیوە، حەجاج وتی: ئەی ئێستا موحەممەد لە کوێیە؟ وترا لە مەدینەیە، خێرا بەرەو مەدینە کەوتەڕێ و بڕیاری دا موسڵمان بێت.[1]

کاتێک حەجاج موسڵمان بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من لە مەککە ژن و منداڵ و سامانم جێهێشتووە، دەبێت بچم بیانهێنم، جا ئەگەر ناچار کرام بەرامبەر بە تۆ قسە بڵێم مۆڵەتم دەدەیت؟ پێغەمبەریش(ﷺ) مۆڵەتی پێدا تا چی ویست بیڵێت، ئەویش چوویەوە بۆ مەککەو بە ژنەکەی وت: چیت هەیە کۆی بکەرەوە چونکە من دەمەوێت شتێک لە سامانی فەوتاوو مەڕو ماڵاتی موحەممەد و هاوەڵانی بکڕم، چونکە ئەوان لە جەنگدا دۆڕاون و حاڵیان شڕە،[2] وا موحەممەد لەلایەن جوولەکەکانەوە بەدیل گیراوەو هاوەڵەکانیشی یان کوژراون یان بڵاوەیان لێکردووە،[3] ئەو هەواڵە لە مەککە بڵاوبوویەوەو موسڵمانەکانی مەککە پێی دڵگران بوون و بێباوەڕەکانیش پێی دڵخۆش بوون، هەواڵەکە گەیشتە عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب، عەبباسیش کە ئەوەی بیست لە پێ کەوت و دۆش داما و نەیئەتوانی بجووڵێت، ئینجا عەبباس کوڕێکی هەبوو کە ناوی قوثەم بوو و زۆر لە پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو، راکشا و لەسەر سنگی داینا و شیعری دەهۆنیەوە کە تیایدا دەیوت خۆشەویستم لە پێغەمبەری خوا دەچێت:

حبي قثم حبي قثم

شبيه ذي الأنف الأشم

نبي رب ذي النعم

برغم أنف من رغم

ئینجا غولامێکی نارد بۆ لای حەجاجی کوڕی عیلاط و پێی وت: ماڵوێران

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٥٥٩.

[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٢٦٠٤، صححه شعيب الأرناؤوط.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٠٨.

ئەمە چ هەواڵێک بوو هێنات؟ تۆ چی دەڵێیت؟ بەڵێنی خوا لەو هەواڵەی تۆ باشترە، حەججاجیش بە غولامەکەی وت: سەلامم بگەیەنە بە ئەبولفەضل و پێی بڵێ: بچێتە ماڵێکەوە تا بە تەنها ببینم، چونکە هەواڵێکم هەیە بۆی کە دڵی خۆش دەکات، غولامەکە هاتەوە، کە گەیشتەوە بەردەرگا، وتی: موژدەت لێ بێت ئەی ئەبولفەضل، عەبباسیش لە خۆشیدا خۆی بۆ فڕێدا و ناوچاوانی ماچ کرد، ئەویش هەواڵی قسەکانی حەججاجی پێدا، عەبباسیش ئەو غولامەی ئازاد کرد، ئینجا چوو بۆ لای حەججاج و ئەویش هەواڵی دروستی پێ وت، وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) خەیبەری فەتح کردووەو سامانی ئەوانی بە دەستکەوت گرتووە، پێغەمبەر(ﷺ) لە دەستکەوتەکاندا صەفیەی کچی حویەی بۆ خۆی هەڵبژارد و سەرپشکی کرد ئایا ئازادی بکات و ببێتە ژنی یان بچێتەوە بۆ ناو ماڵ و کەسوکاری خۆی، ئەویش پێی باش بوو ئازادی بکات و شوو بکات بە پێغەمبەر(ﷺ)، منیش بۆیە هاتوم بۆ ئێرە تا ئەو سامان و ژن و منداڵەی لێرە هەمە ببەم و بڕۆم، مۆڵەتیشم لە پێغەمبەر(ﷺ) وەرگرت و ئەویش مۆڵەتی دام چی پێویست بکات بیڵێم، جا تکام وایە تا سێ رۆژ هیچ نەڵێیت، دوای سێ رۆژەکە چیت پێ خۆش بوو باسی بکە، ئەوەبوو ژنەکەی حەججاج چی خشڵ و پێویستی هەبوو کۆی کردەوەو دای بە حەججاج و حەججاجیش هەموو برد لەگەڵ خۆی و کەوتەڕێ، دوای تێپەڕبوونی سێ رۆژەکە عەبباس چوو بۆ لای ژنەکەی حەججاج و وتی: مێردەکەت کوا؟ ئەویش هەواڵی ئەوەی پێدا کە حەججاج چووە بۆ مەدینە، ئینجا وتی: خوا سەرشۆڕت نەکات ئەی ئەبولفەضل ئەوەی پێت وتین زۆر لەسەرمان قورس بوو، ئەویش وتی: بەڵێ خوا سەرشۆڕم ناکات، سوپاس بۆ خواش تەنها ئەوە روویداوە کە حەزمان پێ بووە، حەججاج هەواڵی پێداوم کە خوای گەورە فەتحی خەیبەری بەخشیوە بە پێغەمبەرەکەی و تیایدا پشکەکان جیاکراونەتەوەو

پێغەمبەر(ﷺ) صەفییەی هەڵبژاردووە بۆ خۆی، جا ئەگەر پێویستیەکت هەیە بە مێردەکەت ئەوە برۆ و خۆت بگەیەنە پێی، ژنەکەی حەججاجیش وتی: سوێند بەخوا بڕوات پێ دەکەم، ئەویش وتی: من راست دەڵێم و مەسەلەکە ئاوەهایە کە پێم وتیت، ئینجا عەبباس چوویەدەرەوەو چوو بۆ کۆڕی قورەیشیەکان و دەیبیست دەیانوت ئەی ئەبولفەضل بەس خێرت بێتەڕێ، ئەویش وتی: سوپاس بۆ خوا خێرم هاتوەتەڕێ و حەججاجیش هەواڵی پێداوم کە خوای گەورە فەتحی خەیبەری بەخشیوە بە پێغەمبەرەکەی و تیایدا پشکەکان جیاکراونەتەوەو پێغەمبەر(ﷺ) صەفییەی هەڵبژاردووە بۆ خۆی، حەججاج داوای لێکردم سێ رۆژ ئەو قسەی بشارمەوەو نەیڵێم، ئەو تەنها بۆ ئەوە هاتبوو چی سامانی هەیە بیبات و بڕوات، بەو هەواڵە خوای گەورە دڵتەنگی سەر موسڵمانانی هەڵگرت و دای بەسەر بێباوەڕاندا، چی موسڵمانی دڵتەنگی مەککەش هەبوون دەهاتن بۆ لای عەبباس، ئەویش هەواڵی پێدەدان و موسڵمانانیش دڵخۆش دەبوون.[1]

ئەم بەسەرهاتە بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی عەبباسی مامی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێشتر موسڵمان بووەو مانەوەی لە مەککە بە ڕێنمایی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووە تا هەم هەواڵی قورەیشیەکان بنێرێت بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، هەم ئاگای لە موسڵمانبووەکانی ناو مەککە بێت، وەک دەبینین کاتێک هەواڵی ناخۆش سەبارەت بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمانان دەبیستێت زۆر دڵتەنگ دەبێت، هەروەها کاتێکیش هەواڵە راست و دڵخۆشکەرەکە دەبیستێت زۆر دڵخۆش دەبێت، موسڵمانانیش دێن بۆ لای و ئەویش موژدەیان پێ دەدات، واتە لەوێ وەک جەمسەرێک بووە بۆ موسڵمانە لاوازەکانی ناو مەککە کە توانای کۆچیان نەبووەو هەواڵی خۆشی و ناخۆشی موسڵمانانیشیان لەوەوە وەرگرتووە، لەو بارەوە ئیبن عەبدولبەر دەڵێت:(دەوترێت عەبباس پێش غەزای بەدر موسڵمان بووەو هەواڵی بێباوەڕانی دەنارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)

[1] مسند أحمد بن حنبل - مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٢٦٠٤، صححه شعيب الأرناؤوط.

و موسڵمانانی مەککە وەک پشتێک تەماشای عەبباسیان دەکرد، عەبباس حەزی لەوە بوو بچێت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) نامەی بۆ نووسی کە مانەوەت لە مەککە باشترە، بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ڕۆژی بەدردا فەرمووی: (هەرکامتان گەیشت بە عەبباس با نەیکوژێت، چونکە ئەو بە ناچاری هاتووە)،[1] هەروەها عەبباس وردەکاری کارو ئامادەکاریەکانی قورەیشیەکانی بە نامە دەنووسی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) وەک چۆن لە غەزای ئوحوددا ئەوەی کرد کاتێک قورەیش خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگ عەبباس هەموو زانیاریەکانی بە نامەیەکدا نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ).[2]

رایەک دەڵێت: حەججاج کە موسڵمان بوو راستەوخۆ لە غەزای خەیبەردا بەشداریشی کرد.[3]

حەججاج یەکەم کەس بوو زەکاتی بەنی سولەیمی نارد بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)،[4] حەججاج دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) چوو لە حیمص نیشتەجێ بوو.[5]

لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا خەلیفە نامەیەکی نووسی بۆ خەڵکی شام و وتی: پیاوماقووڵێکی خۆتان بنێرن بۆ لام، ئەوانیش حەججاجی کوڕی عیلاطیان نارد بۆ لای.[6]

حەججاج لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا مرد.[7]

ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: ئیبن ئەبی حاتەم باسی کردووە حەججاج لە قلیقلە ئەسپەردە کراوە.[8]

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٨١٢.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٣٧.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤.
[8] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٢٦.

## ٩٢٩. حەجنی کوڕی مورەقیع(ﷺ)

ناوی حەجنی کوڕی مورەقیعی ئەزدیە، وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، عومەیری کوڕی حارثی ئەزدی دەڵێت: لەگەڵ دەستەیەک لە هۆزەکەم چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، لەوانە حەجنی کوڕی مورەقیع ئەبوو سەبرە و میخنەف و عەبدولا کە هەردووکیان کوڕی سلیم بوون، هەروەها عەبدشەمسی کوڕی عەفیف کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناوەکەی گۆڕی و ناوی نا عەبدولا...[1]

## ٩٣٠. حەرامی ئەنصاری(ﷺ)

ناوی حەرامە، سەبارەت بە ناوی باوکی دەوترێت ناوی ئەبی کەعبە،[2] چونکە گێڕانەوەیەک لە بارەیەوە هاتووە کە تەنها ناوی حەرامی هێناوە، بەڵام ئەبوو نوعەیم هەمان گێڕانەوەی هێناوە،[3] بەڵام بە حەزمی کوڕی ئەبی کەعب هێناویەتی، حەرام لە پشتیوانانە.[4]

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: جارێک موعاذی کوڕی جەبەل پێش نوێژی بۆ هۆزەکەی دەکرد، حەرامیش هاتە ژوورەوەو دەیشیویست ئاوی دارخورماکانی بدات، بەڵام چووە مزگەوت تا پێشتر نوێژەکەی بکات، لە نوێژەکەدا دەبینی موعاذ زۆر درێژە بە نوێژەکەی دەدات - لە گێڕانەوەکەی ئەبوو نوعەیمدا هاتووە کە سوورەتی بەقەرەی دەخوێند- بۆیە حەرام کەناری گرت و خۆی نوێژەکەی تەواو کرد و چوو بۆ ئاودانی دارخورماکانی، کاتێک موعاذ نوێژەکەی تەواو کرد پێی وترا خۆ حەرام هاتە ژوورەوە،

---

[1] أسد الغابة، ج٤، ص ٣٠٧.

[2] الإصابة في تمييز اصحابة، ج٢، ص ٤٦.

[3] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢٠٥٩.

[4] الإصابة في تمييز اصحابة، ج٢، ص ٤٦.

کە بینی تۆ درێژەت دا بە نوێژەکەت کەناری گرت و نوێژی خۆی کرد و چوو بۆ ئاودانی باخە خورماکەی، موعاذیش وتی: دەی بە دڵنیاییەوە ئەو مونافیقە، لەپێناو خورماکانیدا پەلە دەکات لە نوێژدا؟!! حەرام چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موعاذیش لەوێ بوو، حەرام وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ویستم ئاوی باخە خورماکەم بدەم، بۆیە چوومە مزگەوت تا لەگەڵ خەڵکەکە نوێژ بکەم، بەڵام کە بینیم موعاذ نوێژەکە درێژ دەکاتەوە، من نوێژەکەم کرد و درێژم نەکردەوەو چووم بۆ ئاودانی باخە خورماکەم، کەچی موعاذ بانگەشەی ئەوەی کردووە من مونافیقم، پێغەمبەر(ﷺ) رووی وەرچەرخاند بە رووی موعاذدا و فەرمووی: (أفتان أنت، أفتان أنت، لا تطول بهم، اقرأ بسبح اسم ربك الأعلى و الشمس و ضحاها)،[1] (ئەرێ تۆ پەکخەریت، ئەرێ تۆ پەکخەریت؟! نوێژەکەیان بۆ درێژ مەکەرەوە، ئەم ئایەتانەو هاوشێوەی بخوێنە سبح اسم ربک الأعلى، والشمس و ضحاها).

لە گێڕانەوەکەی بوخاریدا ناوی حەرام نەهاتووەو دەڵێت: پیاوێک هات، ئینجا لە کۆتاییشەوە هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) بە موعاذی فەرموو (فلولا صليت بسبح اسم ربك والشمس وضحاها، والليل إذا يغشى، فإنه يصلي وراءك الكبير والضعيف وذو الحاجة)،[2] (با کە نوێژت کرد ئەمانەت بخوێندایە، سبح اسم ربک، والشمس و ضحاها، والليل إذا يغشى، چونکە لە دوای تۆوە کەسی بەتەمەن و لاواز و خاوەن ئیشی گرنگ هەن نوێژ دەکەن).

لە گێڕانەوەکەی موسلیمیشدا هاتووە خەڵکەکە بە کابراکەیان وت: -واتە حەرام- ئایا بویت بە مونافیق؟ ئەویش وتی: سوێند بەخوا دەچم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەمەی بۆ باس ئەکەم.[3]

---

[1] مسند أحمد بن حنبل - مسند أنس بن مالك(ﷺ) ، الرقم ١٢٤٣١، السنن الكبرى للنسائي - كتاب التفسير - سورة الشمس ، الرقم ١١٦١٠، صححه شعيب الأرناؤوط و قال إسناده صحيح على شرط الشيخين.

[2] صحيح البخاري - كتاب الأذان - باب من شكا إمامه إذا طول، الرقم ٧٠٥.

[3] صحيح مسلم - كتاب الصلاة - باب القراءة في العشاء، الرقم ٤٦٥.

## ٩٣١. حەرامی کوڕی میلحان(ﭬ)

ناوی حەرامی کوڕی میلحانە، میلحانیش ناوی مالیکی کوڕی خالید بوو، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە بەنی نەججار، حەرام خاڵۆی ئەنەسی کوڕی مالیکە،[1] دایکی ناوی ملیکەی کچی مالیکە،[2] خوشکەکەی حەرام ناوی ئوممو سولەیمی کچی ملحان بوو کە ئەویش باوەڕدار بوو و هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ) بوو،[3] خوشکێکی تریشی هەبوو بە ناوی ئومموحەرام.[4]

حەرام لە غەزای بەدر و ئوحودیشدا بەشدار بوو، لە بیئر مەعوونەشدا بەشدار بوو و لەو غەزایەشدا شەهید بوو.[5]

حەرام لەگەڵ دەستەیەکی تری هاوەڵان شەوانە لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) قورئانیان دەخوێند و بە رۆژیش دەچوون ئاویان دەهێنا و لە مزگەوت دایاندەنا و بە دەستکەوتی ئەو ئاوە خواردنیان دەکڕی بۆ هەژارانی ئەهلی صوففە.[6]

کاتێک بەنی سولەیم ناپاکیەکەیان کرد، حەرام چوو بۆ لایان و سەبارەت بە پێغەمبەر(ﷺ) قسەی دەکرد بۆیان، ئەوەبوو ئیشارەتیان کرد بۆ کەسێک و ئەویش بە ناپاکی لێیدا، حەرامیش هاواری کرد و وتی: الله أكبر سوێند بە خوای کەعبە بردمەوە، ئینجا بەنی سولەیم کەوتنە کوشتنی هاوەڵانی تر، دواتر جیبریل هەواڵی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوانە گەیشتون بە خوای گەورە و خواش لێیان رازیە و ئەوانیش لە خوا رازین،[7] پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو (إن إخوانكم قد قتلوا، وإنهم قالوا: اللهم بلغ عنا نبينا أنا قد لقيناك

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٥٧٩.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ١٧.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٠٩.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص ١٨٩.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥١٤.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥١٤.

[7] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب من ينكب في سبيل الله، الرقم ٢٨٠١.

فرضينا عنك، ورضيت عنا)، (براكانتـان كوژران و ئەوەشیان دەوت خوایە لە زاری ئێمـەوە بـە پێغەمبەرەكەمـان بگەیەنـە كـە پێت گەیشـتوین و لێت رازیـن و تۆیش لێمـان رازیـت).[١]

لـە پشـتەوە خەنجـەرێ درا لـە حـەرام و خەنجەرەكـە لـە سەرسـنگیەوە دەرچـوو، ئەویـش هـاواری دەكـرد سـوێند بـە خـوای كەعبـە بردمـەوە.[٢]

## ٩٣٢. حەرمەلەی كچی عوبەید(﵂)

ناوی حەرمەلەی كچی عوبەیدە، لە پشتیوانانە، چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێدا.[٣]

## ٩٣٣. حەرمەلەی كوڕی خالید(ﷺ)

نـاوی حەرمەلـەی كوڕی خالیدی عامیریە، برایەكی هەبوو بە نـاوی عدائی كـوڕی خالیـد كـە هەردووكیـان هـاودەم بـە باوكیـان موسـڵمان بـوون، ئـەو دوانـە لـە گـەورە پیاوانـی نـاو هـۆزی خۆیـان بوون، هەردووكیـان دوای فەتحـی مەككـە موسـڵمان بـوون و لـە دڵڕاگیركـراوان بـوون.[٤]

## ٩٣٤. حەرمەلەی كوڕی زەید(ﷺ)

ناوی حەرمەلەی كوڕی زەیدە، لە پشتیوانانە.[٥]

ئیبـن عومـەر دەڵێـت: جارێـک لای پێغەمبـەر(ﷺ) دانیشـتبووم كـە حەرمەلـەی كوڕی زەیدی ئەنصـاری هـات و وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)

---

[١] صحيح مسلم - كتاب الإمارة - باب ثبوت الجنة للشهيد، الرقم ٦٧٧.

[٢] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٣٠٧.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٠.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٠.

[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٥٨٢.

ئیمان ئا لێرەدایە، ئینجا ئاماژەی کرد بۆ زمانی، وتیشی نیفاقیش ئا لێرەدایە، دەستی لەسەر سنگی دانا، پێغەمبەریش(ﷺ) لێی بێدەنگ بوو، پێغەمبەر(ﷺ) داوای کرد دووبارەی بکاتەوەو حەرمەلەش بێدەنگ بوو، پێغەمبەر(ﷺ) لایەکی زمانی حەرمەلەی گرت و فەرمووی: (اللهم اجعل له لسانا صادقا، وقلبا شاكرا، وارزقه حبي وحب من يحبني وصير أمره إلى الخير)، (خوایە زمانی راستگۆ بکەو دڵی سوپاسگوزار بکە، خۆشەویستی من و خۆشەویستی ئەوەشی پێ ببەخشە کە منی خۆشدەوێت، بارو حاڵیشی بەرەو خێر بگێڕە)، حەرمەلە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من بڕێک برای دووڕووم هەن کە لەنێویاندا بووم، ئایا ئەوانەت پێ بناسێنم کێن؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لا، من جاءنا كما جئتنا استغفرنا له كما استغفرنا لك، ومن أصر على ذنبه فالله أولى به ولا تخرق على أحد سترا)،[1] (نا، هەرکەس وەک تۆ بێت بۆ لامان داوای تەوبەی بۆ دەکەین وەک چۆن بۆ تۆ داوامان کرد، هەرکەسیش لەسەر تاوانەکەی سوور بێت ئەوە خوای گەورە شیاوترە بە سزادانی، پەردەی کەس مەدڕەو نهێنی ئاشکرا مەکە).

## ٩٣٥. حەرمەلەی کوڕی سەلما(ﷺ)

ناوی حەرمەلەی کوڕی سەلمایە، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە فەتحی عێراقدا بەشدار بوو، کاتێک لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلیددا لە عێراق بوو، خالیدی کوڕی وەلید ئەوی کرد بە ئەمیر، وەک پێشتریش وتمان: هاوەڵانی بەرپرسی فتووحات و خەلیفە راشیدینەکانیش بۆ ئەنجامدانی فتووحات و کارەکانی ناوچەکان تەنها هاوەڵانیان دەکرد بە ئەمیر.[2]

[1] المعجم الكبير للطبراني - باب الحاء - من اسمه حرملة - حرملة بن زيد الأنصاري ، الرقم ٣٤٧٥، قال الحافظ ابن حجر إسناده لا بأس به.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥١.

## ٩٣٦. حەرمەلەی کوڕی عەبدولا (رضي الله عنه)

ناوی حەرمەلەی کوڕی عەبدولای کوڕی ئیاسە، دواتر لە بەصرە نیشتەجێ بوو، زۆر خواپەرستی دەکرد و شەونوێژی زۆر بوو تا ئاستێک لەتاو زۆری شەونوێژ پێیەکانی دەئاوسان.[١]

## ٩٣٧. حەرمەلەی کوڕی عەمر (رضي الله عنه)

ناوی حەرمەلەی کوڕی عەمری کوڕی سینئەی ئەسلەمیە، لە حەجی ماڵئاواییدا بەشدار بوو، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڕەحمان، ئەم هاوەڵە لە ناوچەی یەنبوع نیشتەجێ بوو.[٢]

حەرمەلە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەجم کرد، کاتێک لە عەرەفات وەستاین پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی کە پەنجەیەکی لەسەر پەنجەکەی تری دانابوو، منیش بە مامم وت: مامە گیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) چی دەفەرموێت؟ ئەویش وتی: دەفەرموێت (ارموا الجمار بمثل حصى الخاذف)،[٣] (وردە بەردی بچووک بوەشێنن).

## ٩٣٨. حەرمەلەی کوڕی نوعمان (رضي الله عنه)

ناوی حەرمەلەی کوڕی نوعمانە، فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە لە ئیبن حەجەر هێناویەتی.

حەرمەلە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئافرەتێک کە زۆر رووخۆش و منداڵ بێت لای خوا خۆشەویستترە لە ئافرەتێکی جوان کە منداڵی نابێت).[٤]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥١.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٥٨٢-٥٨٣.

[٣] صحيح ابن خزيمة - كتاب المناسك - باب قدر الحصى الذي يرمى به الجمار ، الرقم ٢٨٧٤، قال الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة ، الرقم ١٤٣٧: رجاله ثقات غير يحيى بن هند.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٢.

## ٩٣٩. حەرمەلەی كوڕی هەوەذە(رضي الله عنه)

ناوی حەرمەلەی كوڕی هەوەذەی كوڕی خالیدی عامیریە، لەگەڵ خالیدی برایدا وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[١]

## ٩٤٠. حەرمەلەی كوڕی وەلید(رضي الله عنه)

ناوی حەرمەلەی كوڕی وەلیدی كوڕی موغیرەی مەخزوومیە، برای خالیدی كوڕی وەلیدە،[٢] دایكی ناوی عەصمائی كچی حارثە،[٣] دواتر لە خاكی شام لە نزیک دیمەشقەوە نیشتەجێ بوو.[٤]

## ٩٤١. حەرمەلەی مودلیجی(رضي الله عنه)

ناوی حەرمەلەی مودلجیەو بە ئەبوو عەبدوڵا ناسراوە، چەندین دەرچوونی لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەبوو، چەند فەرموودەشی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[٥]

كوڕێكی هەبوو بە ناوی خالید كە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[٦]

## ٩٤٢. حەریش(رضي الله عنه)

ناوی حەریشەو زانیاری لەبارەی باوكیەوە نەهاتووە، حەریش دەڵێت: لە گەڵ باوكم لە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووین كاتێک ماعیز رەجم كرا.[٧]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٢

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٢.

[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٣٩٤.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٢.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٣.

[٦] مسند الروياني، الرقم ١٤٩٠.

[٧] أسد الغابة، ج١، ص ٥٨٧.

## ٩٤٣. حەریشی کوڕی هیلال(رضي الله عنه)

ناوی حەریشی کوڕی هیلالی قورەیعیە، کەسێکی شاعیر بوو، چەند دێڕە شیعرێک هاتووە کە بەڵگەن لەسەر هاوەڵبوونی خاوەنەکەی، جا رایەک دەڵێت: ئەوانە شیعری حەریشن، رایەکی تریش دەڵێت: بەڵکو هی جحافی کوڕی حەکیمن.[١]

## ٩٤٤. حەزمی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

ناوی حەزمی کوڕی عەمری واقفیە، ئەم هاوەڵە یەکێکە لەوانەی ئەم ئایەتەیان لەبارەوە دابەزی (لَيْسَ عَلَى الضُّعَفَاءِ وَلا عَلَى الْمَرْضَى وَلا عَلَى الَّذِينَ لا يَجِدُونَ مَا يُنْفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِنْ سَبِيلٍ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ، وَلا عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لا أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوْا وَأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ حَزَنًا أَلا يَجِدُوا مَا يُنْفِقُونَ).[٢]

## ٩٤٥. حەزمەی کچی قەیس(رضي الله عنها)

ناوی حەزمەی کچی قەیسی فەهریە، خوشکێکی ناوی فاطیمە بوو، برایەکیشی هەبوو بە ناوی ضحاکی کوڕی قەیس.[٣]

## ٩٤٦. حەزن(رضي الله عنه)

ناوی حەزنەو باپیرەی سەعیدی کوڕی موسەییبە، لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو، پاش وەفاتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ژیا و لە جەنگی یەمامەشدا بەشداری کرد.[٤]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٥٨٧.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦١.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٠.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦١.

سـەعیدی کـوڕی موسـەیب دەڵێـت: حەزنـی باپیـرم چـوو بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ)پێـی فەرمـوو نـاوت چیـە؟ وتـی: نـاوم (حـەزن)ە، فەرمـووی: بەڵکو تۆ (سـەهل)یت، ئەویش وتـی: ناوێک ناگۆڕم کە باوکم لێی نـاوم، ئیبنولموسـەیب دەڵێت: لـەوە بـەدواوە هـەر خەمباری لەنێوماندا بـوو.[1]

## ٩٤٧. حەسسانەی موزەنی(ﷺ)

دایکی بـاوەڕداران عائیشـە دەڵێت: پیرەژنێک هـات بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ)، ئـەوکات پێغەمبـەر(ﷺ) لـە لای مـن بـوو، پێغەمبـەر(ﷺ) بـەو پیرەژنـەی فەرمـوو تـۆ کێیـت؟ وتـی: مـن جەثثامـەی موزەنیـم، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرمـووی: بەڵکـو تـۆ حەسسـانەی موزەنیت، ئێوە چۆنـن؟ حاڵتـان چۆنـە؟ پیرەژنەکـەش وتـی: باشـین بەدایـک و باوکمـەوە بەقوربانـت بـم ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)، عائیشـە دەڵێت: دواتـر کـە قسـەیان تـەواو بـوو و پیرەژنەکـە چوویـە دەرەوە، وتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) چـۆن بـەو گەرموگوڕیـە پێشـوازیت کـرد لـەو پیرەژنـە؟ خێـر بـوو وا زۆر بەخـوڵک بوویـت لەگەڵـی؟ فەرمـووی: (إنها كانت تأتينا زمن خديجة، وإن حسن العهد من الإيمان)، (ئـەم ئافرەتـە کاتـی خـۆی کـە خەدیجـە مابـوو دەهـات بـۆ لامـان، وەفاداریـش لـە ئیمانەوەیـە).[2]

پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) زۆر ڕێـزی ئـەم ئافرەتـەی دەگـرت، ڕێـزی هەمـوو ئـەو ئافرەتانـەی تریشـی دەگـرت کـە هاوڕێـی خەدیجـە بـوون، ئەنەسـی کـوڕی مالیک کـە چەندیـن سـاڵ خزمەتکاری پێغەمبـەری خـوای(ﷺ) دەکـرد دەڵێـت: کاتێـک شـتێک دەهێنـرا بـۆ پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەیفەرمـوو (إذهبوا به إلى فلانة فإنها كانت صديقة خديجة)،[3] (بیبـەن بـۆ فلانـە ئافـرەت چونکـە ئـەو هاوڕێـی خەدیجـە بـوو).

---

[1] صحيح البخاري – كتاب الأدب – باب اسم الحزن، الرقم ٦١٩٠.

[2] المستدرك على الصحيحين – كتاب الإيمان – حسن العهد من الإيمان ، الرقم ٤٠، قال الذهبي في التلخيص صحيح على شرط الشيخين و ليست له علة، صححه الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٢١٦.

[3] صحيح ابن حبان – كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله

## ٩٤٨. حەسەنی کوڕی عەلی(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە باسی دەکەین یەکێکە لە خۆشەویستترین و نزیکترین و لێکچووترین و پایەدارترینی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەمە حەسەنی کوڕی عەلیە، کوڕی فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، کوڕی ئامۆزای پێغەمبەر(ﷺ)، باوکی موژدەپێدراوی بەهەشت و چوارەم خەلیفەی موسڵمانانە، دایکی کچی پێغەمبەر(ﷺ) و گەورەی ژنانی بەهەشتە، باپیرەشی موحەممەدی پێغەمبەری خوایە، براکەی حوسەینی کوڕی عەلیە، حەسەن لێکچووترین کەسە بە پێغەمبەر(ﷺ)، رەیحانە خۆشەویستەکەی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، ئەو منداڵە چاوگەشەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) ماچی دەکرد، دەیگرتە کۆش، یاری بۆ دەکرد، خۆشی دەویست و دەیفەرموو من خۆشم دەوێت، خوایە تۆش خۆشت بوێت، ئەو لاوە خوێن گەرمە بوو کە لە دەوری هاوەڵاندا بوو، نزیک و خۆشەویستی خەلیفەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، ئەو کەڵەپیاوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) موژدەی دا دەبێتە هۆی چاککردنی نێوانی دوو دەستەی موسڵمانان، لە ئالوبەیتی پێغەمبەرە(ﷺ)، بۆیە زۆر گرنگە بە وردی توێژینەوە لە ژیانی ئەم هاوەڵە بکەین، چونکە هەم خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، هەم خەلیفەی پێنجەمی باوەڕدارانە، گومانگەلێکی زۆریش لەسەر ژیانی دروستکراوە.

**ناوو رەچەڵەکی:**

ناوی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبی کوڕی عەبدولموطەلیبی کوڕی هاشمی قورەیشی هاشیمیە، کونیەکەی ئەبوو موحەممەدە.[1]

---

عليهم أجمعين - ذكر خبر ثان يصرح بصحة ما ذكرناه ، الرقم ٧٠٠٧، المستدرك على الصحيحين - كتاب البر والصلة - أعظم الناس حقا على الرجل أمه ، الرقم ٧٤٣٢، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص، صححه الذهبي في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٢٨١٨.

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ١٥.

باوکی ناوی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبە کە ئامۆزای پێغەمبەری خوا(ﷺ)[1] و یەکەم منداڵی موسڵمان بووو زاوای پێغەمبەر(ﷺ) و مێردی فاطیمەی کچی موحەممەدە،[2] یەکێکە لە دە موژدەپێدراوەکەی بەهەشت[3] و کەسی نزیکی پێغەمبەر(ﷺ) و مەولا و خۆشەویستی بوو، خەلیفەی چوارەمی باوەڕداران بوو، بە شەهیدی گەڕایەوە بۆ لای خوا.[4]

دایکی حەسەن ناوی فاطیمەی کچی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵایە، کچی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)،[5] گەورەی ژنانی بەهەشت[6] و دایکی دوو ڕەیحانە و خۆشەویستەکەی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)،[7] یەکەم کەسی ناو بنەماڵەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە دوای پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد.[8]

زڕدایکێکی (باوەژن) هەبوو بە ناوی ئومامەی کچی ئەبیلعاص کە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا بەهاوسەری گرت.[9]

زڕدایکێکی تری (باوەژن) هەبوو بە ناوی خەولەی کچی ئیاس کە دایکی موحەممەدی برای بوو.[10]

باپیرەی لە سەری باوکیەوە ئەبوو تالیب بوو کە پشت و هاوکارێکی گەورەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، تا دوا ساتی ژیانی پشتگیری پێغەمبەری خوای(ﷺ) کرد، بەڵام بە بێباوەڕی کۆچی دوایی کرد.

(١) أسد الغابة، ج٤، ص ١٠٠.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٥٦٤.

(٣) جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) - باب مناقب عبد الرحمن بن عوف الزهري(ﷺ)، الرقم ٣٧٤٧.

(٤) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٦، ص ١٢.

(٥) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٩.

(٦) صحيح البخاري - كتاب المناقب - باب علامات النبوة في الإسلام، الرقم ٣٦٢٤.

(٧) صحيح البخاري - كتاب الأدب - باب رحمة الولد وتقبيله ومعانقته، الرقم ٥٩٩٤.

(٨) صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب فضائل فاطمة بنت النبي عليها الصلاة والسلام، الرقم ٢٤٥٠.

(٩) سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٢٥.

(١٠) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦١٧.

داپیرەی لە سەری باوکیەوە ناوی فاطیمەی کچی ئەسەد بوو کە ژنی ئەبوو طالیب بوو،[1] ئەم ئافرەتە لە کۆچەران بوو و کاتێکیش وەفاتی کرد پێغەمبەر(ﷺ) کراسەکەی خۆی کرد بە کفن و لە ناو گۆڕەکەشیدا راکشا تا خۆڵەکە رێک بوو و فەرمووی: بۆیە وامکرد تا جلی بەهەشت بکاتە بەری ولە گۆڕەکەشیدا راکشام تا گۆڕەوشاری لەسەر سووک بێت، دوای ئەبووطالیب ئەم ئافرەتە لە هەموو کەس چاکتر بوو لەگەڵم.[2]

داپیرەی لە سەری دایکیەوە خەدیجەی کچی خوەیلیدە، دایکی باوەڕداران و ژنی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، یەکەم کەس بوو کە باوەڕی هێنا بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئافرەتێکی دەوڵەمەند بوو و سامانەکەی بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بەکارهێنا، دایکی هەموو منداڵەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو جگە لە ئیبراهیم کە لە ماریە لەدایک بوو،[3] چاکترینی ئافرەتانی بەهەشتە، سێ ساڵ پێش کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە کۆچی دوایی کرد.[4]

**براو خوشکەکانی:**

برایەکی هەبوو بە ناوی حوسەین کە خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) و برابچووکی حەسەن و گەورەی گەنجانی بەهەشتە،[5] لە ساڵی شەست و یەکی کۆچی لە کەربەلا بە دەستی سەربازانی دەوڵەتەکەی یەزید شەهید کرا.[6]

برایەکی تری هەبوو بە ناوی موحەسین کە برابچووکی بوو، کاتێک لەدایک بوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بە عەلی کوڕەکەمم نیشان بدەن بزانم ناوتان ناوە چی؟ وتی: ناومان ناوە حەرب، فەرمووی: (بەڵکو موحەسینە).[7]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٦، ص ١٢.

[2] المعجم الأوسط للطبراني - باب الميم - من اسمه محمد - محمد بن الحسن بن البستنبان ، الرقم ٦٩٣٥، قال الهيثمي: في سنده سعدان بن الوليد و لم أعرفه و بقية رجاله ثقات.

[3] أسد الغابة، ج٧، ص ٨٨-٩٢.

[4] أسد الغابة، ج٧، ص ٩٥.

[5] السنن الكبرى للنسائي - كتاب المناقب - فضائل الحسن والحسين ابني علي بن أبي طالب(ﷺ) وعن أبويهما، الرقم ٨١١٣

[6] أسد الغابة، ج٢، ص ٢٨.

[7] المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - مناقب الحسن والحسين ابني بنت رسول

لە ژنەکانی تری باوکی چەند برایەکی تری هەبوو کە لە کەربەلائدا لەگەڵ حوسەیندا شەهید بوون (جەعفەر، عەبباس، عوثمان، ئەبووبەکر)،[1] هەروەها موحەممەد کە لە مێژوودا بە ئیبنولحەنەفیە ناسراوە، دایکی ناوی خەولەی کچی ئیاسە.[2]

خوشکێکی هەبوو بە ناوی ئومموکلثوم کە لە ساڵی شەشی کۆچی لەدایک بوو.[3]

خوشکێکی تری هەبوو بە ناوی زەینەب کە ئەمیش خوشکی حەق و دای بوو، لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) لەدایک بوو، زەینەب لەگەڵ حوسەینی برایدا چوو بۆ کەربەلا، کاتێک حوسەینی برای شەهید کرا، زەینەب-هاودەم بەو ژن و منداڵانەی کە مابوون- برا بۆ دیمەشق.[4]

**مامەکانی:**

مامێکی ناوی جەعفەر بوو کە خۆشەویستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەرپرسی کۆچەرانی حەبەشە بوو، لە غەزای موئتەدا شەهید بوو و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) مۆژدەی دا جەعفەر لە بەهەشتە.[5]

مامێکی تری ناوی عەقیل بوو کە براگەورەی هەموویان بوو، خۆشەویستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، لە ساڵی هەشتی کۆچیدا کۆچی کرد بۆ مەدینە و بەشداری چەند غەزایەک بوو، عەقیل لە دوای عەلی برای و لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیاندا کۆچی دوایی کرد.[6]

مامێکی تری هەبوو بە ناوی طالیبی کوڕی ئەبوو طالیب کە ئەمیان بە

---

الله(ﷺ) - حديث تسمية الحسن والحسين(ﷺ)، الرقم ٤٨٠١، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص، ضعفه الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٣٧٠٦، حسنه شعيب الأرناؤوط.

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٨٩.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦١٧.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٥٠٠.

[4] أسد الغابة، ج٧، ص ١٤٦.

[5] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص ٢٠٦-٢١١.

[6] أسد الغابة،ج ٤، ص ٧٠-٧٣.

بێباوەڕی مرد، هەرچەندە لەگەڵ بێباوەڕان هات بۆ غەزای بەدر، بەڵام پێش جەنگەکە گەڕایەوە بۆ مەککەو بەشداری نەکرد،[1] ئەو بە نابەدڵی هاتبوو بۆیە گەڕایەوە، بەڵام دواتر نە لەناو کوژراواندا بینرا و نەگەیشتەوە مەککە.[2]

**پوورەکانی:**

لە سەری دایکیەوە کچەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوون (زەینەب، روقییە، ئوممو کلثوم).

زەینەب پووری گەورەی حەسەن و کچە گەورەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، بەڵام لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا وەفاتی کرد.[3]

روقییەش ژنی عوثمانی کوڕی عەففان بوو، کاتێک غەزای بەدر روویدا روقییە نەخۆش بوو، بۆیە بە ویستی پێغەمبەر(ﷺ) عوثمان لای روقییە مایەوە، بەڵام پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بگاتەوە ناو مەدینە روقییە کۆچی دوایی کرد.[4]

ئوممو کلثوم لە روقییە بچووکتر بوو و دوای مردنی روقییەی خوشکی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی مارە کرد لە عوثمانی کوڕی عەففان، بەڵام ئەمیش لە ساڵی نۆی کۆچیدا وەفاتی کرد و باوکی (پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)) نوێژی لەسەر کرد.[5]

**پوورەکانی لە سەری باوکیەوە بریتی بوون لە:**

ئوممو هانیئی کچی ئەبوو طالیب کە لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو، کاتێک موسڵمان بوو پەنای هوبەیرەی مێردی دا و پێغەمبەریش(ﷺ) پەناکەی قبووڵ کرد.[6]

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٢٦٦.
[2] تاريخ الطبري، ج٢، ص ٢٩.
[3] أسد الغابة، ج٧، ص ١٤٤.
[4] أسد الغابة، ج٧، ص ١٢٦.
[5] أسد الغابة، ج٧، ص ٤٢١.
[6] أسد الغابة، ج٧، ص ٤٤٢.

جومانەی کچی ئەبوو طالیب کە ئەم زووتر موسڵمان بووبوو، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) لە دەستکەوتەکانی خەیبەر سی کۆڵ خورمای پێدا.[1]

**خاڵۆکانی:**

خاڵۆکانی بریتی بوون لە کوڕەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە هەموویان هەر بە منداڵی کۆچی دواییان کرد.

**لەدایکبوونی:**

حەسەنی کوڕی عەلی لە ساڵی سێیەمی کۆچی و لە ناوەڕاستی مانگی رەمەزاندا لەدایک بوو، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو لە ناوەڕاستی مانگی شەعباندا لەدایک بووە، رایەکیش دەڵێت: ساڵێک پاش ئوحود لەدایک بوو، رایەک دەڵێت: دوو ساڵ پاش ئوحود لەدایک بووە.[2]

بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: رای دروستتر ئەوەیە لە ناوەڕاستی رەمەزانی ساڵی سێیەمی کۆچیدا لەدایک بووە.[3]

پێش لەدایک بوونی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیزانی کە فاطیمەی کچی منداڵی دەبێت، ئەوەتا ئوممولفەضل دەڵێت: شەوێک خەوم دی بەشێک لە جەستەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ماڵی مندایە، منیش ترسام و راچڵەکیم، ئینجا هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و خەوەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: (خيرا رأيت، تلد فاطمة غلاما، فتكفلينه بلبن ابنك قثم)، (خەوی خێرت دیوە، فاطیمە منداڵێکی دەبێت و تۆیش دەیگریتە خۆ و دایەنی دەکەیت و لە شیری قوثەمی کوڕت دەدەیت پێی)، ئوممولفەضل دەڵێت: ئەوەبوو حەسەن لەدایک بوو، هێنرا بۆم و شیرم پێدەدا تا کەوتە گاگۆڵکێ، ئینجا هێنام بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و لە ژوورەکەیدا دامنیشاند، حەسەن میزی کرد، منیش دام لەنێوان هەردوو شانی، پێغەمبەر(ﷺ) پێی ناخۆش بوو و فەرمووی: (لەگەڵ کوڕەکەم نەرمونیان بە رەحمەتی خوات لێ بێت، کوڕەکەمت ئازار

---

[1] أسد الغابة، ج٧، ص ٥٦.

[2] أسد الغابة، ج٢، ص ١٦.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٨.

دا)، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) جلەکەت لابەرە و جلێکی تر بپۆشە تا ئەوەت بۆ بشۆم، ئەویش فەرمووی: (إنما يغسل بول الجارية وينضح بول الغلام)،[1] (میزی کچ بێت جل دەشۆردرێت، ئەگەر میزی کوڕ بوو ئاوپرژێن دەکرێت).

هەرچەندە ئەم گێڕانەوەیە لە هەندێ ریوایەتدا بۆ حوسەین[2] هاتووەو لە هەندێکی تردا هاتووە (حەسەن یان حوسەین)،[3] بەڵام راستتر وایە کە حەسەن بووە، چونکە ئەوەیان کە دەڵێت: حوسەین بووە ذەهەبی بە لاوازی داناوە، ئەوەشیان دەڵێت: حوسەین یان حەسەن بووە ئەلبانی بە لاوازی داناوە، بەڵام ئەو گێڕانەوەی دەڵێت: حەسەن لەدایکبوو شوعەیب ئەرنائووط بە صەحیحی داناوە.

**ناونانی:**

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی بیست فاطیمەی کچی منداڵی بووە خێرا چوو بۆ ماڵیان، فەرمووی: (أروني ابني ما سميتموه)،(ئادەی کوڕەکەمم نیشان بدەن، ناوی چیتان لێ ناوە؟) عەلی کوڕی ئەبوو طالیبیش وتی: ناوم ناوە حەرب، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بل هو حسن)،[4] (بەڵکو با ناوی حەسەن بێت)، بەوە ناوی نرا حەسەن.

**وەستانێک:**

پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەیەکی صەحیحدا دەفەرموێت (إن أحب أسمائكم إلى الله عبد الله وعبد الرحمن)،[5] (خۆشترین ناوەکانتان لای خوا بریتین لە عەبدوڵا

---

[1] مسند أحمد بن حنبل - مسند النساء(رضي الله عنهن) - حديث أم الفضل بن عباس وهي أخت ميمونة(رضي الله عنها)، الرقم ٢٧٥١٦، صححه شعيب الأرناؤوط.

[2] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٤٧٧٠، قال الذهبي في التلخيص منقطع ضعيف.

[3] سنن ابن ماجه - أبواب تعبير الرؤيا - باب تعبير الرؤيا ، الرقم ٣٩٢٣، ضعفه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ٣٩٢٣.

[4] المستدرک على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(رضي الله عنهم) - مناقب الحسن والحسين ابني بنت رسول الله(ﷺ) - حديث تسمية الحسن والحسين(رضي الله عنهما)، الرقم ٤٨٠١، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص، ضعفه الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٣٧٠٦، حسنه شعيب الأرناؤوط.

[5] صحيح مسلم - كتاب الآداب - باب النهي عن التكني بأبي القاسم، الرقم ٢١٣٢.

و عەبدوڕەحمان)، بەڵام دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) ناوی کچەزاکانی خۆی بەو ناوەوە نەناوە، ئایا ئەمە بەڵگەیە لەسەر ناڕاستی ئەو فەرموودەیە یان ئەو گومانە دروست دەکات پێغەمبەر(ﷺ) جوانترین ناوەکانی هەڵنەبژاردبێت؟!!

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

ئەو فەرموودەیە صەحیحەو گومانی تێدا نیەو لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتووە، گومانیش نیە پێغەمبەر(ﷺ) هەمیشە جوانترینی هەڵبژاردووە، بەڵام:

یەکەم: پێدەچێت ئەو فەرموودەی دوای ئەوە فەرمووبێت کە کچەزاکانی لەدایک بون و دوای ئەوە ئەو فەرموودەی فەرمووبێت.

دووەم: پێدەچێت پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی نەکردبێت تا ئوممەتەکەی وانەزانن ئەمە واجبە یان سوننەتێکی موئەککەدەیە و بەوە ناوی هەموو ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە چەند ناوێکدا بەرتەسک بێتەوە، هەر بۆیە ئەوەشی فەرمووەو بە هاوەڵان و موسڵمانانیشی نیشانداوە دەکرێت ناوی تری جوانیش بنێیت لە منداڵی تازە لەدایک بوو، بەڵام ناوێک بێت کە ئاماژەی خێری تێدا بەدی بکرێت، بۆیە دەبینین دوای پێغەمبەریش(ﷺ) هاوەڵان بە سەدان ناوی جیاوازیان ناوە لە تازە لەدایکبوان و ناوی موسڵمانانیان لە چەند ناوێکدا بەرتەسک نەکردووەتەوەو جوان لە پەیام و مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) تێگەیشتون.

سێیەم: پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەیەکی تری نیشانی موسڵمانان داوە کە گرتنەبەری سوننەتی پێغەمبەرانی پێشووە لە ناوناندا، ئەوەتا دەفەرموێت لەسەر سەنگی منداڵەکانی هاروون ناوی ئەم منداڵانەم ناوە.

کاتێک حەسەن لەدایک بوو پێغەمبەر(ﷺ) بانگی نوێژی فەرموو بە گوێی حەسەندا.[1]

---

[1] سنن أبي داود - كتاب الأدب - أبواب النوم - باب في المولود يؤذن في أذنه ، الرقم ٥٠٨٩، جامع الترمذي - أبواب الأضاحي عن رسول الله(ﷺ) - باب الأذان في أذن المولود ، الرقم ١٦٠٩و قال حديث حسن صحيح، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٥١٠٥، ضعفه شعيب الأرناؤوط.

وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا پاش لەدایکبوونی، لەلایەن ئوممولفەضلهوە شیری پێدەدرا.

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) گوێزەبانەی بۆ حەسەن کرد و دوو بەرانی بۆ سەربڕی.[1]

ئەبی رافع دەڵێت: کاتێک حەسەن لەدایک بوو، فاطیمە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: گوێزەبانەیەک نەکەم بۆ کوڕەکەم؟ ئەویش فەرمووی: (لاولكن احلقي رأسه ثم تصدقي بوزن شعره من فضة على المساكين أو الأوفاض)، (نا، بەڵام سەری بتاشەو بە کێشی مووە تاشراوەکانی لە زیو بکە بە خێر و بیدە بە هەژاران و ئەو هاوەڵانەی لە مزگەوتن و دەستکورتن یان ئەهلی صوففە)، فاطیمەش چوو ئەوەی کرد.[2]

جابیر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە رۆژی حەوتەمی لەدایکبوونی حەسەن و حوسەینیشدا خەتەنەی کردون.[3]

**حەسەنی کوڕی عەلی لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ)**

ئوسامەی کوڕی زەید دەڵێت: من و حەسەن پێکەوە بووین، پێغەمبەر(ﷺ) ئێمەی دەگرتە کۆش و دەیفەرموو (اللهم إني أحبهما فأحبهما)،[4] (خوایە من ئەم دوانەم خۆش دەوێن، دەی تۆش خۆشت بوێن).

هەروەها دەڵێت: شەوێک دام لە دەرگای ماڵی پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەرم(ﷺ) بە جۆرێک شتێکی لە خۆی گرمۆڵە کردبوو کە نەمدەزانی چیە، جا کە ئیشەکەم تەواو بوو وتم: بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە چیت پێیە وا بەرگت بۆ گرمۆڵە کردووە؟ پێغەمبەر(ﷺ) کە بەرگەکەی لابرد بینیم حەسەن و حوسەینی لە باوەش ناوەو فەرمووی: (هذان ابناي وابنا ابنتي اللهم أحبهما فأحبهما

[1] سنن النسائي - كتاب العقيقة - باب كم يعق عن الجارية ، الرقم ٤٢٣٠، صححه الألباني.

[2] مسند أحمد بن حنبل - من مسند القبائل - حديث أبي رافع(ﷺ) ، الرقم ٢٧٨٢٧، ضعفه شعيب الأرناؤوط، و قال الألباني: وهذا إسناد حسن لولا أن شريكا وهو ابن عبد الله القاضي سيء الحفظ لكنه لم يتفرد به.

[3] المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٦٨٢٦.

[4] صحيح البخاري - كتاب فضائل الصحابة - باب مناقب الحسن والحسين، الرقم ٣٧٤٧.

وأحب من يحبهما)،[1] (ئەوە دوو کوڕەکەمن، کوڕانی کچەکەمن، خوایە من ئەم دوانەم خۆش دەوێن دەی تۆیش خۆشت بوێن و ئەوەشت خۆش بوێت کە ئەم دوانەی خۆش دەوێن).

بەرائی کوڕی عازب دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ)لە حەسەن و حوسەین رادەما و دەیفەرموو (اللهم إني أحبهما فأحبهما)،[2] (خوایە من ئەم دوانەم خۆش دەوێن، دەی تۆیش خۆشت بوێن).

بەرائی کوڕی عازب دەڵێت: پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی حەسەنی کوڕی عەلی لە قەلادۆشکان نابوو و دەیفەرموو (اللهم إني أحبه فأحبه)،[3] (خوایە من خۆشم دەوێت دەی تۆیش خۆشت بوێت).

ئەبوو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی حەسەنی کوڕی عەلی لە قەلادۆشکان نابوو و لیکەکانی حەسەنیش دەڕژان بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ).
[4]

ئەبوو هورەیرە دەڵێت: جارێک لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە بازاڕی مەدینە بووم، پێغەمبەر(ﷺ) چوو و منیش بە دوایدا چووم، پێی فەرمووم (أين لكع) (کوا لوکەع)-وشەی لوکەع بۆ خۆشی بۆ منداڵ بەکاردەهێنرا- سێ جار ئەوەی فەرموو، ئینجا فەرمووی: (حەسەنی کوڕی عەلی بانگ بکە)، منیش چووم بینیم حەسەن دەڕوات بە رێدا و ملیوانێک لە ملیدایە، پێغەمبەر(ﷺ) بە دەست ئاماژەی بۆ کرد و ئەویش ئاماژەی بۆ کرد-واتە پێغەمبەر(ﷺ) باوەشی بۆ کردەوەو بە ئاماژەی دەست بانگی کرد- کە حەسەن هات

[1] جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) - باب مناقب أبي محمد الحسن بن علي بن أبي طالب والحسين بن علي بن أبي طالب(ﷺ)، الرقم ٣٧٦٩ وقال حسن غريب.

[2] جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) - ، الرقم ٣٧٨٢و قال حديث حسن صحيح، صححه الألباني.

[3] مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣١٥٥٣، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٢٠٩، صحيح البخاري، الرقم ٣٥٦٠، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٥٢، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٠١.

[4] سنن ابن ماجه - أبواب التيمم - باب اللعاب يصيب الثوب ، الرقم ٦٥٨صححه الألباني، صححه شعيب الأرناؤوط على شرط مسلم.

پێغەمبەر(ﷺ) گرتیە کۆش و فەرمووی: (خوایە من خۆشم دەوێت دەی تۆیش خۆشت بوێت و ئەوەشت خۆش بوێت کە ئەوی خۆش دەوێت)، ئەبووهورەیرە دەڵێت: ئیتر دوای ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر(ﷺ) کەس نەبوو هێندەی حەسەنی کوڕی عەلی لام خۆشەویست بێت.[1]

ئەبوو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (من أحب الحسن والحسين فقد أحبني، ومن أبغضهما فقد أبغضني)،[2] (هەرکەس حەسەن و حوسەینی خۆش بوێت ئەوە منی خۆش ویستووە، هەرکەسیش رقی بێت لێیان ئەوە رقی لە منە).

ئەبووهورەیرە دەڵێت: جارێک ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوو، پێغەمبەر(ﷺ) حەسەنی کوڕی عەلی ماچ کرد، ئەقرەع وتی: من دە کوڕم هەیە تا ئێستا هیچکامیانم ماچ نەکردووە، پێغەمبەریش(ﷺ) سەیرێکی کرد و پاشان فەرمووی: (من لا يرحم لا يرحم)،[3] (ئەوەی میهرو سۆزی نەبێت میهر و سۆزی بۆ نیە).

هەروەها ئەبوو هورەیرە دەڵێت: رۆژێک پێغەمبەرم(ﷺ) بینی چوو بۆ بەر دەرگای ماڵی فاطیمەو فەرمووی: ئەی حەسەن، حەسەن هاتە دەرەوە بۆ لای، پێغەمبەر(ﷺ) دەمی ماچ کرد و زمانی مژی و گرتیە کۆش، ئەبووهورەیرە دەڵێت: سوێند بە خوا تا ئێستاش هەر حەسەنم خۆش دەوێت.[4]

ئەبووهورەیرە دەڵێت: حەسەنی کوڕی عەلیم بینی لە ژوورەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و پەنجەکانی دەکرد بە ناو ریشی پێغەمبەردا(ﷺ) و پێغەمبەریش(ﷺ) زمانی دەکرد بە دەمیدا، واتە زمانی حەسەنی دەکرد بە دەمی خۆیدا، ئینجا فەرمووی: (خوایە من خۆشم دەوێت، دەی تۆیش

[1] صحيح البخاري – كتاب اللباس – باب السخاب للصبيان، الرقم ٥٨٨٤.
[2] سنن ابن ماجه – أبواب السنة – باب في فضائل أصحاب رسول الله(ﷺ) – فضل الحسن والحسين ابني علي بن أبي طالب(رضي الله عنهم) ، الرقم ١٤٣، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٤٣.
[3] صحيح البخاري – كتاب الأدب – باب رحمة الولد وتقبيله ومعانقته، الرقم ٥٩٩٧.
[4] المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٦٥٨٦.

خۆشت بوێت و ئەوەشت خۆش بوێت کە حەسەنی خۆش دەوێت).[1]

جارێک حەسەنی کوڕی عەلی لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بوو، بڕێک خواردنی صەدەقە دانرابوو، ئەویش دانەیەکی خستە دەمیەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (کخ کخ) بۆ ئەوەی فڕێی بدات، ئینجا پێی فەرمو (أما شعرت أنا لا نأكل الصدقة)،[2] (مەگەر نازانیت ئێمە لە صەدەقە ناخۆین).

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: هیچ کەس نەبوو هێندەی حەسەنی کوڕی عەلی لە پێغەمبەر(ﷺ) بچێت.[3]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: بەیانیەک پێغەمبەر(ﷺ) چوویە دەرەوەو جلێکی خوری لەبەر بوو کە لە مووی ڕەش دروستکرابوو، ئینجا حەسەنی کوڕی عەلی هات و پێغەمبەر(ﷺ) هێنایە ژوورەوە، دوای ماوەیەکی تر حوسەین هات و لەگەڵی هاتە ژوورەوە، دواتر فاطیمە هات و پێغەمبەر(ﷺ) ئەویشی هێنایەژوورەوە، ئینجا عەلیش هات و پێغەمبەر(ﷺ) ئەویشی هێنایە ژوورەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە (إنما يريد الله ليذهب عنكم الرجس أهل البيت و يطهركم تطهيرا).[4]

پێغەمبەر(ﷺ) نزای پەنای بۆ حەسەن و حوسەین دەکرد و دەیفەرموو: (باوکتان بەوە داوای پەنای ئیسماعیل و ئیسحاقی دەکرد: أعوذ بكلمات الله التامة من كل شيطان و هامة و من كل عين لامة).[5]

ئەگەر سەیر بکەین ژیانی حەسەن لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) یەکپارچە بریتی بووە لە وەرگرتنی ناز و خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ)، دەیگرتە کۆش، ماچی دەکرد، خۆشەویستی خۆی بۆ نیشان دەدا، نزای بۆ دەکرد، دەیخستە قەلادۆشکانی، زمانی دەمژی، لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ سەر مینبەر، لە نوێژدا کە

[1] معجم ابن الأعرابي، الرقم ١٣٢٦، معجم ابن المقرىء، الرقم ٦٣١.

[2] صحيح البخاري - كتاب الزكاة - باب ما يذكر في الصدقة للنبي(ﷺ) وآله، الرقم ١٤٩١.

[3] صحيح البخاري - كتاب فضائل الصحابة - باب مناقب الحسن والحسين، الرقم ٣٧٥٢.

[4] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب فضائل أهل بيت النبي(ﷺ)، الرقم ٢٤٢٤.

[5] صحيح البخاري - كتاب أحاديث الأنبياء - باب حدثنا موسى بن إسماعيل، الرقم ٣٣٧١.

دەچوویە سەر پشتی بە نەرمی سەری بەرز دەکردەوە،هتد....، چەندین بەسەرهات کە لە هەموویاندا خۆشەویستی خۆی بۆ حەسەن نیشان داوەو داوای کردووە خوا خۆشی بوێت و ئەوەشی خۆش بوێت کە حەسەنی خۆش دەوێت.

ئەبی بەکرە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوت بەرنوێژی بۆ دەکردین و حەسەنیش بچووک بوو دەهات، کە پێغەمبەر(ﷺ) سوجدەی دەبرد حەسەن دەچوویە سەر کۆڵی، پێغەمبەریش(ﷺ) زۆر بە نەرمی و هێواشی سەری بەرز دەکردەوە، هاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەر(ﷺ) تۆ لەگەڵ ئەم منداڵە جۆرێک سۆز دەنوێنیت کە نەماندیوە لەگەڵ کەسی تر وابکەیت، ئەویش فەرمووی: (إنه ريحانتي من الدنيا، إن ابني هذا سيد وعسى الله أن يصلح به بين فئتين من المسلمين)،[1] (ئەم کوڕەم رەیحانەی منە لە دنیادا، ئەم کوڕەم سەییدەو هیوام وایە خوا بیکاتە هۆی چاککردنی نێوانی دوو دەستەی موسڵمانان).

ئەبی بەکرە دەڵێت: رۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) حەسەنی هێنا و لەگەڵ خۆی بردیە سەر مینبەر و فەرمووی: (ابني هذا سيد ولعل الله أن يصلح به بين فئتين من المسلمين)،[2] (ئەم کوڕەم سەییدەو هیوام وایە خوای گەورە بەهۆیەوە نێوانی دوو دەستەی موسڵمانان رێکبخات).

ئەبی سەعیدی خودری دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (الحسن و الحسين سيدا شباب أهل الجنة)،[3] (حەسەن و حوسەین گەورەی گەنجانی بەهەشتن).

حەسەن کە لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بوو فەرموودەی لێوە دەبیست و ئەو فەرموودانەشی دەگێڕایەوە، لەوانە حەسەن دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) نزایەکی فێر کردم تا لە قنووتی نوێژی ویتردا بیخوێنم (اللهم اهدني فيمن هديت،

[1] صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله عليهم أجمعين - ذكر قول المصطفى(ﷺ) للحسن بن علي إنه ريحانته من الدنيا ، الرقم ٦٩٦٤، صححه شعيب الأرناؤوط.

[2] صحيح البخاري - كتاب المناقب - باب علامات النبوة في الإسلام، الرقم ٣٦٢٩، سنن النسائي - كتاب الجمعة - باب مخاطبة الإمام رعيته وهو على المنبر، الرقم ١٤٠٩.

[3] السنن الكبرى للنسائي - كتاب المناقب - فضائل الحسن والحسين ابني علي بن أبي طالب(رضي الله عنه) وعن أبويهما، الرقم ٨١١٣، قال الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٧٩٦، حديث حسن صحيح.

وعافني فيمن عافيت ، وتولني فيمن توليت ، وبارك لي فيما أعطيت ، وقني شر ما قضيت ، فإنك تقضي ولا يقضى عليك ، وإنه لا يذل من واليت ، تباركت ربنا وتعاليت).[1]

کاتێک قورەیشییەکان پەیمانیان شکاند و پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا هێرش بباتە سەر مەککە و فەتحی بکات، ئەبووسوفیان هات تا ڕێککەوتنەکە درێژ بکاتەوە، کە چووە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەڵامی نەدایەوە، بۆیە چوو تکای لە ئەبووبەکر و عومەر و عەلی کرد تا لای پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵای بۆ بکەن، کە چوو بۆ لای عەلی حەسەنی کوڕی عەلی منداڵێک بوو لەبەردەمیدا یاری ئەکرد، عەلیش وەک ئەوانی تر ئەبووسوفیانی بێهیوا کرد و وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بڕیارێکی داوە کە کەسمان بۆی نیە قسەی تێدا بکات.[2]

## حەسەنی کوڕی عەلی لە سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدیندا

### حەسەنی کوڕی عەلی لە سەردەمی ئەبووبەکری صدیقدا

حەسەنی کوڕی عەلی لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدینەکاندا ڕێز و خۆشەویستی زۆری هەبوو، ئەبووبەکری صدیق کە نزیکترین هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیزانی حەسەن چەند خۆشەویست بوو لای پێغەمبەر(ﷺ).

چەند شەوێکی کەم بەسەر وەفاتی پێغەمبەردا(ﷺ) تێپەڕ بووبوو، ئەبووبەکری صدیق نوێژی عەسری کرد بۆ موسڵمانان، کە لێبوونەوە هاتەدەرەوەو عەلیش لەگەڵیدا بوو، دەرۆیشتن بە ڕێدا، ئەبووبەکر حەسەنی بینی کە لەگەڵ چەند منداڵێک یاری دەکرد، ئەبووبەکر حەسەنی گرتە قەلادۆشکان و دەیوت لە پێغەمبەر(ﷺ) دەچێت نەک لە عەلی، عەلیش پێدەکەنی.[3]

---

[1] سنن النسائي - كتاب قيام الليل وتطوع النهار - باب الدعاء في الوتر ، الرقم ١٧٤٤، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١١٧٨، صححه شعيب الأرناؤوط.

[2] تاريخ الطبري، ج٢، ص ١٥٤.

[3] مسند أحمد بن حنبل - مسند العشرة المبشرين بالجنة وغيرهم - مسند أبي بكر الصديق(ﷺ)، الرقم ٤١.

حەسەن ئامادەی کاتی وەفاتی ئەبووبەکری صدیق بوو، حەسەن دەڵێت: کاتێک ئەبووبەکر سەرەمەرگی هات بە عائیشەی وت: ئەی عائیشە سەیری ئەو وشترە بکە کە لە شیرەکەیمان دەخواردەوەو ئەو تەشتەی بەکارمان دەهێنا و ئەو بەرگەی دەمانپۆشی، ئێمە کاتێک کاروباری موسڵمانانمان بەدەست بوو ئەو شتانەمان بەکاردەهێنا، جا ئەگەر مردم ئەوانە ببە بۆ عومەر، ئەوەبوو کە ئەبووبەکر مرد ئەو شتانەی نارد بۆ عومەر، ئەویش وتی: خوا لێت رازی بێت ئەی ئەبووبەکر، ئەرکی دوای خۆتت قورس کرد.[1]

**حەسەنی کوڕی عەلی لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا**

عومەری کوڕی خەططابیش رێزێکی زۆری دەنا لە بنەماڵەی پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێک ویستی بەخششی خەڵک دیاری بکات، راوێژی کرد بە عەبدورەحمانی کوڕی عەوف، عەبدورەحمانیش وتی: لە خۆتەوە دەست پێ بکە، چونکە تۆ شیاوتریت، عومەریش وتی: نا سوێند بەخوا لە نزیکترین کەسەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەست پێ دەکەم، ئینجا لەوانەی بەشداری بەدر بوون، بەوجۆرە دەچم تا دەگاتە خۆم، ئەوەبوو یەکەمجار پێنج هەزاری بڕیەوە بۆ عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، دواتر بۆ هاشمیە بەشداربووەکانی بەدر.[2]

بیلالی کوڕی رەباح کە چووبوو بۆ شام خەوی دی بە پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، لە خەوەکەیدا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو ئەو هەموو جەفاو دوورگرتنەت چیە ئەی بیلال، ئایا کاتی نەهاتووە سەردانم بکەیت، بیلال بە خەفەت و دڵداگیرانەوە لەخەو راچڵەکی، سواری وڵاخەکەی بوو بەرەو مەدینە، چوویە لای گۆڕەکەی پێغەمبەر(ﷺ) و دەگریا، لەو کاتەدا حەسەن و حوسەین-دوو رەیحانەکەی پێغەمبەر(ﷺ)- هاتن بۆ ئەوێ، بیلال دەیگوشین بە خۆیدا و ماچی دەکردن، حەسەن و حوسەین وتیان زۆر بە تاسەوەین بانگت ببیستین، ئەویش دڵی دوو رەیحانەکەی نەشکاند و بانگی دا، دەنگی

---

[1] المعجم الكبير للطبراني - مسند أبي بكر - سن أبي بكر وخطبته ووفاته(ﷺ)، الرقم ٣٨.

[2] مصنف ابن أبي شيبة - كتاب السير - ما قالوا فيمن يبدأ به في الأعطية، الرقم ٣٣٥٧٠.

بانگی بیلال لە مەدینەدا بەرزبوویەوە، هەر کە وتی: اللە أکبر خەڵکی مەدینە راپەڕین، تا گەیشتە أشهد أن محمدا رسول اللە ئیتر گریان هەموانی گرتەوە، دوای پێغەمبەری خوا(ﷺ) رۆژێکی تری وا نەبینرابوو ئاوا گریان هەموان بگرێتەوە.[1]

**حەسەنی کوڕی عەلی لە سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففاندا**

کاتێک هێرش کرایە سەر ماڵەکەی عوثمانی کوڕی عەففان و ویستیان بیکوژن، حەسەنی کوڕی عەلی لەگەڵ چەند هاوەڵێکی تردا لە ماڵی عوثمانی کوڕی عەففاندا مایەوە و بەرگری دەکرد، بەڵام عوثمان داوای لێکردن وازبێنن و نەجەنگن،[2] کاتێکیش عوثمان شەهید کرا و ژنەکەی هاوارای کرد، هەریەک لە حەسەن و حوسەین و چەند کەسێکی تر چوونە ژوورەوە، سەیریان کرد عوثمان شەهید کراوە و سەری بڕراوە.[3]

ئیبنولعەرەبی لەو بارەیەوە دەڵێت:

حەسەن و حوسەین و ئیبن زوبەیر و ئیبن عومەر و مەروان هەموویان بەچەکەوە چوون بۆ ماڵ-بۆ بەرگری کردن لە عوثمان- بەڵام ئەو پێی وتن بڕیارم بۆتان ئەوەیە بگەڕێنەوەو چەکەکانتان دابنێن و لە ماڵی خۆتان بمێننەوە...

عەبدوڵای کوڕی عامری کوڕی رەبیعە دەڵێت: من لەگەڵ عوثمان لە ماڵەوە بووم، وتی: بزانە کێ گوێڕایەڵی فەرمانی منە پێی بڵێ دەست و چەکی بگرێتەوەو بەکاری نەهێنێت، پاشان وتی: ئەی ئیبن عومەر هەستە-ئەوکات ئیبن عومەر شمشێرێکی بەدەستەوە بوو-بڕۆ ئەو هەواڵە بدە بە خەڵکەکە.

ئیبن عومەر و حەسەنی کوڕی عەلیش چوونەدەرەوەو -ئاشووبگێڕانیش-

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٧، سير أعلام النبلاء، ج١، ص٣٥٨، قال الذهبي إسناده لين و هو منكر.
[2] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٤٥٢.
[3] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٤٥٩.

چوونە ناو ماڵەکەو عوثمانیان کوشت...

حەسەنی کوڕی عەلی کۆتا کەس بوو کە لەلای مابوویەوە، چونکە حەسەن و حوسەین و ئیبن عومەر و ئیبن زوبەیر و مەڕوان هاتبوون بۆ لای، ئەویش زۆر جەختی لێکردنەوە چەکەکانیان دابنێن و بچنەدەرەوەو بچنەوە بۆ ماڵی خۆیان.[1]

هەریەک لە عەبدوڵای کوڕی زوبەیر و حەسەنی کوڕی عەلی و مەروانی کوڕی حەکەم لە کاتی بەرگریکردنیان لە عوثمانی کوڕی عەففان بریندار بوون.[2]

کاتێک هەواڵی شەهیدبوونی عوثمان گەیشت بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب، عەلی تەواو شڵەژا و هاودەم بە طەلحەو زوبەیر و سەعد چوون بۆ لای عوثمان و بینییان کوژراوە، عەلی تووڕە بوو لە حەسەن و حوسەین و وتی: ئێوە لەبەر دەرگا بوون و هێشتتان ئەمیری باوەڕداران بکوژرێت؟! ئەوانیش وتیان ئێمە ئاگادار نەبوین بە کوژرانی، عەلی دەستی بەرزکردەوەو زللەیەکی دا لە حەسەن و دای بەسەر سنگی حوسەینیشدا، قسەشی وت: بە موحەممەدی کوڕی طەلحەو عەبدوڵای کوڕی زوبەیر.[3]

**حەسەنی کوڕی عەلی لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبوو تالیبدا(ﷺ)**

کاتێک عوثمان شەهید کرا دوای ئەوە بەیعەتی خیلافەت درا بە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، بەڵام کێشەکە لەوەدا بوو بەیعەتەکە هەموو موسڵمانانی لەخۆنەگرت، بەڵکو بەهۆی راجیایی سەبارەت بە خوێنی عوثمان فیتنەیەک لەنێوان هاوەڵاندا روویدا، ئەویش بوویە هۆی روودانی هەردوو جەنگی جەمەل و صفین، دواجاریش کێشەکە هەر بەو بارەیەوە مایەوە تا لەسەر دەستی حەسەنی کوڕی عەلی فیتنەکە کوژایەوە.

[1] ابن العربي، العواصم من القواصم.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٨٨.

[3] () ٠ الثقات لابن حبان، ج٢، ص ٢٦٥.

موعاویە لە شام و خەڵکی شام مانەوەو بەیعەتیان نەدا بە عەلی، جگە لەوەی طەلحەو زوبەیرو دایکی باوەڕداران عائیشەش ئیجتیهادیان وابوو دەبێت بکوژانی عوثمان یەکسەر بکوژرێنەوە، بەڵام عەلی کوڕی ئەبووطالیب رای وابوو پەلە نەکرێت لە کوشتنەوەیان چونکە ئەوان لەناو مەدینەدان و سەربازانی دەوڵەتی ئیسلامیش لە دەرەوەن و ئەگەر خێرا بکرێت لە لێدانیان لەوانەیە بتوانن مەدینە بگرن.

بەهەرحاڵ ئەمە بوویە هۆی فیتنەیەکی گەورە کە ئەنجامێکی دڵتەزێنی هەبوو بۆ موسڵمانان و تا ئەمڕۆش داخی ئەو فیتنەیە لای موسڵمانان گەرمەو هێشتا خەفەتیان بەو فیتنەیە دانەمرکاوەتەوەو بووە بە چەکێک بەدەست دوژمنانەوە تا داخی دڵی خۆیان بڕژن.

حەسەنی کوڕی عەلی بەیعەتی دا بە عەلی باوکی و لەگەڵیدا مایەوە، کاتێک سەربازگەکەی عەلی لە رەبذە بوو تا بچن بۆ جەنگی دژ بە طەلحەو زوبەیر، پاش ئەوەی نوێژیان کرد، حەسەن چوو بۆ لای عەلی باوکی و لەلای دانیشت و وتوێژێکی لەگەڵ باوکیدا کرد، حەسەن وتی: باوکە من شتێکم پێ وتیت و تۆیش لە قسەم دەرچوویت، سبەی بێ کەس دەکوژرێیت و کەس پشتت ناگرێ، عەلیش پێی وت: تۆ هێشتا لووشکەلووشکی کچانت هەیە، چیت پێ وتم: و من بەگوێم نەکردیت؟ حەسەن وتی: ئەو رۆژەی گەمارۆی ماڵی عوثمان درا داوام لێکردیت لە مەدینە بچیتە دەرەوە تا کاتێک عوثمان کوژرا تۆ لەناو مەدینەدا نەبیت، پاشان ئەو رۆژەی عوثمان کوژرا پێم وتیت بەیعەت لەکەس وەرنەگریت تا وەفدی خەڵکی ناوچەکان و عەرەب و بەیعەتی هەموو میصرت بۆ بێت، پاشان کاتێک ئەو دوانە بەزمی خۆیان کرد پێم وتیت لە ماڵی خۆتدا بمێنیتەوە تا رێکدەکەون، ئەگەر خراپەی لێکەوتەوە ئەوە تۆی بەرنەدەکەوت، کەچی لە هەموو ئەمانەدا تۆ پێچەوانەی من جووڵایتەوە، عەلیش وتی: کوڕی ئازیزم، سەبارەت بە دەرچوونم لە

مەدینە کاتێک عوثمان گەمارۆ درابوو، دەی سوێند بەخوا وەک چۆن ئەو گەمارۆ درابوو منیش گەمارۆ درابووم، سەبارەت بەوەی بەیعەت وەرنەگرم تا هەموو ناوچەکان بێن و بەیعەت بدەن، دەسەڵاتەکە هی مەدینە بوو و پێمان باش نەبوو ئەو دەسەڵاتە بفەوتێت، سەبارەت بە دەرچوونی طەلحەو زوبەیریش ئەوە کەموکورتی و ترسنۆکی بوو بۆ موسڵمانان، سوێند بەخوا لەو کاتەوەی دەسەڵاتم وەرگرتووە پشتم بەردراوە و ئەوەی پێویست بووە نەهاتووەتە رێم، سەبارەت بەوەی لەماڵەوە دابنیشتایەم، ئەی چیم بکردایە بەوەی دەهات بۆ لام، تۆ ئەتویست من چۆن بم؟ دەتویست وەک ئەو جرجە بوومایە کە گەمارۆ دەدرێت دباب دبابیەتی-بانگکردنی نێوان جرجەکان-.[1]

بەڵام حەسەن کە ئەمانەی دەوت بە باوکی، هاوکات ئامادەیی هەبو وهەموو پشتگیریەکی باوکی بکات وەک خەلیفەیەک کە بەیعەتی پێدابوو، بۆیە کاتێک عەلی داوای کرد خەڵکی کووفە بێنە ناو ریزی سوپاکەی و ئەبوومووسای ئەشعەریش خەڵکەکەی سارد دەکردەوە تا نەچن چونکە ئەوەی بە فیتنەیەک دەزانی، عەلی چەند کەسێکی نارد تا خەڵکەکە رازی بکەن بێنە ناو سوپاکەی، بەڵام هیچکام ئەوەیان پێ نەکرا، دواجار عەلی حەسەنی کوڕی نارد لەگەڵ عەمماردا، ئەوەبوو حەسەن وعەلی چوونە مزگەوتی کوفەو لەوێ ئەبوو مووسا کە حەسەنی بینی باوەشی پێداکرد، حەسەن وتی: ئەی ئەبوو مووسا بۆچی خەڵکمان لێدەتەکێنیتەوە، سوێند بەخوا ئێمە تەنها خێرمان دەوێت و کەسی وەک ئەمیری باوەڕدارانیش لەهیچ ناترسێت، ئەبوومووسا وتی: بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم راست دەکەیت، بەڵام راوێژپێکراو دەبێت سپاردەکار بێت، من بیستوومە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (فیتنەیەک روودەدات کە ئەوەی تیایدا دانیشتووە زۆر باشترە لەوەی تیایدا راوەستاوە، ئەوەی تیایدا راوەستاوە زۆر باشترە لەوەی تیایدا رێ دەکات، ئەوەی تیایدا رێ دەکات زۆر باشترە

[1] تاريخ الطبري، ج٣، ص ١١.

لـەوەی تیایـدا سـوارە) خـوا ئێمـەی کردوەتـە بـرای یـەک و مـاڵ و خوێنـی لەیەک حـەرام کردویـن، ئینجا چەنـد ئایەتێکی خوێنـدەوە، عەممـار کـە لەگەڵ حەسـەن بـوو تـووڕە بـوو و هەسـتا و کەوتـە قسـەکردن لەنـاو خەڵکەکـەدا، هەندێکیـش وەڵامیـان دایـەوە... حەسـەن دواتـر قسـەی بـۆ خەڵکەکـە کـرد و وتـی: ئـەی خەڵکینـە بێـن بـەدەم بانگـەوازی ئەمیرەکەتانـەوەو بچـن بـۆ لای براکانتـان، چونکـە هەمـوو کەسـێ دەبێـت بچێـت بـەدەم ئـەم بانگـەوازەوە، سـوێند بەخـوا ئەگـەر کەسـانی ژێـر ئـەم بـارە بگرنـە دەسـت زۆر لەپێشـتر و باشـترە بـۆ داهاتـووش، دەی وەرن بـەدەم بانگەوازەکەمانـەوەو لـەو بـارەدا کـە ئێمـەو ئێـوەش پێـی تاقـی دەکرێینـەوە هاریکارمـان بـن، بـەوە خەڵکەکـە رازی بـوون. [1]

بەوجۆرە حەسـەن بـەردەوام لـە ریـزی سـوپای باوکیدا مایـەوەو هەولێدا، تـا ئـەوەی عەلـی باوکـی بـە دەسـتی ناپاکـی لێیـدرا و سـەرەمەرگی هـات، جـا جوندوبی کوڕی عەبدوڵا هـات بۆ لای عەلـی و وتـی: ئـەی ئەمیری بـاوەڕداران ئەگـەر تۆمـان لەدەسـتدا ئایـا بەیعـەت بدەیـن بـە حەسـەن؟ عەلیـش وتـی: نـە فەرمانتـان پـێ دەکـەم بـۆ ئـەوەو نـە رێگریشـتان لـێ دەکـەم، خۆتـان باشـتر دەزانـن، [2] ئەمـەش ئاماژەیـە بـەوەی عەلـی کـوڕی ئەبـوو طالیـب راوێـژی پـێ رەوا بـووە نـەک دەسـەڵاتی بنەماڵەیـی و پشتاوپشـت.

پاشـان عەلـی هەریـەک لـە حەسـەن و حوسـەینی بانـگ کـرد و ئامـۆژگاری کـردن و وەسـیەتی بـۆ کـردن تـا لەخواتـرس بـن و دنیـا لەخشـتەیان نەبـات و قسـەی حـەق بڵێـن و کـار بکـەن بـۆ رۆژی دوایـی و نەیـاری سـتەمکار و سـەرخەری سـتەملێکراو بـن و کـار بـە قورئـان بکـەن و لەبـەر خـوا ترسـیان لـە لۆمـەی لۆمـەکاران نەبێـت، ئینجـا بـە موحەممـەدی کوڕیشـی وت: هەمـان ئامۆژگاریشـم بـۆ تـۆ هەیـەو داواشـم لێتـە رێـز لـە براکانـت بگریـت چونکـە

[1] تاریخ الطبري، ج٣، ص ٢٦-٢٧.

[2] تاریخ الطبري، ج٣، ص ١٥٧.

مافیان بەسەرتەوە زۆرە، داوای کرد لە حەسەن و حوسەینیش چاک بن لەگەڵ موحەممەد چونکە برایانە و خۆشەویستی باوکیانە.، ئینجا روویکردە حەسەن و وتی: کوڕی خۆم وەسیەتت بۆ دەکەم لەخواترس بیت و نوێژەکان لە کاتی خۆیدا بکەیت و زەکات لە کاتی خۆیدا بدەیت و جوان دەستنوێژ بگریت چونکە نوێژ بە پاکی قبووڵە، نوێژی زەکات نەدەر دروست نیە، لێبوردنت هەبێت بۆ تاوانکار و قین و تووڕەییت بخۆرەوەو پەیوەندی خزمایەتیت بەتین بکە و لەگەڵ نەزاناندا لەسەرخۆ بە و شارەزای ئایین بەو خۆراگربە لەسەر دینداری و پەیوەستی قورئان بەو دراوسێیەتیت چاک بێت و فەرمان بکە بە چاکەو رێگری بکە لە خراپە و دوور بە لە خراپەو داوێن پیسی.[1]

ئینجا کە عەلی وەفاتی کرد حەسەن هەستاو وتارێکی پێشکەش کرد و تیایدا وتی: دوێنێ کەسێک جێی هێشتن کە پێش خۆی و پاش خۆیشی هێندەی ئەو زانستیان نەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) کە ئاڵای دەدایە دەست پشتی هەڵنەدەکرد تا ئەو شوێنەی فەتح دەکرد، جبریل لە لای راستیەوە بوو و میکائیل لە لای چەپیەوە بوو، تەنها شتێک پاش خۆی جێی هێشتبێت حەوت سەد درهەم بووە کە لە مووچەکەی پاشەکەوتی کردبوو، دەیویست بەو پارەیە خزمەتکارێک بکڕێت،[2] شەوێک کوژرا کە تیایدا قورئان دابەزیوە، تیایدا عیسا بەرزکرایەوە، تیایدا مووسا گیانی سپارد)، حەسەن و حوسەین و عەبدوڵای کوڕی جەعفەر تەرمەکەی عەلییان شۆرد،[3] ئینجا حەسەن نوێژی لەسەر باوکی کرد.[4]

[1] تاريخ الطبري، ج٣، ص ١٥٨.

[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند أهل البيت رضوان الله عليهم أجمعين - حديث الحسن بن علي بن أبي طالب(ﷺ)، الرقم ١٧٤٢، حسنه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٢٤٩٦، حسنه شعيب الأرناؤوط.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٣٢٩.

[4] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٤٦٣٦، سكت عنه الذهبي.

## خیلافەتی حەسەنی کوڕی عەلی

بەیعەتپێدانی:

پاش ئەوەی عەلی کوڕی ئەبووطالیب شەهید کرا، بەیعەتی خیلافەت درا بە حەسەنی کوڕی عەلی، وەک پێشتریش هێنامان ئەوە بە بڕیاری عەلی نەبوو، بەڵکو ئەو وتی: نە فەرمانتان پێ دەکەم بەیعەتی پێبدەن و نە ڕێگریشتان لێ دەکەم.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە عەلی وتی: من بەو بارەوە جێتان دێڵم کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) جێی هێشتن-واتە کەستان بۆ دیاری ناکەم-، جا ئەگەر خوا خێری بوێت بۆتان لەسەر چاکترین کەستان کۆتان دەکاتەوە وەک چۆن دوای پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر چاکترین کەستان کۆی کردنەوە.[١]

عەلی کوڕی ئەبووطالیب لە حەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی چلی کۆچیدا شەهید کرا، بۆیە بەیعەتدانەکەی عەلیش لەو دەوروبەرەدایە، نزیکەی چل هەزار کەس بەیعەتیان پێدا، ئەوانە پێشتر بەیعەتی مەرگیان دابوو بە عەلی باوکی.[٢]

یەکەم کەس بەیعەتی دا بە حەسەن، قەیسی کوڕی عوبادە بوو کە پێی وت: دەستت بێنە تا لەسەر کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی بەیعەتت پێبدەم، حەسەنیش بێدەنگ بوو، ئەوەبوو بەیعەتی پێدا و بە دوایدا خەڵکی تریش بەیعەتیان پێدا.[٣]

حەسەن مەرجی لەسەر خەڵکی دانا ئینجا ڕازی بوو بەیعەتی پێ بدرێت، ئەوەتا هیلالی کوڕی خەباب دەڵێت: حەسەن کەسە دیارەکانی خەڵکی عێراقی لە کۆشکی مەدائیندا کۆکردەوە و وتی: ئێوە بەو بڕیارە بەیعەتتان پێ داوم کە لەگەڵ هەر کەسێ ئاشتی بکەن کە من ئاشتی لەگەڵ دەکەم و لەگەڵ هەر کەسێ بجەنگن کە من لەگەڵی دەجەنگم.[٤]

---

[١] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٤.

[٢] أسد الغابة، ج٢، ص ١٩.

[٣] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٤.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٧٣.

خەڵکی زیاتر لە عەلی حەسەنیان خۆشدەویست و زۆر پێی سەرسام بوون.[1]

**ناچارکردنی حەسەن بە جەنگ**

حەسەن قەیسی کوڕی سەعدی دانابوو بە ئەمیری ئاذەربایجان، بەڵام قەیس بەردەوام زۆری دەکرد لە حەسەن تا بچێت بۆ جەنگی شام، بۆیە حەسەن بڕیاری دا قەیس لابەرێت و لە شوێنیدا عوبەیدوڵای کوڕی عەبباسی دانا، هەرچەندە حەسەن نیازی جەنگی نەبوو، بەڵام زۆرێک لە دەوری زۆریان لێکرد و ناچاریان کرد بڕیاری جەنگ بدات، بۆیە سوپایەکی گەورەی پێکهێنا و قەیسی کوڕی سەعدی لە پێشەوە دانا و دوانزە هەزار سەربازی دایە دەست، خۆیشی بە سوپاوە کەوتەڕێ تا بڕوات جەنگی موعاویە و خەڵکی شام بکات تا رازی بن بەیعەت بدەن، لە نزیک مەدائین بوو کە هەواڵێک هات وترا قەیس کوژراوە، هەر بەم هەواڵە سەرجەم سەربازان شڵەژان و کەوتنە تاڵان و بڕی،[2] دەوروبەرەکەی کەوتنە دزینی شمەکەکانی حەسەن، ئەوەی مابوویەوە بەڕەکەی ژێری بوو، ئەویشیان برد، ئینجا یەکێک لە خەواریجەکان کە لەوێ بوو خەنجەرێکی دا لە حەسەن و برینداری کرد، خێرا خەڵکەکە ئەو کابرایان کوشت، ئەو خەنجەرەش ژەهراوی بوو، ماوەی نزیکەی مانگێک حەسەن بەو برینەوە مایەوە، دواتر خوا شیفای دا و برینەکەی چاک بوویەوە،[3] حەسەن بەوە زۆر بێزار بوو لەو سوپایەو متمانەی پێیان نەما و چوو لە کۆشکی سپی ناو مەدائین دانیشت، هێشتا برینەکەشی چاک نەبووبوویەوە، یەکێک لەوانەی لەوێ بوو ناوی موختاری کوڕی ئەبی عوبەید بوو، بە والی مەدائین (سەعدی کوڕی مەسعوود)ی وت: بۆچی شتێک ناکەیت هەم ببیتە خاوەن پۆست و

---

[1] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ٦.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٤.

[3] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ٦.

هەم دەوڵەمەندیش بیت؟ وتی: چی بکەم؟ وتی: حەسەن بگرەو بینێرە بۆ موعاویە، ئەویش پێی وت: خوا خۆت و بیرۆکەکەت بێزراو بکات، ناپاکی بنوێنم بەرامبەر بە کچەزای پێغەمبەری خوا؟!!![1]

**هەنگاونان بەرەو رێککەوتن لەگەڵ موعاویە**

حەسەنی کوڕی عەلی بڕیاریدا لەگەڵ موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیاندا رێکبکەوێت، جا هەر دەستەیەک و باس لە هۆکارێک دەکەن بۆ ئەو رێککەوتنە.

ئەمەشی لە ناچاری و لاوازیدا نەکرد، بەڵکو تەنها لەپێناو کوژاندنەوەی فیتنەو رێکخستنی نێوان دوو دەستەی موسڵماناندا بوو وەک چۆن پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەیەکدا ئاماژەی بەوە دابوو حەسەن کارێکی وا دەکات، ئەبی بەکرە دەڵێت: رۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) حەسەنی هێنا و لەگەڵ خۆی بردیە سەر مینبەر و فەرمووی: (ابني هذا سيد ولعل الله أن يصلح به بين فئتين من المسلمين)،[2] (ئەم کوڕەم سەییدەو هیوام وایە خوای گەورە بەهۆیەوە نێوانی دوو دەستەی موسڵمانان رێکبخات).

عەبدوڵای کوڕی جەعفەر دەڵێت: حەسەنی کوڕی عەلی وتی: رایەکم هەیە حەز دەکەم تۆیش شوێنم بکەویت، وتم: چیە؟ وتی: دەمەوێت بچمەوە مەدینەو لەوێ دابنیشم و دەسەڵات جێبهێڵم بۆ موعاویە، چونکە فیتنە هەر ناکوژێتەوەو خوێن زۆر رژاوە و رێ بڕاوە، منیش وتم: خوا لەسەر ئوممەتی موحەممەد پاداشتی خێرت بداتەوە، ئینجا حەسەن ناردی بە شوێن حوسەیندا و هەمان قسەی بۆ کرد و زۆر مشتومڕی لەگەڵ کرد تا حوسەینی رازی کرد.[3]

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٤.

[2] صحيح البخاري - كتاب المناقب - باب علامات النبوة في الإسلام، الرقم ٣٦٢٩، سنن النسائي - كتاب الجمعة - باب مخاطبة الإمام رعيته وهو على المنبر، الرقم ١٤٠٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٧٣.

موعاویە دەیزانی حەسەن لە هەموان زیاتر رقی لە فیتنەو ئاشووبە، هەر بۆیە ڕێککەوتنی لەگەڵ کرد.[1]

جارێک حەسەن کە بە کووفەدا دەگەڕا، یەکێک سەلامی بۆ کرد و وتی: سەلاموعەلەیک ئەی سەرشۆڕکەری باوەڕداران، ئەویش وتی: من سەرشۆڕکەری باوەڕداران نیم، بەڵکو نەمویست لەسەر دەسەلاٌت بەکوشتتان بدەم.[2]

حوسەینی برای نارازی بوو لەو هەڵوێستەی حەسەنی برای کە لە ڕێککەوتنی لەگەڵ موعاویە نواندی و وتی: تو خوا وا نەکەیت قسەی باوکم پشتگوێ بخەیت و قسەی موعاویەت لا ڕاست بێت، حەسەنیش پێی وت: بێدەنگ بە من لە تۆ شارەزاترم بەم مەسەلەیە.[3]

**ڕێککەوتنی حەسەن و موعاویە**

لە ساڵی چل و یەکی کۆچیدا حەسەنی کوڕی عەلی لەگەڵ موعاویە دانیشتنی کرد و گەیشتنە ڕێککەوتن، بەوپێیە حەسەن وازی لە خیلافەت هێنا بۆ موعاویە، بۆیە بەو ساڵە دەوترێت عام الجماعە (ساڵی کۆدەنگی)، کۆبوونەوەکەی حەسەن و موعاویە لە خاکی عێراق بوو لە ناوچەی ئەنبار، ئەمەش لە مانگی ڕەبیعولئاخیر یان لە مانگی جەمادیلئوولادا بوو، لەوێ ڕێککەوتن و حەسەن دەسەلاٌتی دایە دەست موعاویە.[4]

ناپاکی و نیازی خراپی ناو سوپاکەی حەسەن وایکرد حەسەن نامە بنووسێت بۆ موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان تا ڕێککەوتن بکەن، موعاویەش هەریەک لە عەبدولاٌی کوڕی عامیر و عەبدورەحمانی کوڕی سەمورەی نارد بۆ لای تا چی سامانی دەوێت پێی ببەخشن، حەسەنیش مەرجی دانا لە بەیتولمالی کووفە پێنج ملیۆن درهەم ببات و خەراجی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٧٣.

[2] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ٦.

[3] أسد الغابة، ج٢، ص ٢٨.

[4] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ٥.

ئەبجەرد بۆ ئەو بێت و قسە نەوترێت بە عەلی باوکی، بەرامبەر بەوە واز لە خیلافەت بێنێت بۆ موعاویە و رژانی خوێنی موسڵمانان بوەستێت، حوسەینی برای زۆر بەمە نارازی بوو و سەرکۆنەی حەسەنی دەکرد، بەڵام حەسەن سوور بوو لەسەر راکە، هەواڵی نارد بۆ قەیس تا گوێڕایەڵ بێت و واز بێنێت لە جەنگ، بەڵام قەیس رازی نەبوو، دواتر هاتە سەر بار و بەیعەتی دا بە موعاویە.[1]

ئینجا موعاویە هات بۆ عێراق و لەوێ رێککەوتن، موعاویە هات تا لەناو خەڵکەکەدا وتار بدات، بەڵام پێشنیاری بۆ کرا داوا بکات تا حەسەن وتار بدات بۆ خەڵکەکەو پێیان بڵێت وازی لە دەسەڵات هێناوە بۆ موعاویە، حەسەنیش هەستا و دەستی کرد بە وتارەکەی، سەرەتا بە سوپاس و ستایشی خوا دەستی پێکرد، ئینجا صەلەواتی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا فەرمووی:

ئەی خەڵکینە خوای گەورە بە هۆی پێشینانمانەوە ئێوەی رێنموونی کرد و بەهۆی دواینەکانیشمانەوە خوێن رشتنی نەهێشت، ئەم بارە ماوەیەکی هەیە و دنیاش ماوە ماوەیە، خوای گەورەش فەرموویەتی بە پێغەمبەرەکەی (وإن أدري لعله فتنة لكم ومتاع إلى حين)، کە ئەمەی وت: موعاویە تووڕە بوو و داوای کرد حەسەن دابنیشێت.[2]

خەڵکێک رازی نەبوون بەیعەت بدەن بە موعاویە، بۆیە حەسەن کەسە دیارەکانی خەڵکی عێراقی لە کۆشکی مەدائیندا کۆکردەوە و وتی: ئێوە بەو بڕیارە بەیعەتتان پێ داوم کە لەگەڵ هەر کەسێ ئاشتی بکەن کە من ئاشتی لەگەڵ دەکەم و لەگەڵ هەرکەسیش بجەنگن کە من لەگەڵی دەجەنگم، وا منیش بەیعەتم داوە بە موعاویەو ئێوەش گوێڕایەڵی بن.[3]

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٤-١٥.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٨.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٧٣.

**مەرجەکانی رێککەوتنەکە**

موعاویە زۆر دڵخۆش بوو بەو دەستپێشخەریەی حەسەن بۆ رێککەوتن، چونکە دەیزانی حەسەن لە هەموان زیاتر رقی لە فیتنەو ئاشووبە،[1] بۆیە پەڕەیەکی سپی بۆ نارد و پێی وت: چ مەرجێکت دەوێت بینووسە،[2] لە خوارووی پەڕەکەشەوە مۆری خۆی لێدابوو.[3]

حەسەن مەرجی دانا موعاویە بەپێی قورئان و سوننەت و ئەزموونی خەلیفە راشیدینەکان بجووڵێتەوە.

نابێت موعاویە دوای خۆی کەس دابنێت بۆ خیلافەت، بەڵکو بە شوورا بێت.

خەڵکی پارێزراو و دڵنیا بن لە هەردوو لا، خۆیان و سامان و ژن و منداڵیان.

نابێت حەسەن و حوسەین و ئالوبەیت ژێربەژێر ناپاکی بنوێنن.[4]

حەسەن داوای ئەوەی کرد دوای موعاویە ئەگەر هاتو حەسەن مابوو بەیعەت بدرێتەوە بە حەسەن،[5] موعاویە بەڵێنی دا بە حەسەن ئەگەر ئەو پێش مەرگی حەسەن شتێکی تووش بوو و مرد، ئەوا پۆستی خیلافەت بگەڕێتەوە بۆ حەسەن[6]

هەروەها حەسەن مەرجی دارایی دانا تا ئەو سامانەی لایانە لێیان نەسەنرێتەوە[7] مەرجی دانا لە بەیتولمالی کووفە پێنج ملیۆن درهەم ببات و خەراجی ئەبجەرد بۆ ئەو بێت،[8] بەپێی رێککەوتنەکە دەبوو موعاویە قەرزەکانی حەسەن بداتەوە.[9]

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٧٣.
[2] المنتظم لابن الجوزي، ج ٥، ص ١٨٣.
[3] تأريخ ابن خلدون، ج٢، ص ٦٤٨.
[4] الصواعق المحرقة، ج٢، ص ٣٩٩.
[5] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ٥.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٧٣.
[7] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٦، ص ٢١٩.
[8] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٤.
[9] الصواعق المحرقة على أهل الرافضة لابن حجر الهيثمي، ط١، مؤسسة الرسالة (لبنان-١٩٩٧)، ج٢، ص ٣٩٨.

هەروەها حەسەن مەرجی دانا کە ئیتر خوێنی موسڵمانان نەڕژێت و بیر نەکرێتەوە لە رشتنی خوێنی موسڵمانان، ئەوانەی بەشدار بون تۆڵەیان لێ نەکرێتەوە، واتە ئەو بۆیە وازی هێنا تا خوێن نەڕژێت، بۆیە مەرجی وەستاندنی رژانی خوێنی موسڵمانانی دانا.[1]

ئەمەش دەقی ئەو رێککەوتنە بوو کە حەسەن نووسی:

بسم الله الرحمن الرحيم هذا ما صالح عليه الحسن بن علي(ﷺ) معاوية بن أبي سفيان، صالحه على أن يسلم إليه ولاية المسلمين على أن يعمل فيهم بكتاب الله تعالى وسنة رسول الله وسيرة الخلفاء الراشدين المهديين وليس لمعاوية بن أبي سفيان أن يعهد إلى أحد من بعده عهدا بل يكون الأمر من بعده شورى بين المسلمين وعلى أن الناس آمنون حيث كانوا من أرض الله تعالى في شامهم وعراقهم وحجازهم ويمنهم وعلى أن أصحاب علي وشيعته آمنون على أنفسهم وأموالهم ونسائهم وأولادهم حيث كانوا وعلى معاوية بن ابي سفيان بذلك عهد الله وميثاقه وأن لا يبتغي للحسن بن علي ولا لأخيه الحسين ولا لأحد من أهل بيت رسول الله غائلة سرا ولا جهرا ولا يخيف أحدا منهم في أفق من الآفاق، أشهد عليه فلان وفلان بن فلان وكفى بالله شهيدا).[2]

(بەناوی خوای گەورەو میهرەبان، ئەمە رێککەوتنی حەسەنی کوڕی عەلیە لەگەڵ موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیاندا، لەگەڵی رێککەوت لەسەر ئەوەی دەسەڵاتداری موسڵمانانی بداتەدەست بەرامبەر بەوەی –موعاویە- لەناویاندا بە پێی قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خواو رێڕەوی خەلیفە راشیدینە رێنموونەکان بجووڵێتەوە، موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان بۆی نیە دوای خۆی کەس راسپێرێت بۆ دەسەڵات، بەڵکو دەبێت دوای ئەوە بە شووورای نێوان موسڵمانان بێت و خەڵکیش لە هەر ناوچەیەکی زەوی خوادا بن دڵنیا و بێخەم بن، چ لە شام یان عێراق یان حیجاز یان یەمەندا بن، هەروەها دەبێت هەوادارانی عەلی لە خۆیان و سامان و ژن و منداڵیان دڵنیا و پارێزراو بن لە هەر کوێ بن، موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان دەبێت

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٥.

[2] الصواعق المحرقة، ج٢، ص ٣٩٩.

بۆ ئەمە بەڵێن و پەیمانی خوا بدات، حەسەنی کوڕی عەلی و حوسەینی برای و هیچ کام لە ئالوبەیتی پێغەمبەر(ﷺ) بۆیان نیە بە نهێنی و ئاشکرا ناپاکی بنوێنن و هیچ کام لەوانەش لە هیچ ئاسۆیەک ترسیان لەسەر نەبێت، هەریەک لە فلانە کەس و فلانی کوڕی فلان شاهید بوون، هێندەش بەسە کە خوا شاهید بێت).

**ئایا مەرجی قسە نەوتن بە عەلی تێدایە؟**

لەو بارەوە هەندێ سەرچاوە هێناویانە یەکێک لە مەرجەکان ئەوە بووە لەوەودوا موعاویە بە ئاشکرا قسە نەڵێت بە عەلی باوکی حەسەن، بەڵام ئەمە لای زانایانی ئەهلی سوننە بە قبووڵ نەکراو هاتووە، چونکە پێیان وایە موعاویە کەسێکی وا نەبووە قسە بڵێت بە عەلیەک کە موژدەپێدراوی بەهەشت و زاوای پێغەمبەر(ﷺ) بووە، خواش زاناترە.

**حەسەن دوای ڕێککەوتنی لەگەڵ موعاویە**

دواتر حەسەن و داروودەستەو نزیکەکانی بڕیاریان دا بەرەو حیجاز بگەڕێنەوەو ڕووەو حیجاز کووفەیان بەجێهێشت،[1] خەڵکی کووفەش بە گریانەوەماڵئاواییان لێکرد.[2]

حەسەن تا دە ساڵ دوای ئەم ڕێککەوتنە ژیا و ساڵانەش لەلایەن موعاویەوە ملیۆنێک درهەمی پێدەدرا ،[3] ئەویش بەشی زۆری ئەو پارەی دەبەخشی.[4]

خەڵکێک هەبوون بەو ڕێککەوتنەی حەسەن نارازی بوون و ئەوەیان بە زەلیلی دادەنا، بۆیە جارێک حەسەن کە بە کووفەدا دەگەڕا، یەکێک سەلامی بۆ کرد و وتی: سەلاموعەلەیک ئەی سەرشۆڕکەری باوەڕداران، ئەویش وتی: من سەرشۆڕکەری باوەڕداران نیم، بەڵکو نەمویست لەسەر دەسەڵات

---

[1] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٢.

[2] تاريخ ابن خلدون، ط٥، دار القلم (بيروت-١٩٨٤)، ج٢، ص ٦٤٩.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٦٤.

[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٦١.

بەکوشتتان بدەم.[١]

هەیانبوو پێی دەوت ئەی ئابڕووبەری موسڵمانان، ئەویش دەیوت ئابڕووچوون باشترە لە چوونە دۆزەخ.[٢]

بەمە نارەحەتیەکەی حەسەن زۆر سەختتر بوو، لەگەڵ ئەوەی لەپێناو موسڵماناندا مافێکی خۆی وازلێهێنابوو، کەچی هێشتا موسڵمانان سووکایەتییان بەرامبەری دەنواند.

بەمجۆرە حەسەن پێنجەم خەلیفەی راشیدین بوو و بە وازهێنانی حەسەنی کوڕی عەلی لە خیلافەت ئیتر ماوەی خیلافەتی راشیدین تەواو بوو، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە سەفینەی خزمەتکاری پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە ماوەی خیلافەتی راشیدین گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (الخِلاَفَةُ فِي أُمَّتِي ثَلاَثُونَ سَنَةً ثُمَّ مُلْكٌ بَعْدَ ذَلِكَ)[٣] واتە:(خیلافەت لە ئوممەتەکەمدا سی ساڵ دەبێت، دواتر دەبێتە پاشایەتی).

ماوەی خیلافەتی حەسەنیش حەوت مانگ و شتێک بوو،[٤] هەرچەندە رای تر هەیە دەڵێت: شەش مانگ یان حەوت مانگ یان هەشت مانگ بووە.

دەسەڵاتداری موعاویەش سەرەتای پاشایەتی بوو و موعاویە بوو بە یەکەم پاشای موسڵمانان و چاکترینی پاشایانی موسڵمانیش بوو.[٥]

حەسەن زۆربەی ئەوەی هەیبوو لە رێی خوادا دەیبەخشی، عەلی کوڕی زەید دەڵێت: حەسەن سێ جار لەپێناو خوادا چی هەبووە کردوویەتی بە دوو بەشەوەو بەشێکی بەخشیوە.

هەروەها دەڵێت: حەسەن نزیکەی پانزە حەجی کردووە کە بە پیادە -لە

---

[١] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ٦.

[٢] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ٥.

[٣] جامع الترمذي - أبواب الفتن عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء في الخلافة، الرقم ٢٢٢٦ وقال حديث حسن، صححه الألباني في الجام الصغير و زيادته، الرقم ٥٥٦٨ و في السلسلة الصحيحة، الرقم ٤٥٩.

[٤] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٦٣.

[٥] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٩.

مەدینەوە- چووە و ئەو حەجەی کردووە.[1]

حەسەن کە چوویەوە مەدینە جار جارە سەردانی موعاویەی دەکرد، جارێک کە سەردانی موعاویەی کرد، موعاویە پێی وت: ئەی حەسەن دیاریەکت پێ دەدەم کە کەس پێش من بە کەسی نەدابێت، ئەوەبوو چوارسەد هەزاری پێدا.[2]

سالانە حەسەن دەچوو بۆ لای موعاویەو سەد هەزار درهەمی وەردەگرت، سالێکیان حەسەن نەچوو، موعاویەش پارەکەی بۆ نەنارد، حەسەن داوای کرد پەرەی بۆ بێنن تا نامەیەک بنووسێت بۆ موعاویەو پێی بلێت، بەلام خەوی لێکەوت و پێغەمبەری خوای(ﷺ) بینی کە گلەیی لێکرد چۆن داوا لە بەندەیەک دەکەیت و لە خوا داوا ناکەیت، ئەویش وتی: ئەی چی بکەم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ ئەویش نزایەکی فێر کرد تا بیلێت، حەسەنیش هەستا و ئەو نزایەی دەخوێند، هێندەی نەبرد بە موعاویە وترابوو حەسەن ئەمسال نەهاتووە، ئەویش فەرمانی کرد دووسەد هەزار درهەمی بۆ بنێردرێت.[3]

### ژنهێنانەکانی حەسەن(ﷺ)

مەسەلەیەک کە سەبارەت بە حەسەنی کوڕی عەلی وەک گومانێک لەسەر ژیانی هاتووە، مەسەلەی ژنهێنانەکانیەتی، بەجۆرێک لە چەند سەرچاوەدا هاتووە کە حەسەن نزیکەی حەفتا ژنی هێناوەو زوو زوو ژنی تەلاقداوە، تەنانەت وای لێهاتبوو عەلی بە خەلکی کووفەی دەوت ژن مەدەن بە حەسەن چونکە کەسێکە زوو ژن تەلاق دەدات،[4] کەسێک هەستا و وتی: بەخوا هەر ژنی پێدەدەین، کامی پێ باش بوو با بیهێلێتەوەو کامی پێ باش نەبوو با تەلاقی بدات.[5]

---

[1] المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ٢٢٥.

[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١٥٤.

[3] تأريخ دمشق، ج١٣، ص ١٦٦.

[4] مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ١٥٦٢٣.

[5] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ٣٦-٣٧.

ئەمە لە چەند رووبەکەوە جێی گومانە:

یەکەم: حەسەنی کوڕی عەلی ئەو کەسەیە کە پێشتر باسمان کرد پێغەمبەر(ﷺ) چەندە خۆشی ویستووەو فەرموویەتی گەورەی گەنجانی بەهەشتەو خوای گەورە دەیکاتە هۆی رێکخستنی نێوانی دوو دەستەی موسڵمانان و سەییدە، جا کەسێکی وا گەورە ناگونجێت هەردەم سەرقاڵ بووبێت بە ژنهێنانەوە.

دووەم: ئەگەر حەسەن ئەوەندە ژنی بهێنایە دەبوو هیچ نا ناوی سی چل منداڵ و ژنی بهاتایە، چونکە لە حەفتا ژن تەنها پانزە منالێک ناکەوێتەوە، یان ئەگەریش منداڵی نەبوایە هیچ نا ناوی چارەکێکی ژنەکانی دەهات، چونکە هەموان حەزیان کردووە بۆ چوونەوە سەر بنەماڵەی پێغەمبەر(ﷺ) رەچەڵەکی خێزانییان لەگەڵ ئالوبەیت باس بکەن، ئەگەر ئەو رێژەی ژنهێنانە هەبوایە حەتمەن باس دەکران.

سێیەم: ئەو چەند گێڕانەوە کەمەی لەو بارەوە هاتون هەموویان لە سەرچاوە دیارەکانی فەرموودەو کتێبە جێباوەڕەکاندا بوونیان نیەو لەو کتێبانەشدا کە هاتون بە وتی: و وتیان و بە بابەتێکی لاوەکی وەک گێڕانەوەیەک هێنراون.

چوارەم: تەمەنی حەسەن زۆر نەبووە، چونکە تەمەنی نەگەیشتوەتە پەنجا ساڵ، هەر بیست ساڵێکی چووە بۆ ماوەی پێش هاوسەرگیری، چەند ساڵێکی سەرقاڵ بووە بە چارەسەری فیتنەی سەردەمی خەلیفە عوثمانی کوڕی عەففان و دواتریش کێشەکانی سەردەمی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبووطالیبەوە، دواتریش سەرقاڵی ئیشی خیلافەت و کێشەی بەیعەت و خەڵکی عێراق و شام و رێککەوتن لەگەڵ موعاویە بووە، جا دەکرێت بەو کەمە ماوەی بۆی ماوەتەوە ئەو هەمووە ژنەی هێنابێت؟ ئەگەر وا بوایە ئێستا هەموو سەرچاوەکان بەشی زۆرینەی ژیانی حەسەنیان تایبەت دەکرد بەو مەسەلەیەوە.

بۆیە پێم وایە مەسەلەی ئەو ژنهێنانە زۆرە دەستێکی بە ئامانجە بۆ لێدانی کەسایەتیە گەورەکانی ناو هاوەڵان بەتایبەت نزیکانی پێغەمبەر(ﷺ)، بەتایبەتتر حەسەن کە گەورەی گەنجانی بەهەشت و سەییدی ئوممەت و هۆی یەکڕیزی موسڵمانان بووە، تا بڵێن لەبەر ئارەزووبازی رێککەوتنی کردووەو گومان بخەنە سەر دڵسۆزی و گەورەیی کارەکەی.

**منداڵەکانی حەسەنی کوڕی عەلی(ﷺ)**

حەسەن: ئەم کوڕەی لە خەولەی کچی مەنظور بوو.[1]

عەبدوڵا: ئەم منداڵەی لەگەڵ حوسەینی مامیدا لە کەربەلا شەهید بوو.

زەید: ئەم کوڕەی لە ئوم بەشیری کچی ئەبی مەسعوود بوو.[2]

ئەبووبەکر: ئەمەشیان لەگەڵ حوسەینی مامی شەهید بوو.[3]

طەلحە: ئەم منداڵەی لە ئوم ئیسحاقی کچی طەلحە بوو.[4]

قاسم: ئەم منداڵەی لەگەڵ حوسەینی مامیدا شەهید بوو.[5]

عەمر، حوسەین، عوبەیدوڵا، عەبدوڕەحمان، موحەممەد، جەعفەر، حەمزە.[6]

ئەمەش بەڵگەیەکی ترە کە حەسەن هیچ نەیاری و کێشەیەکی نەبووە لەگەڵ خەلیفە راشیدینەکاندا، چونکە ئەگەر رق و دژایەتی هەبوایە لەگەڵیان هەڵنەدەسا ناوی منداڵی بنێت ئەبووبەکر و طەلحە.

**کۆچی دوایی حەسەنی کوڕی عەلی**

یەکێکی تر لە مەسەلە هەستیارەکان سەبارەت بە ژیانی حەسەن بریتیە لە جۆری مردنەکەی حەسەن، چونکە لە چەند سەرچاوەیەکدا هاتووە کە حەسەن ژەهرخوارد کراوەو بەهۆی ئەو ژەهرەوە مردووە، ئەوەتا ئیبن حەجەر هێناویەتی کە حەسەن لە سەرەمەرگیدا وتوویەتی من چەند جار

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٣١٩.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٣١٨.
[3] ابن حزم الأندلسي، جمهرة العرب، ط٣، دار الكتب العلمية (بيروت-٢٠٠٣)،ج١، ص ٣٩.
[4] جمهرة العرب لابن حزم الأندلسي، ج١، ص ٣٩.
[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٨٥.
[6] جمهرة العرب لابن حزم الأندلسي، ج١، ص ٣٩.

ژەهرخـوارد کـراوم، بـەڵام هیچـکام وەک ئـەم ژەهـرەی ئەمجـارە نەبـوو، حوسـەین هـات بـۆ لای و وتـی: کـێ ژەهرخـواردی کردیـت؟ ئەویـش ئامـادە نەبـوو بڵێـت کێیـە،[1] ئەیـوت بـۆ چیتـە؟ بـۆ ئـەوەی بیکوژیت؟حوسـەین وتـی: بەڵێ، حەسـەن وتـی: ئەگـەر ئـەو کەسـە بێت کـە گومانـم بـۆی ئەچێت ئـەوە سـزای خـوا زۆر سـەختترە، ئەگەریـش ئـەو نەبێـت حـەز ناکـەم بـە ناحـەق بکوژرێـت.[2]

یـان گێڕانەوەیەکـی تـر هاتـووە دەڵێـت: یەزیـدی کـوڕی موعاویـە بـە جەعدەی ژنـی حەسـەنی وت: حەسـەن ژەهرخـوارد بکە با بمرێت، دواتر خۆم بەهاوسـەرت دەگرم، کاتێک ئـەوەی کرد و حەسـەن مرد یەزید وتـی: ئێمە بۆ حەسـەن تۆمـان پـێ بـاش نەبـوو ئێسـتا بـۆ خۆمـان.[3]

ئیبـن کەثیر دەڵێت: بـە رای مـن ئـەو گێڕانـەوە راسـت نیە، چ ئـەوەی بە ناوی یەزیـدەوە هاتـووە کـە وای کردبێت، چ ئـەو گێڕانـەوەی بـە نـاوی موعاویـەوە هاتـووە کـە فەرمانـی وای کردبێت.[4]

رایەکیش دەڵێت: ژنەکـەی ژەهـری پێداوە لەبـەر ئـەوەی تـەڵاق دراوە بۆیـە وایکردووە.[5]

گێڕانەوەیەکـی تـر هاتـووە کـە موعاویـە فەرمانـی کـردووە بـە ئەشـعەثی خـەزووری حەسـەن تـا بـە کچەکـەی بڵێت حەسـەن ژەهرخـوارد بـکات، ئیبن تەیمیـەش وەڵامێکـی یەکلاکـەرەوەی دەداتـەوەو دەڵێـت: ئەشـعەثی کـوڕی قەیـس لـە سـاڵی چلـی کۆچیـدا مـردووە، بۆیـە لـە رێککەوتنـی نێوان حەسـەن و موعاویـەدا (کـە بـە سـاڵی کۆدەنگـی ناوبـراوە) نـاوی نەهاتـووە کـە ئەویـش سـاڵی چـل و یەکـی کۆچیـە، .. جـا ئەگـەر ئـەو نزیکـەی دە سـاڵ پێش حەسـەن

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٧٣.
[2] مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٦٦٧٥.
[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٤٣.
[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٤٣.
[5] المنتقى من منهاج الإعتدال لأبي عبدالله الذهبي، ج١، ص ٢٦٦

کۆچی دوایی کردووه ئیتر چۆن ئەم فەرمانەی کرد بە کچەکەی،[1] بەم پێیە بێت دەبێت ئەشعەث لەناو گۆڕەکەیدا هەستابێتەوەو چووبێت بۆ لای کچەکەی و پێی وتبێت حەسەن ژەهرخوارد بکات، یان دەکرێت چووبێتە خەوی کچەکەی و پێی وتبێت!!!

ئیبنولعەرەبی سەبارەت بە ژەهرخواردکردنی حەسەن بە پیلانی یەزید دەڵێت: ئەمە لە دوو رووەوە راست نیە، یەکەمیان ئەوەیە کە حەسەن ترسی لەسەر نەبوو چونکە خۆی دەسەڵاتی دابوویە دەست موعاویە، دووەمیش ئەوەیە کە ئەو مەسەلەیە غەیبە و بەس خوا دەیزانێت، ئیتر چۆن دەیدەنەوە پاڵ کەسێک.[2]

ئیبن خەلدوونیش ئەو تۆمەتە بەرپەرچدەداتەوە کە دەڵێت: موعاویە فەرمانی وایکردووەو دەڵێت: ئەوە قسەڵۆکی شیعەیە و موعاویە پاک و بەدووره لە شتی وا.[3]

حەسەن ماوەی چل رۆژ نەخۆش بوو، دواتر لە مانگی رەبیعولئەوەل و لە تەمەنی چل و حەوت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.[4]

پێش مردنی حەسەن حوسەینی بانگ کرد و ئەم وەسیەتەی بۆ کرد:

(براکەم باوکمان بەر رەحمەتی خوا بکەوێت کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد خۆی بۆ ئەم بارە-دەسەڵات- دانابوو و هیوای وابوو بۆ ئەو بێت، ئەوەبوو خوا دووری گرت لێی و دایە دەست ئەبووبەکر، کە ئەبووبەکر سەرەمەرگی هات هەمدی حەزی پێکرد، ئەوەبوو هەمدی دوورخرایەوە لێی بەر عومەر کەوت، کە عومەر سەرەمەرگی هات کردی بە شوورا لە نێوان شەش کەسدا کە باوکمان یەکێک بوو لەوان، ئەوەبوو بەر عوثمان کەوت، کە عوثمانیش کوژرا بەیعەتی پێدرا، دوایی ململانێی لەگەڵ کرا تا شمشێری

[1] المنتقى من منهاج الإعتدال لأبي عبدالله الذهبي، ج١، ص ٢٦٦.
[2] العواصم من القواصم لابن العربي، تحقيق محب الدين الخطيب، ص ١٦٠.
[3] تاريخ ابن خلدون، ط٥، دار القلم (بيروت- ١٩٨٤)، ج٢، ص ٦٤٩.
[4] المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ٢٢٦.

بۆ هەڵکرد و لەسەری جەنگا، بارەکە بۆی لەبار نەبوو و هیچی لێ دەست نەکەوت، سوێند بەخوا وانابینم خوای گەورە پێغەمبەرایەتی و خیلافەتیش لە ناو ئێمەی ئالوبەیتدا کۆبکاتەوە، وادەبینم هەرزەکانی کووفە تۆیش کەم دەگرن و دەرت دەکەن، من داوام لە عائیشە کردووە ئەگەر مردم مۆڵەتم بدات لە ماڵەکەی ئەودا لەلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپەردە بکرێم، ئەویش رازی بووە، دەڵێم لەوانەیە لە شەرمدا وتبێتی بەڵێ و رازی بووبێت، بۆیە ئەگەر مردم برۆ بۆ لای و داوای هەمان شتی لێ بکەرەوە، ئەگەر پێی خۆش بوو ئەوە لە ماڵەکەی ئەودا ئەسپەردەم بکە، گومانم زۆرە خەڵکێک نەهێڵن ئەوە بکەیت، جا ئەگەر رێگرییان لێکردیت ئەوا لێیان مەپارێرەوەو لەسەری مەرۆ و لە بەقیع ئەسپەردەم بکە، چونکە لەوێش کەسانی پێشەنگی لێیە).[1]

حەسەن کە حاڵی سەخت بوو وتی: بمبەنە دەرەوە با ئاسمانم لێوە دیار بێت، بردیانە دەرەوە، سەیرێکی ئاسمانی کرد و وتی: خوایە من لای تۆ چاوەڕێی پاداشتم.[2]

حوسەینی برای بەسەرسەریەوە بوو، حوسەینیش بە دڵگرانیەوە ئەیوت برا ئازیزەکەم خۆ تۆ وا دەچیت بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ)-باپیرەمان- و عەلی -باوکمان- و خەدیجە-ی داپیرەمان- و فاتیمە-ی دایکمان- و قاسم و طاهیری خاڵوانت و حەمزەو جەعفەری مامت، حەسەنیش پێی وت: ئای برا ئازیزەکەم، وا دەچمە حاڵێکەوە کە خوا دایناوە هیچکات حاڵی لەو جۆرەم نەدیوە، بڕێ دروستکراوی خوا ئەبینم کە هیچکات شێوەی وەک ئەوانەم نەدیوە، ئیتر حوسەین خۆی پێ رانەگیرا و دەستی کرد بە گریان.[3]

حەسەنی کوڕی عەلی لە ساڵی چل و نۆی کۆچیدا وەفاتی کرد، بۆچوونێ دەڵێت: لە ساڵی پەنجاو یەکی کۆچیدا بووە،[4] رایەکیش دەڵێت: لە ساڵی

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩١-٣٩٢.
[2] البداية والنهاية لابن كثير. ج٨، ص ٤٣.
[3] تأريخ دمشق، ج١٣، ص ٢٨٦.
[4] تاريخ ابن خلدون، ج٢، ص ٦٤٩.

پەنجای کۆچیدا وەفاتی کردووە،[1] ئیبن کەثیر دەڵێت: رای راستتر ئەوەیە لە ساڵی چل و نۆی کۆچیدا وەفاتی کردووە،[2] هەروەک ئیبن خەلدوونیش هەمان رای هەیە.[3]

**ئەسپەردەکردنی حەسەن**

سەبارەت بە پرسی ئەسپەردەکردنی حەسەنیش کێشە هەیە، چەند گێڕانەویەک هاتووە کە حەسەن داوای لە حوسەین کرد با لەلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپەردە بکرێت، ئەگەر زانی کێشەی لێدەکەوێتەوە ئەوا با لە بەقیع ئەسپەردە بکرێت، ئەوەبوو کاتێک ویستی لە لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپەردەی بکات ئومەویەکان رازی نەبوون، بۆیە جابیر بە حوسەینی وت: با فیتنە نەکەوێتەوەو لە بەقیع ئەسپەردەی بکە، ئەوەبوو لە بەقیع ئەسپەردە کرا، کاتێک ئەسپەردە کرا لەتاو قەرەباڵغیدا بەقیع کەسێکی تری نەدەگرت و هەموان دەگریان. [4]

وەک پێشتریش لە وەسیەتەکەی حەسەندا بۆ حوسەینی برای هێنامان حەسەن داوای کردبوو لەلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپەردە بکرێت ئەگەر هاتوو عائیشە رازی بوو، ئەگەریش خەڵکەکە رێگر بوون ئەوا با لە بەقیع ئەسپەردەی بکات و لەسەر مەسەلەکە نەڕوات، بۆیە کاتێک حەسەن مرد، لەسەر وەسیەتی خۆی حوسەین چوو بۆ لای عائیشەو داوای لێکردەوە کە حەسەنی برای لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپەردە بکرێت، ئەویش رازی بوو و وتی: باشە، بەڵام مەڕوان کە ئەمەی بیست وتی: سوێند بەخوا نابێت حەسەن لەوێ ئەسپەردە بکرێت، نەیانهێشت عوثمان لەوێ ئەسپەردە بکرێت و ئێستا ئەمان دەیانەوێت حەسەن لەوێ ئەسپەردە بکەن؟ کە حوسەینیش ئەم قسەی بیست بە چەکەوە هاودەم بە چەند کەسێکی تر چوو، مەڕوانیش خۆی ئامادە کرد، کە ئەبووهورەیرە

---

[1] المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ٢٢٦.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٤٥.

[3] تاريخ ابن خلدون، ج٢، ص ٦٤٩.

[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٤٤.

بیستی بارەکە گەیشتوەتە ئەوە، وتی: سوێند بەخوا ئەوە ستەمێکە لە حەسەن دەکرێت، دەبێت رێ بدرێت لەگەڵ باوکیدا (واتە مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) بوو) کفن بکرێت، ئەو کچەزای پێغەمبەرە(ﷺ)، ئینجا چوو بۆ لای حوسەین و قسەی لەگەڵ کرد و سوێندی دا وازبهێنێت، وتی: مەگەر براکەت نەیوت ئەگەر زانیت جەنگی لێدەکەوێتەوە ئەوا بمبەنەوە بۆ گۆڕستانی موسڵمانان؟ زۆر لێی پاڕایەوە تا حوسەین رازی بوو و حەسەنیان برد لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردەی بکەن، حوسەین حەزی دەکرد خۆی نوێژی مردوو لەسەر تەرمی حەسەنی برای کرد، بەڵام سەعیدی کوڕی عاصی والی مەدینەی پێش خست و وتی: ئەگەر سوننەت نەبوایە تۆم رانەدەسپارد بۆ ئەو بەرنوێژیە، سەعیدی کوڕی عاصیش کە ئەمیری مەدینە بوو ئامادەی مەراسیمی نوێژ و ئەسپەردەکردنی تەرمی حەسەن بوو، هەروەها خالیدی کوڕی وەلیدیش ئامادەی مەراسیمی ئەسپەردەکردنەکەی بوو، گۆڕەکەی حەسەن لەپاڵ گۆڕی فاطیمەی دایکیدا بوو.[1]

بەو جۆرە دەبینین لەوەشدا ستەم لە حەسەن کرا و رێگری کرا لە بەدیهێنانی وەسیەتەکەی، هەرچەندە هەم دایکی باوەڕداران عائیشە رازی بوو لە ماڵەکەیدا ئەسپەردە بکرێت، هەم وەسیەتەکەی شەرعی بوو، هەم وەک ئەبووهورەیرە شایەتی بۆ دا مافێکی رەوای بوو لای باپیرەی ئەسپەردە بکرێت و نەدەبوو رێگری لێ بکرایە، بەڵام حەسەن لە دوا ساتەکانی ژیانیشیدا رێی کرانەوەی دەرگای فیتنەی داخست و داوای لە حوسەینی برای کرد لەبەر حەز و ماف و وەسیەتێکی ئەم نەهێڵێت فیتنەو ئاشووب سەرهەڵبدات و رێی جەنگ هەڵگیرسان نەدات، لەوەشدا حوسەین زۆر دڵگەرم بوو، بەڵام ئەبوو هورەیرە بێداری کردەوە لە ئەگەری روودانی فیتنەو وەسیەتەکەی حەسەنی بیرهێنایەوە کە پێی وتبوو ئەگەر زانیت جەنگی لێدەکەوێتەوە ئەوا وازبهێنەو بمبە لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردەم بکە.

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩٢.

## ٩٤٩. حەسحاسی کوڕی بەکر(ﷺ)

ناوی حەسحاسی کوڕی بەکری کوڕی عەوفی ئەزدیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی ئەبولفەیض کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[١]

حەسحاس دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (من لقي الله بخمس عوفي من النار: سبحان الله والحمد لله وولا إله إلا الله والله أكبر)،[٢] (هەرکەس بە پێنج شتەوە بگاتەوە بە خوا لە دۆزەخ پارێزراو دەبێت: سبحان الله والحمد لله وولا إله إلا الله والله أكبر).

## ٩٥٠. حەسسانی کوڕی ئەسعەد(ﷺ)

ناوی حەسسانی کوڕی ئەسعەدە، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە فەتحی میصریشدا بەشداری کرد.[٣]

## ٩٥١. حەسسانی کوڕی ثابت(ﷺ)

ناوی حەسسانی کوڕی ثابتی کوڕی موندیرە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان لە بەنی نەججار، شاعیری ناسراو و رێزداری پێغەمبەر(ﷺ) بوو، کونیەکەی ئەبولوەلیدە، یان دەوترێت ئەبولحسام، یان ئەبووعەبدورەحمانیشی پێ دەوترا،[٤] بۆیە پێی دەوترا ئەبولحسام لەبەر بەرگری زۆری لە پێغەمبەر(ﷺ) و هێرش کردنە سەر بێباوەڕان.[٥]

دایکی ناوی فورەیعەی کچی خالیدە، دایکیشی موسڵمان بوو و بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ).[٦]

---

[١] أسد الغابة، ج٢، ص ١٣.
[٢] أسد الغابة، ج٢، ص ١٣
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج ٢، ص ٦٢.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج ٢، ص ٦٣.
[٥] أسد الغابة، ج٢، ص ٧.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج ٢، ص ٦٣.

حەسسان دوو برای هەبوو بە ناوەکانی ئوبەی و ئەوس کە هەردووکیان موسڵمان بوون،[1] پێشتریش باسی ژیانی هەرکام لەوانمان کردووە، برایەکی تری هەبوو بە ناوی ثابت کە ئەمیش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو[2] و پێشتر باسمان کردووە، هەروەها حەسسان خوشکێکی هەبوو بە ناوی کەبشە.[3]

حەسسان کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڕەحمان کە دایکی ناوی سیرین بوو، سیرین خوشکی ماریە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دوو خوشکەی لەلای مقوقسی میصرەوە بە دیاری بۆ هات و ماریەی بۆ خۆی داناو سیرینی بەخشی بە حەسسان، عەبدوڕەحمانیش شاعیر بوو.[4]

حەسسان بەسەرهاتێکی تەمەنی منداڵی خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: من حەوت یان هەشت ساڵ بووم کە رۆژێک بینیم لە مەدینە جوولەکەیەک بەرەبەیان هاواری کرد ئەی گرۆی جوولەکە، ئەوانیش کۆبوونەوە، منیش نزیک بووم و گوێم لێ دەگرت، کابرا وتی: وا ئەستێرەی ئەو ئەحمەدە دەروشایەوە کە بڕیارە ئەمشەو لەدایک بێت.[5]

لەپێش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) حەسسان شاعیری ناو مەدینە بوو و لای خەڵکی مەدینە زۆر ناسراو بوو، دواتریش کە پێغەمبەر(ﷺ) هات و حەسسان باوەڕی پێ هێنا بوو بە شاعیری پێغەمبەر(ﷺ).

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە تەمەنی حەسسان نزیکەی شەست ساڵ بوو.[6]

## ئایا حەسسان ترسنۆک بووە؟

ئیبن حەجەر دەڵێت: حەسسان لەگەڵ ئەوەی شاعیرێکی وا گەورە بوو بەڵام ترسنۆک بوو.[7]

---

[1] أسد الغابة، ج١ص٧٥.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٤٢.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٠٨.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٢٦٦.
[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٦٧.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٤.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٣.

لەوانەیە بەڵگەی ئیبن حەجەر بۆ بە ترسنۆک دانانی حەسسان ئەم گێڕانەوەیە بێت: صەفییەی کچی عەبدولموطەلیب دەڵێت: لە قەڵاکەی حەسساندا بووین و حەسسانیش لەگەڵمان بوو و ئێمەش بڕێک ژن و منداڵ بووین، ئەمەش لەو کاتەدا بوو کە خەندەق لێدرابوو، کابرایەکی جوولەکە دای بە لاماندا و بە دەوری قەڵاکەدا دەگەڕا، منیش وتم: بە حەسسانم وت: ئەو جوولەکەیە لە دەوری قەڵاکەیە و من لێی دڵنیا نیم، کێ دەڵێت: بۆ ئابڕوومان ناگەڕێت و نایەوێت ڕێیەک بدۆزێتەوە؟! خۆ پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان سەرقاڵ بوون و دەرفەتیان نیە ئاگادارمان بن، دەی تۆ بڕۆ بیکوژە، ئەویش وتی: خوا لێت خۆش بێ ئەی کچی عەبدولموطەلیب، بەخوا دەزانیت من هی ئەو ئیشە نیم، صەفییەش کە هیچی بەدی نەکرد دارێکی داکوتراوی ناو قەڵاکەی هەڵگرت و لە قەڵاکە دابەزی و کەوتە لێدانی جوولەکەکە تا کوشتی، ئینجا گەڕایەوە بۆ قەڵاکە، صەفییە دەڵێت: ئینجا کە هاتمەوە بە حەسسانم وت: دابەزەو چەک و بەرگە سەربازیەکەی لێ داماڵە، خۆم بۆیە لامنەبرد چونکە پیاو بوو، حەسسانیش وتی: هیچ پێویستم بەو شتانەی نیە.[1]

هەروەها ذەهەبی دەڵێت: ئیبن سەعد لە واقیدیەوە هێناویەتی دەڵێت: حەسسان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری هیچ غەزایەکی نەکرد چونکە کەسێکی ترسنۆک بوو.[2]

بەڵام بەرگری لێدەکات و دەڵێت: بەپێی ئەم بەڵگەیە دەسەلمێت کە حەسسان بەشداری غەزای کردووە:

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: بە ئیبن عەبباس وترا وا حەسسانی نەفرەتی هات، ئەویش وتی: ئەو نەفرەتی نیە، ئەو بە گیان و زمانی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) جیهادی کردووە.[3]

---

[1] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٦٩٣٣، قال الذهبي عن سنده: عروة لم يدرک صفية.

[2] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥١٢.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥١٨.

ئیبنولکەلبی دەڵێت: حەسسان کەسێکی دلێر و نەبەرد بوو، بەڵام حاڵێکی تووش بوو ئیتر بەو هۆیەوە ترسێکی تێدا پەیدا بوو.[1]

**حەسسان لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ)**

ڕۆژێک ئەبووطەلحە بڕێ لە سامانەکەی خۆی کردبە خێر و هێنای بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش دای بە کەسە نزیکەکانی خۆی، ئوبەی کوڕی کەعب و حەسانی کوڕی ثابت و شەدادی کوڕی ئەوس و چەندێکی تر، ئەوانیش نرخی بەشەکەی خۆیان دیاری کرد و حەسسان وەریگرتەوە، بۆیە بوو بە موڵکی حەسسان و ئەویش فرۆشتی بە موعاویە.[2]

بەرائی کوڕی عازب باسی ڕووداوی بەنی قورەیضە دەکات و دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لەو ڕۆژەدا بە حەسسانی کوڕی ثابتی فەرموو هێرش بکەرە سەر بێباوەڕان-بە شیعر- چونکە جبریل لەگەڵتدایە.[3]

جەنابی کیلابی کە هاوەڵێکی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بووە دەڵێت: بیستم پێغەمبەری خوایش(ﷺ) بە کەسێکی ڕەبعەی دەفەرموو (جبرەئیل لە ڕاستەوەیەو میکائیلیش لە چەپەوەیەو فریشتەکانیش سێبەریان کردووە بۆ سەربازگەکەم، دەی شتێ لە وتەی-شیعری- خۆت بڵێ)، کابراش ئەم شیعرەی وت:

یا رُكْنَ معتمدٍ وعصمةً لائذٍ

ومَلاذَ منتجع وجار مجاورِ

يا من تَخَيَّرَه الإله لخلقه

فحباه بالخلق الزكي الطاهر

أنت النبي وخير عصبة آدمٍ

يا من يجود كفيض بحرٍ زاخرٍ

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥٢١.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص٣٢٠.

[3] البداية و النهاية لابن كثير، ج٤، ص١٣١.

میکال مَعْك وجبريل كلاهما

مَدَدٌ من عزيزٍ قاهرِ

منیش وتم: ئەرێ ئەو شاعیرە کێ بوو؟ وترا حەسسانە، بینیم پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای بۆ دەکرد و فەرمایشتی خێری دەفەرموو.[1]

کاتێ وەفدی تەمیم هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەقرەعیش لەگەڵ وەفدەکەدا بوو، کە گەیشتنە مەدینە ئەقرەع هاواری دەکرد ئەی موحەممەد وەسف و سەنام جوانە و سەرکۆنەو لەدژ خوێندنیشم زۆر خراپە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ذلكم الله سبحانه)، لە گێڕانەوەی تردا هاتووە کە هەموو وەفدەکە پێکەوە هاواریان دەکرد و ئەوەیان دەوت، پێغەمبەریش(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ لایان و فەرمووی: (ذلكم الله فما تريدون). ئەوانیش وتیان ئێمە خەڵکێکین لە بەنو تەمیم بە شاعیرو وتاربێژمانەوە هاتوین تا لە بەرامبەرت شیعر بڵێین و فەخر بنوێنین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ما بالشعر بعثنا ولا بالفخار أمرنا ولكن هاتوا)، (ئێمە بە شیعر نەنێرداوین و فەرمانمان پێ نەکراوە فەخر بکەین بەڵام ئادەی)، ئەقرەعیش بە یەکێک لە گەنجەکانی وت: فڵانە کەس هەستە و باسی فەزڵی خۆت و هۆزەکەت بکە، ئەویش وتارێکی دا و وتی: سوپاس بۆ خوایەک کە ئێمەی کردۆتە چاکترین دروستکراوی و سامانی پێ بەخشیوین تا چیمان بوێت پێی بکەین، جا ئێمە چاکترین کەسانی سەرزەوین، لە هەموان زۆرترین و زیاترین چەکیشمان هەیە، هەرکەس نکوڵی ئەو قسەمان دەکات با هەستێت و قسەیەکی باشتر لەوەی ئێمەو کارێکی باشتر لە کاری ئێمە نیشان بدات، پێغەمبەریش(ﷺ) بە ثابیتی کوڕی قەیسی ئەنصاری وتاربێژی فەرموو: هەستەو وەڵامی بدەرەوە، ئەویش هەستاو لە وەڵامیدا وتی: سوپاس بۆ خوا، سوپاسی دەکەم و پشتی پێ دەبەستم و بڕوام پێی هەیە و پشتم بەو بەستووەو شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوای تاک وتەنهای بێ هاوەڵ،

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٤٣٥.

شـایەتی دەدەم موحەممـەد بەنـدەو نێـردراوی خوایـە، کۆچەرانـی ئامـۆزای خـۆی بانـگ کـرد کـە چاکتریـن و دیارترینـی کەسـان بـوون و ئەوانیـش چـوون بـەدەم داواکەیـەوە، سـوپاس بـۆ خـوا کـە ئێمەشـی کـردە پشـتیوان و وەزیرانـی پێغەمبەرەکـەی و مایـەی شـکۆمەندی بـۆ ئایینەکـەی، ئێمـە لەگـەڵ خەڵـک دەجەنگیـن تـا کاتـێ شـایەتی دەدەن هیـچ پەرسـتراوێ نیـە جگـە لـە خـوا، هەرکـەس ئـەوەی وت: گیـان و ماڵـی لێمـان حـەرام دەبێت، هەرکەسـیش وانـەکات لەگەڵـی دەجەنگیـن و لەبەرخـوا لامـان سـووک و بـێ بایـەخ دەبێت، ئەمـە دەڵێـم و داوای لێخۆشـبوون لای خـوا دەکـەم بـۆ هەمـوو بـاوەڕداران چ پیـاوان و چ ئافرەتانیـان، پاشـان زوبرقانـی کـوڕی بـەدر هەسـتاو بـە یەکێـک لـە کەسـەکانی خۆیانـی وت: ئـادەی هەسـتە و چەنـد دێـڕە شـیعرێ بڵـێ کـە تیایـدا فەزڵـی خـۆت و هۆزەکـەت بـاس بکەیـت، ئەویـش هەسـتاو ئـەم شـیعرەی وت:

نحن الكرام فلا حي يعادلنا... نحن الرؤوس وفينا يقسم الربع

ونطعم الناس عند المحل كلهم... من السديف إذا لم يؤنس القزع

إذا أبينا فلا يأبى لنا أحد... إنا كذلك عند الفخر نرتفع

پێغەمبەریـش(ﷺ) داوای حەسـانی کـوڕی ثابتـی کـرد و ئەویـش هـات پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمانـی پێکـرد وەڵامـی بداتـەوە، ئەویـش لـە وەڵامیانـدا وتـی:

نصرنا رسول الله والدين عنوة... على رغم عات من معد وحاضر

بضرب كإبزاغ المخاض مشاشه... وطعن كأفواه اللقاح الصوادر

وسل أحدا يوم استقلت شعابه... بضرب لنا مثل الليوث الخوادر

ألسنا نخوض الموت في حومة الوغى... إذا طاب ورد الموت بين العساكر

ونضرب هام الدارعين وننتمي... إلى حسب من جذم غسان قاهر

فأحياؤنا من خير من وطئ الحصى... وأمواتنا من خير أهل المقابر

فلولا حياء الله قلنا تكرما... على الناس بالخيفين هل من منافر

ئەقرەع هەستاو وتی: ئەی موحەممەد سوێند بەخوا ئەوەی من بۆی هاتوم جیایە لەوەی ئەمانە بۆی هاتون، من شیعرێکم وتووە گوێی بۆ بگرە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئادەی، ئەویش وتی:

أتيناك كيما يعرف الناس فضلنا... إذا خالفونا عند ذكر المكارم

وأنا رؤوس الناس من كل معسر... وأن ليس في أرض الحجاز كدارم

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: حەسسان هەستە وەڵامی بدەرەوە، ئەویش وا وەڵامی دایەوە:

بني دارم لا تفخروا إن فخركم... يعود وبالا عند ذكر المكارم

هبلتم علينا تفخرون وأنتم... لنا خول من بين ظئر وخادم

ئەقرەع هەستاو وتی: ئەی خزمینە نازانم بۆ وایە، وتاربێژیان لە ئێمە بەهێزتر و شاعیریان لە ئێمە چاکترە، دواتر نزیک بوویەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) و شایەتومانی هێنا، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (لا يضرك ما كان قبل هذا)، (چی پێش ئەمە روویداوە زیانت پێ ناگەیەنێت). ئەم ئایەتەش لەسەر بەنی تەمیم دابەزی (إن الذين ينادونك من وراء الحجرات أكثرهم لا يعقلون)،[1] دواتر هەموویان موسڵمان بون و ماوەیەک لە مەدینە مانەوە تا فێری قورئان و ئایین ببن، دواتر کە ویستیان بگەڕێنەوە پێغەمبەر(ﷺ) جلو بەرگ و بەخششی پێ بەخشین.[2]

پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوتی مەدینەدا مینبەرێکی دانابوو بۆ حەسسان و حەسسان لەسەری دەوەستا و بە شیعر بەرگری لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) دەیفەرموو (إن الله ليؤيد حسان بروح القدس ما ينافح عن رسول الله)،[3] (خوای گەورە بە روحولقودوس پاڵپشتی حەسسان دەکات تا کاتێک بەردەوام بێت لە بەرگری کردن لە پێغەمبەر(ﷺ)).

---

[1] الحجرات: ٤.

[2] أسد الغابة، ج١، ص١٦٤-١٦٦.

[3] مسند أحمد بن حنبل - مسند عائشة(رضي الله عنها)، الرقم ٢٥٠٧٥، المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(رضي الله عنهم) - ذكر مناقب حسان بن ثابت الأنصاري ، الرقم ٦١١١، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٢٨٤٦، قال شعيب الأرناؤوط صحيح لغيره.

لە دەقی دیکەدا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) نزای دەکرد خوای گەورە جبریل بکاتە پشتیوان و سەرخەری حەسسان و دەیفەرموو (اللَّهُمَّ أَيِّدْهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ).[1]

جارێک پێغەمبەر(ﷺ) بە حەسسانی فەرموو ئایا سەبارەت بە ئەبووبەکر هیچ شیعرت وتووە؟ ئەویش وتی: بەڵێ، فەرمووی: بیڵێ تا بیبیستم، ئەویش وتی:

وثاني اثنين في الغار المنيف وقد    طاف العدو به إذ صعد الجبلا

وكان حب رسول الله قد علموا    من البرية لم يعدل به رجلا

پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوەی بیست پێکەنی تا دانەکانی پێشەوەی دەرکەوت، پاشان فەرمووی: راستت وت: ئەی حەسسان، هەروایە کە تۆ وتووتە.[2]

جارێک حەسسان مۆڵەتی لە پێغەمبەر(ﷺ) خواست تا بە شیعر هێرش بکاتە سەر بێباوەڕان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی چی دەکەیت بە رەچەڵەکی من)، ئەویش وتی: چۆن موو لە هەویر دەردەکەیت ئاوا جیات دەکەمەوە (مەبەستی ئەوە بوو رەچەڵەکت دەپارێزم).[3]

زوبەیری کوڕی عەووام جارێک چوویە مەجلیسێکی هاوەڵانەوەو بینی حەسسان شیعر دەهۆنێتەوەو ئەوانیش زۆر دڵی پێ نادەن، زوبەیر وتی: ئەوە چیە دەبینم گوێ قوڵاخ نین بۆ شیعرەکانی ئیبن فورەیعە! ئەو کە لای پێغەمبەر(ﷺ) شیعری دەهۆنییەوە، پێغەمبەر(ﷺ) بە چاکی گوێی لێدەگرت و دەستخۆشیی لێدەکردو پشتگوێی نەدەخست.[4]

### حەسسان و هەڵەیەکی زەق

حەسسان یەکێک بوو لەو کەسانەی لە مەسەلەی ئیفکدا تێکەوت، مەسەلەی ئیفکیش ئەو بوختانە بوو کە کرا بۆ دایکی باوەڕداران عائیشە،

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الصلاة - باب الشعر في المسجد، الرقم ٤٤٩، صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب فضائل حسان بن ثابت(ﷺ)، الرقم ٦٤٦٩.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٧٤.

[3] صحيح البخاري - كتاب المناقب - باب من أحب أن لا يسب نسبه، الرقم ٣٥٣١.

[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٤١.

گوایە تووشی زینا بووە، ئەوەبوو چەند هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ) بە هەڵە کەوتنە ژێر کاریگەری دووروەوان و کەوتنە ئەو هەڵەوە، ئەوانیش بریتی بوون لە حەسسانی کوڕی ثابتی شاعیری پێغەمبەر(ﷺ) و میسطەح و حەمنە، خوای گەورە لەو بارەوە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە.

سەبارەت بە تاوانباربوونی ئەو سێ هاوەڵەی بەشداری ئەو بوختانە بوو، لەو مەسەلەدا نابێتە بەڵگەی ئەوەی کە لە هاوەڵبوون دەربچن، چونکە هەرکام لەوانە لای پێغەمبەر(ﷺ) پایەی تایبەتیان هەبووە، بۆ نموونە پێغەمبەر(ﷺ) بە حەسسانی کوڕی ثابتی فەرمووە هێرش بکەرە سەر بێباوەڕان-بە شیعر- چونکە جبریل لەگەڵتدایە،[1] هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوتی مەدینەدا مینبەرێکی دانابوو بۆ حەسسان و حەسسان لەسەری دەوەستا و بە شیعر بەرگری لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) دەیفەرموو (إن الله ليؤيد حسان بروح القدس ما ينافح عن رسول الله)،[2] (خوای گەورە بە روحولقودوس پاڵپشتی حەسسان دەکات تا کاتێک بەردەوام بێت لە بەرگری کردن لە پێغەمبەر(ﷺ)).

هەروەها حەسسان لە فەتحی مەککەدا لەلایەن پێغەمبەری خواوە(ﷺ) پشتگیری کراوە تا بە شیعر بەرگری لە ئیسلام بکات و پێغەمبەر(ﷺ) نزای خێری بۆ کردوە، ئەوەتا جەنابی کیلابی کە هاوەڵێکی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بووە دەڵێت: بیستم پێغەمبەری خوایش(ﷺ) بە کەسێکی رەبعەی دەفەرموو (جبرەئیل لە راستەوەیەو میکائیلیش لە چەپمەوەیەو فریشتەکانیش سێبەریان کردووە بۆ سەربازگەکەم، دەی شتێ لە وتەی-شیعری- خۆت بڵێ)، کابراش شیعرێکی وت، منیش وتم: ئەرێ ئەو شاعیرە کێ بوو؟ وترا حەسسانە، بینیم پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای بۆ

[1] البداية و النهاية لابن كثير، ج٤، ص١٣١.

[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند عائشة(رضي الله عنها)، الرقم ٢٥٠٧٥، المستدرک على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(رضي الله عنهم) - ذكر مناقب حسان بن ثابت الأنصاري ، الرقم ٦١١١، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٢٨٤٦، قال شعيب الأرناؤوط صحيح لغيره.

دەکرد و فەرمایشتی خێری دەفەرموو.[1]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد، حەسسان زۆر دڵتەنگ بوو و بە شیعر پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەلاواندەوە.[2]

**حەسسان دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ)**

جارێک حەسسان لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) شیعری دەهۆنیەوە، عومەر دای بە لایدا و رێگری لێکرد کە بۆچی لە مزگەوتدا شیعر دەهۆنێتەوە، ئەویش وتی: من لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) شیعرم دەهۆنیەوەو کەسی لە تۆ باشتریشی تێدا بوو (مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) بوو)، عومەریش وتی: راست دەکەیت.[3]

رۆژێک عائیشەی دایکی باوەڕداران دانیشتبوو و خەڵکێک باسی حەسسانیان دەکرد و قسەیان بەرامبەری دەوت، ئەویش راچڵەکی و وتی: باسی کێ دەکەن؟ وتیان حەسسان؟ عائیشە وتی: وس،من بیستوومە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (ئەوە بەربەستێکی نێوان ئێمەو دووروەکانە، تەنها باوەڕدار خۆشی دەوێت و تەنها دووروویش رقیەتی لێی).[4]

حەسسان پاش تەمەنێک بینایی لەدەست دا، جارێک چوو سەردانی دایکی باوەڕداران عائیشەی کرد، عائیشەش راخەرێکی بۆ دانا، ئەوەبوو عەبدوڕەحمانی برای عائیشە هاتەژوورەوەو وتی: وا لەسەر راخەر دایدەنیشێنیت لەکاتێکدا لە رووداوی ئیفکدا قسەی هەبوو؟! عائیشەش وتی: حەسسان لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) دەهاتەوە جواب و بەرگری لێدەکرد و بە لێدانی دوژمنانی پێغەمبەر(ﷺ) ئاسوودەیی دەبەخشی بە دڵ و دەروونی پێغەمبەر(ﷺ)، من هیوام وایە حەسسان لە رۆژی دواییدا سزای نەبێت.[5]

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٤٣٥.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٣٢١-٣٢٤.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥١٣.

[4] أخبار أصبهان لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٤٧٠، قال الذهبي في (سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥١٨) هذا حديث منكر.

[5] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥١٤.

**ئایا حەسسان بەیعەتی دا بە عەلی؟**

رایەک هاتووە کە برێک لە هاوەڵان بەیعەتیان نەدا بە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، لەوانەش حەسسانی تێدابوو، بەڵام ئەمە راست نیە، چونکە زۆرترین ئەو ریژەی هاتووە کە هاوەڵانی ناو مەدینە بەیعەتیان نەدابێت بە عەلی تەنها ناوی حەوت کەس هاتووە کە ناوی حەسسانی تێدا نیە.[١]

**مردنی حەسسان**

دەوترێت حەسسان لە تەمەنی سەد ساڵی و لە ساڵی چلی کۆچیدا مردووە، رایەکی تر دەڵێت: لە سەد و دە ساڵی و لە ساڵی پەنجای کۆچیدا مردووە، رایەکی تر دەڵێت: لە تەمەنی سەد و چوار ساڵیدا مردووە، رای زۆرینەش لەسەر ئەوەیە کە تەمەنی سەد و بیست ساڵ بووە، شەست ساڵی ژیانی پێش ئیسلام و شەست ساڵیشی لەناو ئیسلامدا بەسەر بردووە.[٢]

## ٩٥٤. حەسسانی کوڕی جابیر(ﷺ)

ناوی حەسسانی کوڕی جابیر یان کوڕی ئەبووجابیری سولەمیە، لە فەرموودەیەکدا کە ئەبوویووسف دەیگێڕێتەوە یەکێک لە هاوەڵان دەڵێت: یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کە ناوی حەسسانی کوڕی ئەبی جابیری سولەمی بوو هات بۆ لامان[٣] و وتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) تەوافمان دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) لایکردەوەو خەڵکێکی بینی کە ریشیان زەرد کردبوو، خەڵکێکی تریش رەنگی ریشیان سوور(خەنەیی) کردبوو، ئەویش فەرمووی: (مرحبا بالمصفرين والمحمرين)،[٤] مەرحەبا لە ریش زەردکەران و ریش سوورکەران.

---

[١] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٢٧.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٤.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٥.

[٤] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣٥١١، الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ١٢٨٠، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢٠٣٥، قال ابن حجر في الإصابة في إسناده نظر و هو غير معروف، انظر الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٥.

## ٩٥٣. حەسسانی کوڕی خووط(رضي الله عنه)

ناوی حەسسانی کوڕی خووطی ذوهلی بەکریە،[١] برایەکی هەبوو بە ناوی بیشر کە لەگەڵ حەسسانی برای مایەوە تا لە جەنگی جەمەلدا لەناو سوپای عەلیدا بەشداری کرد، هەروەها دوو کوڕی هەبوو بە ناوەکانی حارث و بیشر کە ئەوانیش بەشداری ئەو جەنگە بوون.[٢]

حەسسان لەناو هۆزەکەیدا کەسێکی خانەدان و پیاوماقووڵ بوو، نوێنەری هۆزی بەکر بن وائیل بوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ)، لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا لە جەنگی جەمەلدا بەشداری کرد، هەریەک لە خۆی و بیشر و حارثی کوڕی و بیشری برای و چەند خزم و کەسێکی نزیکی لەو سوپایەدا بەشدارییان کرد.[٣]

## ٩٥٤. حەسسانی کوڕی شەدداد(رضي الله عنه)

ناوی حەسسانی کوڕی شەددادی تەمیمیە، هەم خۆی و هەم دایکیشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بون، ناوی لەناو هاوەڵانی نیشتەجێی بەصرەدا هاتووە،[٤] ئەم هاوەڵە منداڵ بوو کە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، منداڵێکی هەبوو بە ناوی عەففاس کە فەرموودەیەکی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٥]

حەسسان دەڵێت: لەگەڵ دایکم چووین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، دایکم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من هاتوم بۆ لات تا نزا بکەیت بۆ ئەم کوڕەم

[١] أسد الغابة، ج٢، ص ١٢.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٥.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٥.

[٤] أسد الغابة، ج٢، ص ١٢.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٦.

بەڵکو خوا بەرەکەتی تێ بخات و پاک و نەوەی زۆر بکات، پێغەمبەریش(ﷺ) دەستنوێژی گرت و دەستی هێنا بە دەموچاویدا و هەمان ئەو نزایانەی بۆ کرد و فەرمووی: (اللهم بارك لها فيه واجعله كثيرا طيبا).[1]

## ٩٥٥. حەسسانی کوڕی قەیس(رضي الله عنه)

ناوی حەسسانی کوڕی قەیسی کوڕی ئەبی سوودی تەمیمی یەربووعیە، کونیەکەی ئەبوو سوودە،[2] کوڕێکی هەبوو بە ناوی وەکیع.[3]

ئیبن دورەید دەڵێت: ئەبووسوود کەسێکی مەجووسی بوو و موسڵمان بوو، ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئەوەش دوور نیە لە راستیەوە، چونکە وڵاتی دیار دراوسێی وڵاتی فارس بوو و لەژێر دەستی فارسەکاندا بوون، هەندێ لە عەرەبەکان بووبوونە مەسیحی و هەندێکیشیان بووبوون بە مەجووسی کە ئەمانە کەمینە بوون.[4]

ئیبن حەجەریش پاڵپشتی ئەم رایە دەکات و دەڵێت: ئەوەی لە چیرۆکەکەی حاجیبی باوکی عەتارددا هاتووە بەڵگەیە بۆ ئەوە، هەروەها گێڕانەوەی فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئاماژەیە بە موسڵمانبوونی.[5]

حەسسانی کوڕی قەیس فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (اليمين الفاجرة التي يقتطع بها الرجل مال المسلم تعقم الرحم)،[6] (ئەو سوێندە ناحەقەی کە موسڵمان بەکاری دەهێنێت بۆ برینی ماڵ و سامانی موسڵمانی تر-برا موسڵمانەکەی- دەبێتە هۆی وەجاخ

[1] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣٥١٠، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢٠٣٣، قال ابن حجر في الإصابة: قال العلائي في الوشي المعلم في إسناده أعرابي لا ذكر لروايته في شيء من التواريخ.
[2] أسد الغابة، ج٢، ص ١٣.
[3] أسد الغابة، ج٦، ص ١٦٩.
[4] أسد الغابة، ج٦، ص ١٧٠.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ١٩٤.
[6] مسند أحمد بن حنبل - مسند البصريين(رضي الله عنهم) - حديث أبي سود(رضي الله عنه) ، الرقم ٢١٠٧٨، قال شعيب الأرناؤوط إسناده ضعيف لإبهام الرجل الذي روى عنه معمر.

کوێرکردنی خزمایەتی –واتە نەمانی خزمایەتی و چاکەی نێوان خەڵک–).

ئەم هاوەڵە باپیری وەکیع بوو، ئەو وەکیعەی کە لە سەردەمی سولیەمانی کوڕی عەبدولمەلیکدا لە خوراسان راپەڕی و قوتەیبەی کوڕی موسلیمی کوشت.[1]

## ٩٥٦. حەسسانی کوڕی یەزیدی عەبدی(ﷺ)

ناوی حەسسانی کوڕی یەزیدی عەبدی موحاریبییە، وەک وەفدی عەبدولقەیس هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، یەکێک بوو لە گەورەو ناسراوو سوارچاکەکانی عەبدولقەیس.[2]

## ٩٥٧. حەسسانی ئەسلەمی(ﷺ)

ناوی حەسسانەو لە ئەسلەمیەکانە، لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بوو و جڵەوی سوارەکەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەگرت.[3]

## ٩٥٨. حەسسانی جنۆکە(ﷺ)

ناوی حەسسانەو یەکێک بووە لەو جنۆکانەی کە لە نصیبینەوە هاتون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا گوێی لێبگرن، ئەوانیش بریتی بوون لە نۆ کەس، بەسەرهاتی ئەمانەش لە قورئاندا باس کراوە کە خوای گەورە دەفەرموێت (وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنْصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِمْ مُنْذِرِينَ)،[4] (وە (بیریان خەرەوە) کاتێ چەند جنۆکەیەکمان نارد بۆ لات تا گوێ لە قورئان بگرن جا کاتێ ئامادەی گوێ گرتن لە قورئان بوون وتیان (بە یەکتری) بێ دەنگ بن (و گوێ بگرن) جا کە (قورئان خوێندنەکە) تەواو

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ١٩٤.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٦.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٦.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٥.

بوو هەموو گەڕانەوە بۆ لای قەوم و هۆزەکەیان بە ترسێنەر)
شنقیطی سەبارەت بە تەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێت: سەبارەت بە (نفرا من الجن) واتە کەمتر لە دە جنۆکە بوون.[1]

## ٩٥٩. حەسەنە(رضي الله عنها)

ناوی حەسەنەیە، ئەم ئافرەتە دایکی شورەحبیلی کوڕی حەسەنەیە، واتە شورەحبیلی کوڕی بە ناوی ئەمەوە ناسراوە، حەسەنە ئافرەتێک بوو لە عەدویەکان، مێردەکەی ناوی عەبدوڵای کوڕی موطاح بوو.[2]
زوبەیر دەڵێت: حەسەنە دایکی شورەحبیل نەبووە، بەڵکو شورەحبیلی گرتووەتەخۆ و گەورەی کردووە، بۆیە شورەحبیل لەبری ناوی باوکی دەدرێتەوە پاڵ حەسەنە.[3]
رایەک هاتووە دەڵێت: حەسەنە ژنی سوفیانی کوڕی مەعمەر بوو، لەم مێردەی هەریەک لە خالید و جونادەی بوو، ئینجا سوفیان کۆچی کرد بۆ حەبەشەو هاودەم بە حەسەنەی ژنی و شورەحبیلی کوڕی حەسەنە کە برای دایکیی خالید و جونادە بوو ئەو دوو منداڵەشی لەگەڵ خۆی برد، بەڵام رایەکی تر دەڵێت: سوفیان برای دایکیی شورەحبیل بووە،[4] ئیبن ئەثیر هێناویەتی کە برا دایکیەکانی بریتی بوون لە جابیر و جونادەو سوفیانیش لە مەککە دایکی شورەحبیلی بەهاوسەرگرتووە.[5]
ئیبن ئەثیر روونکردنەوەی داوە کە حەسەنە سەرەتا شووی کردووە بە عەبدوڵا و شورەحبیلی بووە، دواتر شووی کردووە بە سوفیان.[6]

---

[1] أضواء البيان، ج٧، ص ٢٣٥.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٢٩٣.
[3] أسد الغابة، ج٢، ص ٥٩١.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ١٢٧.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٢.
[6] أسد الغابة، ج٢، ص ٥٩١.

## ٩٦٠. حەشرەج(ﷺ)

ناوی حەشرەجە، بەڵام ناوی باوک و ڕەچەڵەکی تۆمار نەکراوە، بەپێی گێڕانەوەیەک دەردەکەوێت حەشرەج هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بووە.[١]

ئەبولحارث دەڵێت: حەشرەجم بینی پیاوێک بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی گرت و بردیە ژوورەکەی خۆی و دەستی هێنا بەسەر سەریدا و نزای بۆ کرد.[٢]

## ٩٦١. حەضرەمیی کوڕی عامر(ﷺ)

ناوی حەضرەمیی کوڕی عامری کوڕی موجەممیعی ئەسەدیە،[٣] کونیەکەی ئەبوو کەدمە، یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، وەک وەفدی بەنو ئەسەد بن خوزەیمە هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو و چەند کەسێکی تر، لەوانە عامر و سەلەمەی کوڕی حوبەیش و قەتادەی کوڕی قائیف و چەندێکی تر، ئەمانە هاتن و موسڵمان بوون و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) نامەیەکی نووسی بۆیان،[٤] لەوێ ماوەیەک مانەوەو خۆیان فێری قورئان دەکرد،[٥] هەر لەوێ حەضرەمی سوورەتی (عبس وتولى)ی لەبەرکرد، لەکاتی خوێندنەوەکەدا لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بوو کە زیادەیەکی بۆ کرد و وتی: (والذي أنعم الحبلى فأخرج منها نسمة تسعى)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لانزد فيها)[٦] (زیادەی تێدا ناکەین).

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨٢.
[٢] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣٥٢٣.
[٣] أسد الغابة، ج٢، ص ٤١.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٩٥.
[٥] أسد الغابة، ج٢، ص ٤٢.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٩٥.

له گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) بە حەضرەمی فەرموو: ئەرێ شتێ لە قورئان دەخوێنیتەوە-دەزانیت-؟ ئەویش وتی: بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دەی بیخوێنەوە)، حەضرەمیش سوورەتی (عبس وتولى) ی خوێند، دواتر ئەوەشی بۆ زیاد کرد(وهو الذي من على الحبلى فأخرج منها نسمة تسعى بين شارسيف وحشا)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لا تزد فيها فإنها كافية)،[1] (زیادەی بۆ مەکە، چونکە هێندە-کە هاتووە- بەسە).

هاتنی ئەو وەفدە لە سەرەتای ساڵی نۆیەمی کۆچیدا بوو.[2]

حەضرەمی نۆ برای تری هەبوو، نۆ براکەی تری هەموویان لەناوچوون و تەنها ئەم مایەوەو میراتی هەموویانی بۆ مایەوە،[3] ئەو نۆ برایەی سەرقاڵی هەڵکەندنی بیرێک بوون کە بیرەکە تەپی بەسەریانداو بوو بە گۆڕ بۆیان.[4]

هەروەها حەضرەمی شاعیر بوو و چەندین دێڕە شیعری وتووە.[5]

حەضرەمی کە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) هێشتا فێر نەبووبوو چۆن ڕەوشتی ئیسلامی بەرامبەر بە پێغەمبەر(ﷺ) بنوێنێت، چونکە تازە موسڵمان بووبوو، بۆیە بەم دەربڕینە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کرد(ئێمە لە جەرگەی تاریکی شەودا لەم وشکە ساڵیەدا ڕێمان بڕیوە هاتوین بۆ لات و تۆیش هیچ نێردراوێکت نەناردووە بۆ لامان)، ئەوەبوو خوای گەورە لەبارەیانەوە ئایەتی دابەزاند (يمنون عليك أن أسلموا قل لاتمنوا علي إسلامكم بل الله يمن عليكم أن هداكم للإيمان) (منەتت بەسەردا دەکەن کە موسڵمان بون، پێیان بڵێ موسڵمانبوونتان مەکەن بە منەت بەسەرمەوە، بەڵکو خوا منەت دەکات بەسەرتاندا کە ڕێنموونی کردن بۆ ئیمان).[6]

---

[1] فضائل القرآن لمحمد بن الضريس، الرقم ١٤،

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٢٩٢.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٩٦.

[4] أسد الغابة، ج٢، ص ٤٢.

[5] أسد الغابة، ج٢، ص ٤٢.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٢٩٢.

حەضرەمی دەڵێت: کاتێک هەواڵمان پێگەیشت پێغەمبەر(ﷺ) نەخۆشە، ئەوکات موسەیلەمەی درۆزن دەستی گرتبوو بەسەر یەمامەدا.[1]

حەضرەمی لە جەنگی دژ بە فارس و رۆمەکاندا شیعری زۆری دەوت بۆ بەرگری کردن لە ئیسلام، شیعرەکانی ناوبانگیان دەرکردبوو، کاتێک حەضرەمی جارێک چوویە خزمەت عومەری کوڕی خەططاب، عومەر داوای لێکرد برێ لە شیعرەکانی سەبارەت بە جیهادی موسڵمانان دژ بە فارس و رۆمەکان بۆ بخوێنێتەوە.[2]

**پەندو وانە:**

نەرمونیانی پێغەمبەر(ﷺ) لە راستکردنەوەی هەڵەکاندا بەتایبەت بەرامبەر بەوانەی تازە موسڵمان دەبن، ئەمە واتە راستکردنەوەی هەڵەی کەسێک کە تازە دەچێتە مەیدانێکەوە، دەبینین بە نەرمونیانی تێیگەیاند کە زیادەکردن بۆ قورئان هەڵەیەو کارێکی باش نیە، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) بەتایبەت ئەمەی بەم هاوەڵە فەرموو کە سیفەتێکی شارەزایی شیعری هەبوو تا وریا بێت مەیدانی بەهێزی لە ئەدەبیاتدا نەبێتە هۆکارێک بۆ لارێکردنی ئایینەکەی، زۆرن کەسانێک لەمڕۆدا بەهۆی پێشڕەوییان لە مەیدانێکدا سنوورەکانی خوا و پەیڕەوی شەریعەت لەبیر دەکەن و هێندەت بینی یان قسە لەسەر بنەرەتە چەسپاوەکانی ئیسلام دەکەن، یان دەبنە سەرچاوەیەکی بیدعەکاری سەرشێوێن بۆ موسڵمانان، بێدارکردنەوەی ئەو کەسانەش پێویستە بە نەرمی بێت مادەم نیازیان دژایەتی ئیسلام نەبێت و هۆکارەکەی ئەوە بێت کە کەوتوونەتە هەڵەوەو بەس.

منەتکردنی خەڵکی بە موسڵمانبوونیان نیشانەی کاڵفامییانە، چونکە زۆرجار لە رۆژگاری ئەمڕۆشدا دەبینیت کاتێک رێنمایی خەڵکێک دەکەیت، خێرا دینەکەی دەفرۆشێتەوە پێت و هەر چاکەیەک دەکات وەک منەتێک

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٩٦.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٩٦.

دەیداتەوە بەرووی موسڵمانان بەگشتی و بانگخوازاندا بە تایبەتی، ئەمەش هەڵەیە، چونکە ئەوە خوای گەورەیە کە مافی منەتکردنی هەیە بەسەر موسڵماناندا بەوەی ئیسلامی بەخشیوە پێیان، دەبینی دەڵێت خوشکم بالآپۆش بە، دەڵێت: جا بۆ نارازین و سوپاسی خوا ناکەن، چیمان کەمە، نوێژ دەکەین و رۆژوو دەگرین و هەزار خێر و خێرات دەکەین، هەر ماوەتەوە سەر ئەم بالآپۆشیە، کەچی ئێوەش گرتوتانە بەمەوە، ئیتر ئەمە خودی منەتکردنە بەسەر کەسی بەرامبەردا، چونکە کەسی بەرامبەر دیاری و یارمەتی هەبووە بۆیان، ئەویش بەخشینی ئامۆژگاریەکە کە خوا پێی رازیە، بەڵام ئەو وەڵامەی بەرامبەر منەتێکە بەسەر موسڵمانان و ئایینیشدا کە ئەوان ئەو چاکانە دەکەن، ئەمەو دەیان و سەدان نموونەی تر، بەڵام ئەمەمان تەنها وەک نموونەیەک باس کرد.

## ٩٦٢. حەفصی برای پێغەمبەر(ﷺ)

ناوی حەفصی کوڕی حەلیمەتوسەعدیەیە، واتە برای شیری پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، چونکە حەلیمەتوسەعدیە شیردەری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو.[1]

## ٩٦٣. حەفصی کوڕی سائیب(رضي الله عنه)

ناوی حەفصی کوڕی سائیبە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی هاروون کە فەرموودەیەکی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، حەفص دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) منی ناونا حەفص.[2]

## ٩٦٤. حەفصی کوڕی ئەبیلعاص(رضي الله عنه)

ناوی حەفصی کوڕی ئەبیلعاصی کوڕی بیشرە، ئەم هاوەڵە لە ثەقەفیەکانە،

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٩٧.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٩٨.

برایەکی هەبوو بە ناوی عوثمان کە هاوەڵێکی زۆر ناسراوی پێغەمبەرە(ﷺ)، حەفص دواتر چوویە بەصرەو لەوێ نیشتەجێ بوو، ئەگەرچی رایەک پێی وایە حەفص تابعی بوویێت، بەڵام ئیبن حەجەر بە بەڵگەیەک دەیسەلمێنێت هاوەڵ بووە، ئەویش ئەوەیە کە لە حەجی ماڵئاواییدا چی قورەیشی و ثەقەفیەکان هەبوون هەموویان موسڵمان بووبوون و بەشداری ئەو حەجەش بوون، حەفص زۆر جار ئامادەی نانخواردنی عومەری کوڕی خەططاب دەبوو.[1]

## ٩٦٥. حەفصەی کچی حاطب(رضي الله عنها)

ناوی حەفصەی کچی حاطبي کوڕی عەمرە، لە پشتیوانانە، خوشکی حارثی کوڕی حاطبە، حەفصە چوویە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێدا.[2]

## ٩٦٦. حەفصەی کچی عومەر(دایکی باوەڕداران)(رضي الله عنها)

ناوی حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەططابی کوڕی نوفەیلە، دایکی ناوی زەینەبی کچی مەظعوونە.[3]

خاڵۆی زەینەب ناوی عوثمانی کوڕی مەظعوون بوو کە یەکێک بوو لە گەورە هاوەڵان.[4]

خاڵۆیەکی تری ناوی سائیب بوو کە ئەویش لە کۆچەرانی یەکەمی خاکی حەبەشە بوو، ئەویش گەڕایەوەو چوویە مەدینەو بەشداری بەدری کرد.[5]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٩٨.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨١.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٨١.
[4] أسد الغابة، ج٣، ص ٦٢٠.
[5] أسد الغابة، ج٢، ص ٢٨٣.

خاڵۆیەکی تری ناوی عەبدوڵا بوو کە ئەویش لەگەڵ دوو براکەی تری کۆچی کرد بۆ حەبەشە و گەڕایەوەو چوویە مەدینەو بەشداری غەزای بەدری کرد.[1]

خاڵۆیەکی تری ناوی قودامە بوو کە ئەمیش هاوشێوەی براکانی تری کۆچی حەبەشەو غەزای بەدری بینی، دواتریش بەشداری هەموو غەزاکانی تریشی کردو دوای سەردەمی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا.[2]

حەفصە برایەکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵای کوڕی عومەر کە یەکێکە لە هاوەڵە گەنج و زۆر ناسراوەکانی پێغەمبەر(ﷺ)،[3] حەفصە شەش ساڵ لە عەبدوڵای برای گەورەتر بوو.[4]

برایەکی تری هەبوو بە ناوی زەید کە لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا لەدایک بوو.[5]

برایەکی تری ناوی عەبدوڕەحمان بوو کە ئەمیش لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[6]

برایەکی تری ناوی عاصم بوو کە لە کۆتاییەکانی سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) لەدایک بوو و دایکی ناوی جەمیلە بوو.[7]

برایەکی تری ناوی عەبدوڕەحمان بوو کە ئەمەیان بە عەبدورەحمانی ناوەند ناسرابوو، واتە بچووکتر بوو لە عەبدوڕەحمانی برا گەورەی، ئەم برایەی لە سەردەمی خیلافەتی باوکیدا وەفاتی کرد.[8]

برایەکی تری ناوی عوبەیدوڵا بوو کە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ)

---

[1] أسد الغابة، ج٣، ص ٤٠٥.
[2] أسد الغابة، ج٤، ص ٤١٧.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ١٨١.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٧.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٢٨.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٣٣٩.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص ٣.
[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص ٤٤.

لەدایک بوو و دایکی ناوی ئومموکلثومی کچی جەروەل بوو، عوبەیدوڵا لە سەردەمی خیلافەتی باوکیدا بەشداری جیهادی کرد.[1]

حەفصە خوشکێکی هەبوو بە ناوی صەفییە و لە غەزای خەیبەردا بەشداری کرد،[2] خوشکێکی تریشی هەبوو بە ناوی فاتیمە کە لە باوکیەوە خوشکی بوو.[3]

کاتێک حەفصە لەدایک بوو هێشتا سەردەمی نەفامی بوو، ئەوکات قورەیشیەکان کەعبەیان بنیاد دەنایەوە، ئەمەش پێنج ساڵ پێش ماوەی پێغەمبەرایەتی بوو.[4]

حەفصە ژنی خونەیسی کوڕی حوذافەی سەهمی بوو، ئەم مێردەی زۆر زوو موسڵمان بووبوو، یەکێک بوو لە بەشداربوانی کۆچی حەبەشە، دواتر گەڕایەوەو چوو بۆ مەدینە، لەوێیش لە غەزاکانی بەدر و ئوحوددا بەشداری کرد، لە غەزای ئوحوددا خونەیس بریندار بوو و برینەکەی لێی قورس کرد و بەو هۆیەوە مرد، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) حەفصەی بەهاوسەر گرت.[5]

کاتێک حەفصە بێوەژن کەوت، عومەری باوکی بڕیاری دا مێردێکی باش بدۆزێتەوە بۆ کچەکەی، بۆیە پێشنیازی کرد بۆ ئەبووبەکر تا بەهاوسەری بگرێت، بەڵام ئەبووبەکر ڕەزامەندی دەرنەبڕی، ئینجا پێشنیازی کرد بۆ عوثمان، ئەویش ڕەزامەندی دەرنەبڕی و وتی: بڕوام نیە بتوانم ئەم ماوە ژن بهێنم، عومەریش بەوە دڵتەنگ بوو و جۆرێک لە بێتاقەتی رووی تێکرد و چوو لای پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵای کرد کە چی روویداوە، ئەویش فەرمووی: (يتزوج حفصة من هو خير من عثمان ويتزوج عثمان من هي خير من حفصة)، (کەسی باشتر لە عوثمان حەفصە بەهاوسەر دەگرێت و عوثمانیش کەسی باشتر لە

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص ٥٢.
[2] أسد الغابة، ج٧، ص ١٨٩.
[3] موطأ الإمام مالك - كتاب الرضاعة - رضاعة الصغير، الرقم ٢٢٤٠.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٨١.
[5] أسد الغابة، ج٢، ص ١٨١.

حەفصە بەهاوسەر دەگرێت)، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) داوای حەفصەی کرد و بەهاوسەری گرت، دواتر کە ئەبووبەکر عومەری بینی وتی: دڵت شتێک نەکات بەرامبەرم، من بیستبووم کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی حەفصەی دەکرد، بۆیە -ئەمەشم پێ نەوتیت- وتم: با نهێنی پێغەمبەر(ﷺ) ئاشکرا نەکەم، بە دڵنیاییشەوە پێغەمبەر(ﷺ) حەفصەی بەهاوسەر نەگرتایە من داوام دەکرد و بەهاوسەرم دەگرت.[1]

**وەستانێک**

بە چەند گێڕانەوەیەک هاتووە کە کاتێک روقییەی کچی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد کە ژنی عوثمان بوو، عوثمان زۆر دڵگران بوو، بۆیە عومەر پێشنیازی بۆ کرد تا حەفصەی کچی بەهاوسەر بگرێت، بەڵام ئەو رازی نەبوو،[2] بەڵام دەزانین کاتێک غەزای بەدر روویدا روقییە نەخۆش بوو، بۆیە بە ویستی پێغەمبەر(ﷺ) عوثمان لای روقییە مایەوە، بەڵام پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بگاتەوە ناو مەدینە روقییە کۆچی دوایی کرد،[3] هاوسەرگیری پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ حەفصەدا بەپێی بۆچوونی دروست لە ساڵی سێیەمی کۆچیدا بووە، چونکە خونەیسی مێردی حەفصە لە جەنگی ئوحوددا بریندار بوو و بەو هۆیەوە مرد،[4] تەنها لە گێڕانەوەیەکدا هێناویەتی کە خونەیس لە گەڕانەوەی لە بەدردا مردووە،[5] بەڵام هەموو راکانی تر بە گێڕانەوەکانی تری ئیبن سەعدیشەوە بەڵگەی ئەوەن کە خونەیس لە ئوحوددا بەشدار بووەو تیایدا بریندار بووەو بەو هۆیەوە پاش ئوحود مردووە، جا ئەمە دەیسەلمێنێت ئەو رووداوە پەیوەست نەبووە بە کاتی مردنی روقییەی کچی پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، ئەوەتا ئیبن سەعدیش دەڵێت:

[1] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٨.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٨٢.

[3] أسد الغابة، ج٧، ص ١٢٦.

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٤٥٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤٥، أسد الغابة، ج٢، ص ١٨١.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢١٧.

خونەیسی مێردی حەفصە لە پاش دوو ساڵ و یەک مانگ پاش کۆچی مەدینە وەفاتی کرد،[1] دەی دوای مردنی خونەیس ماوەی عیددەی حەفصە تەواو بووە ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوسەری گرتووە.

پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی سێیەمی کۆچیدا حەفصەی بەهاوسەرگرت،[2] ئەمەش رای زۆرینەی زانایانە،[3] جا بەو پێیەی لە پێنج ساڵ پێش پێغەمبەرایەتی لەدایک بووبێت و لە ساڵی سێی کۆچیدا بووبێتە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)، واتە تەمەنی نزیکەی بیست ساڵێک بووە.[4]

هاوسەرگیری حەفصە دوای عائیشە بوو، واتە پێغەمبەر(ﷺ) پاش عائیشە حەفصەی بەهاوسەرگرتووە.[5]

عائیشە و حەفصەی دایکانی باوەڕداران غیرەیەکیان هەبوو بەرامبەر بە هەڵوێستێک کە پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ زەینەبی کچی جەحش هەیبوو، حەفصە دوای عائیشەو زەینەبیش دوای حەفصە بوون بە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) کە دەچوو بۆ لای زەینەب لای ئەو هەنگوینی دەخوارد، عائیشەو حەفصەش بڕیاریاندا پێکەوە کارێک بکەن پێغەمبەر(ﷺ) راگرن لەو خواردنی هەنگوینە، بۆیە بڕیاریان دا پێغەمبەر(ﷺ) بچێت بۆ لای هەرکامیان بڵێن ئەوە مەغافیرت خواردووە (خواردنێکی بۆن ناخۆشە)، ئەو بۆنەت لێ دێت، پێغەمبەریش(ﷺ) کە ئەوەی پێ وترا فەرمووی: (نا، بەڵام من لای زەینەبی کچی جەحش هەنگوینم خواردووە، ئیتر هەرگیز نایخۆم و سوێندیشم خواردووە، هەواڵی ئەمەش مەڵێ بە کەس)،[6] ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٣٩٢.

[2] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٧.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص ١٨١١.

[4] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٧

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٢.

[6] صحيح البخاري - كتاب تفسير القرآن - سورة المتحرم - باب يا أيها النبي لم تحرم ما أحل الله لک تبتغي مرضاة أزواجک والله غفور رحيم، الرقم ٤٩١٢.

أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ، قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ وَاللَّهُ مَوْلَاكُمْ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ، وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَنْ بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنْبَأَكَ هَذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ، يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ)،[1] (ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆچی شتێک لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەلاڵ کردوویت تۆ ڕەزامەندی ژنەکانت دەوێ لە کاتێکدا خوا لێخۆشبووی میهرەبانە، بێگومان خوا دایناوە بۆتان هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانتان خوا کارساز و دۆستی ئێوەیە وە ئەو زانای کاردروستە، کاتێک کە پێغەمبەر(ﷺ) بەنهێنی لای هەندێ لە ژنەکانی قسەیەکی درکاند ئینجا کە ئەو (ژنە) قسەکەی کرد (بۆ هەوێکەی) خواش پێغەمبەری(ﷺ) ئاگادار کرد (پێغەمبەر(ﷺ)) هەندێک (لە قسەکان) ی باسکرد و بێ دەنگ بوو لە هەندێکی تری ئینجا کە پێی وت: (ژنەکەی) وتی: کێ ئەمەی پێ گەیاندی فەرمووی خوای زانای ئاگادار پێی گەیاندم، ئەی (حەفصە و عائیشە) ئەگەر هەردووکتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خودا (جێ ی خۆیەتی) چونکە بەڕاستی دڵتان لایدا (لە حەق و ڕاستی) وە ئەگەر پشتی یەکتر بگرن لە دژی پێغەمبەر(ﷺ) (سەرکەوتوو نابن) چونکە بێگومان خوا پشگیری ئەوەو هەروەها جوبرەئیل و ئیمانداره چاکەکانیش دوای ئەوان فریشتەکانیش پشتیوانی ئەون).

**وەستانێک**

لە گێڕانەوەیەکی تری هەمان بەسەرهات هاتووە، بەڵام وا هاتووە کە خاوەنی هەنگوینەکە حەفصە بووەو پلان دانانەکەش عائیشەو سەودە بون،[2] بەڵام ئیبن حەجەر لە شەرحی بوخاریدا دەڵێت: دەگونجێت ئەو ڕووداوە جارێکی تر بووبێت و پەیوەست نەبووە بەم ڕووداوەو بە دابەزینی ئەم ئایەتانەوە، چونکە ڕووداوی هەنگوینەکەی زەینەب و پێ

[1] صحيح البخاري - كتاب الأيمان والنذور - باب إذا حرم طعامه، الرقم ٦٦٩١.

[2] صحيح البخاري - كتاب الطلاق - باب لم تحرم ما أحل الله لك، الرقم ٥٢٦٨، صحيح مسلم - كتاب الطلاق - باب وجوب الكفارة على من حرم امرأته ولم ينو الطلاق،الرقم ١٤٧٤.

ناخۆش بوونی عائیشەو حەفصە چەسپاوە، لەو بارەشەوە مشتومڕێکی ورد دێنێت، ئەو پێی وایە کە لەوانەیە رووداوەکەی هەنگوین خواردن لای حەفصە پێش ئەم رووداوە بووبێت و پەیوەست نەبووبێت بەو ئایەتانەوە،[1] بەڵام ئەمە وردەکاری دەوێت، چونکە ناکرێت پێغەمبەر(ﷺ) دوو جار بە هەمان رووداو تێکەوتبێت، وەک خۆی لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت (لا يلدغ المؤمن من جحر واحد مرتين)،[2] (باوەڕدار دوو جار لە کونێکدا ناگەزرێت)، ناگونجێت پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم جار بەو جۆرەی بەرامبەر کرابێت و بۆ جاری دووەمیش هەمان شتی بەرامبەر کرابێت و هەستی پێ نەکردبێت، دوور بێت لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ئەمە بە لاوازدانانی هەست و پێزانینی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، بۆیە دەکرێت ئەگەرێکی تر هەبێت، ئەویش ئەوەیە دەبێت پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار نەبووبێت بە رووداوی یەکەم و ئەو شتەی بۆ ئاشکرا نەبووبێت تا لە رووداوی دووەمدا ئینجا خوای گەورە ئاشکرای کردبێت، چونکە وەک هاتووە کاتێک هەریەک لە عائیشەو سەودە وا دەڵێن بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەویش دەچێتەوە بۆ لای حەفصە، حەفصە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەو هەنگوینەت بۆ تێبکەم؟ ئەویش دەفەرموێت نا پێویستم نیە، ئینجا سەودە بە عائیشەی وت: سوبحانەڵا، بەخوا ئەو هەنگوینەمان لێ حەرام کرد، عائیشەش بە سەودەی وت: بێدەنگ بە،[3] بۆیە نابینین هیچ سوێند خواردنێکی تێدا بووبێت بۆ نەخواردنی و باسی دابەزینی ئایەتەکەشی تێدا نیە.

بەهەرحاڵ ئەم رووداوە بەڵگەیە لەسەر بوونی غیرە لای ئافرەتان، وەک دەبینین ئوممو سەلەمەی دایکی باوەڕداران خۆی دان بەوەدا دەنێت و کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) داوای دەکات ئەو دەڵێت: ئاخۆ من ئافرەتێکم غیرەیەکی

[1] فتح الباري، ج٩، ص ٣٧٦ – ٣٧٧.

[2] صحيح البخاري – كتاب الأدب – باب لا يلدغ المؤمن من جحر مرتين، الرقم ٦١٣٣، صحيح مسلم – كتاب الزهد والرقائق – باب لا يلدغ المؤمن من جحر مرتين، الرقم ٢٩٩٨.

[3] صحيح مسلم – كتاب الطلاق – باب وجوب الكفارة على من حرم امرأته ولم ينو الطلاق،الرقم ١٤٧٤.

زۆرم تێدا هەیە،[1] هەروەها کاتێک پرسیار دەکرێت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆچی ئافرەتێکی پشتیوانان بەهاوسەر ناگریت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموێت (إن فيهم لغيرة شديدة)،[2] (ئەوان غیرەیەکی زۆر زۆریان تێدایە).

هەروەک ئەمە بەڵگەیەکی جوان و روونە بۆ موسڵمان تا ئەگەر هەڵەیەکی لە هەر کەسێک بەدی کرد نەیکاتە بیانوو بۆ سفرکردنەوە یان شکاندنی ئەو کەسە، چونکە مرۆڤ هەرکات جێی هەڵەکردنەو دەکەوێتە هەڵەوە، دەبینین ئەوە هاوسەرانی پێغەمبەری خوان(ﷺ) و دایکانی باوەڕدارانن، کەچی دەکەونە هەڵەوەو تەوبەش دەکەن و خوای گەورەش نایانشکێنێتەوە، بەڵکو پێشنیازی تەوبەیان بۆ دەخاتەڕوو، پێغەمبەریش(ﷺ) هەڵوێستی قورسی نەگرتەبەر بەرامبەریان و کارەکەی جێهێشت بۆ فەرمانی خوا، کەچی دەبینین لە رۆژگاری ئەمڕۆدا موسڵمانانێک هەن چاو دادەخەن لە ئاست هەوڵ و ماندوێتی بانگەواز و جیهاد و رەنجی دەیان یان سەدان بانگخوازی رێی خوادا و بە بینینی هەڵەیەک لە هەر کەسێک لەوانە دەکەونە زەقکردنەوەی هەڵەکەی و شکاندنی و ئیدی بە کەم تەماشاکردنی، جا خۆ ئەگەر وا بوایە دەبوو ئەم ژنانەی پێغەمبەر(ﷺ) لەو ئاستە بەرزەیان داماڵرابان و دەرکرابان، بەڵام ئایا خوا و پێغەمبەر(ﷺ) بڕیار و خوێندنەوەیان بۆ باری مرۆیی وایە؟ نەخێر، خوا دایناوە مرۆڤ هەڵە دەکات و تەوبەی لەسەر واجب دەبێت، وەک پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (كل بني آدم خطاء وخير الخطائين التوابون)، (هەموو ئادەمیزاد هەڵەکارن و چاکترینی هەڵەکاران تەوبەکارانن)، تەنانەت خوای گەورە داینـاوە هەر دەبێت مرۆڤ هەڵە بکات و تەوبەی لێ بکات، وەک لە فەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە (والذي نفسي بيده لو لم تذنبوا لذهب الله بكم، ولجاء بقوم يذنبون فيستغفرون الله فيغفر لهم)،[3] (سوێند بەوەی گیانی

[1] مسند أحمد بن حنبل - أول مسند المدنيين(رضي الله عنهم) أجمعين - حديث أبي سلمة بن عبد الأسد(رضي الله عنه)، الرقم ١٦٦٠٣.

[2] السنن الكبرى للنسائي - كتاب النكاح - المرأة الغيراء، الرقم ٥٣٢٢.

[3] صحيح مسلم - كتاب التوبة - باب سقوط الذنوب بالاستغفار توبة، الرقم ٢٧٤٩.

منی بەدەستە ئەگەر ئێوە تاوان نەکەن، بە دڵنیاییەوە خوای گەورە ئێوە لادەبات و خەڵکانێک دێنێت کە تاوان دەکەن و ئینجا داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەن و خوای گەورەش لێیان خۆش دەبێت).

عومەری کوڕی خەططاب دەڵێت: من و دراوسێیەکی پشتیوانیم کە لە سەرووی شاری مەدینەوە بووین هەر ڕۆژەو یەکێکمان دادەبەزی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئیتر ئەوەمان دەچوو هەواڵی سروش و پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەهێنا بۆ ئەوی ترمان، جارێک کە سەرەی پشتیوانیەکە بوو، گەڕایەوەو بە توندی دای لە دەرگا و منیش تەواو ترسام، وتی: شتێکی گەورە ڕوویداوە، مەسەلەکەی بۆ باس کرد، منیش چووم بۆ لای حەفصەو بینیم دەگری، وتم: ئایا پێغەمبەر(ﷺ) تەلاقی داون؟ ئەویش وتی: نازانم، ئینجا چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەر بە پێوە وەستابووم وتم: ئایا ژنەکانت تەلاق داون؟ ئەویش فەرمووی: نا، منیش وتم: الله أكبر.[1]

جیا لەو ڕووداوە پێغەمبەر(ﷺ) تەلاقێکی حەفصەی دا، دواتر گێڕایەوە بۆ لای خۆی، چونکە جبرەئیل هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی فەرموو (راجع حفصة، فإنها صوامة قوامة، وإنها زوجتك في الجنة)،[2] (حەفصە بگێڕەوە، چونکە ئەو زۆر ڕۆژوو دەگرێت و زۆر شەونوێژ دەکات، هەروەها ئەو هاوسەرت دەبێت لە بەهەشتدا).

کاتێک حەفصە تەلاق درابوو، عومەر چوو بۆ لای و بینی حەفصە دەگری، وتی: بۆچی دەگریت؟ لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) تەلاقی داویت؟ ئەو تەلاقی داویت و لەبەر من دەتگێڕێتەوە، دە بەخوا ئەگەر جارێکی تر تەلاقت

---

[1] صحيح البخاري - كتاب العلم - باب التناوب في العلم، الرقم ٨٩.

[2] المستدرک على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﭫ) - ذكر الصحابيات من أزواج رسول الله(ﷺ) وغيرهن(ﭫ) - ذكر أم المؤمنين حفصة بنت عمر بن الخطاب(ﭫ) - نزول جبريل لفسخ طلاق حفصة ، الرقم ٦٨٢٤، سكت عنه الذهبي في التلخيص، قال الألباني أما تطليقه لحفصة و كونه أمر بإرجاعها صحيح، أما قول جبريل(راجعها...) حسن، انظ سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٢٠٠٧.

بدات هەرگیزاو هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم.[1]

حەفصە دەڵێت: ڕۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) لەماڵەوە بوو و جلەکەی خستبووە نێوان ڕانەکانی، ئەوەبوو ئەبووبەکر هات و داوای مۆڵەتی کرد و مۆڵەتی پێدراو هاتە ژوورەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هەروەک خۆی مایەوەو خۆی تێکنەدا، ئینجا عومەریش هات و هەمان شت ڕوویدا، ئینجا عەلی هات و هەمان شت ڕوویدا، ئینجا هاوەڵانێکی تر هاتن و پێغەمبەر(ﷺ) هیچ خۆی تێکنەدا و هەر لەو شێوەی خۆیدا مایەوە، ئینجا عوثمان هات و داوای مۆڵەتی کرد، مۆڵەتی پێدرا تا بێتەژوورەوە، خێرا پێغەمبەر(ﷺ) جلەکانی ڕێککرد، ئینجا کەوتنە قسەکردن و پاش ماوەیەک خەڵکەکە چوون، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەبووبەکر و عومەری و عەلی و ئەو هاوەڵانەی تر هاتن تۆ هیچ خۆت تێکنەدا، کەچی کە عوثمان هات خێرا خۆت کۆکردەوەو جلەکانت ڕێککرد، ئەویش فەرمووی: (ألا أستحي ممن تستحي منه الملائكة)،[2] (ئایا شەرم نەکەم لە کەسێک کە فریشتە شەرمی لێ دەکات)

دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد و بڕیاردرا قورئان کۆبکرێتەوەو، زەید ڕاسپێردرا بەو کارەو دواجار هەموو قورئان نووسرایەوە، دواتر ئەبووبەکر ئەو نوسخەی دایە لای عومەری کوڕی خەططاب، پاش مردنی عومەر نوسخەکەی قورئانەکە کەوتە لای حەفصەی دایکی باوەڕداران، لە سەردەمی عوثماندا خەلیفە داوای لە حەفصە کرد ئەو نوسخەی قورئانەی لایەتی بیداتە لایان تا هەموو موسڵمانان لەسەر یەک خوێندنەوەی قورئان یەکدەنگ ببن.[3]

لە سەرەتای خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا، کاتێک دایکی

---

[1] صحيح ابن حبان - كتاب الطلاق - باب الرجعة - ذكر البيان بأن المصطفى(ﷺ) راجع حفصة من أجل أبيها عمر بن الخطاب ، الرقم ٤٢٧٦، قال شعيب الأرناؤوط إسناده جيد، قال الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة الرقم ٢٠٠٧ فلا يفرح بمتابعته. وللحديث شواهد مختصرة.

[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند النساء(رضي الله عنهن) - حديث حفصة أم المؤمنين بنت عمر بن الخطاب(رضي الله عنهما)، الرقم ٢٧٠٥٦.

[3] البدايةو النهاية لابن كثير، ٧، ص ٢١٧.

باوەڕداران عائیشە ئیجتیهادی ئەوەی کرد دەبێت بکوژانی عوثمان خێرا بکوژرێنەوەو لەسەر ئەوە لەگەڵ خەلیفە راجیایی کەوتە نێوانیان و عائیشە بڕیاری دا بەرەو بەصرە بڕوات، حەفصەش بڕیاری دا لەگەڵ عائیشەدا بڕوات بۆ بەصرە، بەڵام عەبدوڵای برای رێگری لێکرد و نەیهێشت لەگەڵ عائیشەدا بچێت.[1]

سەبارەت بە کاتی مردنی دایکی باوەڕداران حەفصە راجیایی هەیە، رایەک دەڵێت: لە جەمادیئلوولای ساڵی چل و یەکی کۆچیدا وەفاتی کرد کاتێک حەسەنی کوڕی عەلی بەیعەتی دا بە موعاویە، رایەکی تر دەڵێت: لە ساڵی چل و پێنجی کۆچی وەفاتی کرد.[2]

ئیبن کەثیر دەڵێت: رای راستتر ئەوەیە کە لە شەعبانی ساڵی چل و پێنجی کۆچیدا مردووەو ئەوکات تەمەنی شەست ساڵان بووە،[3] بەڵام ئەگەر پێنج ساڵ پێش پێغەمبەرایەتی لەدایک بووبێت و لە ساڵی ٤٥ی کۆچیش وەفاتی کردبێت، ئەوە تەمەنی دەبێت نزیکەی شەست و سێ ساڵێک بووبێت.

والی ئەوکاتی مەدینە مەڕوانی کوڕی حەکەم نوێژی مردووی لەسەر تەرمی حەفصەی دایکی باوەڕداران ئەنجام دا،[4] هەریەک لە مەڕوان و ئەبووهورەیرە تەرمەکەی حەفصەیان بەرەو گۆڕستان هەڵگرتبوو.[5]

دایکی باوەڕداران حەفصە ژمارەیەک فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، ذەهەبی دەڵێت: لە کتێبەکەی (بقي بن مخلد) دا ژمارەی ئەو فەرمووودانەی نووسراون کە دایکی باوەڕداران حەفصە گێڕاویەتیەوە شەست فەرموودەن، چوار فەرموودەیان لە هەردوو صەحیحی بوخاری و

---

[1] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣١.
[2] أسد الغابة، ج٧، ص ٧٥.
[3] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٠.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٩.
[5] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٣٠.

موسلیمدا هەن، شەش فەرمووده‌شیان تەنها لە موسلیمدا هاتون،[1] ئەوانی تر لە کتێبەکانی تری فەرمووده‌دا هەن، لەوانە چەند نموونەیەک وەردەگرین:

حەفصەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لا يحل لامرأة تؤمن بالله و اليوم الآخر أن تحد على ميت فوق ثلاثة أيام إلا على زوجها فإنها تحد عليه أربعة أشهر و عشرا).[2]

(بۆ هیچ ئافرەتێک نیە کە بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێت زیاتر لە سێ ڕۆژ خەمپۆشی هەبێت بۆ مردوویەک مەگەر بۆ مەرگی مێردەکەی، ئەمەیان بۆی هەیە چوار مانگ و دە ڕۆژ خەمپۆشی هەبێت بۆی). مەبەست بە خەمپۆشی پۆشینی بەرگی خەمباری نیە، بەڵکو وازهێنانە لە خۆ رازاندنەوە.

حەفصەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: کاتێک بانگبێژ لە بانگی بەیانی دەبوویەوەو بەرەبەیان دەهات، پێغەمبەر(ﷺ) دوو ڕکاتی کورت نوێژی دەکرد پێش ئەوەی نوێژی بەیانی بکرێت.[3]

حەفصەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (ليؤمن هذا البيت جيش يغزونه حتى إذا كانوا ببيداء من الأرض يخسف بأوسطهم وينادي أولهم آخرهم ثم يخسف بهم فلا يبقى إلا الشريد الذي يخبر عنهم).[4]

(سوپایەک بەڕێدەکەون هێرش بێنن بۆ کەعبە تا دەگەنە زەویەکی ڕووتەڵان و چۆڵەوانی، لەوێ ئەوانەی لە ناوەڕاستی سوپاکەدان دەبرێن بە ناخی زەویدا، ئەوانەی پێشەوە هاوار دەکەن لەوانەی دواوە، دواتر هەموویان دەبرێن بە ناخی زەویداو کەسیان لێ دەرناچێت تەنها کەسێ نەبێت کە رادەکات و هەواڵی ئەوانی تر دەباتەوە).

---

[1] نفس المصدر.

[2] صحيح مسلم - كتاب الطلاق - باب وجوب الإحداد في عدة الوفاة وتحريمه في غير ذلك إلا ثلاثة أيام، الرقم ١٤٩٠.

[3] صحيح منسلم، الرقم ١٢١٩،

[4] صحيح مسلم - كتاب الفتن وأشراط الساعة - باب الخسف بالجيش الذي يؤم البيت، الرقم ٢٨٨٣.

## ٩٦٧. حەکەمی سولەمی(رضي الله عنه)

ناوی حەکەمە، سەبارەت بە ناوی باوکی دوو را هەیە، رایەک دەڵێت: کوڕی حارثە، رایەکی تر دەڵێت: کوڕی ئەبییووبە،[١] حەکەم دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) منی ناردە پێشەوە، کەچی دوایی دای بەلامدا و وشترەکەم نەدەرۆیشت و مۆڵی دابوو، منیش سەرقاڵ بووم دەمدا لە وشترەکەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لا تضربها، حل)، لێی مەدە، ئینجا خوڕیە وشترەکە، ئەوەبو وشترەکەم هەستا و کەوتەڕێ.[٢]

حەکەم لە سێ غەزادا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بەشداری کردووە،[٣] بەڵام لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە حەکەم دەڵێت: لە حەوت غەزادا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەشدار بووم و کۆتا غەزایشیان غەزای حونەین بوو، ئەو بەسەرهاتەی وشترەشم لەو غەزایەدا بوو.[٤]

حەکەم دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیست کە دەیفەرموو (إذا دفنتموني ورششتم على قبري الماء فقوموا على قبري واستقبلوا القبلة وادعوا لي)،[٥] (کاتێک ئەسپەردەتان کردم و ئاوپرژێنی گۆڕەکەمتان کرد، لەسەر گۆڕەکەم بوەستن و روو بکەنە قیبلەو نزام بۆ بکەن).

## ٩٦٨. حەکەمی کوڕی حەزن(رضي الله عنه)

ناوی حەکیمی کوڕی حەزنی کولفیە، فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[٦]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٩٨.

[٢] الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ١٢٧٧.

[٣] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٧٩٩.

[٤] المطالب العالية، الرقم ١٥٢٠.

[٥] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣١٠٠،قال الألباني سنده منكر، انظر سلسلة الاحاديث الضعيفة، الرقم ٦٦٤٩.

[٦] أسد الغابة، ج٢، ص ٤٥.

شوعەیبی کوڕی زورەیق دەڵێت: لەپاڵ پیاوێکدا دانیشتم کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و پێی دەوترا حەکەمی کوڕی حەزنی کولەفی، حەکەم فەرموودەی بۆ دەگێڕاینەوەو وتی: من لەگەڵ شەش یان هەشت کەسی تردا بووم چووین بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، چووینە خزمەتی و وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتوین سەردانت بکەین، دەی نزای خێرمان بۆ بکە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمانی کرد رێزمان بگرن و برێ خورمامان پێبدەن، ئەوکاتیش ژیان وەک ئێستا نەبوو ئاوا شت زۆر بێت، لەوێ چەند رۆژێک ماینەوەو کەوتینە رۆژی هەینی، لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری نوێژی هەینیمان کرد، پێغەمبەر(ﷺ) هەستابووە سەر پێ و خۆی دابوو بەسەر گۆچان یان کەوانێکدا-واتە بۆ رێک راوەستانی وەک گۆچان بەکاری دەهێنا- ئینجا بە چەند وشەیەکی سادەی جوانی پیرۆز سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: (أيها الناس إنكم لن تطيقوا أو لن تفعلوا كل ما أمرتم به، ولكن سددوا و أبشروا)،[1] (ئەی خەڵکینە ئێوە هەرگیز تواناتان نیە هەموو ئەوە بکەن کە فەرمانتان پێ کراوە، یان هەموو ئەوە ناکەن کە فەرمانتان پێ کراوە، بەڵام پابەندی رێی راست و دروست بن و موژدە بەخش و دلخۆش بن بەوە).

## ٩٦٩. حەکەمی ئەنصاری(رضي الله عنه)

ناوی حەکەمی کوڕی ئەبولحەکەمە، لە پشتیوانانە[2]و جیایە لە حەکەمی کوڕی ئەبولحەکەمی ئومەوی.

حەکەم لە غەزای تەبووکدا بەشداری کرد، کەعبی کوڕی خەزرەج کە یەکێکە لە هاوەڵە پشتیوانیەکان دەڵێت: لە غەزای تەبووکدا حەکەمی کوڕی ئەبولحەکەم هاودەمم بوو، بەراستی هاودەمێکی چاک و ناوازە بوو.[3]

[1] سنن أبي داود - كتاب الصلاة - باب الرجل يخطب على قوس، الرقم ١٠٩٦، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ١٠٩٦.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٠.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص ٥٩٢.

## ٩٧٠. حەکەمی کوڕی حەییان(رضي الله عنه)

ناوی حەکەمی کوڕی حەییانی عەبدیە، لە بەنی نەججارە، برایەکیشی هەبوو بە ناوی عەبدوڕەحمان کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، حەکەم یەکێک بووە لە ئەندامانی وەفدی عەبدولقەیس کە هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ).[١]

حەکەم دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیست دەیفەرموو (هەر بەندەیەک کە بەیانی کردەوە سێ جار بڵێت: الحمد لله ربي الله الذي لا أشرك به شيئا وأشهد أن لا إله إلا الله، ئەوە هەموو تاوانەکانی یەک بە یەکیان بەر لێخۆشبوون دەکەون، ئەگەریش ئێوارەی کردەوە هەمان شت بڵێت تاوانەکانی بەر لێخۆشبوون دەکەون تا بەیانی دەکاتەوە).[٢] بەڵام ئەم فەرموودەیە لە کتێبەکانی تری فەرموودەدا وا هاتووە کە حەکەم لە ئەبانی موحارببیەوە گێڕاویەتیەوە پێغەمبەر(ﷺ) وای فەرمووە.[٣]

## ٩٧١. حەکەمی کوڕی رەبیع(رضي الله عنه)

ناوی حەکەمی کوڕی رەبیعی کوڕی عامرە، لە پشتیوانانە لە زورقیەکان،[٤] ژنەکەی ناوی حەبیبەی کچی شەریقە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی مەسعوود کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٥]

مەسعوود دەڵێت: باوکم بۆی گێڕامەوە کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە مینا بون، لەو کاتەدا گوێیان لە سوارێک بوو هاواری دەکرد(کەس رۆژوو

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٠.
[٢] تأريخ المدينة لابن شبة، الرقم ٨٨٠.
[٣] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٦٣٤، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٩٦٤.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٠.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٠.

نەگرێت، چونکە ئەم ڕۆژانە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن).[1]

مەسعوود دەڵێت: بیستم لە باوکم دەیگێڕایەوە دەیوت ئامادەی ئەسپەردەی تەرمێک بووم لە عێراق، بینیم خەڵکێک بە پێوە وەستابوون و چاوەڕێ بوون تەرمەکە دابنرێت، بینیم عەلی کوڕی ئەبوو تالیب بە قامچیەکەی دەستی ئاماژەی کرد بۆ خەڵکەکە دابنیشن و دەیوت چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردوین پاش هەستانەوە دابنیشین.[2]

ئەمەش لە حەجی ماڵئاواییدا بوو و پێغەمبەر(ﷺ) چەند کەسێکی ڕاسپارد تا بەناو خەڵکدا ئەو هاوارە بکەن، وەک لە باسی ژیانی بیشری کوڕی سوحەیم و بودەیلی کوڕی وەرقائیشدا باسمان کردووە.

## ٩٧٢. حەکەمی کوڕی ڕافیع(ﷺ)

ناوی حەکەمی کوڕی ڕافیعی کوڕی سینانە، لە پشتیوانانە، جەعفەری کوڕی عەبدوڵای کوڕی حەکەم دەڵێت، من منداڵ بووم و لێرەو لەوێوە نانم دەخوارد، حەکەم منی بینی و وتی: منداڵ گیان شەیتان ئاوا نان دەخوات، پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ شتی دەخوارد پەنجەکانی نێوانیان نەدەما. بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەم فەرموودەیە لاوازە.[3]

## ٩٧٣. حەکەمی کوڕی سەعید(ﷺ)

ناوی حەکەمی کوڕی سەعیدی طائیفیە، ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەمە جیایە لە حەکەمی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص، حەکەم دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا بەیعەتی پێبدەم، فەرمووی: ناوت چیە؟ وتم: ناوم حەکەمە، فەرمووی: بەڵکو ناوت عەبدوڵایە.[4]

---

[1] تهذيب الآثار للطبري، الرقم ١٦٨٤، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٨٢٠.

[2] تهذيب الآثار للطبري، الرقم ٧٣٧.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠١.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠١.

## ٩٧٤. حەکەمی کوڕی سەعیدی ئومەوی(ﭬ)

ناوی حەکەمی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصی کوڕی ئومەییەی ئومەویە،[١] دایکی ناوی هیندی کچی موغیرەی مەخزوومیە.[٢]

حەکەم لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینەو چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)،[٣] حەکەم دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا بەیعەتی پێبدەم، فەرمووی: ناوت چیە؟ وتم: ناوم حەکەمە، فەرمووی: بەڵکو ناوت عەبدوڵایە.[٤]

ئەم رووداوە بۆ حەکەمی کوڕی سەعیدی ئەنصاریش روویداوە.

حەکەمی ئومەوی کەسێکی خوێنەوار بوو و نووسینی دەزانی.

رایەک دەڵێت: لە غەزای بەدردا بەشداری کردووەو شەهید بووە، رایەکی تر دەڵێت: لە غەزای موئتەدا شەهید بووە، رایەکی تر دەڵێت: لە جەنگی یەمامەدا شەهید بووە، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو دواتر چووەتە شام و لەوێ نیشتەجێ بووەو زۆر ژیاوەو دواتر مردووە.[٥]

## ٩٧٥. حەکەمی کوڕی عەبدولا(ﭬ)

ناوی حەکەمی کوڕی عەبدوڵای ثەقەفیە، فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[٦]

حەکەم دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بۆ چوونەدەرێکی چووین و لە رێدا ئافرەتێکمان پێگەیشت کە منداڵێکی پێبوو، وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم منداڵەم رۆژی سێ جار شەیتان شێتی ئەکات، پێغەمبەریش(ﷺ) منداڵەکەی گرت

[١] أسد الغابة، ج٢، ص ٤٧.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٢.
[٣] أسد الغابة، ج٢، ص ٤٧.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٢.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٢.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٦.

و شەیتانی دەرکرد، ئینجا چووین بۆ سەفەرەکەو هاتینەوە ئافرەتەکەمان تووش بوویەوەو دوو بەرانی پێ بوو و لەگەڵ منداڵەکەی بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئیتر لەو کاتەوە شەیتان نزیکی نەبوەتەوە، ئینجا داوای کرد پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دوو بەرخەی بە دیاری لێوەربگرێت، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمانی کرد بەرانێکیان وەربگرن و ئەوی تر بۆ ژنەکە خۆی بێت.[1]

ئەم فەرموودەیە هەمووی لە (معرفة الصحابة) دا نەهاتوە، بەڵکو تا ئەوە دێنێت کە ژنەکە بە منداڵەکەوە دێت و ئینجا دەڵێت: (الحديث) واتە تەواوکەری ئەو فەرموودەی ئەو بەسەرهاتەی هێناوە، ئەو بەسەرهاتەش لە کتێبەکانی فەرموودەدا لە جابیرەوە هاتووە،[2] چونکە چەندین هاوەڵ لەو سەفەرەدا بەشدار بون و ئەو بەسەرهاتەیان گێڕاوەتەوە، حەکەمیش یەکێکە لەو هاوەڵانە.

## ٩٧٦. حەکەمی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

ناوی حەکەمی کوڕی عەمری کوڕی شریدە، ئەم هاوەڵە دەڵێت: لە دوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) نوێژم دەکرد، کەسێک پژمی، منیش وتم: يرحمك الله، ئیتر هەندێ لە خەڵکەکە پێکەنین.[3]

## ٩٧٧. حەکەمی کوڕی عەمری غیفاری(رضي الله عنه)

ناوی حەکەمی کوڕی عەمری کوڕی موجەددەعی غیفاریەو کونیەکەی ئەبوو عەمرە،[4] دایکی ناوی ئومامەی کچی مالیکە،[5] برایەکی هەبوو بە

---

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٨١٦.

[2] مسند الدارمي - مقدمة المؤلف - باب ما أكرم الله تعالى به نبيه(ﷺ) من إيمان الشجر به والبهائم والجن ، الرقم ١٧، قال حسين سليم أسد : إسناده ضعيف لضعف إسماعيل بن عبد الملك، ولكن الحديث صحيح بشواهده.

[3] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٨١٧.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٧.

[5] المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٨٦٣.

ناوی رافیع، هەروەها بە حەکەمی کوڕی ئەقرەعیش ناوی هاتووە، ئەم هاوەڵە لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ژیا تا پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد.[1]

عومەری کوڕی خەططاب کاتێک حەکەمی دەبینی کە ریشی زەردباو کردبوو، دەیوت ئەمە لە ئیمانەوەیە.[2]

دواتر چوو لە بەصرە نیشتەجێ بوو و ماوەیەکی زۆر ژیا، دواجار زیاد حەکەمی کرد بە والی خوراسان و هەر لەوێ مایەوە تا لەوێ مرد.[3]

حەکەم لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا بڕیاری دا کەنار بگرێت لەو فیتنەی پەیدا بووە، ئەوەبوو کاتێک عەلی کوڕی ئەبوو تالیب نێردراوێکی نارد بۆ لای، نێردراوەکە وتی: ئەمیری باوەڕداران پێت دەڵێت: تۆ شیاوترینی بە هەموان تا لەسەر ئەم مەسەلە هاوکارمان بیت، حەکەمیش لە وەڵامی خەلیفەدا وتی: دەی من لە خۆشەویستم بیستووە کە ئامۆزای تۆیە ئەی ئەمیری باوەڕداران دەیفەرموو (ئەگەر بارودۆخی وا هات شمشێرێکی تەختە دروست بکە).[4]

کاتێک حەکەم لە خوراسان بوو نامەی نارد بۆ موعاویە و نووسیبووی بێباوەڕان زۆریان بۆ هێناوەو ناشکێن، ئەویش وەڵامی بۆ نووسیەوە بەکری کوڕی وائیلیان بدە بە گژدا چونکە من بیستوومە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (دوژمن بەسەر بەکری کوڕی وائیلدا سەرناکەوێت).[5]

هۆکاری ئەوەی کە حەکەم لەسەر دەسەڵاتی خوراسان لابرا ئەوەبوو کاتێک حەکەم دەستکەوتێکی زۆری دەستکەوت، زیاد نامەی نووسی بۆی و وتی:

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٧.

[2] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٧٥.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٧.

[4] المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذكر مناقب الحكم بن عمرو الغفاري(ﷺ)، الرقم ٥٩٢١، سكت عنه الذهبي في التلخيص.

[5] المطالب العالية، الرقم ٤٢٣٢،

ئەمیری باوەڕداران نامەی ناردووە تا هەموو دەستکەوتەکانی بۆ جیا بکەیتەوەو زێڕو و زیو لەنێوان موسڵماناندا دابەش نەکەیت، حەکەمیش نامەی نووسی بۆی و وتی:

نامەیەکت نووسیوە باسی پەیامەکەی ئەمیری باوەڕدارانت کردووە، جا من پێش نامەکەی ئەمیری باوەڕداران کتێبەکەی خوام خوێندووەتەوە، سوێندیش دەخۆم بە خوا ئەگەر زەوی و ئاسمانەکان بنووسێن بەسەر سەری بەندەیەکەوەو ئەو بەندەیە لەخواترس بێت خوای گەورە لەو نێوەندەدا ڕێی دەربازی بۆ دەکاتەوە،

بۆیە حەکەم کەسێکی بانگ کرد و وتی: بڕۆن دەستکەوتەکان لەنێوان موسڵماناندا دابەش بکەن، بۆیە کاتێک موعاویە بیستی حەکەم لە قسەی دەرچووە و چی کردووە بڕیاری دا لاببرێت و بەند بکرێت.

کاتێک هێشتا فەرمانی لابردنەکەی نەهاتبوو، عیمرانی کوڕی حوصەین چوو بۆ لای حەکەم و وتی: دەزانیت بۆچی هاتوم بۆ لات؟ بیرت دێت پێغەمبەر(ﷺ) کاتێک هەواڵی ئەو کەسەی پێگەیشت کە ئەمیرەکەی پێی وتبوو هەستە خۆت بخەرە ناو ئاگرەوە، ئەویش هەستابوو تا وابکات، ئەمیرەکە خێرا وەستاندبووی، پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەمەی بیست فەرمووی: (لو وقع فيها لدخل النار لا طاعة في معصية الله)، (ئەگەر خۆی بخستایەتە ناو ئاگرەکە بە دڵنیاییەوە دەچوویە دۆزەخەوە، لە سەرکەشی خوادا هیچ گوێڕایەڵیەک نیە)، حەکەمیش وتی: بەڵێ ئەو فەرموودەم بیر ماوە، عیمرانیش وتی: دەی ویستم ئەو فەرموودەیەت بیر بخەمەوە.[1]

حەکەمی کوڕی عەمر یەکەم کەس بوو لە ناوچەی ئەودیو ڕووبار نوێژی کرد،[2] ئەمەش پاش ئەو فتووحاتە گەورەی لەوێ کرا.

---

[1] المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذكر مناقب الحكم بن عمرو الغفاري(ﷺ) - كان سبب موت حكم بن عمرو أنه دعا على نفسه ، الرقم ٥٩٢٤، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص.

[2] فتوح البلدان للبلاذري، دار الكتب العلمية (بيروت – ١٤٠٣ هـ)، ج١، ص ٤٠٠.

سەبارەت بە مردنەکەی دەوترێت موعاویە توورە بووە لێی و ئەوی لەسەر دەسەڵات لابردووەو کەسێکی تری ناردووەو لەوێ حەکەم بەند کراوە تا لە ساڵی چل و پێنجی کۆچیدا مردوووە،[1] رایەکی تریش دەڵێت: بەڵکو لە ساڵی پەنجای کۆچیدا وەفاتی کردووە، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو لە ساڵی پەنجاو یەکی کۆچیدا وەفاتی کردووە،[2] ئیبن حەجەر دەڵێت: راستتر ئەوەیە کاتێک زیاد نامەی سەرکۆنەی نارد بۆ حەکەم، حەکەم داوای لە خوا کرد بیباتەوە بۆ لای خۆی.[3]

حەسەنی کوڕی ئەبیلحەسەنی بەصری دەڵێت: حەکەم کە نزای مەرگی کرد وتی: ئەی تاعوون وەرە بمبە بۆ لای خۆت، کەسێک پێی وت: باشە تۆ چۆن وا دەڵێیت لەکاتێکدا بیستووتە لە پێغەمبەر(ﷺ) کە دەیفەرموو (کەستان لەبەر خراپەو زیانێک کە تووشی دەبێت ئاوات بە مەرگ نەخوازێت)، حەکەم وتی: بەڵێ من ئەو فەرموودەم بیستووە، بەڵام دەمەوێت پێش شەش شت بکەوم و نەگەم بەوانەو پێش ئەوانە بمرم: فرۆشتنی دادوەری، مەرج زۆری، دەسەڵاتداری مێردمنداڵان، خوێن رشتن، پچڕاندنی خزمایەتی، بارێکی ئاوازخوێنی کە قورئان بە ئاواز دەگرن.[4]

هەرچەندە ذەهەبی لە حوکمی صەحیحی ئەم فەرموودەیە بێدەنگ بووە، بەڵام لەو دەقەی ئیبن حەجەرەوە دەزانین صەحیحە کە دەڵێت: رای راستتر ئەوەیە حەکەم نزای مەرگی بۆ خۆی کردووە.

مەبەست بەوەی قورئان بە ئاواز دەگرن ئەوەیە کە خەڵکی بۆ بەرنوێژی کەسێ دەخەنە پێشەوە نەک لەبەر زیرەکی و شارەزاییەکەی، بەڵکو تەنها لەبەر دەنگ خۆشیەکەی.[5]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٧

[2] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٧٧.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٧.

[4] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٥٨٦٩، سكت عنه الذهبي.

[5] شرح صحيح البخاري لابن بطال، ط٢، مكتبة الرشد(الرياض – ٢٠٠٣م)، ج ١٠، ص ٢٧٦.

سەبارەت بە حوکمی داواکردنی مەرگ لە شەرحی ئەو فەرموودەدا کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (کەستان لەبەر خراپەو زیانێک کە تووشی دەبێت ئاوات بە مەرگ نەخوازێت) ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەم گوتارە بۆ هاوەڵان و موسڵمانانی دواتریشە، سەبارەت بەوەی فەرموویەتی لەبەر زیانێک داوای مەرگ نەکرێت دەستەیەک لە زانایانی پێشین پێیان وایە مەبەستی زیان و نارەحەتی دنیاییە، ئەگەرنا ئەگەر بینی زیانەکە بۆ ئاخیرەتی بوو و ترسا دینەکەی تووشی فیتنە بێت ئەوە رێگری نەکراوە لە داوای مەرگ، دەستەیەک لە هاوەڵانیش ئەوەیان کردووەو -لە ترسی زیانی ئاخیرەت- داوای مەرگیان کردووە، وەک لە مەوطائدا هاتووە عومەر داوای مەرگی کردووەو وتوویەتی خوایە تەمەنم زۆر بووەو توانام کەمی کردووەو هاولاتیانیشم بلاوبوونەتەوە، دەی بمبەرەوە بۆ لای خۆت،...سەبارەت بەوەش کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (ئەگەر هەرکامتان هەر ناچار بوو -ئاوات بە مەرگ بخوازێت- با بڵێت خوایە بممرێنە ئەگەر مەرگ خێرە بۆم).[1]

حەکەم چەند فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، لەوانەش:

حەکەم دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دوورەپەرێزی دەکرد لەوەی پیاو بە ئاوی زیادەی دەستنوێژی ئافرەت دەستنوێژ بگرێت.[2]

سەبارەت بە حوکمی ئەم فەرموودەیە مرادی دەڵێت: ئەم حوکمە تەعەببودیەو بە روانینی عەقڵی حیکمەتەکەی نەزانراوە، تەنها ئەوەیە دەقی لەسەر هاتووە، بۆ ئافرەتی تر رەوایە زیادەی ئاوی دەستنوێژی ئافرەتێکی تر بەکاربهێنێت.[3]

شەوکانی ئەو رایەی هێناوە کە هیچ کێشەیەک نیە ئەگەر ژن و پیاو پێکەوە خۆیان بشۆن و دەستنوێژ بگرن، کێشە نیە هەردووکیان پێکەوە

[1] فتح الباري، ج١٠، ص ١٢٨.

[2] سنن ابن ماجه - أبواب الطهارة وسننها - باب النهي عن ذلك، الرقم ٣٧٣، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٨٢.

[3] الموسوعة الفقهية الكويتية، ج٤٣، ص ٣٨٣.

بن، بەڵام ئەگەر ئافرەتێک بە تەنها دەستنوێژی گرت ئەوکات بۆ پیاوەکە نیە ئەو ئاوە بەکاربهێنێت، بۆ ئەمەش رای تری هێناوە کە برێ بەڵگە دەهێننەوە بۆ رەواییەکەی، لەبەرئەوەی بابەتەکەمان زیاتر پەیوەستە بە ژیاننامەی هاوەڵانەوە، بۆیە ناتوانین وردەکاری بابەتە فیقهیەکان بخەینە بەرباس و تەنها ئەوەی پێویستە بە کورتی دەیخەینەڕوو.

## ٩٧٨. حەکەمی کوڕی عەمری کوڕی موعتب(رضي الله عنه)

ناوی حەکەمی کوڕی عەمری کوڕی موعەتەبی کوڕی مالیکە، یەکێک بوو لە ئەندامانی وەفدی ثەقیف کە لەگەڵ عەبدیالیل هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[1]

## ٩٧٩. حەکەمی کوڕی عەمری ثەعلەبی(رضي الله عنه)

ناوی حەکەمی کوڕی عەمری ثەعلەبیە، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە فتووحاتدا رۆڵێکی کارای هەبوو، بەتایبەت لە گەمارۆدانی مەکران و شکاندنی پاشاکەیدا.[2]

حەکەمی کوڕی عەمر لە فەتحی مەکراندا سەرکردەی سوپای موسڵمانان بوو، هەریەک لە شیهابی کوڕی موخاریق و سوهەیلی کوڕی عەددی و عەبدوڵای کوڕی عەبدوڵاش هاتن بۆ یارمەتیدانی و لەگەڵ پاشای سندا جەنگان و خوای گەورە سوپای سندی روخاند و موسڵمانان دەستکەوتێکی زۆریان کەوتە دەست، ئینجا حەکەم نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفە و باسی فتووحاتەکەی بۆ کرد و لەگەڵ صیحاری عەبدیدا نامەکەو پێنج یەکی دەستکەوتەکانیشی نارد، کاتێک خەلیفە پرسیاری کرد لە نێردراوەکە سەبارەت بە سروشتی ناوچەی مەکران و زانی ناوچەیەکی سەختە، نامەی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٨.

[2] نفس المصدر.

نووسیەوە بۆ حەکەم و داوای لێکرد ئیتر هێرش نەبەنە سەر ناوچەکانی ترو لەو سنوورەدا بوەستن.[1]

## ٩٨٠. حەکەمی کوڕی کیسان(ﷺ)

ناوی حەکەمی کوڕی کیسانە، بوویە دیلی دەستی موسڵمانان و دواتر موسڵمان بوو و بە شەهیدی مرد.[2]

پێغەمبەر(ﷺ) سریەیەکی حەوت کەسی نارد و عەبدوڵای کوڕی جەحشی ئەسەدی کرد بە ئەمیریان، ئەوانیش بریتی بوون لە عەمماری کوڕی یاسر و ئەبوو حوذەیفە و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و عوتبەی کوڕی غەزوان و سوهەیلی کوڕی بەیضا و عامری کوڕی فوهەیرە و واقیدی کوڕی عەبدوڵای یەربووعی، نامەیەکی نووسی بۆ ئیبن جەحش و فەرمانی پێکرد تا نەگاتە ناوچەی مەلەل نامەکە نەخوێنێتەوە، کە گەیشتنە ئەوێ نامەکەی خوێندەوەو تیایدا نوسرابوو: بڕۆ تا دەگەیتە (بطن نخلة)، عەبدوڵا بە هاوڕێکانی وت: کامتان مەرگی دەوێت با بێت و وەسیەت بکات، چونکە من وا وەسیەتی خۆم دەکەم و دەچم فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بەجێدەگەیەنم، کەوتەڕێ و هەریەک لە سەعد و عوتبە لەبەرئەوەی وڵاخێکیان ون بووبوو دواکەوتن، بۆیە بەدوایدا دەگەڕان تا گەیشتنە بوحران، عەبدوڵاش کە چوویە (بطن نخلة) بینی خەڵکی لە دەوری حەکەمی کوڕی کیسان و عەبدوڵای کوڕی موغیرەو عەمری کوڕی حەضرەمیدان، جەنگ روویدا و تیایدا حەکەمی کوڕی کیسان و عەبدوڵای کوڕی موغیرەیان بەدیل گرت، کاتێک بە دیلەکانەوە گەڕانەوە بۆ مەدینەو دەستکەوتەکانیشیان هێنانەوە، خەڵکی مەککە ویستیان بە پارە دیلەکان ئازاد بکەن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (جارێ با بزانین هاوەڵەکانمان چییان کردووە)، مەبەستی ئەوەبوو بزانێت ئەو دوو هاوەڵە

[1] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٣١.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٩.

دەگەڕێنەوەو هیچیان پێ ناکرێت، ئەگەر گەڕانەوە ئەوکات دیلەکان بە فیدیە ئازاد دەکەن، کاتێک سەعد و هاوەڵەکەی گەڕانەوە، بێباوەڕەکان دەیانوت موحەممەد بانگەشەی ئەوە دەکات گوێڕایەڵی خوایە، کەچی یەکەم کەس بوو لە مانگە حەرامەکاندا شەڕی کرد و لە مانگی ڕەجەبدا هاوەڵەکەی ئێمەی کوشت، موسڵمانەکانیش دەیانوت بەڵکو لە مانگی جومادیدا یان لە کۆتا شەوی جومادیدا کوشتوومانە، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاند(یسألونک عن الشهر الحرام قتال فیه...)،[1] حەکەمی کوڕی کیسان موسڵمان بوو و بە ڕاستیش موسڵمان بوو و پاش ئەوەی پێغەمبەریش(ﷺ) ئازادی کردبوو کەچی نەگەڕایەوە بۆ مەککەو هەر لە مەدینە مایەوەو لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بوو تا لە ڕۆژی بیئر مەعووونەدا شەهید بوو.[2]

بەو جۆرە یەکەم دیلی دەستی موسڵمانان حەکەمی کوڕی کیسان و هاوەڵەکەی بوون،[3] حەکەم کە ڕەفتاری موسڵمانانی بینی موسڵمان بوو و ئامادە نەبوو بچێتەوە خاکی خۆی و ناو ماڵ و هۆزی خۆی و مانەوەی لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) هەڵبژارد و هێندەش ڕاستگۆ بوو لەو پێناوەدا کە دواجار گیانی خۆی لەو پێناوەدا بەخت کرد و شەهید بوو.

ئەمە تەنها بە باسکردن ئاسانە، ئەگەرنا موسڵمانان هێشتا ئازاری قامچیەکانی قورەیشیان لەبیر نەچووبوویەوە، هێشتا دەنگی بوختانەکانی قورەیش دژ بە پێغەمبەر(ﷺ) (درۆزن، شێت، فاڵچی، جادووگەر، شاعیر) لە گوێی هاوەڵاندا دەزرنگایەوە، هێشتا ئازاری بەردە گەرمەو گەورەکانی نیوەڕوانی سەر سنگی بیلال و هاوشێوەکانی لە دیدەی هاوەڵاندا ون نەبووبوو، هێشتا سووری خوێنی ڕژاوی سومەییە لەبەرچاوان بوو، هێشتا ئاوارەیی ئەو هەمووە موسڵمانەی چوون بەرەو حەبەشە لەبیر نەکرابوو، ئا

[1] تفسیر الطبري، ج٢، ص ٣٤٩.

[2] تاریخ المدینة لابن شبة، رقم الحدیث، ٧٧٠.

[3] البدایة والنهایة لابن کثیر، ج٣، ص ٢٥٠.

لەم کاتەدا دوو کەسی ناو ئەو ستەمکارانە کەوتنە بەردەستی موسڵمانان، کەچی نەک هەر ئەوەی نەیانکوشتن، بەڵکو هەڵسوکەوتێکیان لە روویاندا نواند کە وایکرد حەکەم موسڵمان بێت و ئامادە بێت نەچێتەوە خاکی خۆی و ناو ماڵ و هۆزی خۆی و مانەوەی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) هەڵبژارد، خۆ ئەوانەی ناحەزن بە ئیسلام ئەگەر سەد بەسەرهاتی لەم چەشنەش ببیستن و بخوێننەوە قەناعەتیان ناگۆڕێت، چونکە پەردە دراوە بەسەر دڵ و گوێیاندا.

## ٩٨١. حەکەمی کوڕی مەسعوود(رضي الله عنه)

ناوی حەکەمی کوڕی مەسعوودی کوڕی عەمری ثەقەفیە، برایەکی هەبوو بە ناوی ئەبوو عوبەید، هەریەک لە حەکەم و ئەبووعوبەید تا دوای سەردەمی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیان و لە جەنگی جسردا بەشدارییان کرد، حەکەم لەو جەنگەدا شەهید بوو.[١]

## ٩٨٢. حەکەمی کوڕی موسلیم(رضي الله عنه)

ناوی حەکەمی کوڕی موسلیمی عوقەیلیە، زانیاری لەبارەی ژیانیەوە نەهاتووە.[٢]

## ٩٨٣. حەکەمی کوڕی مینا(رضي الله عنه)

ناوی حەکەمەو سەبارەت بە ناوی باوکی راجیایی هەیە، رایەک دەڵێت: کوڕی مینهالەو رایەکی تریش دەڵێت: کوڕی مینایە،[٣] ئیبن حەجەر ئەو ئەگەرە دادەنێت کە دوو کەسایەتی جیاواز بن.[٤]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١٠.

[٢] نفس المصدر.

[٣] أسد الغابة، ج٢، ص ٥٥ – ٥٦.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١٠.

حەکەم دەڵێت: جارێک گوێم لێ بوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئا لێرەوە قورەیشم بۆ کۆبکەرەوە)، ئەویش چوو کۆی کردنەوەو دواتر وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) تۆ دەچیتە دەرەوە بۆ لایان یان ئەوان بێنە ژوورەوە؟ ئەویش فەرمووی: بەڵکو من دەچمە دەرەوە بۆ لایان، پێغەمبەر(ﷺ) چوویە دەرەوە بۆ لایان ...[1]

## ٩٨٤. حەکەمی ئەنصاری(رضي الله عنه)

ناوی حەکەمەو لە پشتیوانانە، زانیاری سەبارەت بە ژیانی نەهاتووە تەنها هێندە هاتووە حەکەم لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد.[2]

## ٩٨٥. حەکیمی کوڕی ئەشرەف(رضي الله عنه)

ناوی حەکیمی کوڕی ئەشرەفە، موقاتیلی کوڕی سولەیمان دەڵێت: ئەم ئایەتە سەبارەت بە حەکیم دابەزی (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ)، (ئەو پیاوانەی دەمردن لەئێوە و ژنانی هاوسەر بەجێ دەهێڵن (خوا فەرمانی کردووە) بە وەسیەت کردن بۆ ژنەکانیان تاساڵێک بەخێو بکرێن بێ ئەوەی دەربکرێن (لە ماڵی مێردیان) ئینجا ئەگەر خۆیان چوونە دەرەوە ئیتر هیچ گوناهتان لەسەر نی یە (ئەی کەس وکاری مێرد) لەوەی کە ئەو ژنانە دەیکەن دەربارەی خۆیان بەباشیی وەخوا زاڵی کار دروستە)، ئەم ئایەتە سەبارەت بە حەکیمی کوڕی ئەشرەف دابەزی کە لە مەدینە کۆچی دوایی کرد و دایک و باوک و دوو منداڵی خۆیشی مابوون، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) بە

[1] مسند أبي يعلى الموصلي - مسند العباس بن مرداس السلمي، الرقم ١٥٧٩.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١١.

دروستی میراتی دابەشکرد بەسەر دایک و باوکی و منداڵەکانیدا و هیچی نەدا بە ژنەکەی، بەڵام فەرمانی کرد خواردن و جل و بەرگی ژنەکەی بۆ وادەی دیاریکراو دابین بکرێت...ئەوەش پێش دابەزینی ئایەتی میرات بوو.[1]

## ٩٨٦. حەکیمی کوڕی ئومەییە(ﷺ)

ناوی حەکیمی کوڕی ئومەییەی کوڕی حارثەیە، حەکیم هەر لە سەردەمی نەفامیشدا ڕێگری دەکرد لە لاسارەکانی قورەیش و تەمبێی دەکردن، ئەمەش ڕەزامەندی قورەیشیەکانی لەسەر بوو.[2]

حەکیم کچێکی هەبوو بە ناوی خوەیلە کە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[3]

کوڕێکیشی هەبوو بە ناوی ئەوفا.[4]

حەکیم زۆر زوو موسڵمان بوو،[5] حەکیم ڕێگری لە هۆزەکەی دەکرد لەوەی دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ) بکەن و هۆشیاری پێدەدان کاری وا نەکەن.[6]

## ٩٨٧. حەکیمی کوڕی حارثی طائیفی(ﷺ)

ناوی حەکیمی کوڕی حارثی طائیفیە، ئیبن عەبباس دەڵێت: ئەوەی بە خۆی و ژن و منداڵیەوە کۆچی کرد بۆ مەدینەو لەوێ مرد و ئایەتی (والذين يتوفون منكم...)ی لەسەر دابەزی ئەم هاوەڵەیە،[7] بەڵام موقاتیل پێی وایە ئەو ئایەتە سەبارەت بە حەکیمی کوڕی ئەشرەف دابەزیوە.

[1] تفسير مقاتل بن سليمان، ط١، دار الكتب العلمية (بيروت-٢٠٠٣م)، ج١، ص ١٢٧.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١١.
[3] السير ةالنبوية لابن هشام، دار الجيل(بيروت – ١٤١١هـ)، ج٥، ص ١٥٦.
[4] سبل الهدى و الرشاد لمحمد بن يوسف الشامي، ج١١، ص ١٤١.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١١.
[6] السير ةالنبوية لابن هشام، دار الجيل(بيروت – ١٤١١هـ)، ج٢، ص ١٢٦.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١٢.

## ٩٨٨. حەكیمی كوڕی حیزام(رضي الله عنه)

ناوی حەكیمی كوڕی حیزامی كوڕی خوەیلیدی كوڕی ئەسەدی ئەسەدیە، برازای خەدیجەی دایكی باوەڕدارانە، واتە خەدیجە پووری حەكیمە، كونیەكەی حەكیم ئەبوو خالیدە.[١]

سەبارەت بە ناوی دایكی هەریەك لە ناوەكانی صەفیەو فاخیتەو زەینەب هاتون.[٢]

حەكیم كوڕێكی هەبوو بە ناوی عەبدولا كە لە فەتحی مەككەدا موسڵمان بوو و هاوەڵی پێغەمبەری خوای(ﷺ) كرد.،[٣] كوڕێكی تریشی ناوی هیشام بوو كە ئەویش لە فەتحی مەككەدا موسڵمان بوو و پێش باوكیشی وەفاتی كرد،[٤] كوڕێكی تری ناوی حیزام بوو كە بە ناوی باوكیەوە ناوی نابوو،[٥] كوڕێكی تریشی ناوی یەحیا بوو كە ئەویش لەگەڵ براكانی تری موسڵمان بوو،[٦] سەبارەت بە كچەكانیشی بریتی بوون لە ئومموسومەییەو ئوممو عەمر و ئوممو هیشام.[٧]

حەكیم برایەكی هەبوو بە ناوی خالید كە زۆر زوو موسڵمان بوو و لە كۆچی دووەمی حەبەشەدا یەكێك بوو لە كۆچەران، بەڵام لە ڕێدا مارێك گەستی و پێش ئەوەی بگاتە حەبەشە مرد.[٨]

ژنەكەی حەكیم ناوی ئوممو‌هیشام بوو، رایەكیش دەڵێت: ژنێكی ناوی ملیكەی كچی مالیك بووە.[٩]

---

[١] نفس المصدر.

[٢] نفس المصدر.

[٣] أسد الغابة، ج٣، ص ٢١٧.

[٤] أسد الغابة، ج٥، ص ٤١٤.

[٥] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٤٥.

[٦] أسد الغابة، ج٥، ص ٤٨٥.

[٧] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٤٥.

[٨] أسد الغابة، ج٢، ص ١١٣.

[٩] أسد الغابة، ج٥، ص ٤١٤.

حەکیم سیانزە ساڵ پێش ساڵی فیل لەدایک بووە، وەک خۆی دەڵێت: من سیانزە ساڵ پێش ساڵی فیل لەدایک بووم و عەقڵ و فامم هەبوو کاتێک عەبدولموتەلیب ویستی عەبدوڵای کوڕی سەرببڕێت، واتە پێنج ساڵ پێش لەدایکبوونی پێغەمبەر(ﷺ) لەدایک بووە.[١]

سەبارەت بە لەدایکبوونەکەی، حەکیمی کوڕی حیزام لە پەنا کەعبەدا لەدایک بوو، چونکە دایکی کە سکی پڕ بوو بە حەکیمەوە لەگەڵ بڕێ ئافرەتدا چوویە پەنا کەعبە، لەوێ ژان گرتی و حەکیم لە پاڵ کەعبەدا لەدایک بوو.[٢]

باوکی حەکیم لە جەنگی فوججاردا کوژرا، حەکیم خۆیشی لەو جەنگەدا بەشدار بوو.[٣]

حەکیمی کوڕی حیزام لە جەنگی بەدردا لە ناو سوپای بێباوەڕاندا بوو، بەڵام خوای گەورە رزگاری کرد، بۆیە دواتر هەرکات سوێندی قورسی بخواردایە دەیوت سوێند بەوەی رۆژی بەدر رزگاری کردم،[٤] بێباوەڕان لەو جەنگەدا هێندە ترس چووبوویە دڵیان هەندێک لە سەرکردەکان چووبوونە ناو چادرێک و چەند کەسێکیان ڕاسپاردبوو تا بیانپارێزن، یەکێک لەوانەی ناو چادرەکەش حەکیمی کوڕی حیزام بوو.[٥]

پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) سروشی بۆ دابەزێت، حەکیم هاوڕێیەکی نزیکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو و زۆر پێغەمبەری خوای خۆشدەویست، دوای دابەزینی سروشیش هەر پێغەمبەری خوای خۆشدەویست، بەڵام باوەڕی پێ نەهێنا تا لە فەتحی مەککەدا ئینجا موسڵمان بوو.[٦]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١٢.

[٢] أسد الغابة، ج٢، ص ٥٨.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١٢.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١٢.

[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ١١.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١٢.

جارێـک حەکیـم چوویـە بـازاڕی کۆیلەفرۆشـان و لـەوێ زەیـدی بینـی، ئەوەبوو زەیدی کڕی بۆ خەدیجەی پووری، خەدیجەش زەیدی کردە دیاری بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ).[1]

حەکیمی کوڕی حیزام بۆ بازرگانی کردن دەچوو بۆ دیمەشق،[2] ئەوەتا خۆی دەڵێت: من بازرگانیم دەکرد و دەچوومە یەمەن و دەهاتمەوە بۆ شام، جا لـەو بازرگانیـەدا قازانجێکی زۆرم دەست دەکـەوت و بـەوەش یارمەتـی هەژارانی ناو هۆزو کەس و کاری خۆمم دەدا. [3]

حەکیمی کوڕی حیزام دەڵێت: لـە سـەردەمی نەفامیدا خۆشەویستترین کـەس لام پێغەمبـەر(ﷺ) بـوو، جا کاتێـک بـوو بـە پێغەمبـەر و کۆچی کرد بۆ مەدینـە، حەکیم لـە گەشـتێکیدا چوویـە دەر، جلێکی جوانی (ذي یـزن)ی بینـی کـە بـە پەنجا درهـەم دەفرۆشـرا، حەکیـم کـڕی تـا بـە دیـاری بیبـات بـۆ پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) و بـردی بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ)، بـەڵام پێغەمبـەر(ﷺ) وەری نەگـرت و فەرمـووی: (ئێمـە هیـچ لـە بێبـاوەڕان وەرناگریـن، بـەڵام بـە پـارە دەمانەوێت)، ئەوەبـوو پێغەمبـەر(ﷺ) کـردە بـەری و بینیـم لەسـەر مینبـەر بـوو ئـەو جلـەی پۆشـیبوو، قـەت نەمدیبوو هێندەی ئـەو رۆژە جوان دەرکەوتبێـت، دواتـر پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەو جلـەی بـە ئوسـامەی کـوڕی زەیـد بەخشـی، حەکیـم کـە جلەکـەی لـە بـەری ئوسـامەدا بینـی، وتـی: ئوسـامە تـۆ جلـی وا دەپۆشـیت؟ ئەویـش وتـی: بەڵـێ، مـن زۆر چاکتـرم لـە (ذي یـزن) و بـاوک و دایکیشـم زۆر باشـترن لـە دایـک و باوکـی ئـەو، حەکیـم دەڵێت: تـەواو سەرسـامی ئـەو قسـەی ئوسـامە بووبـووم و بـەرەو مەککـە کەوتمـەوە رێ.[4]

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ٣٣٥.

[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٤٤.

[3] نفس المصدر، ج٣، ص ٤٧.

[4] المستدرک على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذكر مناقب حكيم بن حزام القرشي(ﷺ) - يد السائل أسفل الأيدي ، الرقم ٦١٠٤، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص.

کاتێک قوڕەیش هەواڵیان بیست پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو مەککە دێت، هەریەک لە ئەبووسوفیان و حەکیمی کوڕی حیزام و بودەیلی کوڕی وەرقا چوونە دەرەوە تا هەواڵێکی پێغەمبەر(ﷺ) وەربگرن، ئەوەبوو هاتن تا گەیشتنە مەڕروظهەران، لەوێ ئاگرێکی زۆر زۆریان بینی، ئەبوو سوفیان وتی: ئەمە چیە؟ ئەڵێیت ئاگری عەرەفەیە، بودەیل وتی: ئەبێت ئاگری بەنی عەمر بێت، ئەبوو سوفیان وتی: بەنی عەمر زۆر ژمارەیان لەوە کەمترە، لەو قسانەدا بوون کە برێ پاسەوانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانیان بینین و گرتنیان و بردنیان بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوەبوو ئەبووسوفیان موسڵمان بوو.[1]

دیارە حەکیم ئازاد کراوە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دواتر پەنای هەر کەسی دا کە بچێتە ماڵی حەکیمی کوڕی حیزام، یان ئەوەیە کە حەکیمیش ئەو شەوە موسڵمان بووە، ئەم رایەش راستترە، چونکە ئیبن ئەثیر ئەو رایەی هێناوە هەریەک لە بودەیل و عەبدوڵای کوڕی و حەکیمی کوڕی حیزام لە مەڕروظهەران موسڵمان بوون.[2]

ذەهەبیش گێڕانەوەیەکی هێناوە تەواو مەسەلەکە روون دەکاتەوەو دەڵێت: ئەبوو سوفیان و حەکیمی کوڕی حیزام و بودەیلی کوڕی وەرقا موسڵمان بوون و بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ) ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانی نارد بۆ لای خەڵکی مەککە تا بانگیان بکەن بۆ لای ئیسلام.[3]

کاتێک فەتحی مەککە کرا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد هەرکەس بچێتە ماڵی حەکیمی کوڕی حیزام ئەوە پارێزراوە، وەک فەرمووی: (من دخل دار حكيم بن حزام وكف يده فهو آمن)، (هەرکەس بچێتە ماڵی حەکیمی کوڕی حیزام و دەستی بگرێتەوە لە جەنگ ئەوە پارێزراو و پەنادراوە)، ماڵی حەکیمی کوڕی حیزامیش لە خوارووی مەککەوە بوو.[4]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب أين ركز النبي(ﷺ) الراية يوم الفتح، الرقم ٤٢٨٠.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٢٥٦.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٤٨.

[4] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٧٠٩٤، صححه الحافظ ابن حجر في الإصابة، ج٢، ص ١١٢.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) پێش ئەوەی فەتحی مەککە بکات فەرمووی: چوار کەس هەن لە قورەیش هیوام هەیە دوور بگرن لە شیرک و موسڵمان بن، عتابی کوڕی ئوسەید و جوبەیری کوڕی موطعیم و حەکیمی کوڕی حیزام و سوهەیلی کوڕی عەمر، ذەهەبی دەڵێت: دەی هەر چواریان موسڵمان بوون و بە چاکیش موسڵمان بوون.[1]

حەکیم یەکێک بوو لە دڵراگیر کراوان، دواتریش بەشداری کرد لە غەزای حونەیندا و پێغەمبەر(ﷺ) سەد وشتری لە دەستکەوتەکانی ئەو غەزایە بەخشی بە حەکیم.

موسڵمانبوونی حەکیم بە ساغ و دروستی بوو.[2]

حەکیم دەڵێت: جارێک داوای شتم کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش پێی بەخشیم، ئینجا هەمدی داوای هی ترم لێکرد و ئەویش پێی بەخشیم، بۆ جاری سێیەمیش لێم داواکرد و هەمتر پێی بەخشیم، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم (يا حكيم، إن هذا المال خضرة حلوة، فمن أخذه بسخاوة نفس بورك له فيه، ومن أخذه بإشراف نفس لم يبارك له فيه، كالذي يأكل ولا يشبع ، اليد العليا خير من اليد السفلى)، (ئەی حەکیم ئەم ماڵ و سامانە -سەوز-جوان و شیرینە، جا هەرکەس بە دەروونی سەخاوەتەوە-واتە بێ پاڕانەوەو فرت و فێڵ و بە پاکی دەستی بکەوێت- وەری بگرێت بەرەکەتی تێدەکەوێت بۆی، هەرکەسیش بە چاوچنۆکیەوە وەریگبرێت ئەوە بەرەکەتی تێناکەوێت بۆی، وەک ئەو کەسەی هەر دەخوات و تێر نابێت، دەستی باڵا چاکترە لە دەستی نزم)، حەکیم دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە دوای تۆ تا ڕۆژی مردنم داوا لە کەس ناکەم، ئەوەبوو کاتێک ئەبووبەکر بووبوو بە خەلیفە حەکیمی بانگ دەکرد تا مووچەو بەخششی پێبدات کەچی حەکیم ئامادە نەبوو وەریبگرێت، پاشانیش کە عومەر هات

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٤٧.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١٢.

بە هەمان شێوە، عومەر ئەیوت ئەی گرۆی موسڵمانان من ئێوە بە شاهید دەگرم بەرامبەر بە حەکیم، وا من مافەکەی خۆی دەخەمە بەردەستی و ئەویش ئامادە نیە وەریبگرێت، حەکیم بەڵێنەکەی خۆی بردە سەر.[1]

حەکیم دەڵێت: جارێک وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من لە سەردەمی نەفامیدا برێ خێرم دەکرد بە نیازی نزیکبوونەوەم لە خوا وەک بەخشین یان ئازادکردنی کۆیلە و پەیوەندی خزمایەتی، ئایا هیچ پاداشتێکم دەست دەکەوتێت لەوانەدا؟ ئەویش فەرمووی: (أسلمت على ما سلف من خير)،[2] (لەسەر ئەو چاکەی پێشووترتەوە موسڵمان بوویت) واتە چاکەی پێشووت بۆ هەیە، حەکیم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کارێ کە لە سەردەمی نەفامیدا کردوومە هەر دەبێت لە ئیسلامیشدا بیکەم، حەکیم لە سەردەمی نەفامیدا سەد کۆیلەی ئازاد کردبوو، سەد قوربانیشی کردبوو، بۆیە بە موسڵمانبوونیشی هەمان شتی دووبارە کردەوەو سەد کۆیلەی ئازاد کرد و سەد قوربانیشی کرد.[3]

حەکیمی کوڕی حیزام دوای سەردەمی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا.

کاتێک زوبەیری کوڕی عەووام مرد و قەرزێکی زۆری لەسەر بوو، عەبدوڵای کوڕی گەیشت بە حەکیم و سەبارەت بە قەرزی باوکی پرسیاری لێکرد، ئەویش وتی: قەرزی زۆری لەسەرە، ئینجا وتی: ئەگەر پێویستتان بە پارە بوو پێم بڵێن تا هاوکارتان بم،[4] ئاخۆ زوبەیر ئامۆزای حەکیم بوو.[5]

دەوترێت کاتێک عوثمانی کوڕی عەففان شەهید کرا، حەکیمی کوڕی حیزام نوێژی لەسەر کرد، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو جوبەیر نوێژی لەسەرکرد،[6] ئیبن سەعد دەڵێت: جوبەیر نوێژی لەسەر کرد و لە دوایەوە

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الوصايا - باب تأويل قول الله تعالى من بعد وصية يوصي بها أو دين، الرقم ٢٧٥٠.

[2] صحيح البخاري - كتاب الزكاة - باب من تصدق في الشرك ثم أسلم، الرقم ١٤٣٦.

[3] مستخرج أبي عوانة، الرقم ١٦١.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٠٩.

[5] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٤٤.

[6] أسد الغابة، ج٣، ص ٦١٦.

هەریەک لە حەکیم و ئەبوو جهم و نیاری ئەسلەمی و نائیلەی کچی فرافصە و ئوممولبەنین نوێژیان دەکرد،[1] حەکیم لە ئەسپەردەکردنی تەرمەکەشیدا بەشدار بوو،[2] هەندێک لەو هاوەڵانەی وتمان: چوونە ناو گۆڕەکەوەو حەکیم و ئوممولبەنینی ژنی عوثمانیش تەرمەکەیان دەدایە دەستیان و شۆڕیان دەکردەوە بۆ ناو گۆڕەکە.[3]

داروننەدوە دەبوو تەنها کەسانێک بچنە ناوی کە تەمەنیان لە چل ساڵ کەمتر نەبێت، کەچی حەکیمی کوڕی حیزام هێندە شارەزا و هەڵکەوتە بوو کە لە تەمەنی پانزە ساڵیەوە چوویە ناو داروننەدوەوە.[4]

لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیاندا حەکیم بە سەد هەزار درهەم داروننەدوەی فرۆشت بە موعاویە، چونکە هەر لە کۆنەوە داروننەدوە لە دەستی ئەودا بوو، جا عەبدوڵای کوڕی زوبەیر سەرکۆنەی کرد و وتی: بۆچی فرۆشتووتە؟ ئەویش وتی: برازا گیان من بەوە لە بەهەشتدا خانوویەک دەکڕم، ئەوەبوو هەموو پارەکەی کرد بە خێر.[5]

سەبارەت بە کاتی مردنی حەکیمی کوڕی حیزام راجیایی هەیە، رایەک دەڵێت: لە ساڵی پەنجای کۆچی مردووە، رایەکی تر دەڵێت: لە ساڵی پەنجاو چوار، یان لە ساڵی پەنجا و هەشت، یان لە ساڵی شەستی کۆچیدا مردووە، دەوترێت نزیکەی سەد و بیست ساڵ ژیاوە، نیوەی لە سەردەمی نەفامیدا و نیوەکەی تری لە سەردەمی ئیسلامدا بردووەتە سەر، وەک بوخاری دەڵێت: لە ساڵی شەستی کۆچی و لە تەمەنی سەد و بیست ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.[6]

ذەهەبی دەڵێت: بەڵکو تەنها چل و ئەوەندە ساڵ بە موسڵمانی ژیاوە.[7]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٧٨.
[2] أسد الغابة، ج٦، ص ٦٢.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٧٩.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٥٠.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١٢.
[6] نفس المصدر.
[7] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٤٥.

بەڵام ئەگەر ساڵی لەدایک بوونەکەی حساب بکەین، ئەوا پێنج ساڵ پێش لەدایکبوونی پێغەمبەر(ﷺ) لەدایک بووە، تەمەنی پێغەمبەریش(ﷺ) شەست و سێ ساڵ بووە، واتە لە کاتی وەفاتی پێغەمبەردا(ﷺ) تەمەنی نزیکەی شەست و هەشت ساڵ بووە، ئەگەریش لە ساڵی شەستی کۆچی وەفاتی کردبێت، واتە چل و نۆ ساڵ داوی وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) مردووە، واتە ئەو کات تەمەنی دەکاتە نزیکەی سەد و حەڤدە ساڵ، بۆیە یان دەبێت لەو تەمەنەدا مردبێت، یان دەبێت راستتر ئەوە بێت کە هەشت ساڵ پێش لەدایکبوونی پێغەمبەر(ﷺ) لەدایک بووبێت.

دەوترێت کاتێک حەکیم سەرە مەرگی هات دەیوت لا إله إلا الله، ئەی مردن من لە تۆ دەترسام، کەچی وا ئێستا ئاواتت پێ دەخوازم.[1]

حەکیمی کوڕی حیزام نزیکەی چل فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە چوار لەو فەرموودانە هەریەک لە ئیمامی بوخاری و موسلیم لە صەحیحەکانیاندا هێناویانن.[2]

حەکیمی کوڕی حیزام دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(أفضل الصدقة عن ظهر غنى، واليد العليا خير من اليد السفلى، وابدأ بمن تعول)**،[3] (چاکترین خێر ئەوەیە بە پەنهانی بێت، دەستی باڵایش باشترە لە دەستی نزم، هەروەها لە پێویستیەکانەوە دەست پێ بکە).

## ٩٨٩. حەکیمی کوڕی حەزن(رضي الله عنه)

ناوی حەکیمی کوڕی حەزنی کوڕی ئەبی وەهبە، دایکی ناوی فاطیمەی کچی سائیبی مەخزوومیە، مامی سەعیدی کوڕی موسەییبە،[4] ئەم هاوەڵە

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٥٠.

[2] نفس المصدر، ج٣، ص ٥١.

[3] صحيح البخاري – كتاب الزكاة – باب لا صدقة إلا عن ظهر غنى ، الرقم ١٤٢٧، صحيح مسلم – كتاب الزكاة – باب بيان أن اليد العليا خير من اليد السفلى، الرقم ١٠٣٤ واللفظ له.

[4] أسد الغابة، ج٢، ص ٦٠.

لە رۆژی فەتحی مەککەدا لەگەڵ دایک و باوکیدا موسڵمان بوو، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاو لە جەنگی یەمامەدا بەشداری کرد و لەو جەنگەدا شەهید بوو.[1]

## ٩٩٠. حەکیمی کوڕی طەلیق(رضي الله عنه)

ناوی حەکیمی کوڕی طەلیقی کوڕی سوفیانی ئومەویە، ئەم هاوەڵە پاش فەتحی مەککە موسڵمان بوو و یەکێک بوو لە دڵراگیراوان، پێغەمبەر(ﷺ) لە دەستکەوتەکانی غەزادا سەد وشتری پێ بەخشی.[2]

## ٩٩١. حەکیمی کوڕی عامر(رضي الله عنه)

ناوی حەکیمی کوڕی عامری عەبدی موحارییبیە، یەکێک بوو لە ئەندامانی وەفدی عەبدولقەیس کە هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).

## ٩٩٢. حەلیمەتو سەعدیە(رضي الله عنها)

ئەم ئافرەتە ناوی حەلیمەتوسەعدیەیەو دایەن و شیردەری پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، کچی عەبدوڵای کوڕی حارثە کە ناسراوە بە ئەبی ذوئەیب.[3]

حەلیمە کچێکی هەبوو بە ناوی شەیماء کە خوشکی شیریی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو.[4]

حەلیمە دەڵێت: لەگەڵ برێ ئافرەتی بەنی سەعد بن بەکر چوومە دەرەوە تا بچین منداڵانی مەککە وەرگرین بۆ شیرپێدان، ئەمەش لە ساڵێکی قات و قڕی و وشکەساڵیدا بوو، مێردەکەمشم لەگەڵم بوو، هیچ شیریشمان پێ نەبوو، منداڵێکیشم هەبوو کە لە تاو نەبوونی شیری پێویست لە مەمکەکانمدا

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١٣.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١٤.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٤.

[4] أسد الغابة، ج٧، ص ٥٤.

گریانی شەوی نەیدەهێشت بخەوم، کە هاتینە مەککە چی ئافرەت لەگەڵم بوو پێشنیازی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بۆ کرا و کەسیان ئامادە نەبوون وەریبگرن، چونکە هەموان هیوامان وابوو باوکی منداڵەکە بەخششمان بکات، بەڵام ئەو هەتیو بوو و دەمانوت دەبێت دایکێک چی بکات بە منداڵە هەتیوەکەی و چی پێ بکرێت بۆی، بەڵام چی ژنم لەگەڵ بوو هەرکامیان منداڵێکیان برد، منیش پێم ناخۆش بوو بە دەستی بەتاڵەوە بگەڕێمەوە، بۆیە بە مێردەکەم وت: بەخوا دەگەڕێمەوەو ئەو منداڵە هەتیوە وەردەگرم، بۆیە چووم و وەرمگرت، مێردەکەم وتی: هەر هێنات؟ وتم: ئەرێ وەڵڵا هێنام چونکە هیچی ترم دەست نەکەوت،

ئەویش وتی: باشت کرد، بەڵکو خوا بیکاتە مایەی خێر، حەلیمە دەڵێت: سوێند بەخوا هەرکە خستمە کۆشم مەمکەکانم پڕ بوون لە شیر و تێر شیری خواردەوەو براکەشی-واتە برا شیریەکەی- تێر شیر بوو، شەو مێردەکەم چوو سەرێکی دا لە وشترە پیرەکەمان، دەبینێت شیری هەیە، ئەوەبو چەندە ویستمان شیرمان لێ دۆشی و تێر شیرم خواردەوەو ئەو شەوە بە تێری و بێ برسێتی و تینوێتی خەوتین، منداڵەکەشمان خەوت،

ئەوە بوو مێردەکەم وتی: ئەی حەلیمە بەخوا وادەزانم وەچەیەکی پیرۆزت تووش بووە، وا منداڵەکەمان خەوت و تێر شیریش بوو، حەلیمە دەڵێت: ئینجا دەرچووین و گوێدرێژەکەم پێش هەموو کاروانەکە کەوت، ئەوانیش دەیانوت ماڵوێران چاوەڕێمان بکە، پێمان بڵێ ئەمە هەمان گوێدرێژەکەت نیە کە پێی هاتیت؟ منیش دەموت بەرێ وەڵڵا، پاشان چوینە رووتەنترین زەوی، سوێند بەخوا ئەوان کە بەیانییان دەکردەوە مەڕوماڵاتیان دەبردە دەرەوەو مەڕو ماڵاتەکەی منیش دەردەچوو و بە پڕشیری دەگەڕانەوەو ئەوانەی ئەوانیش بە برسێتی و بێ شیر دەگەڕانەوە، ئێمەش تێر لەو شیرەمان دەخواردەوە، کەچی هیچکام لەوانی تر دڵۆپێک شیریشیان دەست

نەدەکەوت، بۆیە بە شوانەکانیان دەوت بۆچی مەڕومالاتەکان نابەنە لای مالاتەکەی حەلیمە، کەچی هەمان مالاتیان دەبردە لای مالاتەکەی حەلیمە، بەلام هەر بێ شیری دەگەڕایەوە بۆ لایان، کەچی ئەوەی من بە پڕ شیری دەگەڕایەوە،

پێغەمبەر(ﷺ) خێرا گەورە دەبوو، کە ساڵ تەواو بوو و بردمانەوە بۆ لای دایکی من و مێردەکەم بە دایکیمان وت: ئەم منداڵەمان بدەرەوە لا چونکە دەترسین دەرد و نەخۆشیەکانی مەککەی تووش بێت، بەلام مەبەستمان ئەو بەرەکەتە بوو کە لێی بەدیمان کردبوو، هێندە داوامان لێکرد تا وتی: باشە، ئەوەبوو بردمانەوە لەگەڵ خۆمان، دوو مانگ لامان مایەوە،

جارێ لە پشت ماڵەوە لەگەڵ براکەی خەریکی یاری کردن بوون و بڕێ مەڕیان دەلەوەڕاند بۆمان، بینیمان براکەی بە ترسەوە هاتەوە و بە من و مێردەکەمی وت: فریای برا قورەیشیەکەم بکەون، دوو پیاو هاتن بۆ لای و رایانکێشا و سکیان هەڵدڕی، ئێمەش بە پەلە چووین بۆ لای دەبینین بە پێوە وەستاوەو رەنگی زەرد بووە، خێرا گرتمانە کۆش، وتمان: کوڕی شیرینم چی بووە؟ ئەویش وتی: دوو پیاوی جل سپی هاتن بۆ لام و رایانکێشام و سکیان هەڵدڕیم، سوێند بەخوا نەمزانی چییان کرد،

حەلیمە دەڵێت: ترساین و بردمانەوە ماڵەوە، مێردەکەم وتی: ئەی حەلیمە وادەزانم ئەم منداڵە حاڵی باش نیە، وەرە با بیبەینەوە بۆ لای کەس و کاری پێش ئەوەی ئەو شتەی لێی دەترسین لێی دەرکەوێت، ئەوەبوو بردمانەوە بۆ لای دایکی، دایکی وتی: بۆچی هێناتانەوە، خۆ ئێوە زۆر سوور بوون لەسەر ئەوەی بیبەن لەگەڵ خۆتان؟ ئێمەش وتمان: نا بەخوا ئێمە گرتمانە خۆ و ئەرکی خۆمان بەجێگەیاند و دواتر ترساین تووشی شتێک بێت، بۆیە وتمان: با لای دایکی بێت باشترە، دایکی وتی: بەخوا مەسەلەکە ئەوە نیە، راستیەکەیم پێ بڵێن، ئیتر هێندەی پێ وتین تا ئێمەش مەسەلەکەمان بۆ باس کرد،

دایکی وتی: ئیتر ئێوەش ترسان؟! نا بەخوا ئەم کوڕەم شان و شکۆیەکی هەیە، مەگەر پێم نەوتون کە هیچ سکێکم هێندەی ئەم سکەم کە موحەممەدم هەڵگرت ئاسان نەبووە، هیچ سکێکم هێندە ئاسان و بە بەرەکەت نەبووە، خەوم بینی کاتێک لە بەرم دامنا رووناکیەکم لێدەرچوو کە گەردنی وشتری لە بوصرا رووناک کردەوە، ئینجا موحەممەدم بوو، لەدایکبوونەکەی وەک لەدایک بوونی منداڵان نەبوو، دەستی لەسەر زەوی دانا و سەرەی رووەو ئاسمان بوو، داینێن و بڕۆن بەدەم ئیشی خۆتانەوە.[1]

سەبارەت بە مەسەلەی شەقکردنی سنگی پێغەمبەر(ﷺ) کە هاتووە لە شەوی ئیسرائدا روویداوەو لە هەردوو صەحیحدا هاتووە، شێخی ئەلبانی دەڵێت: هیچ نەیاری و نەگونجانێک نیە بۆ ئەوەی ئەو رووداوە دوو جار رویدابێت، جارێک کە منداڵ بووەو جارێکیش لە شەوی ئیسرائدا بووە تا ئامادە بێت بۆ چوونە مەلەئولئەعلا و دواندنی پەروەردگار و وەستان لە لەبەردەمیدا.[2]

حەلیمە دەڵێت: ئامینەی دایکی بۆی باس کردبووین کە چۆن لە سکی گرتووەو چۆن لەدایک بووە، ئێمەش لە رێدا بووین کە بڕێ جوولەکەمان بینی، منیش بۆم باسکردن کە لەدایکبوونی چۆن بووە، یەکێکیان وتی: با بیکوژین، ئینجا وتیان ئەم منداڵە هەتیوە؟ منیش وتم: نا ئەوە باوکیەتی و منیش دایکی ئەوم، ئەوانیش وتیان ئەگەر هەتیو بوایە بە دڵنیاییەوە دەمانکوشت، ئەوەبوو چوون، حەلیمەش وتی: خۆ خەریک بوو سپاردەکەم لەناو بەرم.[3]

حەلیمە پێش ئەوەی دایەنی پێغەمبەر(ﷺ) بکات و شیردەری بێت، شیری دا بە حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ) و دوای ئەوەش شیری دا بە ئەبوو

---

[1] صحيح ابن حبان - كتاب التاريخ - باب من صفته(ﷺ) وأخباره - ذكر شق جبريل عليه السلام صدر المصطفى(ﷺ) في صباه، الرقم ٦٣٣٥، قال شعيب الأرناؤوط في سنده إنقطاع.

[2] صحيح السيرة النبوية للألباني، ١٩/١.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ١١٣.

سەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزوومی.[1]

پاش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککە خەدیجەی بەهاوسەر گرت، حەلیمە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و سکاڵای وشکەساڵی و خراپی باری ناوچەکەی خۆیانی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) لەو بارەوە خەدیجەی خێزانی دواند، خەدیجەش چل مەڕی بەخشی بە حەلیمە.[2]

لە سەردەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) حەلیمە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) لەبەری هەستا و عەباکەی سەر شانی خۆی بۆ راخست و حەلیمەش لەسەری دانیشت.[3]

ئەبووطوفەیل دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە جەعرانە بوو و گۆشتی دابەش دەکرد، منیش ئەوکات مێرمنداڵێک بووم و پارچەیەک لە گۆشتی وشترم پێ بوو، هێندەم بینی ئافرەتێکی دەشتەکی هات، کە نزیک بوویەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) عەباکەی خۆی بۆ راخست و ئەویش لەسەری دانیشت، منیش پرسیارم کرد وتم: ئەو ئافرەتە کێیە؟ وتیان ئەوە ئەو دایکەیەتی کە شیری پێدا.[4]

## ٩٩٣. حەمامە(ﷺ)

یەکێک بووە لەو کەنیزەکانەی کە کرابوو بۆ خزمەت، کاتێک موسڵمان بوو خاوەنە قورەیشیەکەی لەبەر موسڵمانبوونەکەی سزای زۆری دەدا، ئەوەبوو ئەبووبەکری صدیق حەمامەی کڕیەوەو لەپێناو خوادا ئازادی کرد.[5]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ١٠٨.

[2] نفس المصدر.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٤.

[4] سنن أبي داود - كتاب الأدب - أبواب النوم - باب في بر الوالدين ، الرقم ٥١٤٤، صحيح ابن حبان - كتاب الرضاع - ذكر ما يستحب للمرء إكرام من أرضعته في صباه ، الرقم ٤٢٣٢، ضعفه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٥١٤٤.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٥.

## ٩٩٤. حەمامەی ئەنصاری(رضي الله عنها)

ناوی حەمامەیە و لە پشتیوانانە، ئافرەتێکی تازەپێگەیشتوو بوو و لە ماڵی پێغەمبەردا(ﷺ) گۆرانی دەوت.[١]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: ئەبووبەکر هاتە ژوورەوە بۆ لام و دوو کچۆڵەم لا بوون کە دەفیان لێدەدا، پێغەمبەریش(ﷺ) بە جلەکانی خۆی داپۆشیبوو، ئەبووبەکر هەڵشاخی پیایاندا، پێغەمبەر(ﷺ) جلەکانی لەسەر دەموچاوی لابرد و فەرمووی: (دعهما يا أبابكر فإنها أيام عيد وتلك الأيام أيام منى)،[٢] (وازیان لێ بێنە ئەی ئەبووبەکر، چونکە ئەم ڕۆژانە ڕۆژانی جەژنن و ڕۆانیی مینان).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە عائیشە دەڵێت: گۆرانییان دەوت و دەفیان لێدەدا.[٣]

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەو دوو کیژۆڵەش بریتی بوون لە حەمامەو زەینەب.[٤]

## ٩٩٥. حەمەلی کوڕی سەعدانە(رضي الله عنه)

ناوی حەمەلی کوڕی سەعدانەی کوڕی حارثەی کەلبیە، لە خەڵکی دەومەتەلجەندەل بوو.[٥]

هەریەک لە حارثەی کوڕی قەطەن و حەمەلی کوڕی سەعدانە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمان بوون، جا پێغەمبەر(ﷺ) ئاڵایەکی دایە دەست حەمەل، ئیتر حەمەل ئەو ئاڵایەی لای خۆی هێشتەوە، حەمەل دوای سەردەمی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاو لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلیددا

---

[١] نفس المصدر.

[٢] صحيح البخاري - كتاب العيدين - باب إذا فاته العيد يصلي ركعتين وكذلك النساء، الرقم ٩٨٧.

[٣] صحيح البخاري - كتاب المناقب - باب قصة الحبش وقول النبي(ﷺ) يا بني أرفدة، الرقم ٣٥٢٩.

[٤] فتح الباري، ج٩، ص ٢٢٦.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢٤.

بەشداری جیهاد و جەنگەکانی کرد، دواتریش تا سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو تالیب و لە ناوی سوپای موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیاندا بوو و ئەو ئاڵایەی بەدەستەوە بوو.[1]

## ٩٩٦. حەمەلی کوڕی مالیک(ﷺ)

ناوی حەمەلی کوڕی مالیکی کوڕی نابیغەی کوڕی جابیرە، دواتر لە بەصرە نیشتەجێ بوو و لەوێ خانوویەکی درووست کرد،[2] کونیەکەی ئەبوو نەضلەیە.[3]

ئەبوو هورەیرە دەڵێت: جارێک دوو ئافرەت جەنگیان بوو و یەکێکیان بەردێکی فڕێ دا بۆ ئەوی تر و ژنەکەو کۆرپەکەی ناو سکیشی کوشت، ئینجا سکاڵا هێنرایە لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش حوکمی لەو بارەوە دا،[4] جا لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا عومەر داوای لە خەڵک کرد کێ زانیاری هەیە لە بارەی کوشتنی کۆرپەی ناو سکەوە، حەمەل هەستاو ئەم فەرموودەیەی وەک ئەبووهورەیرە گێڕایەوەو وتی: من لای دوو ئافرەت بووم کە جەنگان و یەکێکیان دای لەوی تریان و ژنەکەو کۆرپەکەی سکیشی کوشت، پێغەمبەر(ﷺ) حوکمی دا ژنەکە بکوژرێتەوەو لە بری کۆرپەکەش کۆیلە یان کەنیزەکێک بدرێت.[5]

جا ئەو دوو ژنەی جەنگیان کرد هەردووکیان ژنی حەمەل خۆی بوون، یەکێکیان ناوی مولەیکە بوو و ئەوی تریش ناوی ئوممو عەفیف بوو،[6] ئوممو

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢٤.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢٤.
[3] أسد الغابة، ج٢، ص ٧٤.
[4] صحيح مسلم - كتاب القسامة والمحاربين والقصاص والديات - باب دية الجنين ووجوب الدية في قتل الخطأ وشبه العمد على عاقلة الجاني، الرقم ١٦٨١.
[5] مسند أحمد بن حنبل - مسند بني هاشم(ﷺ) - مسند عبد الله بن العباس بن عبد المطلب(ﷺ) عن النبي(ﷺ) ، الرقم ٣٥٠٧، سنن ابن ماجه - أبواب الديات - باب دية الجنين ، الرقم ٢٦٤١، صححه شعيب الأرناؤوط.
[6] مشكل الآثار للطحاوي، الرقم ٣٨٩١.

عەفیف بە دارێک دای لە مولەیکەو کوشتی،[1] حەمەل هات بۆ لای باوکی ژنە بکوژەکەو وتی: خوێن بایی ژنەکەم و منداڵەکەمم دەوێت، باوکیشی وتی: منداڵەکانی خوێن باییەکەی ئەدەن، سکاڵا برایە لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: (خوێن بایی لەسەر کەسوکارە و بۆ کۆرپەلەش کۆیلە یان کەنیزەکێک دەدرێت).[2]

نەوەوی لە شەرحی ئەو فەرموودەدا دەڵێت: ئەو دارەی ئەو ژنە بەکاری هێناوە بۆ لێدانی ئەوی تریان زیاتر بە مەبەستی کوشتن بەکارنایەت، چونکە دارێکی گەورە نەبووە، بۆیە کوشتنەکە نیمچە ئەنقەست بووە.[3]

## ٩٩٧. حەمزەی کوڕی حومەییر(رضي الله عنه)

ناوی حەمزەی کوڕی حومەییرە، لە پشتیوانانە، ئیبن ئیسحاق دەڵێت: ناوی خاریجەی کوڕی حومەییرە، ئیبن حەجەر دەڵێت: لەوانەیە حەمزەو خاریجە برای یەک بن.[4]

## ٩٩٨. حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیب(رضي الله عنه)

ناوی حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیبی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدمەنافە، مامی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، هەروەها برای شیری پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، گەورەی شەهیدانە،[5] پێشەوای پاڵەوان و شێری خوا حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ) کونیەکەی ئەبوو عومارە و ئەبوو یەعلاشە، لە قورەیشیەکانە لە هاشمیەکان.[6]

---

[1] فتح الباري، ج١٠، ص ٢١٨.

[2] السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٥٢٣٧.

[3] شرح النووي على صحيح مسلم، ج١، ص ١٧٧.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢١.

[5] أسد الغابة، ج٢، ص ٦٦.

[6] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٧٢.

دایکی ناوی هالەی کچی ئوهەیبە.[1]

سەبارەت بە برایەتی شیری حەمزە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە کە ثوەیبەی مەولای ئەبوو لەهەب شیری داوە بە حەمزەو پێغەمبەریش(ﷺ)،[2]رایەکیش دەڵێت: حەلیمەتوسەعدیە شیری داوە بە هەردووکیان، حەلیمە پێش ئەوەی دایەنی پێغەمبەر(ﷺ) بکات و شیردەری بێت، شیری داوە بە حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ) و دوای ئەوەش شیری داوە بە ئەبوو سەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزوومی.[3]

خوشکێکی هەبوو بە ناوی عاتیکە کە پووری پێغەمبەریش(ﷺ) بوو و سەبارەت بە موسڵمانبوونی راجیایی هەیە.[4]

خوشکێکی تری ناوی صەفییە بوو کە باوەڕی هێنا بە پێغەمبەر(ﷺ) و لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتتابدا وەفاتی کرد، صەفییە مەرگی حەمزەی برای بینی و زۆر لەسەری سەخت بوو.[5]

خوشکێکی تری ناوی ئەروا بوو و سەبارەت بە موسڵمان بوونی ئەمیش راجیایی هەیە.[6]

خوشکێکی تری ناوی عاتیکە بوو[7] کە دووبارە سەبارەت بە موسڵمانبوونی ئەمیش راجیایی هەیە، چونکە تەنها یەکدەنگی لەسەر ئەوە هەیە کە صەفییە موسڵمان بووە.[8]

خوشکێکی تریشی ناوی ئوممومحەکیم بوو کە نەگەیشتە سەردەمی

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٨

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢١.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ١٠٨.

[4] أسد الغابة، ج٧، ص ٢٠١.

[5] أسد الغابة، ج٧، ص ١٨٧.

[6] أسد الغابة، ج٧، ص ١٠.

[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٢٧٢.

[8] أسد الغابة، ج٧، ص ١٠

پێغەمبەر(ﷺ) و وەفاتی کرد.[1]

خوشکێکی تریشی ناوی بەرِرە بوو کە ئەمیش نەگەیشتە سەردەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ).[2]

خوشکێکی تریشی ناوی ئومەیمە بوو کە دایکی زەینەبی دایکی باوەڕداران بوو.[3]

برایەکی هەبوو بە ناوی حارث کە پێش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد،[4] برایەکی تریشی ناوی زوبەیر بوو،[5] منداڵەکانی ئەم دوو برایە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوون.

برایەکی تری هەبوو بە ناوی عەبباس کە هەواڵگری پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە مەککە[6]و دواتر لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بوونی خۆی ئاشکرا کرد.

حەمزە دوو ساڵ پێش لەدایکبوونی پێغەمبەر(ﷺ) لەدایک بوو.[7]

حەمزە ژنێکی هەبوو بە ناوی خەولەی کچی قەیس کە لە پشتیوانەکان بوو.[8]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی عومارە کە کونیەی حەمزە بەم کوڕەیەوە بوو، کوڕێکی تریشی ناوی یەعلا بوو.[9]

حەمزە کچێکی هەبوو بە ناوی ئومامە کە پێغەمبەر(ﷺ) داوتر دایە لای جەعفەری مامی تا لای ئەو بمێنێتەوەو دواتر پێغەمبەر(ﷺ) مارەی کرد لە سەلەمەی کوڕی ئومموسەلەمە.[10]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٢٧٣.

[2] نفس المصدر.

[3] نفس المصدر.

[4] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٩٩.

[5] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٨١.

[6] صحيح ابن حبان - كتاب السير - باب في الخلافة والإمارة - ذكر ما يستحب للإمام بذل عرضه لرعيته إذا كان في ذلك صلاح أحوالهم في الدين والدنيا، الرقم ٤٥٣٠.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢٢.

[8] أسد الغابة، ج٧، ص ١٠٧.

[9] أسد الغابة، ج٤، ص ١٤٨.

[10] أسد الغابة، ج٧، ص ٢٤.

کچێکی تری هەبوو بە ناوی فاطیمە کە پێغەمبەر(ﷺ) جار جارە شتی بۆ دەنارد.[1]

ئیبن عەبباس دەڵێت: بە پێغەمبەر(ﷺ) وترا بۆچی کچەکەی حەمزە بە هاوسەر ناگریت؟ ئەویش فەرمووی: (ئەو کچی برای شیریمە)[2] واتە حەمزە برای شیری پێغەمبەر(ﷺ) بوو.

**موسڵمان بوونی:**

حەمزە لە ساڵی دووەمی پێغەمبەرایەتیدا موسڵمان بوو.[3]

جارێک ئەبووجەهل لای صەفا ڕێی گرت بە پێغەمبەر(ﷺ) و ئازاری دا و قسەی پێ وت، پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی نەدایەوە، خزمەتکارێکی عەبدوڵای کوڕی جودعانیش لە سەروو صەفاوە لە شوێنی خۆی بوو گوێی لەوە بوو، ئینجا چوو و چوویە ناو کۆڕی قورەیشیەکان لای کەعبەو لەگەڵیان دانیشت، هێندەی نەبرد حەمزە بە کەوانەکەیەوە لە ڕاوەوە هاتەوە، ئەوکات حەمزە هێشتا بێباوەڕ بوو، ئافرەتە خزمەتکارەکە چوو بۆ لای حەمزە، ئەوکات پێغەمبەر(ﷺ) هەستابوو تا بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، ئافرەتەکە بە حەمزەی وت: ئای ئەگەر ئەتبینی ئەبولحەکەم تۆزێ لەمەوبەر چی کرد بە موحەممەدی برازات، ئازاری دا و قسەی پێ وت، ئینجا چوو تا چوویە کۆڕی قورەیش لای کەعبەو لەگەڵیان دانیشت و قسەی لەگەڵ موحەممەد نەکرد، حەمزە تووڕەیی دایگرت و بێ ئەوەی لای هیچ کەس ڕابوەستێت چوو تا تەوافێکی کەعبە بکات و هیوادار بوو ئەبوو جەهل ببینێت، کە چوویە مزگەوت بینی ئەبووجەهل لەناو خەڵکەکەدا دانیشتووە، خێرا چوو بۆی و کە گەیشتە لای بە کەوانەکەی توند دای بەسەر سەری ئەبووجەهلدا، چەند کەسێ لە بەنی مەخزووم هەستان تا بەرگری لێبکەن، وتیان ئەی حەمزە

---

[1] أسد الغابة، ج٧، ص ٢٣٧.

[2] صحيح البخاري - كتاب النكاح - باب وأمهاتكم اللاتي أرضعنكم ويحرم من الرضاعة ما يحرم من النسب، الرقم ٥١٠٠.

[3] أسد الغابة، ج٢، ص ٦٦.

هەرچی سەیر دەکەین تۆیش لە ئایین هەڵگەڕاویتەتەوە، حەمزەش وتی: جا کێ و چی شتێ هەیە ڕێگرم بێت، بەڵێ، من شایەتی دەدەم موحەممەد نێردراوی خوایە و ئەوەی دەیڵێت حەقە، سوێند بەخوا دەست هەڵناگرم، دەی ئەگەر ڕاست دەکەن ڕێگریم لێ بکەن، ئەبوو جەهلیش وتی: واز بهێنن لە ئەبوو عومارە من زۆر بە ناشیرینی قسەم وتووە بە برازاکەی، بەوە ئازاری قوەریشیش بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) کەمی کرد.[1]

کاتێک حەمزە موسڵمان بوو ئیتر قورەیشیەکان زانییان حەمزە بەرگری لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکات، بۆیە دەستیان هەڵگرت لە هەندێ لەو ئازاردانەی کە ئەنجامیان دەدا.[2]

**ژیانی حەمزە لە مەدینە:**

ئینجا حەمزە کۆچی کرد بۆ مەدینەو لەوێ مایەوە.[3]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، برایەتی خستە نێوان زەیدی کوڕی حارثەو حەمزەوە.[4]

یەکەم سریە کە پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بە سەرکردایەتی حەمزە بوو، ئەوەش لە مانگی ڕەمەزان و پاش حەوت مانگ بوو لە کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە، پێغەمبەر(ﷺ) ئالایەکی سپی دایە دەستی و سی کەس لە هاوەڵە کۆچەریەکانی لەگەڵ نارد، حەمزە دەیویست ڕێ بگرێت بەو کاروانەی قوڕەیش کە لە شامەوە بەرەو مەککە دەهاتەوە، کە گەیشتنە سەیفولبەحر هەردوو لا بەیەکگەیشتن، بەڵام مەجدی کوڕی عەمری جوهەنی کە هاوپەیمانی هەردوو لا بوو، کەوتە نێوانیان و نەیهێشت جەنگ ڕووبدات، بۆیە ئەبووجەهل و هاوەڵانی بەرەو مەککەو حەمزەو هاوەڵانیشی بەرەو مەدینە گەڕانەوە.[5]

[1] المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذكر مناقب سعد بن مالك بن خالد كنيته أبو سهل(ﷺ) - ذكر إسلام حمزة بن عبد المطلب وحمايته لرسول الله عند إيذاء أبي جهل، الرقم ٤٩٠٦.

[2] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٧٢.

[3] أسد الغابة، ج٢، ص ٦٧.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢٢.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٦.

هەروەها لە غەزای ئەبوائیشدا کە لە مانگی صەفەر روویدا و پاش دوانزە مانگ لە کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، حەمزەش تیایدا بەشداری کرد و ئاڵاکەی بە دەستەوە بوو، ئەوانەی تیایدا بەشدار بوون هەموویان لە کۆچەران بوون، ماوەی پانزە شەو لە مەدینە دەرچوون و جەنگ رووی نەداو پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان گەڕانەوە بۆ مەدینە.[1]

هەروەها لە غەزای ذیلعشیرەدا کە لە مانگی جومادیلئاخیرەی ساڵی دووەم و پاش شانزە مانگ لە کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) روویدا، حەمزە بەشداری کرد و ئاڵاکەی بەدەستەوە بوو، ئاڵاکەش ئاڵایەکی سپی بوو، سەد و پەنجا کەس یان دوو سەد کەس لە کۆچەران بە ویستی خۆیان بەشدار بوون تیایداو بڕیار بوو رێ بگرن بە کاروانێکی قورەیشیەکان کە بەرەو شام دەچوو، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان گەیشتنە ذەلعشیرە لە نێوان یەنبوع و مەدینەدا، زانییان کاروانەکە چەند رۆژێک پێشتر چووە.[2]

**بەشداری لە جەنگی بەدردا:**

حەمزە لە جەنگی بەدردا بەشداری کرد و رۆڵێکی گەورەی تێدا بینی.[3]

حەمزە کە لە جەنگدا بەشداری دەکرد بڕێ مووی نەعامەی پێوە بوو.،[4] لە جەنگی بەدریشدا ئەوەی پێوە بوو.[5]

سەرەتای جەنگەکە جەنگی زۆرانبازی بوو، واتە کەسێک بەرامبەر بە کەسێک، ئەوەبوو شەیبەو عوتبەی کوڕانی رەبیعەو وەلیدی کوڕی عوتبە لە بێباوەڕان هاتنە پێشەوەو داوای جەنگی بەرامبەرییان کرد، ئەوەبوو سێ لە هاوەڵانی پشتیوانان هاتنە پێشەوە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) حەزی نەدەکرد لە جەنگی یەکەمدا پشتیوانان لە پێشەوە بن، بۆیە داوای کرد بگەڕێنەوەو نزای

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٨.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٩.

[3] أسد الغابة، ج٢، ص ٦٧.

[4] أسد الغابة، ج٢، ص ٦٨.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٠.

خێری کرد بۆیان، قورەیشیەکان وتیان ئەی موحەممەد کەسانی شیاو لە خزمانمان بنێرە بۆمان، ئەوەبوو پێغەمبەریش(ﷺ) داوای کرد لە کۆچەران تا بچنە پێشەوە، حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیب و عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و عوبەیدەی کوڕی حارث چوونە پێشەوە، عوتبە وتی: قسە بکەن تا بتانناسینەوە، حەمزە وتی: من حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیبم، شێری خوا و پێغەمبەرەکەی، عوتبەش وتی: هاوبەرامبەرێکی چاک و رێزدار، منیش شێری هاوپەیمانانم، ئەی ئەو دوانە کێن لەگەڵت؟ ئەویش وتی: عەلی و عوبەیدە، هەمان وەسفی ئەوانیشی کرد، ئینجا بە وەلیدی کوڕی وت: هەستە، بەرامبەر بە عەلی وەستا، جەنگان و هێندەی نەبرد عەل وەلیدی کوشت، ئینجا حەمزە عوتبەی کوشت، ئینجا شەیبە بەرامبەر بە عوبەیدە وەستا، عوبەیدەش بە تەمەنترینی هاوەڵانی ئەو جەنگە بوو، شەیبە دای لە پێی عوبەیدەو قاچی بڕی، خێرا حەمزە و عەلی چوون بۆ شەیبەو کوشتیان.[1]

یەکێک لەو بێباوەڕانەی لە جەنگی بەدردا کوژرا سوفیانی کوڕی عەبدولئەسەد بوو کە بە دەستی حەمزە کوژرا،[2] هەروەها هەریەک لە شیبەی کوڕی رەبیعەو طوعەیمەی کوڕی عەددی کوشت.[3]

هەروەها حەمزە لە غەزای بەنی قەینووقاعدا بەشداری کرد و ئاڵاهەڵگری ئەو غەزایە بوو، ئاڵاکەشی ئاڵایەکی سپی بوو، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) لە مانگی شەوال و پاش بیست مانگ لە کۆچی بۆ مەدینە و پاش غەزای بەدر گەمارۆی ئەم جوولەکانەی دا، ئەمەش لەبەر ناپاکیەک کە نواندیان، ترسێکی گەورە نیشتە دڵی ئەم جوولەکانەو ناچار بوون ملکەچی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بن و سامانەیان جێبهێڵن و بە خۆیان و ژن و مناڵیانەوە مەدینە جێبهێڵن.[4]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٧.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧٥.

[3] نفس المصدر، ج٢، ص ١٢٢.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٢٩.

**بەشداری لە جەنگی ئوحوددا:**

لە جەنگی ئوحوددا حەمزە لە بەردەم پێغەمبەردا(ﷺ) بوو و بە دوو شمشێرەوە دەجەنگا و دەیوت من شێری خوام،[1] دەچووە پێش پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پشت پێغەمبەر(ﷺ) و دەجەنگا،[2] خوای گەورە لەسەر دەستی حەمزە سی و یەک بێباوەڕی لەناو برد.[3]

کۆیلەیەک بە ناوی وەحشی حەمزەی شەهید کرد،[4] وەحشی دەڵێت: من لای جوبەیری کوڕی موطعیم بووم، جا جوبەیر لە غەزای بەدردا مامی کوژرابوو، پێی وتم: ئەگەر مامی موحەممەد بکوژیت ئەوە ئازادت دەکەم، ئەوەبوو لە رۆژی جەنگی ئوحوددا منیش چووم بۆ جەنگ، سیباع وتی: کەس هەیە جەنگی بەرامبەریم لەگەڵ بکات؟ حەمزە هات بۆی و قسەیەکی ناشیرینی وت: بە سیباع و وتی: ئایا دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا دەکەیت؟ ئینجا هەڵیکوتایە سەری،[5] تاکە خەم و خەیاڵم ئەوە بوو ئازاد ببم، بۆیە چاوم لەسەر حەمزە بوو،[6] لە پشت بەردێکەوە خۆم بۆ مەڵاس دا تا دەرفەتی چاکم دەست کەوت و بە رمەکەم لێمدا و دام لە ورگی،[7] حەمزە هەوڵیدەدا هەستێتەوە بەڵام نەیتوانی و کەوت، منیش گەڕامەوە بۆ مەککەو ئازاد کرام، ئینجا کە فەتحی مەککە کرا منیش چووم بۆ طائیف و لەوێ مامەوە، کاتێک خەڵکی مەککە رێککەوتنیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کرد

---

[1] المستدرک على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذكر مناقب سعد بن مالك بن خالد كنيته أبو سهل(ﷺ) - ذكر مناقب عم رسول الله(ﷺ) وأخيه من الرضاعة ، الرقم ٤٩٠٣، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص.

[2] مصنف ابن أبي شيبة - كتاب المغازي - هذا ما حفظ أبو بكر في أحد وما جاء فيها، الرقم ٣٧٩٠٥.

[3] مسند الشاميين للطبراني، ما انتهى إلينا من مسند بشر بن العلاء أخي عبد الله ما انتهى إلينا من مسند بحير بن سعد - خالد عن عبد الله بن أبي بلال، الرقم ١١٤٧.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٤٢.

[5] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب قتل حمزة بن عبد المطلب(ﷺ)، الرقم ٤٠٧٢.

[6] المعجم الكبير للطبراني - باب الحاء - باب من اسمه حمزة - حمزة بن عبد المطلب بن عبد مناف - واستشهد حمزة(ﷺ) يوم أحد، الرقم ٢٩٤٧.

[7] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب قتل حمزة بن عبد المطلب(ﷺ)، الرقم ٤٠٧٢.

بارم سەخت بوو و دەموت باشە مل بۆ کوێ بنێم؟ لەو خەمەدا بووم کە کەسێک منی بینی و وتی: چیە وا خەمبار دەتبینم؟ منیش وتم: وەڵا من مامی موحەممەدم کوشتووەو وا دەبینم ئەم خەڵکەش لەگەڵی ڕێککەوتون و نازانم بەرەو کوێ ڕاکەم؟ ئەویش وتی: بەخاو هەرکەس بچێت بۆ لای و شایەتومان بهێنێت ئەو نایکوژێت، منیش خێرا چوومە مەدینەو چوومە بەردەمی و بە پێوە وەستابووم و ئەویش دانیشتبوو، سەری بەرز کردەوەو فەرمووی: تۆ وەحشیت؟ وتم: بەڵێ، ئینجا شایەتومانم هێنا،[1] فەرمووی: تۆ حەمزەت کوشت؟ وتم: مەسەلەکە وایە کە بیستووتە؟[2] ئینجا فەرمووی: ئادەی بۆم باس بکە چۆن حەمزەت کوشت ماڵ وێران؟ منیش بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە،[3] پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (فهل تستطيع أن تغيب عني وجهك)، ( دەی ئەتوانیت دەموچاوتم لێ دوور بگریت)، منیش خۆم دوور دەگرت لە پێغەمبەر(ﷺ) تا وەفاتی کرد، ئینجا کە سەردەمی ئەبووبەکر هات و سوپای نارد بۆ یەمامە، منیش وتم: ئەچم تا موسەیلەمە بکوژم بەوە حەقی کوشتنەکەی حەمزە بکەمەوە،[4] لەگەڵ خەڵکەکە چووم و موسەیلەمەم کردە چاو،[5]بینیم کەسێک لای کەلەبەرێکی دیوارێک وەستاوەو دەڵێیت وشترە ڕەشەیەکی پرچ بڵاوە،[6] لەگەڵ یەکێک لە پشتیوانان هەڵمانکوتایە سەری و بە هەمان ئەو ڕمەی کە حەمزەم پێ کوشتبوو دام لە موسەیلەمە،[7] ڕمەکەم

---

[1] مسند أبي داود الطيالسي - وحشي بن حرب، الرقم ١٤١٢، السنن الكبرى للبيهقي - كتاب السير - جماع أبواب السير - باب الكافر الحربي يقتل مسلما ثم يسلم لم يكن عليه قود، الرقم ١٨٢٥٨.

[2] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب قتل حمزة بن عبد المطلب(ﷺ)، الرقم ٤٠٧٢.

[3] مسند أبي داود الطيالسي - وحشي بن حرب، الرقم ١٤١٢، السنن الكبرى للبيهقي - كتاب السير - جماع أبواب السير - باب الكافر الحربي يقتل مسلما ثم يسلم لم يكن عليه قود، الرقم ١٨٢٥٨.

[4] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب قتل حمزة بن عبد المطلب(ﷺ)، الرقم ٤٠٧٢.

[5] مسند أبي داود الطيالسي - وحشي بن حرب، الرقم ١٤١٢، السنن الكبرى للبيهقي - كتاب السير - جماع أبواب السير - باب الكافر الحربي يقتل مسلما ثم يسلم لم يكن عليه قود، الرقم ١٨٢٥٨.

[6] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب قتل حمزة بن عبد المطلب(ﷺ)، الرقم ٤٠٧٢.

[7] مسند أبي داود الطيالسي - وحشي بن حرب، الرقم ١٤١٢، السنن الكبرى للبيهقي - كتاب السير - جماع أبواب السير - باب الكافر الحربي يقتل مسلما ثم يسلم لم يكن عليه قود، الرقم ١٨٢٥٨.

دا لە نێوەندی مەمکەکانی و لە پشتەوە رمەکە دەرچوو، پشتیوانیەکەش بە شمشێر لێیداو دای لە سەری،[1] ئیتر خوا زاناترە کاممان کوشتمان، ئەگەر من کوشتبێتم ئەوە چاکترین کەس و خراپترین کەسیشم کوشتون[2](واتە حەمزەو موسەیلەمە).

وەحشی کاتێک لە جەنگی ئوحوددا تەرمەکەی حەمزەی بینی چوو بە رمێک یان بە خەنجەرێک سکی حەمزەی هەڵدڕی،[3] ئینجا جەرگی حەمزەی هەڵگرت و بردی بۆ هیند، چونکە ئەو ئافرەتە هەر لە کاتی کوژرانی باوکیەوە لە جەنگی بەدردا بە دەستی حەمزە نەزری کردبوو جەرگی حەمزەی دەست بکەوێت.،[4] ئەوەبوو کە جەرگەکە کەوتە دەست هیند، هیند جەرگەکەی جوی و دواتر تفیەوە، ئینجا هاتە لای تەرمەکەی حەمزەو تەرمەکەی زیاتر شێواند.[5]

کوژرانەکەی حەمزەش لە رۆژی شەممەو لە نیوەی مانگی شەوالدا بوو.[6]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) چوویە سەر تەرمەکەی حەمزەو بینی چی لێهاتووە و چۆن تەرمەکەی شێوێنراوە، فەرمووی: (لولا أن تجد صفية في نفسها لتركته حتى تأكله العافية حتى يحشر من بطونها)،[7] (ئەگەر دڵی صەفیە بەرگەی بگرتایەو پێی دڵتەنگ نەبوایە بە دڵنیاییەوە تەرمەکەیم وا جێدەهێشت تا گۆشت خۆرەکان بیانخواردایە تا لە رۆژی دواییدا لەناو سکی ئەواندا حەشر بکرایە)، ئەوەبوو لە نەمیرەیەکدا[8] کفنی کرد، هێندە کەم بوو کە کاتێک سەری پێ

---

[1] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب قتل حمزة بن عبد المطلب(ﷺ)، الرقم ٤٠٧٢.

[2] مسند أبي داود الطيالسي - وحشي بن حرب، الرقم ١٤١٢، السنن الكبرى للبيهقي - كتاب السير - جماع أبواب السير - باب الكافر الحربي يقتل مسلما ثم يسلم لم يكن عليه قود، الرقم ١٨٢٥٨.

[3] مصنف إبن أبي شيبة، الرقم ٣٦٠٦٦.

[4] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٧٩.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٠.

[6] أسد الغابة، ج٢، ص ٦٨.

[7] سنن أبي داود - كتاب الجنائز - باب في الشهيد يغسل، الرقم ٣١٣٦.

[8] جۆرێک پۆشاکی ئەو سەردەمە بوو.

دادەپۆشی قاچەکانی دەردەکەوتن و کاتێکیش قاچەکانی دادەپۆشی سەری دەردەکەوت،[1] ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (مُدُّوهَا عَلَى رَأْسِهِ وَاجْعَلُوا عَلَى رِجْلَيْهِ الْحَرْمَلَ)، (سەری داپۆشن و قاچەکانیشی بە گوژاڵک داپۆشن)، ئەو رۆژە جل و بەرگ کەم بوو و کوژراویش زۆر بوو، بۆیە کەس و دوو کەس و سێ کەس لە یەک بەرگدا کفن دەکران.[2]

پێغەمبەر(ﷺ) کە تەرمی حەمزەی بینی وا شێوێنرا بوو، فەرمووی: (ئەگەر سەرکەوم بەسەر قورەیشدا بە دڵنیاییەوە تەرمی سی دانەیان دەشێوێنم)،[3] هاوەڵانیش کە بینییان پێغەمبەر(ﷺ) چەندە دڵگرانە، دەیانوت ئەگەر سەرکەوین بەسەریاندا وا تەرمیان دەشێوێنین هیچ عەرەبێک شتی وای نەکردبێت،[4] لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە (لَئِنْ ظَفِرْتُ بِهِمْ لَأُمَثِّلَنَّ بِسَبْعِينَ رَجُلاً مِنْهُمْ)،[5] (ئەگەر سەربکەوم بەسەریاندا بە دڵنیاییەوە تەرمی حەفتا دانەیان دەشێوێنم) ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە (وإن عاقبتم فعاقبوا بمثل ما عوقبتم به).[6]

صەفییەی خوشکی حەمزە گەیشت بە عەلی و زوبەیر و هەواڵی حەمزەی پرسی لێیان، ئەوانیش وایان نیشاندا کە هەواڵی نازانن، صەفییە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: (من دەترسم صەفیە عەقڵی لەدەست بدات) بۆیە دەستی خستە سەر سنگی صەفییە و نزای بۆ کرد و داوای کرد بگەڕێتەوە، صەفییەش دەگریا.[7]

[1] المستدرک علی الصحیحین – کتاب الجنائز – ذکر شهادة حمزة والصلاة علیه، الرقم ١٣٥٥، قال الذهبي صحیح علی شرط مسلم، صححه الألباني.

[2] مصنف ابن أبي شيبة – كتاب المغازي – هذا ما حفظ أبو بكر في أحد وما جاء فيها ، الرقم ٣٧٩٠٨، صححه الألباني.

[3] المعجم الكبير للطبراني – باب العين – من اسمه عبد الله – أحاديث عبد الله بن العباس بن عبد المطلب – وما أسند عبد الله بن عباس(ﷺ) – مجاهد عن ابن عباس، الرقم ١١٠٥١.

[4] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١١٦٣.

[5] شرح معاني الآثار – كتاب الجنايات – باب الرجل يقتل رجلا كيف يقتل، الرقم ٥٠٢٣.

[6] المعجم الكبير للطبراني – باب العين – من اسمه عبد الله – أحاديث عبد الله بن العباس بن عبد المطلب – وما أسند عبد الله بن عباس(ﷺ) – مجاهد عن ابن عباس، الرقم ١١٠٥١.

[7] المستدرک علی الصحیحین، الرقم ٤٨٤٨، قال الذهبي سمعه أبوبكر بن عياش من يزيد و هما ليسا بمعتمدين.

صەفییە کە هات دوو جلی حەمزەی پێ بوو، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) صەفییەی بینی حەزی نەکرد صەفییە حەمزە بەو شێوازە ببینێت، بۆیە زوبەیری نارد تا رێ نەدات حەمزە ببینێت، کاتێک زوبەیر گەیشتە لای صەفییە وتی: دایە گیان راوەستە، ئەویش وتی: لەسەر رێم لاچۆ، کاتێک بینی صەفییە واز ناهێنێت وتی: پێغەمبەر(ﷺ) منی نارد بۆ لات، صەفییە کە ئەوەی بیست خێرا وەستا و دوو جلەکەی گرتە دەست و جلێکیان بۆ کفنی حەمزە بوو و ئەوی تریشیان بۆ کفنی پشتیوانییەک بوو.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) نازناوی شێری خوا و گەورەی شەهیدانی بەهەشتیشی لێناوە.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (سيد الشهداء حمزة بن عبدالمطلب و رجل قام إلى إمام جائر فأمره و نهاه فقتله)،[2] (گەورەی شەهیدان حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیبە، هەروەها پیاوێک کە بچێتە لای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار و فەرمان بە چاکەو رێگری لە خراپەی لێ بکات و دەسەڵاتدارەکەش ئەو پیاوە بکوژێت).

سەبارەت بەوەی ئایا نوێژی لەسەر کراوە، هەرچەندە برێ دەق هاتووە کە حەمزە نوێژی لەسەر کراوەو لەلایەن هاوەڵانەوە حەفتا جار نوێژی لەسەر کراوە، بەڵام بە پێی گێڕانەوەی صەحیح کە لە بوخاریدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) بە هەموو شەهیدانی ئوحودی فەرموو (أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هَؤُلَاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)، (من لە رۆژی دواییدا شایەتم بۆ ئەمانە) بۆیە فەرمانی کرد بە خوێنەکەیانەوە ئەسپەردە بکرێن و نەشۆردرێن و نوێژیشیان لەسەر نەکرا.[3]

هەریەک لە حەمزەو عەبدوڵای خوشکەزای (عەبدوڵای کوڕی جەحش) لە یەک گۆڕدا ئەسپەردە کران.[4]

---

[1] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١١٧٠.

[2] المستدرک على الصحيحين – كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) – ذكر مناقب سعد بن مالک بن خالد كنيته أبو سهل(ﷺ) – من قام إلى إمام جائر للحق فقتله فهو سيد الشهداء ، الرقم ٤٩١٢، ضعفه الذهبي في سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٧٣، صححه الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٣٧٤.

[3] صحيح البخاري – كتاب الجنائز – باب الصلاة على الشهيد، الرقم ١٣٤٣.

[4] أسد الغابة، ج٢، ص ٧٠.

هەریەک لە ئەبووبەکر و عومەر و عەلی و زوبەیر دابەزینە ناو گۆڕەکەو پێغەمبەریش(ﷺ) لە لێواری گۆڕەکەدا دانیشتبوو.[1]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە غەزای ئوحود گەڕایەوە گوێی لێبوو ئافرەتانی بەنی عەبدولئەشهەل بۆ کوژراوەکانیان دەگریان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵام حەمزە کەس نیە بۆی بگری)، ئەوەبوو ئافرەتانی پشتیوانان هاتن و دەگریان بۆ حەمزە، پێغەمبەر(ﷺ) کە لەخەو هەستا، هەستایە سەرپێ و فەرمووی: (وَيحَهُنَّ ! مَا انْقَلَبْنَ بَعْدُ؟ مُرُوهُنَّ فَلْيَنْقَلِبْنَ وَلاَ يبكِينَ عَلَى هَالِكٍ بَعْدَ الْيَوْمِ)،[2] (قوڕیان بەسەر، هێشتا نەگەڕاونەتەوە؟ بڕۆن بڵێن با بگەڕێنەوەو لەمڕۆ بەدواوە بەسەر هیچ مردوویەکدا نەگرین).

پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو (لما أصيب إخوانكم بأحد، جعل الله أرواحهم في جوف طير خضر، ترد أنهار الجنة، تأكل من ثمارها، وتأوي إلى قناديل من ذهب معلقة في ظل العرش، فلما وجدوا طيب مأكلهم ومشربهم ومقيلهم، قالوا من يبلغ إخواننا أنا أحياء في الجنة نرزق، لئلا يزهدوا في الجهاد ولا ينكلوا عن الحرب؟ فقال الله تبارك وتعالى: أنا أبلغهم عنكم، وأنزل الله ولا تحسبن الذين قتلوا في سبيل الله أمواتا)،[3] (کاتێک براکانتان لە ئوحود کوژران، خوای گەورە رۆحی ئەوانی خستە ناو سکی باڵندەی سەوزەوە، دەیانبەنە لای رووبارەکانی بەهەشت و لەوێ لە بەرهەمەکانی بەهەشت دەخۆن و دەگەڕێنەوە بۆ لای چرای زێڕینی هەڵواسراو لە سێبەری عەرشدا، کاتێک خۆشی خواردن و خواردنەوەو شوێنی حەوانەوەیان بەدیکرد وتیان کێ هەواڵ بدات بە براکانمان کە ئێمە لە بەهەشتداین و زیندووین و رۆزی دەدرێین، تا ئەوانیش دوور نەگرن لە جیهاد و لە جەنگ نەترسن، خوای گەورە فەرمووی: من

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٠.

[2] سنن ابن ماجه - أبواب الجنائز - باب ما جاء في البكاء على الميت ، الرقم ١٥٩١، قال الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٥٩١ حسن صحيح.

[3] سنن أبي داود - كتاب الجهاد - باب في فضل الشهادة ، الرقم ٢٥١٦، المستدرك على الصحيحين - كتاب الجهاد - شأن نزول آية ولا تحسبن الذين قتلوا في سبيل الله أمواتا ، الرقم ٢٤٥٨، قال الذهبي صحيح على شرط مسلم، حسنه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب، الرقم ١٣٧٨.

ئەوە دەگەیەنم، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاند (وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ، فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِمْ مِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ، يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُؤْمِنِينَ)، (هەرگیز وا گومان مەبەن ئەوانەی کە کوژران لە ڕێ ی خوادا مردوون (نەخێر وانیە) بەڵکو ئەوانە زیندوون لای پەروەردگاریان ڕۆزی دەدرێن، شادمان و دڵخۆشن بەوەی کە خوا پێ ی بەخشیوون لە بەهرە و فەزڵی خۆی شادمانن بەوانەی (برا تێکۆشەرەکانیان) کە هێشتا نەگەیشتوون پێیان لەدوای (شەهیدبوونی) ئەمان نەهیچ ترسێکیان لەسەرە و نە ئەوانە هیچ غەم و خەفەتێک دەخۆن، شادمان و دڵخۆشن بەو بەهرەو زیادە فەزڵەی لە لایەن خواوە (پێیان دراوە) وە بەڕاستی خوا پاداشتی بڕواداران ون ناکات)).

ئەبی مەرثەد فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە حەمزە بۆی گێڕاوەتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (الزموا هذا الدعاء اللهم إني أسئلك باسمك الأعظم و رضوانك الأكبر)،[1] (بەردەوام ئەم نزایە بکەن، خوایە من داوات لێ دەکەم بە ناوی گەورەو بالآت و بە ڕەزامەندی گەورەو بالآت).

لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیاندا موعاویە فەرمانی کرد کانیاوێک رابکێشرێت، ئەوانەی ئیشەکەیان دەکرد نامەیان نووسی بۆ موعاویە کە هەر دەبێت ئەو جۆگەیە بەناو گۆڕستانی ئوحوددا بڕوات، ئەویش نامەی نووسی بۆیان گۆڕەکان هەڵدەنەوە، جابیر دەڵێت: تەرمی شەهیدەکانم دەدی بەسەر شانی ئەو خەڵکەوە بوون دەتوت خەوتون، پاچێک بەر قاچی حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیب کەوت، خوێن لە قاچی هات.[2]

[1] المعجم الكبير للطبراني - باب الحاء - باب من اسمه حمزة - حمزة بن عبد المطلب بن عبد مناف - ما أسند حمزة بن عبد المطلب(ﷺ) ، الرقم ٢٩٥٩، ضعفه الألباني في ضعيف الجامع الصغير و زيادته ، الرقم ١١٥٩.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١١.

دوای مردنی منداڵەکانی حەمزە هیچ وەچەیەک لە حەمزە نەمایەوە،[1] بۆیە هەرکەس خۆی بباتەوە سەر ڕەچەڵەکی حەمزە ڕاست ناکات.

**پەندو وانە**

گوێڕایەڵی بۆ حەق لە ئاست تەمەندا واتایەکی نیە، ئەگەرچی موحەممەد(ﷺ) برازای حەمزە بوو، هەروەها دوو ساڵ لەو بچووکتریش بوو، دیارە دەزانین لە کۆمەڵگە مرۆییەکاندا بە گشتی و کۆمەڵگەی کۆنی عەرەبیدا بە تایبەت مەسەلەی ڕێز و لەپێشتربوونی مام و تەمەن چەند گرنگ بووە، بەڵام حەمزە گوێڕایەڵی تەواوی هەبوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و لە ژێر فەرمان و بڕیاری ئەودا دەجووڵایەوە، جا ئەم نموونەش لەمرۆدا دوور نیە، دەکرێت منداڵێک لە باوکی زاناتر و لەپێشتر بێت، وەک چۆن پێغەمبەر ئیبراهیم بە باوکی فەرموو باوکە گیان من زانستێکم بۆ هاتووە کە بۆ تۆ نەهاتووە، دەی شوێنم بکەوە تا ڕێی ڕاستت نیشان بدەم، بەڵام خۆبەزلزانی ئازەر نەیهێشت شوێن کوڕەکەی بکەوێت، خۆ هەر هەمان خۆبەزلزانی لای ئەبوو جەهل و چەندینی تر هەبوو، بەڵام حەمزە پارێزراو بوو لەو گومڕاییەو شوێن باوکی کەوت، ئەمە سیفەتی دیاری ناو هاوەڵان بووە، بزانن ئەبووبەکر و عومەر و چەندین گەورە هاوەڵی تر بۆ بەجێگەیاندنی فەرمانی خوا چوونە ژێر فەرمانی گەنجێکی نزیک بە هەژدە ساڵ (ئوسامەی کوڕی زەید) تا جەنگی گەورەترین ئیمپراتۆریەتی ئەو سەردەمە بکەن، ئەوەتا حەمزەش تا ئەو ساتەی گیانی سپارد لە ڕێی ڕێبازی خوادا لەژێر فەرمانی برازاکەیدا بوو و ئاڵای سوپاکەی بۆ هەڵدەگرت، خۆی دەچواند بە شێری پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە گوێڕایەڵی تەواوی بۆ بڕیارو فەرمانەکانی خوای گەورە هاوەڵانی فێر کرد کە ئەوانیش لە فەرمانی خوا دەرنەچن، ئەوەتا هەرچەندە زۆر تامەزرۆیە تا تۆڵەی حەمزە بکاتەوەو بە شەهیدبوونی

[1] أسد الغابة، ج٥، ص ٥٤٣.

حەمزە زۆر دڵگران بوو، کەچی کاتێک وەحشی بکوژی حەمزە موسڵمان دەبێت و بەپێی بڕیاری خوا ڕژانی خوێنی حەرام دەبێت، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) توورەیی خۆی وەلا دەنێت و هەموو هەنگاوێکی بەرامبەر بە بکوژی مامی و یەکێک لە سەرکردە گەورەکانی ناو سوپا و دەوڵەتەکەی تەنها ئەوەیە داوای لێدەکات دەتوانیت دەموچاوتم لێ دوور بگریت؟ ئەویش نەک بە فەرمان و واجب بوون، بەڵکو وەک داواکاری پێی فەرمووە، چونکە لە دەستەواژەکەدا هاتووە (دەی ئایا دەتوانیت دەموچاوتم لێ دوور بگریت)، بەڵێ لە ئاست فەرمانی خوادا ویست و نیازە شەخسیەکان هیچ بەهایەکیان نیە، ئەوەش پێغەمبەر(ﷺ) کینەی دڵی خۆی دەخواتەوە وەک خوای گەورە لە سیفەتی باوەڕداراندا دەفەرموێت (والكاظمين الغيظ و العافين عن الناس).

## ٩٩٩. حەمظلی کوڕی شەریق(ﷺ)

ناوی حەمظلی کوڕی شەریقی کوڕی غانیمی کوڕی عامیری قورەیشی عەدویە، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە فتووحاتی ئیسلامیدا بەشداری کرد، دواتریش بە نەخۆشی تاعوون کۆچی دوایی کرد.[١]

## ١٠٠٠. حەمنەی کچی جەحش(ﷺ)

ناوی حەمنەی کچی جەحشی کوڕی ڕیابی کوڕی یەعمەری ئەسەدیە، خوشکی زەینەبی کچی جەحشی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) و دایکی باوەڕدارانە، دایکی ناوی ئومەیمەی کچی عەبدولموطەلیبە کە پووری پێغەمبەری خوایە(ﷺ)،[٢] ئومەیمەی دایکی حەمنە تا سەردەمی خەیبەر مایەوەو پێغەمبەر(ﷺ) لە خەیبەردا چل کوڵ خورمای پێدا.[٣]

[١] أسد الغابة، ج٢، ص ٧٤.
[٢] أسد الغابة، ج٧، ص ٧٨.
[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٤٥.

برایەکیشی هەبوو بە ناوی عەبدوڵای کوڕی جەحش کە پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بچێتە ماڵی ئەرقەمەوە موسڵمان بوو و بەشداری هەردوو کۆچی حەبەشەی کرد.[1]

برایەکی تری ناوی عەبد بوو کە بە ئەبوو ئەحمەد ناسرابوو، ئەویش لە کۆچەرانی حەبەشە بوو و دواتر هاتە مەدینەو هاوەڵی نزیکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو.[2]

هەریەک لە حەمنەو عەبدوڵای برای و هەردوو براکەی تریان ئەبوو ئەحمەد و عوبەیدوڵا و زەینەبی خوشکیان کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، ئەوەبو لەوێ مێردەکەی زەینەب بوو بە مەسیحی و لەوێش بە مەسیحیەتی مرد.[3]

حەمنە سەرەتا ژنی موصعەبی کوڕی عومەیر بوو، ئەوەبوو لە جەنگی ئوحوددا موصعەب شەهید بوو.[4]

حەمنە دەڵێت: -لە جەنگی ئوحوددا- پێم وترا براکەت کوژرا، وتم: إنا لله وإنا إليه راجعون، وتیان مێردەکەشت کوژرا، وتم: ئای چەند بەداخ و خەفەتە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إن للزوج من المرأة لشعبة ما هي لشيء)،[5] (ئافرەت هاوخۆبوونێکی هەیە بۆ پیاو کە بۆ کەسی تر نیەتی)، پێغەمبەر(ﷺ) بە حەمنەی فەرموو بۆچی وات وت: بۆ موصعەبی مێردت؟ ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئاخۆ هەتیوکەوتنی منداڵەکەیم هاتەبەرچاو.[6]

حەمنە لە موصعەب کچێکی هەبوو بە ناوی زەینەب.[7]

---

[1] أسد الغابة، ج٣، ص ١٩٥.

[2] أسد الغابة، ج٣، ص ٥٣١.

[3] أسد الغابة، ج٣، ص ١٩٥.

[4] أسد الغابة، ج٧، ص ٧٨.

[5] سنن ابن ماجه - أبواب الجنائز - باب ما جاء في البكاء على الميت ، الرقم ١٦٥٥، المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ومن نساء قريش اللاتي روين عن رسول الله - ذكر أم حبيبة واسمها حمنة بنت جحش(ﷺ) - إن للزوج من المرأة لشعبة ما هي لشيء، الرقم ٦٩٩٩، سكت عنه الذهبي، ضعفه الألباني في صحيحي و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٥٩٠.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢٤١.

[7] أسد الغابة، ج٧، ص ١٤٨.

حەمنە خۆیشی لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و ئاوی دەگێڕا بۆ هاوەڵان و برینپێچی بریندارانی دەکرد و یارمەتی دەدان.[1]

دواتر حەمنە شووی کرد بە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا بوو و منداڵێکیان بوو بە ناوی موحەممەد کە دواتر لە جەنگی جەمەلدا طەلحەو موحەممەدی کوڕیشی کوژران،[2] کوڕێکی تریشیان هەبوو بە ناوی عیمران کە فەرموودەی لە حەمنەی دایکیەوە گێڕاوەتەوە.[3]

حەمنە کاتێک موحەممەدی بوو بردی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش ناوی نا موحەممەد.[4]

حەمنە یەکێک بوو لەو کەسانەی کە لە مەسەلەی ئیفکدا تێکەوت، مەسەلەی ئیفکیش ئەو بوختانە بوو کە کرا بۆ دایکی باوەڕداران عائیشە گوایە تووشی زینا بووە، ئەوەبوو چەند هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ) بە هەڵە کەوتنە ئەو هەڵەوە، ئەوانیش بریتی بوون لە حەسسانی کوڕی ثابتی شاعیری پێغەمبەر(ﷺ) و میسطەح و حەمنە، خوای گەورە لەو بارەوە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە:

(إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَكُمْ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ)

(بێگومان کەسانێ کە ئەو بوهتانەیان (بۆ عائیشەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵبەست دەستەیە بوون لە خۆتان (با مونافیقیشیان تیا بوو) وا مەزانن ئەو (بوهتانە) شەڕ و خراپە بۆتان (وانی یە) بەڵکو خێرو چاکەیە بۆتان بۆ هەریەک لەوانە هەیە لەتاوان بەو ئەندازەی هەوڵی داوە (لەو بوهتانەدا) وە ئەو کەسەیان کە بەشی گەورەی بوختانەکەی گرتە ئەستۆ (کە عەبدوڵڵای

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٦.

[2] المستدرک على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذكر مناقب طلحة بن عبيد الله التيمي(ﷺ) - ذكر أربع كان طلحة فيها سلف النبي، الرقم ٥٦٤١.

[3] المستدرک على الصحيحين - كتاب الطهارة - أحكام الاستحاضة، الرقم ٦١٩.

[4] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٦٠٨.

کوڕی ئوبەی بوو) (لە ڕۆژی دواییدا) بۆ ئەوە سزای هەرە گەورە)،[1] بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد هەشتا جەلد هەشتا جەلد درا لەو سێ کەسە.[2]

عائیشە دەڵێت: لەناو خێزانەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) زەینەبی کچی جەحش ڕکەبەرم بوو، کە پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بەو مەسەلەیە پرسیاری لێکرد زەینەب وتی: بەخوا تەنها خێر دەزانم، بەوە خوا لەو بوهتانە پاراستی، بەڵام حەمنەی خوشکی لەبەر خوشکەکەی بەرامبەرم وەستاو تێکەوت.[3]

حەمنە لە مزگەوتی مەدینە لە دوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) نوێژی دەکرد، جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) بینی لەنێوان دوو پایەی مزگەوتدا پەتێک بەستراوە، فەرمووی: ئەو پەتە چیە. وتیان ئەی پێغەمبەر(ﷺ) حەمنەی کچی جەحش تا دەتوانێت بەپێوە نوێژ دەکات، کە توانای نەما خۆی دەگرێت بەو پەتەوە، ئەویش فەرمووی: (لِتُصَلِّ مَا أَطَاقَتْ ، فَإِذَا أَعْيَتْ فَلْتَجْلِسْ)، (با تا توانای هەیە نوێژ بکات، کە توانای نەما با دابنیشێت)،[4] بەڵام گێڕانەوەتی تر هاتووە کە دەڵێت: دایکی باوەڕداران زەینەب وایکردووە، ئیبن حەجەر دەڵێت: پێشدەچێت هەردووکیان وایان کردبێت.[5]

پێغەمبەر(ﷺ) لە دەستکەوتەکانی خەیبەردا سێ کۆڵ خورمای دا بە حەمنە.[6]

ڕووداوی ئیفک لە غەزای مورەیسیعدا ڕوویدا لە ساڵی پێنجەمی کۆچیدا،[7] هاوکات حەمنە هەشتا جەلدەکەی لێدرا و بەوە تاوانەکەی لەسەر نەما، دواتر حەمنە هەر لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بوو و پێغەمبەر(ﷺ) لێی

---

[1] مشكل الآثار للطحاوي، الرقم ٢٤٩٤.

[2] مسند أبي يعلى الموصلي – مسند عائشة أم المؤمنين(ﷺ)، الرقم ٤٩٣٢.

[3] صحيح مسلم – كتاب التوبة – باب في حديث الإفك وقبول توبة القاذف، الرقم ٢٧٧٠.

[4] سنن أبي داود – كتاب الصلاة – باب النعاس في الصلاة، الرقم ١٣١٢، قال الألباني صحيح دون ذكر حمنة.

[5] فتح الباري، ج٣، ص ٣٦.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢٤١.

[7] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٥٣.

عاجز نەبوو، بەڵکو لە غەزای خەیبەردا دواتر کە دەستکەوتەکانی خەیبەر دابەشکرا سی کۆڵ خورمای بەخشی بە حەمنە،[1] دەی غەزای خەیبەریش لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا[2] بوو، واتە دوو ساڵ دوای ڕووداوی ئیفک.

بۆیە ئەمە بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی موسڵمان دەکەوێتە هەڵەوەو هاوەڵانیش وەک موسڵمانانی تر کەوتونەتە هەڵەوەو تەوبەیان کردووەو بە پەیڕەوی ئەو حەددەی خوا دایناوە بۆ تاوانەکان ڕازی بوون و پاک بوونەتەوە.

## ١٠٠١. حەمنەی کچی ئەبوو سوفیان(رضي الله عنها)

ناوی حەمنەی کچی ئەبوو سوفیانی کوڕی حەربە، ئوممو حەبیبە پێشنیازی کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تا بەهاوسەری بگرێت.[3]

## ١٠٠٢. حەمنەنی کوڕی عەوف(رضي الله عنه)

ناوی حەمنەنی کوڕی عەوفی کوڕی عەبدعەوفی قوڕەیشیە،[4] دایکی ناوی شیفائی کچی عەوفە،[5] حەمنەن کوڕێکی هەبوو بە ناوی عیاض.[6]

برایەکی هەبوو بە ناوی ئەسوەد کە ئەمیش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و ماوەیەک پێش فەتحی مەککە کۆچی کرد بۆ مەدینە.[7]

برایەکی هەبوو بە ناوی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف،[8] ئەم برایەی یەکێک بوو لە دە موژدەپێدراوانی بەهەشت و یەکێک لە یەکەمین موسڵمان

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢٤١.
[2] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥٨٦.
[3] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٩٣٠٥.
[4] أسد الغابة، ج٢، ص ٧٦.
[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٢٤.
[6] أسد الغابة، ج٢، ص ٧٦.
[7] أسد الغابة، ج١، ص ١٣٥.
[8] أسد الغابة، ج٢، ص ٧٦.

بوان و لە بەشداربوانی بەدر،[1] لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبووبەکر و عومەر و عوثمانیشدا فەتوای دەدا.[2]

حەمنەن هەرچەندە موسڵمان بووبوو بەڵام کۆچی نەکرد بۆ مەدینەو نەچوویە مەدینەو هەر لە مەککە مایەوە، تەمەنێکی دووردرێژی هەبوو، نزیکەی سەد و بیست ساڵ ژیا، نیوەی تەمەنی لە سەردەمی نەفامیدا بەسەر برد و نیوەکەی تریشی لە موسڵمانێتیدا بەسەربرد،[3] حەمنەن هەر لە مەککە مایەوەو جێی نەهێشت تا کۆچی دوایی کرد.[4]

## ١٠٠٣. حەنبەلی کوڕی خاریجە(رضي الله عنه)

ناوی حەنبەلی کوڕی خاریجەیە، ئەم هاوەڵە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بەشداریم کرد لە غەزای حونەیندا و بۆ ئەوانەی سوارەن بۆ ئەسپەکەیان دوو پشک و بۆ خاوەنەکەشی یەک پشکی دیاری کرد.[5]

## ١٠٠٤. حەنەشی کوڕی عەقیل(رضي الله عنه)

ناوی حەنەشی کوڕی عەقیلە، هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر(رضي الله عنه) و پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئیسلامی بۆ کردووەو ئەمیش موسڵمان بووە.[6]

میسوەری کوڕ مەخرەمە دەڵێت: جارێک لەگەڵ عومەر بۆ حەج دەچووین، ڕێمان دەکرد کە یەکێک هاواری کرد راوەستن، ئێمەش راوەستاین، کابرا وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەناوتاندایە؟ عومەر وتی: ئاگات لە خۆتە چی دەڵێیت؟ ئەو وەفاتی کردووە، کابرا ویستی بڕوات، لایەکی کردەوەو وتی:

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٦٨.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٣٤٠.
[3] أسد الغابة، ج٢، ص ٧٦.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢٦.
[5] أسد الغابة، ج٢، ص ٧٩.
[6] أسد الغابة، ج٢، ص ٧٩.

دوای ئەو کێ هاتە شوێنی؟ وتی: ئەبووبەکر، کابرا وتی: ئێستا لەناوتاندایە؟ عومەر وتی: مردووە، کابرا ویستی بڕوات و پشتی هەڵکرد، لایەکی کردەوەو وتی: دوای ئەو کێ چووەتە شوێنی؟ وتی: عومەر، کابرا وتی: ئێستا لەگەڵتانە؟ عومەر وتی: ئەمەیە کە قسەت لەگەڵ دەکات، کابرا وتی: دەی فریام کەوە، عومەر وتی: تۆ کێیت؟ وتی: من حەنەشی کوڕی عەقیلم، لە ڕێی بەنی جوعال گەیشتم بە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش بانگهێشتی کردم بۆ ئیسلام و منیش موسڵمان بووم، ئینجا بڕێ ئاوی پێدام تا بیخۆمەوە، تا ئێستاش ئەو ئاوە نەبڕاوەو برسیم بێ تێرم دەکات و تینوویش بم تینوێتیم ناهێڵێت، دە ساڵە من و ژن و منالم وا دەژین و لە شوێنی خۆمم ڕۆژانە پێنج جار نوێژ دەکەم و ڕۆژووی ڕەمەزان دەگرم و لە دەی زیلحەججەدا قوربانی دەکەم، پێغەمبەر(ﷺ) وا فێری کردم، بەڵام ئەمساڵ پەکم کەوتووەو ئاوەکەم نەماوە، عومەر وتی: فریات دەکەوم، بمبە بۆ سەر ئاوەکە، میسوەر دەڵێت: ئینجا چووین و دواتر کە هاتینەوە پرسیارمان کرد لە خاوەن ئاوەکە ئەرێ حەنەش چی دەکات، ئەویش وتی: مردووەو ئەوە گۆڕەکەیەتی، عومەر سۆزی بۆی جووڵا و نزای خێر و داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد.[1]

دیارە ئەم هاوەڵە زۆر کەم چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) چونکە تەنها بڕێ ڕێنمایی لێوەرگرتووە کە فەرزەکانن، ئیتر ئەوانەی جێبەجێ کردووەو زۆر نەچووەتەوە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) تا وەفاتی کردووە.

## ١٠٠٥. حەنطەبی کوڕی حارث(ﷺ)

ناوی حەنطەبی کوڕی حارثی کوڕی عوبەیدی قوڕەیشی مەخزوومیە، کونیەکەی ئەبوو عەبدولایە، لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدولا کە کونیەکەی بە ناوی ئەوەوە بوو و

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣١.

فەرموودەیەکیشی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[1]

حەنطەب دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (ئەبووبەکر و عومەر بۆ ئایین وەک بیستن و بینین وان لە سەردا)، ئیبن ئەثیر دەڵێت: سەنەدی لاوازە.[2]

بەڵام ترمذی پێی وایە حەنطەب نەگەیشتووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[3]

## ١٠٠٦. حەنظەلی کوڕی ضیرار(رضي الله عنه)

ناوی حەنظەلی کوڕی ضیراری کوڕی حوصەینە، دەشوترێت ناوی حەنظەلەیە، کەسێکە تەمەنی زۆری کردووە، لە سەردەمی نەفامیدا ژیاوەو دواتر موسڵمان بووە.[4]

حەنظەل دەڵێت: جارێک لەگەڵ پاشایەکی عەرەبدا بووم کە پێی وتم: سوێند بەخوا حەزم دەکرد کۆیلەی کۆیلەیەکی حەبەشی سەر رووتاوە بم بەڵام دەرباز بم لە خراپەو سزای رۆژی دوایی.[5]

بەڵام هیچ دەقێک نەهاتووە چووبێتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و لەو کاتەدا موسڵمان بووبێت.

حەنظەل لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبی طالیبدا بەشداری جەنگی جەمەلی کرد و لەو جەنگەدا کوژرا، ئەو کات تەمەنی نزیکەی سەد ساڵ دەبوو.[6]

ئەمەش جێی پرسیارە کەسێکی تەمەن سەد ساڵ بەشداری جەنگ بکات، بەتایبەت جەنگێ کە زۆربەی هاوەڵان کەناریان لێ گرت و بە فیتنەیان دەزانی.

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٢.

[2] أسد الغابة، ج٢، ص ٨٠.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص ٢١١.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٨٢.

[5] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢١١٢.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٨٢.

## ١٠٠٧. حەنظەلەی کوڕی حیذیم(ﷺ)

ناوی حەنظەلەی کوڕی حیذمی کوڕی حەنیفەی مالیکیە، کونیەکەی ئەبوو عوبەیدە،[1] هەم خۆی و باوکی و باپیریشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بون.[2]

حەنظەلە دەڵێت: حەنیفەی باپیرم بە حیذیمی باوکمی وت: کوڕەکانم بۆ کۆبکەرەوە دەمەوێت وەسیەتیان بۆ بکەم، ئەویش هەموویانی کۆکردەوە، حەنیفە وتی: وەسیەتم بۆتان ئەوەیە ئەم هەتیوەی لەماڵەکەمدایە سەد وشتری بۆ هەیە، حیذیم وتی: بابە گیان من بیستوومە منداڵەکانت دەڵێن لای باوکمان دەڵێین باشە، بەڵام کە مرد ئەوە دەکەین کە دەیکەین و وەسیەتەکەی ناهێنینە دی، ئەویش وتی: دەی با داوەری نێوان من و ئێوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بێت، حیذیم وتی: رازین، ئەوەبوو حیذیم و حەنیفەی باوکی چوون و حەنظەلەش لەگەڵیان بوو ئەوکات هێشتا منداڵ بوو و لە پشت باوکیەوە بوو، کە چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەلامیان لێکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبوو حیذیم بۆچی هاتویت؟ ئەویش وتی: لەبەر ئەمە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئینجا دای بەسەر رانی حیذیمدا، حەنیفە وتی: من دەترسم کتوپڕ بمرم، بۆیە ویستم وەسیەت بکەم و وەسیەتم کرد بۆ ئەو هەتیوەی لە ماڵەکەمدا هەیە سەد وشتر بەشی بێت کە ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا پێمان دەوت موطەییەبە، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر تووڕە بوو تا تووڕەییمان لەنێو چاوانیەوە بەدیکرد، دانیشتبوو، خێرا جووڵا و لەسەر ئەژنۆکانی دانیشت و فەرمووی: (لا، لا، لا الصدقة خمس، وإلا فعشر، وإلا فخمس عشرة، وإلا فعشرون، وإلا فخمس وعشرون، وإلا فثلاثون، وإلا فخمس وثلاثون، فإن كثرت فأربعون)، (نا، نا، نا، صەدەقە پێنج بێت، ئەگەر نا زۆر بوو با دە بێت، یان زۆرتر بوو با پانزە بێت، یان با بیست بێت، یان با بیست و پێنج بێت، یان با سی بێت، یان با سی و پێنج بێت، یان ئەگەر هەر زۆر بوو

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ٨١.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٣.

با چل بێت)، ... ئینجا حەنظەڵەی نزیک کردەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: من منداڵی پێگەیشتوو و منداڵی بچووکتریشم هەیە، بچووکترینیان ئەمەیە، دەی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای بۆ بکە، پێغەمبەریش(ﷺ) دەستی هێنا بەسەریدا و فەرمووی: (بارك الله فيك)، ذیال دەڵێت: دەی دەمبینی کەس دەهێنرا بۆ لای حەنظەڵەکە وەرەمی هەبوو یان ئاژەڵ دەهێنرا کە وەرەمی هەبوو، حەنظەڵە تفی دەکردە سەر دەستی و دەیوت بەناوی خوا و دەستی دەخستە سەر سەری و لەسەر ئەو شوێن دەستەی پێغەمبەر(ﷺ) دەستی دادەنا و دواتر دەیهێنا بەسەر ئەو شوێنەداو ئەو وەرەمە نەدەما.[1]

حەنظەڵە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی خۆش بوو هەر کەسێک بانگ دەکرێت بەو ناوەوە بانگ بکرێت کە خۆی زۆر پێی خۆشەو بەو کونیەوە بانگ بکرێت کە خۆی زۆر حەزی لێیەتی.[2]

## ١٠٠٨. حەنظەڵەی ئەنصاری(رضي الله عنه)

ناوی حەنظەڵەی کوڕی ئەبی حەنظەڵەیە، لە پشتیوانانە، پێشنوێژی مزگەوتی قوبا بوو.[3]

## ١٠٠٩. حەنظەڵەی کوڕی ئەبی حەنظەڵە(رضي الله عنه)

ناوی حەنظەڵەی کوڕی ئەبی حەنظەڵەی ثەقەفیە، دواتر لە حیمص نیشتەجێ بوو. [4]

حەنظەڵە دەڵێت: کاتێک خۆر بەرز دەبوویەوەو هەرچی خەڵکە دەچوویەوە،

---

[1] مسند أحمد بن حنبل – مسند البصريين(رضي الله عنهم) – بقية حديث حنظلة بن حذيم(رضي الله عنه) ، الرقم ٢٠٩٩٦، صححه شعيب الأرناؤوط.

[2] الأدب المفرد للبخاري، الرقم ٨٤٨، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣٤١٥، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢٠٤٥.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٤.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٤.

پێغەمبەر(ﷺ) دەچوویە مزگەوت و دوو یان چوار رکات نوێژی دەکرد و تەماشای دەکرد بزانێت کەس هەیە لە مزگەوتدا، ئینجا دەچوو.[1]

## ١٠١٠. حەنظەلەی کوڕی رەبیع(ﭬ)

ناوی حەنظەلەی کوڕی رەبیعی کوڕی صەیفیە، کونیەکەی ئەبوو ریبعیە، بە حەنظەلەی کاتیب ناسرا بوو، چونکە نووسەری خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[2]

برایەکی هەبوو بە ناوی رەباح کە ئەمیش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[3]

حەنظەلە دەڵێت: جارێک ئەبووبەکر دای بە لامداو وتی: ئەی حەنظەلە حاڵت چۆنە؟ وتم: حەنظەلە توشی دووروویی بووە، ئەویش وتی: سوبحانەڵا ئەوە چی دەڵێیت؟ منیش وتم: کاتێک لای پێغەمبەری خواین(ﷺ) کە باسی دۆزەخ و بەهەشتمان بۆ دەکات وا دەزانین لەبەرچاومانەو بە چاوی خۆمان ئەو شتانە دەبینین، کەچی کە لای پێغەمبەر(ﷺ) دەڕۆین گەمەو بەزمی ژن و منداڵ و بژێوی ژیان سەرقاڵمان دەکات و زۆر شتمان بیر دەچێتەوە، ئەبووبەکریش وتی: دەی بەخوا ئێمەش هەر واین، بۆیە لەگەڵ ئەبووبەکر چووین بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەنظەلە تووشی نیفاق بووە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: چی بووە؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێک لای تۆین کە باسی دۆزەخ و بەهەشتمان بۆ دەکەیت وا دەزانین لەبەرچاومانەو بە چاوی خۆمان ئەو شتانە دەبینین، کەچی کە لای تۆ دەڕۆین گەمەو بەزمی ژن و منداڵ و بژێوی ژیان سەرقاڵمان دەکات و زۆر شتمان بیر دەچێتەوە، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) فەرمووی: (والذي نفسي بيده إن لو تدومون على ما تكونون عندي، وفي الذكر،

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢٠٤٩، قال ابن سكن سنده حمصي و هو غير مشهور، انظر(الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٤).

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٤.

[3] أسد الغابة، ج٢، ص ٢٣٩.

لصافحتكم الملائكة على فرشكم وفي طرقكم، ولكن يا حنظلة ساعة و ساعة)، (سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر لەسەر ئەو بارە بەردەوام بن کە لای منن و لە زیکر بەردەوام بن، ئەوە فریشتەکان لەسەر جێگەکانتان و لە سەرە رێکانتاندا تەوقەتان لەگەڵ دەکەن، بەڵام ئەی حەنظەلە ساتەو ساتە)، سێ جار ئەمەی فەرمووە.[1]

جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەنظەلەی وەک هەواڵگر نارد بۆ طائیف، ئەویش چوو و گەڕایەوەو هەواڵی بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێنا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (صدقت ارجع إلى منزلك فإنك قد شهدت الليلة)، (راست دەکەیت، بگەڕێرەوە بۆ ماڵی خۆت چونکە تۆ ئەمشەو بەشدار بوویت) ئینجا کە حەنظەلە چوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ائتموا بهذا و أشباهه)، (پێشەنگی بکەن بەمەو هاوشێوەکانیەوە). واتە ئەمەو هاوشێوەکانی بکەنە پێشەوای خۆتان، جا قەیسی کوڕی زوهەیر ئەم فەرمودەی گێڕاوەتەوەو دەڵێت: لەگەڵ حەنظەلە چووین بۆ مزگەوتەکەی فوراتی کوڕی حەییان، کاتی نوێژ هات، فورات پێی وت: پێشکەوە پێشنوێژی بکە، ئەویش وتی: من پێش تۆ ناکەوم، چونکە تۆ هەم تەمەنت لە من زیاترەو هەم پێش من کۆچت کردووەو مزگەوتەکەش مزگەوتی تۆیە، فوراتیش وتی: بیستوومە پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە تۆ شتێکی فەرمووە ئیتر هیچکات پێش تۆ ناکەوم، ئینجا ئەم فەرموودەی بۆ حەنظەلە گێڕایەوە.[2]

حەنظەلە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بەشداری غەزایەک بووین، دامان بە لای ئافرەتێکدا کە کوژرا بوو و خەڵکی لەسەر تەرمەکەی بوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ما كانت هذه لتقاتل، أدرك خالد فقل له لا تقتل ذرية ولا عسيفا)،[3]

---

[1] صحيح مسلم - كتاب التوبة - باب فضل دوام الذكر والفكر في أمور الآخرة، الرقم ٢٧٥٠.

[2] تأريخ دمشق لابن عساكر، ج١٥، ص ٣٢٧، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٥١٠٧.

[3] صحيح ابن حبان - كتاب السير - باب الخروج وكيفية الجهاد - ذكر خبر ثان يدل على أن النساء والصبيان من أهل الحرب يقتلون إذا قاتلوا ، الرقم ٤٧٩١، و قال ابن كثير قلت وصح قول ابن الرقي أنه لم يرو سوى حديثين، أولا: عن حنظلة الكاتب قال سمعت رسول الله يقول من حافظ على الصلوات

(نەدەبوو ئەو ژنە بکوژرێت، بگە بە خالید و پێی بڵێ ژن و منداڵ و کرێگرتەی ناچار مەکوژە).

ئیبن حەجەر دەڵێت: ڕەباحی برای لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بوو و ئەو غەزایەش غەزای حونەین بووە،[1] جا دەکرێت هەم ڕەباح و هەم حەنظەلەش لەو غەزایەدا بەشدار بووبن و پێکەوە لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بووبن و هەردووکیان ئەو ڕووداوەیان دیبێت و گێڕابێتیانەوە، چونکە هەردوو ڕیوایەتەکە بە سەنەدی وەرگیراو هاتون.

حەنظەلە دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیاو لە جەنگی قادسیەشدا بەشداری کرد،[2] لە جەنگەکانی تری عێراقدا لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلیددا بەشداری کرد.[3]

لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا لە جەنگی جەمەلدا بەشداری نەکرد هەرچەندە سەر بە بەرەی عەلی کوری ئەبی طالیب بوو.[4]

حەنظەلە لە کووفە دادەنیشت، دواتر کووفەی جێهێشت، چونکە لەو شارەدا کەسانێک هەبوون قسەیان دەوت بە عوثمانی کوڕی عەففان.[5]

حەنظەلە یەکێک بوو لەو هاوەڵانەی کە دووری گرت لە فیتنەی نێوان هاوەڵان.[6]

---

الخمس بركوعهن وسجودهن ووضوئهن ومواقيتهن وعلم أنهن حق من عند الله دخل الجنة أو قال وجبت له تفرد به احمد وهو منقطع بين قتادة وحنظلة والله أعلم والحديث الثاني رواه احمد ومسلم والترمذي وابن ماجه من حديث سعيد الجريري عن أبي عثمان النهدي عن حنظلة لو تدمون كما تكونون عندي لصافحتكم الملائكة في مجالسكم وفي طرقكم وعلى فرشكم ولكن ساعة وساعة (البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣٤٢) قال الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٢٦٦٩ حسن صحيح، لكن عن رباح بن الربيع. أما شعيب الأرناؤوط صحح الحديث المروي عن حنظلة الكاتب و قال لسند رباح إسناده حسن و هو صحيح لغيره، أي صححه بإسناد حنظلة الكاتب.

[1] فتح الباري، ج٦، ص ١٤٧.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٤.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣٤٢.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٤.

[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣٤٢.

[6] نفس المصدر.

دواتر حەنظەلە چوویە قرقیسیا و لەوێ نیشتەجێ بوو تا لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیاندا کۆچی دوایی کرد،[1] کە مرد ژنەکەی زۆر بۆی گریا و بە ئازار بوو، ئینجا دەوروبەرەکەی پێیان وت: تۆ وا بکەیت پاداشتت بۆ نامێنێتەوە، ژنەکەشی لە وەڵامیاندا شیعرێکی هۆنیەوە.[2]

## ١٠١١. حەنظەلەی کوڕی طوفەیل(ﷺ)

ناوی حەنظەلەی کوڕی طوفەیلی سولەمیە، یەکێک بوو لە سەرکردەکانی فتووحاتی شام کە لە ساڵی پانزەی کۆچیدا ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەرراح ناردی بۆ فەتحی حیمص و خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو حیمصی فەتح کرد، ئیبن حەجەر دەڵێت: بەرپرسانی فتووحات تەنها هاوەڵانیان دەکردنە ئەمیر، بۆیە ئەمە بەڵگەیە بۆ هاوەڵبوونی.[3]

## ١٠١٢. حەنظەلەی کوڕی ئەبی عامیر(ﷺ)

ناوی حەنظەلەی کوڕی ئەبی عامیری کوڕی صەیفی کوڕی مالیکە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[4] ناسراوە بە غەسیلولمەلائیکە، چونکە کاتێک شەهید بوو فریشتەکان ئەویان شۆرد.[5]

باوکی ناوی عەمر یان عەبد عەمرە و بە ئەبی عامر ناسراوە، باوکی لە سەردەمی نەفامیشدا باسی ئەوەی دەکرد دەبێت زیندووبوونەوە هەبێت و باسی ئایینی حەنەفیەتی دەکرد،[6] ئیتر هێندە خواپەرستی دەکرد کە

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٤.
[2] أسد الغابة، ج٢، ص ٨٤
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٦.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٨٠.
[5] صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله عليهم أجمعين - ذكر حنظلة بن أبي عامر غسيل الملائكة رضوان الله عليه ، الرقم ٧٠٢٥، صححه شعيب الأرناؤوط، حسنه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٣٢٦.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٧.

پێیـان دەوت راهیـب،[1] بـەڵام کاتێـک پێغەمبـەر(ﷺ) دەرکـەوت، ئـەو کەوتـە حەسوودی و لـە مەدینە دەرچوو و چوویە نـاو ریزی قورەیش و لـە جەنگی ئوحوددا دژ بە پێغەمبەر(ﷺ) جەنگا و دواتریش گەڕایەوە بۆ مەککەو دواتر لەوێوە چوو بۆ وڵاتی رۆم و لـەوێ مایـەوە تـا لـە ساڵی نۆ یان دەی کۆچیدا بـە بێباوەڕی مـرد،[2] لەبەرئـەوەی وا دەستبەرداری حـەق بـوو و لـە دەست ئیسلام رایکرد پێغەمبـەر(ﷺ) نـاوی نابـوو فاسـق.[3]

بەڵام حەنظەلەی کوڕی موسڵمان بوو و بە جوانیش موسڵمان بوو.[4]

ژنەکەی حەنظەلە ناوی جەمیلـەی کچی ئوبەی کوڕی سەلوول بـوو،[5] لەم ژنـەی منداڵیکی بوو بە نـاوی عەبدوڵا، بەڵام کوڕەکەی خۆی نـەدی، چونکە ئەو شەوەی چوویە لای ژنەکەی، بۆ بەیانیەکەی شەهید بوو، ئەوەبوو پاش نۆ مانگ لـە شـەهیدبوونی ئـەم منداڵـەی لەدایک بـوو.[6]

بەڵـێ، قـەدەری خـوا وابـوو حەنظەلـە کـوڕی بێباوەڕێکـی لاسـار بـوو کـە دوژمنایەتـی پێغەمبـەری خـوای(ﷺ) هەڵبژاردبـوو، جەمیلـەش کچـی سـەرگەورەی دووڕووەکان بـوو، ئـەم دوو پاکـە بەیەکگەیشـتن و نەوەیەکـی پاکیـان لێکەوتـەوە.

کاتێـک پێغەمبـەر(ﷺ) برایەتـی خسـتە نێـوان کۆچـەران و پشـتیوانانەوە، برایەتـی خسـتە نێـوان شـەمماسـی کـوڕی عوثمـان و حەنظەلـەوە.[7]

حەنظەلـە لـە جەنگی ئوحوددا بەشداری کرد، واتـە دژ بـە بەرەکـەی باوکی وەسـتا و ریـزی پێغەمبـەری خـوای(ﷺ) دژ بـە باوکـی هەڵبـژارد، لـە غـەزای

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢١.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٧.
[3] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢١.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٧.
[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص ١٨٠٢.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٦٦.
[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٤٥.

ئوحوددا بەشداریەکی کارای کرد و تیایدا شەهید بوو.[1]

پێش جەنگی ئوحود حەنظەلە و عەبدوڵای کوڕی عەبدوڵای ئوبەی کوڕی سەلوول-کە ژنبرای حەنظەلە بوو- هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، داوایان لێکرد مۆڵەتیان بدات تا باوکی خۆیان بکوژن، حەنظەلە لەبەرئەوەی بینی باوکی بەرەی دژ بە پێغەمبەری خوای(ﷺ) گرتووەتەبەر و شمشێری لەدژ هەڵکردووە، عەبدوڵاش لەبەر ئەوەی بینی باوکی بووەتە ڕێبەری دوورووان و دژ بە پێغەمبەر(ﷺ) خەبات دەکات، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی نەدا بە هیچکامیان.[2]

حنظەلە شەوێک پێش غەزای ئوحود حەنظەلە ژنی گواستەوە، حەنظەلە پێشتر داوای مۆڵەتی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) تا شەو لای ژنەکەی بێت چونکە دەیگوازێتەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) مۆڵەتی پێدا،[3] پاش نوێژی بەیانی هەمدی چوویەوە لای جەمیلەی ژنی و جیماعیان کرد، دواتر کە گوێی لە بانگەوازی جیهاد بوو چوو خۆی گەیاند بە سوپاکەی پێغەمبەر(ﷺ)،[4] پێش ئەوەی بکەوێتەڕێ جەمیلەی ژنی چوار کەس لە هۆزەکەی خۆی بانگ کرد و کردنی بە شاهید کە حەنظەلە چووەتە لای، ئەوانیش لێیان پرسی بۆچی شاهیدت لێگرت؟ جەمیلە وتی: خەوم بینی ئاسمانی بۆ کراوەو حەنظەلە چوویە ئاسمان و دواتر ئاسمان داخرایەوە، منیش وتم: ئەمە شەهیدبوونی حەنظەلەیە، بۆیە شاهیدم لەسەر گرت کە هاتوەتە لام، ئەوەبوو دواتر سکی کرد.[5]

حەنظەلە کە گەیشتە ئوحود بینی پێغەمبەر(ﷺ) سەرقاڵە ڕیزەکانی سوپاکەی ڕێک دەکات،[6] کاتێک جەنگ ڕوویداو موسڵمانان لە ئوحوددا شکان و دواتر گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، حەنظەلە ڕێی کەوتە

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٧.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٧.
[3] دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٤٠٦.
[4] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٤٨٦٩، قال الذهبي إسناده مظلم.
[5] دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٤٠٦.
[6] السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٨٧١.

ئەبووسوفیان و ویستی بیکوژێت و خەریک بوو بیکوژێت، بەڵام لەو کاتەدا شەدادی کوڕی ئەسوەد-یان کوڕی ئەوس[1]- هات و حەنظەڵەی شەهید کرد،[2] پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: فریشتەکان حەنظەڵەی هاوڕێتان دەشۆن، ئادەی بڕۆن پرسیار بکەن لە ژنەکەی، کاتێک پرسیاریان کرد لە ژنەکەی، ئەویش وتی: حەنظەڵە کاتێک هاواری جیهادی بیست لەشی گران بوو، بۆیە بە لەشگرانیەوە چوو بۆ جیهاد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەی ئەوەیە فریشتەکان شۆردیان.[3]

کاتێک حەنظەڵە گەیشت بە ئەبوو سوفیان، ئەبووسوفیان لەسەر ئەسپێک بوو، حەنظەڵە بە شمشێرەکەی دای لە ئەسپەکەی و ئەبووسوفیان کەوتە سەر زەوی، ئەبووسوفیان هاواری دەکرد: ئەی گرۆی قورەیشیەکان ئەمە منم ئەبووسوفیانی کوڕی حەرب، حەنظەڵەش دەیویست بە شمشێرەکەی گەردنی لێبکاتەوە، بڕێ لە قورەیشیەکان دەنگی ئەبووسوفیانیان بیست و لەتاو سەختی جەنگەکە نەچوون بە دەمیەوە،[4] بەڵام شەداد چوو بە دەمیەوە،[5] بە رمێک دای لە حەنظەڵەو رمەکە لە پشتیەوە دەرچوو و ئەبوو سوفیانیش رایکرد.[6]

بێباوەڕەکانی قورەیش تەرمی شەهیدانی ئوحودیان دەشێواندن، تەنها تەرمی حەنظەڵەیان نەشێواند چونکە باوکی لەناو سوپای قورەیشیەکاندا بوو

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢١.
[2] المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٨٧٠.
[3] صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله عليهم أجمعين - ذكر حنظلة بن أبي عامر غسيل الملائكة رضوان الله عليه ، الرقم ٧٠٢٥، صححه شعيب الأرناؤوط، حسنه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٣٢٦.
[4] السنن الكبرى للبيهقي - كتاب السير - جماع أبواب السير - باب الرخصة في عقر دابة من يقاتله في حال القتال، الرقم ١٨٢١٢.
[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢١.
[6] السنن الكبرى للبيهقي - كتاب السير - جماع أبواب السير - باب الرخصة في عقر دابة من يقاتله في حال القتال، الرقم ١٨٢١٢.

و بۆ دڵراگرتنی باوکی دەستکاری تەرمەکەی ئەویان نەکرد،[1] دەشوترێت بەڵکو ئەبی عامیری باوکی لەسەر تەرمی کوڕەکەی وەستا و بە قاچی پاڵی نا بە سنگی کوڕەکەیەوەو وتی: دوو قەرزم لەسەرە، من پێشتر هاتمە سەر لاشەکەت ئەی پیس و بۆگەن، هەروەها سوێند بەخوا تۆ لەگەڵ باوکتدا زۆر چاکەکار بوویت.[2]

## ١٠١٣. حەنظەڵەی کوڕی نوعمان(ﷺ)

ناوی حەنظەڵەی کوڕی نوعمانی کوڕی عامیری کوڕی عەجلانە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە، حەنظەڵە لە غەزای ئوحودو غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد.[3]

دوای ئەوەی حەمزەی کوڕی ئەبوو تالیب شەهید بوو خەولەی ژنی حەمزە شووی کردەوە بە حەنظەڵە.[4]

حەنظەڵە دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە جەنگی صفیندا لەناو سوپای عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا بوو، هەرچەندە ئیبن حەجەر دەڵێت: لەوانەیە ئەوە حەنظەڵەیەکی تر بێت.[5]

## ١٠١٤. حەنظەڵەی عەبشەمی(ﷺ)

ناوی حەنظەڵەی عەبشەمیە، فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە (ما اجتمع قوم قط يذكرون الله إلا نادى مناد من السماء : قوموا مغفورا لكم، قد بدلت سيئاتكم حسنات)،[6] (هەرکات دەستەیەک کۆ ببنەوە یادی خوا بکەن، ئەوە لە ئاسمانەوە هاوارکەرێک هاوار

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ٦٨.
[2] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٧٩.
[3] أسد الغابة، ج٢، ص ٨٧.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٩.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٩.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٩.

دەکات هەستن ئێوە بەر لێخۆشبوون کەوتون، بە دڵنیاییەوە خراپەکانتان گۆڕان بە چاکە)

بەڵام لە چەند کتێبێکی تری فەرموودەدا لە سوهەیلی کوڕی حەنظەلەوە گێردراوەتەوە.

## ١٠١٥. حەنفائی کچی ئەبووجەهل(ﷺ)

ناوی حەنفائی کچی ئەبوو جەهلی کوڕی موغیرەیە، چوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[١]

## ١٠١٦. حەنیفەی کوڕی جوبەیر(ﷺ)

ناوی حەنیفەی کوڕی جوبەیری کوڕی بەکری تەمیمیە،[٢] هەم خۆی و کوڕەکەشی و نەوەکەشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بون.[٣]

حەنظەلە دەڵێت: حەنیفەی باپیرم بە حیذیمی باوکمی وت: کوڕەکانم بۆ کۆبکەرەوە دەمەوێت وەسیەتیان بۆ بکەم، ئەویش هەموویانی کۆکردەوە، حەنیفە وتی: وەسیەتم بۆتان ئەوەیە ئەم هەتیوەی لە ماڵەکەمدایە سەد وشتری بۆ هەیە، حیذیم وتی: بابە گیان من بیستوومە منداڵەکانت دەڵێن لای باوکمان دەڵێین باشە، بەڵام کە مرد ئەوە دەکەین کە دەیکەین و وەسیەتەکەی ناهێنینە دی، ئەویش وتی: دەی با داوەری نێوان من و ئێوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بێت، حیذیم وتی: رازین، ئەوەبوو حیذیم و حەنیفەی باوکی چوون و حەنظەلەش لەگەڵیان بوو ئەوکات هێشتا منداڵ بوو و لە پشت باوکیەوە بوو، کە چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەلامیان لێکرد، پێغەمبەر(ﷺ)

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٨.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٤٠.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٣.

فەرمووی: ئەی ئەبوو حیذیم بۆچی هاتویت؟ ئەویش وتی: لەبەر ئەمە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئینجا دای بەسەر رانی حیذیمدا، حەنیفە وتی: من دەترسم کتوپڕ بمرم، بۆیە ویستم وەسیەت بکەم و وەسیەتم کرد بۆ ئەو هەتیوەی لە ماڵەکەمدا هەیە سەد وشتر بەشی بێت کە ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا پێمان دەوت موطەییەبە، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر توورە بوو تا توورەییمان لەنێو چاوانیەوە بەدیکرد، دانیشتبوو، خێرا جووڵا و لەسەر ئەژنۆکانی دانیشت و فەرمووی: (لا، لا، لا الصدقة خمس، وإلا فعشر، وإلا فخمس عشرة، وإلا فعشرون، وإلا فخمس وعشرون، وإلا فثلاثون، وإلا فخمس وثلاثون، فإن كثرت فأربعون)، (نا، نا، نا، صەدەقە پێنج بێت، ئەگەر نا زۆر بوو با دە بێت، یان زۆرتر بوو با پانزە بێت، یان با بیست بێت، یان با بیست و پێنج بێت، یان با سی بێت، یان با سی و پێنج بێت، یان ئەگەر هەر زۆر بوو با چل بێت)، ... ئینجا حەنظەلەی نزیک کردەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: من منداڵی پێگەیشتوو و منداڵی بچووکتریشم هەیە، بچووکترینیان ئەمەیە، دەی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای بۆ بکە، پێغەمبەریش(ﷺ) دەستی هێنا بەسەریدا و فەرمووی: (بارك الله فيك)، ذیال دەڵێت: دەی دەمبینی کەس دەهێنرا بۆ لای حەنظەلەکە وەرەمی هەبوو یان ئاژەڵ دەهێنرا کە وەرەمی هەبوو، حەنظەلە تفی دەکردە سەر دەستی و دەیوت بەناوی خوا و دەستی دەخستە سەر سەری و لەسەر ئەو شوێن دەستەی پێغەمبەر(ﷺ) دەستی دادەنا و دواتر دەیهێنا بەسەر ئەو شوێنەداو ئەو وەرەمە نەدەما.[1]

## ١٠١٧. حەنیفەی مامی ئەبی حەرِرە(رضي الله عنه)

ناوی حەنیفەیەو فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ)

---

[1] مسند أحمد بن حنبل - مسند البصريين(رضي الله عنه) - بقية حديث حنظلة بن حذيم(رضي الله عنه)، الرقم ٢٠٩٩٦، صححه شعيب الأرناؤوط.

فەرمووی: (لا یحل مال امريء إلا بطيب نفس منه)،[1] (ماڵی موسڵمان حەڵاڵ نیە مەگەر لە ناخی دڵەوە رازی بێت).

## ١٠١٨. حەووائی کچی یەزید(رضي الله عنها)

ناوی حەووائی کچی یەزیدی کوڕی سەکەنە، بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ)،[2] ئەم ئافرەتە لە پشتیوانانە لە بەنی عەبدولئەشهەل.[3]

ئومموعامیری ئەشهەلی دەڵێت: من و لەیلای کچی خوتەیم و حەووائی کچی یەزید لەنێوان بانگی ئێوارەو عیشادا بوو چووین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و من سەلامم کرد، پرسیاری لێکردم کێم، منیش خۆم ناساند، ئینجا پرسیاری کرد ئەوانە کێن لەگەڵم، ئەوانیش خۆیان ناساند، پێغەمبەر(ﷺ) بەخێرهاتنی کردین و دواتر فەرمووی: ئیشتان چیە؟ وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتوین تا لەسەر ئیسلام بەیعەتت پێ بدەین، چونکە بڕوامان پێت هێناوەو شایەتی دەدەین ئەوەی هێناوتە حەقە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنموونی ئێوەی کرد بۆ ئیسلام، پاشان فەرمووی: وا بەیعەتم وەرگرت لێتان، ئومموعامیر دەڵێت: من لێی نزیک بوومەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (من لەگەڵ ئافرەتان تەوقە ناکەم، قسەم بۆ هەزار ئافرەت و قسەم بۆ یەک ژن وەک یەکە)، ئومموعامیر دەڵێت: ئێمە یەکەم ئافرەتانێک بووین چووین بەیعەتمان دا بە پێغەمبەر(ﷺ).[4]

## ١٠١٩. حەووائی کچی یەزیدی ئەنصاری(رضي الله عنها)

ناوی حەووائی کچی یەزیدی کوڕی سینانە، لە پشتیوانانە لە بەنی

---

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢٠٨٤.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٨.
[3] أسد الغابة، ج٧، ص ٨١
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ١٢.

عەبدولئەشـهەل، دایکـی نـاوی عەقرەبـی کچـی موعاذە،[1] حـەوواء برایەکـی هەبـوو بـە نـاوی موعـاذ.[2]

حەوواء ژنی قەیسی کوڕی خطیم بوو، لەم مێردەی منداڵێکی هەبوو بە ناوی ثابت،[3] قەیسی مێردی یەکێک بوو لە شاعیرە ناسراوەکان.[4]

ئـەم ژنـە هاوەڵـە لەپێش قەیسـی مێردیـدا موسـڵمان بـوو،[5] هێشـتا پێغەمبـەر(ﷺ) لـە مەککـە بـوو و نەهاتبوویـە مەدینـە حەووائـی کچـی یەزیـد موسـڵمان بووبـوو.[6]

موسڵمانبوونی ئـەم ژنـە هاوەڵـە لەنێوان بینـی یەکـەم و دووەمـی هاوەڵـە پشـتیوانیەکان بـوو کـە چوونـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ).[7]

حەوواء لەلایـەن مێردەکەیـەوە ئازاری زۆر دەدرا و مێردەکەی بەرامبـەری خـراپ بـوو، جـار هەبـوو کـە نوێژی دەکـرد و دەچـوو بـە سـوجدەدا، قەیسـی مێـردی بـە قـژ هەڵیدەگێڕایـەوەو بـەرەو دواوە رایدەکێشـا،[8] حەووائیـش ئـەو سـکالایەی گەیاندبـووە لای پێغەمبـەر(ﷺ) هەرچەنـدە هێشـتا لـە مەککـە بـوو، جارێـک قەیسـی مێـردی حـەوواء هاتبوویـە مەککـەو پێغەمبـەر(ﷺ) بـەردەوام داوای لێدەکرد تـا موسـڵمان بێت، پێغەمبـەری خوا(ﷺ) بـە مێردەکەی حەووائی فەرمـوو ئـەی ئەبوو یەزید حەووائی ژنت پێی راگەیانـدووم لەگەڵیدا خراپیت، دەی لەخـوا بترسـەو لـە ئاسـتیدا رەچـاوی مـن بکـە و خـراپ مەبـە لەگەڵـی، ئەویش وتـی: باشـە بەسـەرچاو، ئـەوە دەکـەم کە تۆ پێت خۆشـە، تەنها چاکەم دەبێـت بەرامبـەری، ئینجـا قەیـس هاتـەوە مەدینـەوە حەووائـی بینـی و وتـی:

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٨-٥٨٩.
[2] أسد الغابة، ج٥، ص ٢١٥.
[3] أسد الغابة، ج٥، ص ٢١٥.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٩.
[5] أسد الغابة، ج٧، ص ٨١.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٣٢٣.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٩.
[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٩.

موحەممەد داوای لێکردوم لەگەڵت چاک بم و منیش بەڵێنی خۆم دەبەمە سەر، چیت پێ خۆشە وا بکە، بەخوا ئیتر هیچ ئازارێکت لە منەوە پێ ناگات، حەووائیش کە ئەوەی بیست موسڵمانبوونی خۆی ئاشکرا کرد، قەیسیش هیچی نەوت، هەرچەندە خەڵکێک رەخنەیان لێدەگرت بۆچی ژنەکەت شوێن ئایینی موحەممەد کەوتووە، بەڵام ئەو دەیوت بەڵێنم داوە بە موحەممەد بەرامبەری چاک بم.[1]

## ١٠٣٠. حەووائی ئەنصاری(ﷺ)

ناوی حەووائەو بە ئوممو بوجەید ناسراوەو لە هاوەڵە پشتیوانیەکانە.[2]

ئوممو بوجەید دەڵێت: جارێک وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوێند بەخوا جار هەیە هەژار دێتە بەر دەرگاکەم و منیش هیچ بەدی ناکەم بیدەمێ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرموو (إن لم تجدي له شيئا تعطينه إياه إلا ظلفا محرقا فادفعيه إليه في يده)،[3] (ئەگەر هەر هیچت شک نەبرد پێی ببەخشیت ئەوە با سمە سووتاوێکیش بێت هەر بیدەرە دەستیەوە).

ئوممو بوجەید فەرموودەیەکی تر لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (أسفروا بالصبح فإنه أعظم للأجر)،[4] (بەیانییان نوێژ درەنگ بکەن-تا دەگاتە بەرەبەیان- چونکە پاداشتی گەورەترە).

## ١٠٣١. حەوشەب(ﷺ)

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ٣٢٣.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٩٠.

[3] جامع الترمذي - أبواب الزكاة عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء في حق السائل ، الرقم ٦٦٥ و قال حسن صحيح، سنن أبي داود - كتاب الزكاة - باب حق السائل ، الرقم ١٦٦٧، صححه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ١٦٦٧.

[4] الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ٢٩٨٦.

ئـەم هاوەڵـە نـاوی حەوشـەبەو سـەبارەت بـە نـاوی بـاوک و کەسـانی زانیـاری نەهاتـووە.[1]

حەسسـانی کـوڕی رەیب دەڵێت: مێرد منداڵێک مـرد، دایک و باوکی زۆر بـۆی بەئـازار و نارەحـەت بـوون، حەوشـەبی هاوەڵـی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) وتـی: پێت خۆشـە هەواڵت پێبدەم سەبارەت بە نموونـەی مەرگی ئـەم منداڵەی ئێوە چیم بیست لـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)؟ یەکێک لـە هاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) منداڵێکـی هەبـوو تـازە کەوتبـووە هاتوچۆکـردن، لەگـەڵ باوکیـدا دەهـات بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ)، دواتـر ئـەو منداڵـەی مـرد، باوکـی نزیکـەی شـەش رۆژ زۆر بـە ئـازار و دڵگـران بـوو بـۆی، تەنانـەت نەدەهـات بـۆ لای پێغەمبـەری خوایش(ﷺ)،جارێـک پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (ئـەرێ فلانـە کـەس نابینـم)، وتیـان ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) منداڵەکـەی مـردووەو ئەویش زۆر بە ئازار و نارەحەتـە بۆی، پێغەمبـەر(ﷺ) –چـوو بـۆ لای– و پێی فەرمـوو (يا فلان، أتحب لو أن ابنك عندك الآن كأنشط الصبيان نشاطا، أتحب أن ابنك عندك أحد الغلمان جرأة، أتحب أن ابنك عندك كهلا كأفضل الكهول، أو يقال لك ادخل الجنة ثواب ما أخذ منك)،[2] (ئـەی فلانـی، پێت خۆشـە منداڵەکـەت ئێسـتا وەک چالاکتریـن منـداڵ لـەلات بوایـە؟ پێت خۆشـە منداڵەکـەت لات بوایـەو بوێرتریـن مێرد منـداڵ بوایـە؟ پێت خۆشـە منداڵەکـەت وەک پیاوێکی پیاوانـە لات بوایـە، یـان پێت بوترێت لـە پاداشـتی ئـەوەی لێت وەرگیـرا بـڕۆرە بەهەشـتەوە).

## ١٠٣٢. حەوشەبی فیهری(ﷺ)

نـاوی حەوشـەبەو کوڕێکـی هەیـە بـە نـاوی یەزیـد کـە فەرموودەیەکـی لـە

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٤١.

[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند المكيين(ﷺ) - حديث حوشب صاحب النبي(ﷺ) ، الرقم ١٦٠٨٥، قال ابن حجر: قال بن السكن تفرد به بن لهيعة وهو ضعيف ، كما قال شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف ابن لهيعة سيء الحفظ وباقي رجال الإسناد ثقات رجال مسلم غير حسان بن كريب

باوكیـەوە گێڕاوەتـەوە.[1]

حەوشـەب دەڵێت: جارێـك گوێـم لـە پێغەمبـەر(ﷺ) بـوو دەەیفەرمـوو (لو كان جريج الراهب فقيها عالما لعلم أن إجابته أمه أفضل من عبادة ربه)،[2] (ئەگـەر جورەیجـی راهیب فیقهزان و زانا بوایە دەیزانی كە وەڵامدانـەوەی بانگكردنەكەی دایكی لەپێشـتر بـوو لـە پەرستشـی پـەروەردگاری).

بەسـەرهاتی جورەیج ئەوەبوو كە پێغەمبـەر(ﷺ) باسـی كـردووە: كەسـێك هەبوو ناوی جورەیجی راهیب بوو، دایكی هات بۆ لای و جورەیجی بانگ كرد، كەچی لـەو كاتـەدا جورەیج نوێژی دەكرد، جورەیج لای خۆیەوە وتی: وا دایكم هات و لـە نوێژیشـدام، پێم باشـە نوێژەكەم هەڵبژێرم تا دایكم، ئەوەبوو دایكی چـوو، بۆ جاری دووەم دایكی هاتـەوەو هەمدی بانگی كردەوەو جورەیجیش لـە نوێژدا بـوو، دایكی وتـی: خوایە نەیمرێنیت تا دەموچاوی ئافرەتانی داوێن پیسـی نیشـان بدەیت، جورەیجیش هەر لە پەرستگادا بـوو، ئافرەتەكە ئافرەتێك رێی كەوتـە ئـەوێ و داوای زینـای لێكرد، بـەڵام جورەیج رازی نەبوو، ئەوەبوو چـوو بۆ لای شـوانێك و داوای زینـای لێكرد و پیاوەكـەش جیماعی لەگـەڵ كرد و سـكی بـوو، كاتێك سـكەكەی دانا پێیان وت: خاوەنـی ئـەم منداڵـەت كێیـە؟ ئەویش وتـی: جورەیجی راهیب، جورەیج هێنرا و پەرسـتگاكەی رووخێنراو گرتیان، جورەیج دەسـتنوێژی گرت و نوێژی كرد و دواتر هـات بۆ لای منداڵەكـەو وتـی: ئـەی منداڵ كێ باوكـی تۆیـە؟ ئەویش وتـی: شـوانەكە، وتیان پەرسـتگاكەت لـە زێڕ بۆ دروسـت دەكەینـەوە، ئەویـش وتـی: نەخێر هـەر دەبێت لـە قوڕ دروسـتی بكەنـەوە بۆم.[3]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٤١.

[2] شعب الإيمان للبيهقي - التاسع والثلاثون من شعب الإيمان، الرقم ٧٦١٤، حديث جريج العابد في فضل حفظ قلب الأم الرقم ٧٦١٤، قال البيهقي إسناده مجهول

[3] صحيح البخاري - كتاب المظالم - باب إذا هدم حائطا فليبن مثله، الرقم ٢٤٨٢، صحيح ابن حبان - كتاب التاريخ - باب المعجزات - ذكر خبر ثان يصرح بأن غير الأنبياء قد يوجد لهم أحوال تؤدي إلى المعجزات، الرقم ٦٤٨٩.

سەبارەت بە حوکمی وەڵامدانەوەی بانگکردنی دایک لە نوێژدا و حوکمی بەتاڵبوونەوە یان بەتاڵ نەبوونەوەی نوێژەکە ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەمە راجیایی لەسەرە، جا سەبارەت بەوەی بۆچی جورەیج ئەو نزایەی لێ گیرابووە، ئیبن بەططال دەڵێت: لە ئایینی ئەواندا قسەکردن لە نوێژدا رێپێدراو بووە، بۆیە جورەیج کە وەڵام نەدانەوەکەی پێ باشتر بووەو بەردەوامی نوێژکردنەکەی لە وەڵامدانەوەی دایکی پێشتر خستووە بۆیە دایکی نزای لێکردووە لەبەر ئەوەی مافەکەی دایکی دواخستووە، بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەوەی کە جورەیج وتوویەتی نوێژەکەم بکەم یان وەڵامی دایکم بدەمەوە، ئەمە بەڵگەی ئەوە بووە لای ئەو قسەکردن واتای پچڕانی نوێژ بووە، بۆیە وەڵامی نەداوەتەوە.[1]

نەوەوی دەڵێت: (زانایان دەڵێن: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی راستتر ئەوەبوو وەڵامی دایکی بداتەوە، چونکە لە نوێژی سوننەتدا بووە و بەردەوام بوون لەو نوێژەدا تەتەوعە و واجب نیە، بەڵام وەڵامدانەوەی دایک و چاکبوون لەگەڵی واجبە و ئازاردانیشی حەرامە، دەیتوانی نوێژەکەی کورت بکاتەوەو وەڵامی بداتەوەو دواتر بگەڕایەتەوە بۆ نوێژکردن، لەوانەیەی ترسی ئەوەی بووبێت دایکی بانگی بکات صەومەعەکەی جێبهێڵێت و بگەڕێتەوە نێو دنیا).[2]

## ١٠٢٣. حەوطی کوڕی قیرواش(ﷺ)

ناوی حەوطی کوڕی قیرواشی کوڕی حیصنە، حەوط دەڵێت: لەگەڵ کەسێک لە بەنی عەددی هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە پێی دەوترا واقد.[3]

[1] فتح الباري، ج٣، ص ٧٨.

[2] المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج، ج١٦، ص ١٠٥.

[3] أسد الغابة، ج٢، ص ٩٢.

## ١٠٣٤. حەیدەی کوڕی موخەرریم(ﷺ)

ناوی حەیدەی کوڕی موخەرریم یان مەخرەمەیە، برایەکی هەبوو بە ناوی وەردان کە ئەویش هاوەڵ بوو، هەردووکیان هاتوونەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوون و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) نزای خێری کردووە بۆیان.[1]

## ١٠٣٥. حەییانی کوڕی ئەبجەر(ﷺ)

ناوی حەییانی کوڕی ئەبجەری کینانیە، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوری ئەبوو طالیبدا لە ناو سوپای عەلیدا لە جەنگی صفیندا بەشداری کرد.[2]

## ١٠٣٦. حەییانی کوڕی کورز(ﷺ)

ناوی حەییانی کوڕی کورزی کورزی بەلویە، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە فەتحی میصردا بەشداری کرد.[3]

## ١٠٣٧. حەییانی مەولای قورەیش(ﷺ)

ناوی حەییانەو دواتر لە مەدینە نیشتەجێ بوو و لەوێ مایەوەو فەرموودەیەکی گێڕایەوە کە کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر مینبەر بوو فەرمووی: (ئەی خەڵکینە بزانن بێ دەستنوێژ نوێژ دروست نیەو دەستنوێژیش بێ ناوبردنی خوا دروست نیە).[4]

## ١٠٣٨. حەییەی کوڕی حابیس(ﷺ)

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ٩٩.
[2] أسد الغابة، ج٢، ص ٩٦.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٤٥.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٤٦.

ناوی حەییەی کوڕی حابیسی کوڕی ڕەبیعەی تەمیمیە، حەییە فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، بەڵام ئیبن حەجەر پێی وایە حەییە ئەو فەرموودەی لە باوکیەوە بیستووە کە باوکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بیستوویەتی.[1]

فەرموودەکەش ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی (العین حق)،[2] (چاو حەقە).

## ١٠٢٩. حوبابی کوڕی جوبەیر(رضي الله عنه)

ناوی حوبابی کوڕی جوبەیرە، یان دەوترێت کوڕی حەبیبە.

کوڕێکی هەبوو بە ناوی عرفطە کە لە غەزای طائیفدا شەهید بوو.[3]

## ١٠٣٠. حوبابی کوڕی جەزء(رضي الله عنه)

ناوی حوبابی کوڕی جەزئی کوڕی عەمرە، لە پشتیوانانە، لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیاو لە جەنگی یەمامەدا بەشداری کردو لەو جەنگەدا شەهید بوو.[4]

## ١٠٣١. حوبابی کوڕی زەید(رضي الله عنه)

ناوی حوبابی کوڕی زەیدی کوڕی تیمە، لە پشتیوانانە، لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە جەنگی یەمامەدا بەشداری کرد و لەو جەنگەدا شەهید بوو.[5]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٥٩.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٥٩.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨
[5] () -أسد الغابة، ج١، ص ٥٣٢.

## ١٠٣٢. حوبابی کوڕی عەبد(رضي الله عنه)

ناوی حوبابی کوڕی عەبدە، حوباب چوویە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی چیم پێ دەکەیت؟ ئەویش فەرمووی: موسڵمان بەو دواتر کۆچ بکە، حوبابیش موسڵمان بوو و گەڕایەوە بۆ ناو ژن و مناڵەکانی و ئەوانیشی هێنا و کۆچی کرد بۆ مەدینە.[1]

## ١٠٣٣. حوبابی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

ناوی حوبابی کوڕی عەمرە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە، برای ئەبولیوسرە.[2]

سەلامەی کچی مەعقیل دەڵێت: لە سەردەمی نەفامیدا مامم منی فرۆشت بە حوبابی کوڕی عەمر، منیش عەبدوڕەحمانم لێی بوو، دواتر ئەوەبوو مرد، ژنەکەی وتی: بەخوا ئێستا بۆ قەرزەکەی دەفرۆشرێیت، منیش چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ئافرەتێکی خاریجە قەیس عەیلانم، مامم لە سەردەمی نەفامیدا منی هێنا بۆ مەدینەو منی فرۆشت بە حوبابی کوڕی عەمر و منیش ەبدوڕەحمانم لێی بوو، ژنەکەشی ئێستا دەڵێت: دەبێت بۆ قەرزەکەی بفرۆشرێیت، پێەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت کێ بەرپرسی حوبابە؟ واتە کێ سەرپەرشتی دەکات؟ وتیان ئەبولیوسری کوڕی عەمری برای، پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ لای و فەرمووی: (ئەو ئافرەتە ئازاد بکەن و ئەگەر بیستتان کۆیلەم بۆ هات وەرنەوە بۆ لام لەبری ئەم کۆیلەیەکتان پێ دەدەم)، ئەوەبوو ئەو ئافرەتەیان ئازاد کرد.[3]

## ١٠٣٤. حوبابی کوڕی قەیظی(رضي الله عنه)

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٩.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٥٣٢.

[3] سنن أبي داود - كتاب العتق - باب في عتق أمهات الأولاد ، الرقم ٣٩٥٣، ضعفه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٣٩٥٣، ضعفه شعيب الأرناؤوط.

ناوی حوبابی کوڕی قەیظییە، لە پشتیوانانە لە بەنی عەبدولئەشهەل، دایکی ناوی صعبەی کچی تیهانە،[1] لە غەزای بەدردا بەشدار بوو،[2] دواتریش لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[3]

## ١٠٣٥. حوبابی کوڕی مونذیر(ﷺ)

ناوی حوبابی کوڕی مونذیری کوڕی جەمووحە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان.[4]

دایکی ناوی شەمووسی کچی حەققە،[5] حوباب خوشکێکی هەبوو بە ناوی هیند کە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[6]

ژنەکەی حوباب ناوی زەینەبی کچی صەیفی بوو، لەم ژنەشی کوڕێکی هەبوو بە ناوی خەشرەم و کچێکی هەبوو بە ناوی ئوممو جەمیل،[7] هەروەها حوباب کوڕێکی تری هەبوو بە ناوی جوبەیر.[8]

حوباب لە غەزای بەدردا بەشدار بوو، لەو کاتەشدا تەمەنی سی و سێ ساڵ بووە،[9] لەو غەزایەدا ئاڵای خەزرەجیەکان بەدەست حوبابەوە بوو،[10] کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان گەیشتنە بەدر پێغەمبەر(ﷺ) لای بیری خوارووی بەدرەوە لایدا، جا حوبابی کوڕی مونذیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا دابەزینت لەم شوێنە فەرمانی خوایەو بۆمان نیە لێی لادەین یان رایەک و هونەری جەنگە؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (بل هو الرأي والحرب

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٥٣٣.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٩.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٥٣٣.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٩
[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٦٧.
[6] نفس المصدر، ج٨، ص ٣٩٧.
[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٦٧.
[8] أسد الغابة، ج١، ص ٣٩٦.
[9] أسد الغابة، ج١، ص ٥٣٣.
[10] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٤.

والمكيدة)، بەڵکو ئەوە راو هونەری جەنگە، حوباب وتی: دەی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم شوێنە باش نیە، بەڵکو هەستەو برۆ لە کۆتایی هەموو بیرەکانەوە بوەستە و با هەموو بیرەکان بکەونە پشتتەوەو هەموویان کوێر بکەرەوە تەنها بیرێکیان بمێنێتەوەو حەوزێکی بۆ دروست بکە، ئیتر کە لەگەڵ دوژمن دەجەنگین ئێمە ئاومان هەیە بیخۆینەوەو ئەوان ئاویان نابێت بیخۆنەوە، بەوجۆرە تا خوا حوکمی نێوانمان دەکات، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: رایەکی جوانت خستەڕوو، بۆیە وایکرد.[1]

حوباب لە هەموو غەزاکانی تردا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بەشداری کرد.[2]

لە غەزای ئوحوددا پێش ئەوەی بێباوەڕان بێن، پێغەمبەر(ﷺ) حوبابی نارد تا هەواڵی بێباوەڕانی بۆ وەربگرێت، ئەویش چوو و مەزندەی بێباوەڕانی کرد و زانیاری هێنایەوەو گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ).[3]

دواتریش لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) مایەوەو بەیعەتی مەرگی پێدا، واتە بەیعەتی پێدا تا مردن لەگەڵیدا بمێنێتەوە.[4]

هەروەها لە غەزای خەیبەریشدا پێغەمبەر(ﷺ) ئاڵایەکی دایە دەست حوبابی کوڕی مونذیر،[5] کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم قەڵای جوولەکەکانی فەتح کرد کەسێک بە ناوی عەزوەل لە جوولەکەکان هاتە دەرەوەو داوای جەنگی بەرامبەری کرد، ئەوەبوو خێرا حوباب لێی چووە پێشەوەو بە شمشێری دای لە دەستی و دەستی بڕی، کابرای جوولەکەش رایکرد و حوبابیش کەوتە شوێنی و کوشتی.[6]

---

[1] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٨٧٢، ضعفه الألباني في فقه السيرة ٢٣١/١-٢٣٢.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٥٣٤.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٣٧.

[4] نفس المصدر، ج٣، ص ٥٦٧.

[5] نفس المصدر، ج٢، ص ١٠٦.

[6] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٩٨.

دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) کە وتووێژێک لەنێوان هاوەڵاندا کرا لەسەر دانانی خەلیفەی یەکەم، حوباب پێشنیازی کرد ئەمیرێک لە کۆچەران بێت و ئەمیرێکیش لە پشتیوانان بێت،[1] بەڵام ئەبووبەکر بەرپەرچی ئەو رایەی دایەوە، ئەوەبوو دواتر بەیعەت بە ئەبووبەکر درا.[2]

حوباب لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططاب و لە تەمەنی سەروو پەنجا ساڵیەوە کۆچی دوایی کرد.[3]

## ١٠٣٦. حوبەیشی کوڕی خالید(رضي الله عنه)

ناوی حوبەیشی کوڕی خالیدی کوڕی سەعدی خوزاعیە، کونیەکەی ئەبوو صەخرە، خوشکێکی هەبوو بە ناوی ئوممو مەعبەد.[4]

کوڕێکیشی هەبوو بە ناوی هیشام کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[5]

حوبەیش لە فەتحی مەککەدا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو، چونکە حوبەیش لە بەشی سوپاکەی خالیدی کوڕی وەلیددا بوو،[6]هۆکاری کوژرانەکەشی ئەوەبوو کە حوبەیش رێی جیای گرتەبەر و لە سوپاکە جیابوویەوە، ئەوو کورزی کوڕی جابیر، ئەوەبوو هەردووکیان کوژران.[7]

## ١٠٣٧. حوبشی(رضي الله عنه)

ناوی حوبشی کوڕی جەنادەی کوڕی نەصری سەلوولیە، ئەم هاوەڵە یەکێکە لە بەشداربوانی حەجیماڵئاوایی، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و چوو لە کووفە نیشتەجێ بوو، لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٢٦٩.

[2] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٦.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠.

[4] الإصابة في تمييز الحابة، ج٢، ص ٢٧.

[5] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣٥٢٠.

[6] الإصابة في تمييز الحابة، ج٢، ص ٢٧.

[7] أسد الغابة، ج١، ص ٥٥٤.

ئەبووطالیبدا لەناو سوپای عەلیدا بەشداری جەنگەکانی کرد.[1]

حوبشی فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوەو دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (من سأل وله ما يغنيه فإنما يأكل الجمر).[2] (هەرکەس هێندەی پێویستی هەبێت و سواڵ و داواش بکات ئەوە پشکۆ دەخوات).

حوبشی دەڵێت: لە حەجی ماڵئاوایی لە عەرەفدا بووین پێغەمبەر(ﷺ) راوەستابوو، دەشتەکیەک هات بۆ لای و لایەکی عەباکەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) گرت و داوای شتی لێکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) شتێکی پێ بەخشی، ئیتر لەو کاتەوە سواڵ حەرام کرا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إِنَّ الْمَسْأَلَةَ لاَ تَحِلُّ لِغَنِيٍّ وَلاَ لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ ، إِلاَّ لِذِي فَقْرٍ مُدْقِعٍ أَوْ غُرْمٍ مُفْظِعٍ ، وَمَنْ سَأَلَ النَّاسَ لِيُثْرِيَ بِهِ مَالَهُ كَانَ خُمُوشًا فِي وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)، (بۆ کەسی دەوڵەمەند سواڵ و داواکردن حەڵاڵ نیە، بۆ کەسی بەتوانا و سەلامەتیش سواڵ حەڵاڵ نیە، مەگەر بەس بۆ کەسی زۆر هەژار یان پێگیراوی ناچار، هەرکەس داوا لە خەڵک بکات بۆ ئەوەی سامانەکەی پێ زیاد بکات، لە رۆژی دواییدا دەموچاوی بریندارە).[3]

## ١٠٣٨. حوەیطیبی کوڕی عەبدولعوززا(ﷺ)

ناوی حوەیطیبی کوڕی عەبدولعوززای کوڕی ئەبی قەیسی قورەیشی عامیریە، کونیەکەی ئەبوو موحەممەدە، لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو، لە غەزای حونەیندا بەشداری کرد.[4]

حوەیطیب دەڵێت: لە سەردەمی نەفامیدا دانیشتبووین کە ئافرەتێک هات و پەنای گرت بە کەعبە لە مێردەکەی، مێردەکەی هات و دەستی راکێشا بۆ ژنەکەی، ئەوەبوو دەستی لەکار کەوت، دواتریش لە کاتی هاتنی ئیسلامدا

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣.

[2] صحيح ابن خزيمة - كتاب الزكاة - جماع أبواب صدقة التطوع - باب التغليظ في مسألة الغني من الصدقة ، الرقم ٢٤٤٦، صححه الألباني في صحيح و ضعيف الجامع الصغير و زيادته، الرقم ٦٢٨١.

[3] جامع الترمذي - أبواب الزكاة عن رسول الله(ﷺ) - باب من لا تحل له الصدقة ، الرقم ٦٥٣، ضعفه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٦٥٣.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٤٤.

بینیم هەر دەستی لەکارکەوتبوو.[1]

حوەیطیب دواتر چوو لە مەدینە نیشتەجێ بوو و خانووەکەی خۆی لە مەککە فرۆشت بە موعاویە بە چل هەزار دینار.[2]

دەوترێت ئەم هاوەڵە نزیکەی سەد و بیست ساڵ ژیاوەو لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان و لە ساڵی پەنجاو چواری کۆچیدا وەفاتی کردووە.

## ١٠٣٩. حوەییەصەی کوڕی مەسعوود(ﷺ)

ناوی حوەییەصەی کوڕی مەسعوودی کوڕی کەعبە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە، بەشداری کردووە لە غەزای ئوحوددا، دواتریش لە غەزای خەندەق و هەموو غەزاکانی تریشدا بەشداری کردووە.[3]

هێشتا حوەییەصە موسڵمان نەبووبوو کە کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) پاش کوژرانی کەعبی کوڕی ئەشرەف فەرمووی: هەر جوولەکەیەکتان گرت بیکوژن، حوەییەصە بازرگانێکی جوولەکەی بینی و کوشتی.[4]

حوەییەصە دەڵێت: من هێشتا مێرمنداڵێک بووم لە مەدینە کە لەگەڵ جوولەکەکان تێکەڵ بوین، ئەوان دەیانوت لە مەککە پێغەمبەرێک دەردەکەوێت ناوی وەحمەدەو کۆتای پێغەمبەرانەو لە کتێبماندا باسی کراوەو سیفەتی ئاواو ئاوایە، ئەوەبوو کابرایەکی بەنی عەبدولئەشهەل هات و هاواری کرد وتی: ئەی خەڵکی یەسریب ئەوە هەسارەی ئەو ئەحمەدەیە کە بەهۆی لەدایکبوونیەوە دەرکەوتووە، ئێمەش سەرمان سوڕ دەما لەوە، ئیتر ماوەیەکی زۆر تێپەڕی و من بوومە پیاوێکی تەواو و خەڵکێکی زۆر مردن و خەڵکێکی تر هاتن، ئەمجار کەسێکی ترم بینی هاواری دەکرد ئەی خەڵکی یەسریب وا

---

[1] المستدرک علی الصحیحین، الرقم ٦٠٩٢، سکت عنه الذهبي، المعجم الکبیر للطبراني، الرقم ٢٩٩٩.

[2] الإصابة في تمییز الصحابة، ج٢، ص ١٤٤.

[3] الإصابة في تمییز الصحابة، ج٢، ص ١٤٣.

[4] المطالب العالیة، الرقم ٤٣٥٢.

ئەحمەد دەرکەوت و ئەو نامووسە گەورە هاتووە بۆ لای کە چووبوو بۆ لا مووسایش، هێندەی نەبرد بیستم لە مەککە کەسێک دەرکەوتووە بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکات، خەڵکی لە ئێمە موسڵمان بوون، بەڵام قەزا وابوو من موسڵمان نەبووم تا پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە.[1]

## ١٠٤٠. حوتاتی کوڕی زەید(ﷺ)

ناوی حوتاتی کوڕی زەیدی کوڕی عەلقەمەی موجاشعیە، یەکێک بوو لە ئەندامانی وەفدی بەنی تەمیم، هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بووە.[2]

دەوترێت پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستووەتە نێوان حوتات و موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیانەوەو دواتر حوتات کە مردووە موعاویە میراتی برایی لێ وەرگرتووە،[3] بەڵام دەزانین وەرگرتنی میراتی لە برایەتی کۆچەران و پشتیواناندا لەکارخرا، موعاویەش لە فەتحی مەککە یان کەمێک پێش فەتحی مەککە موسڵمان بوو، بۆیە ئەم رووداوە بەڵگەی دروستی نیە.

## ١٠٤١. حوجەیری کوڕی ئەبی ئیهاب

ناوی حوجەیری کوڕی ئەبی ئیهابی کوڕی عەزیزی تەمیمیە،[4] لە رۆژی فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو و هاودەمی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کرد.[5]

کاتێک لە رۆژی رەجیعدا ژمارەیەک لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) ناپاکییان

(١) دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٣٧.
(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٩.
(٣) أسد الغابة، ج١، ص ٥٥٥.
(٤) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤٠.
(٥) الجزء المتمم لطبقات ابن سعد، ج١، ص ١٠٤.

بەرامبەر کرا، یەکێک لەو هاوەڵانە خوبەیبی کوڕی عەددی بوو کە برایە مەککە تا بفرۆشرێت، ئەوەبوو حوجەیر خوبەیبی کڕی بۆ بەنی حارث تا خوبەیب لەبری باوکیان بکوژنەوە.[1]

## ١٠٤٢. حوجەیری کوڕی ئەبی حوجەیر(﵁)

ناوی حوجەیری کوڕی ئەبی حوجەیری هیلالی یان حەنەفیە،[2] لە حەجی ماڵئاواییدا بەشدار بووەو فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەڵێت: لە حەجی ماڵئاواییدا دەیفەرموو (یا أیها الناس أي بلد هذا؟، قالوا بلد حرام، قال فأي شهر هذا؟ قالوا شهر حرام، قال فأي يوم هذا؟ قالوا يوم حرام، قال :ألا إن دماءكم وأموالكم وأعراضكم عليكم حرام كحرمة يومكم هذا كشهركم هذا كحرمة بلدكم هذا، فليبلغ شاهدكم غائبكم لا ترجعوا بعدي كفارا يضرب بعضكم رقاب بعض)،[3] (ئەی خەڵکینە ئەمە کوێیە؟ وتیان شاری حەرامە (کوشتار تیایدا حەرامە)، فەرمووی: ئەی ئەمە چ مانگێکە؟ وتیان مانگی حەرامە، فەرمووی: ئەی ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ وتیان ڕۆژی حەرامە، فەرمووی: دەی بزانن خوێن و ماڵ و سامان و ناموستان لەیەکدی حەرامەوە وەک حەرامی ئەمڕۆتان و ئەم مانگەتان و ئەم شوێنەتان، با ئەوەی لە ئێوە ئامادەیە ئەمە بگەیەنێت بەوەتان کە ئامادە نیە، دوای من بێباوەڕ مەبنەوەو نەکەن بدەن لە گەردنی یەکدی).

## ١٠٤٣. حوجر ئەبوو عەبدولا(﵁)

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٤٤٠.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤٠.

[3] المستدرك على الصحيحين - كتاب الأهوال - يفترق الناس عند خروج الدجال ثلاث فرق، الرقم ٨٨٧٢.

ناوی حوجرەو کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدولا کە فەرموودەیەکی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، حوجر دەڵێت: من لە دوای پێغەمبەری خواوە(ﷺ) قورئانم دەخوێند، ئەویش فەرمووی (ئەی حوجر بیڵێ تا خوا بیبیستێت نەک من بیبیستم).[1]

## ١٠٤٤. حودەیر(ﭬ)

ناوی حودەیرەو باسی لە فەرموودەیەکدا هاتووە،[2] ئیبن عومەر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) سوپایەکی نارد کە کەسێکیان لەناودا بوو ناوی حودەیر بوو، ئەو ساڵ کەمخۆراکی بوو، پێغەمبەر(ﷺ) خواردنی دا بە هەموویان بەڵام بیری چوو خواردن و توێشوو بدات بە حودەیر، حودەیریش داوای نەکرد و خۆڕاگر بوو و چاوەڕێی پاداشت بوو لای خواو لە کۆتای سوپاکەشدا بوو، ئەو دەیوت لا اله الا الله والله اکبر والحمد لله وسبحان الله ولا حول ولا قوه الا بالله، ئینجا دەیوت چاکترین توێشوو ئەمەیە ئەی خوایە، ئیتر بەردەوام ئەمەی دەوتەوە، ئەوەبوو جبرەئیل هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی فەرموو (پەروەردگارم منی ناردووە بۆ لات تا هەواڵت پێ بدات تۆ توێشووت داوە بە هاوەڵەکانت و بیرت چووە توێشوو بدەیت بە حودەیر و ئەویش لە کۆتایی سوپاکەوەیەو دەڵێت: لا اله الا الله والله اکبر والحمد لله وسبحان الله ولا حول ولا قوه الا بالله، ئینجا دەڵێت: چاکترین توێشوو ئەمەیە ئەی خوایە، بۆیە ئەو قسانەی رووناکیە بۆ رۆژی دوایی، رووناکیەک هێندەی نێوانی ئاسمان و زەوی، بۆیە توێشووی بۆ بنێرە، پێغەمبەریش(ﷺ) کەسێکی بانگ کرد و توێشووەکەی حودەیری پێدا و فەرمانی پێکرد کە گەیشتە لای ئەوەی پێی دەڵێت: لەبەری بکات و کە توێشووەکەی پێدات هەروا پێی بڵێت پێغەمبەر(ﷺ) سەلامت لێدەکات و هەواڵت پێدەدات کە ئەو بیری چووە توێشووت پێبدات

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٥٦٤.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤٢.

و پەروەردگار جبریلی ناردووە بۆ لام و تۆی بیرخستوومەتەوەو ئەوەی بە جبرەئیل فەرمووەو شوێنی تۆی پێ فەرمووە، ئەوەبوو کە کابرا گەیشتە لای حودەیر دەبینێت حودەیر دەڵێت: لا اله الا الله و الله اکبر و الحمد لله و سبحان الله ولا حول ولا قوه الا بالله، ئینجا دەیوت ئەی خوایە چاکترین توێشوو ئەمەیە ، کابراش نزیک بوویەوە لە حودەیر و پێغەمبەر(ﷺ) چی پێ فەرموو بوو پێی گەیاند، حودەیریش سوپاس و ستایشی خوای کرد و وتی: سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانیان کە لە سەروو حەوت ئاسمانەوە و لە سەروو عەرشیەوە منی بیربووەو باسی کردووم و رەحمی هەبووە بۆ برسێتی و لاوازیم، خوایە وەک چۆن پێشتر حودەیرت لەبیر نەکرد وایش بکە حودەیر تۆ لەبیر نەکات، کابرا ئەم قسانەی حودەیری لەبەر کرد و گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بۆی باسکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (دەی ئەگەر سەرت بەرەو ئاسمان بەرز بکردایەتەوە بۆ ئەو قسەیەی، رووناکیەکت بەدیدەکرد درەوشاوە هێندەی نێوانی ئاسمان و زەوی).[1]

## ١٠٤٥. حوذافەی کوڕی نەصر(رضي الله عنه)

ناوی حوذافەی کوڕی نەصری کوڕی غانیمی قورەیشیە، پاش فەتحی مەککە موسڵمان بووە، لەگەڵ براکانیدا هەموویان بە نەخۆشی تاعوون مردن.[2]

## ١٠٤٦. حوذەیفەی کوڕی ئەسید(رضي الله عنه)

ناوی حوذەیفەی کوڕی ئەسیدی کوڕی خالیدە، کونیەکەی ئەبوو سەریحەیە و زیاتر بە کونیەکەی ناسراوە.[3]

حوژەیفە یەکەم بەشداری کردنی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە حودەیبیەدا

[1] الحث على التجارة و الصناعة لابي بكر بن الخلال، رقم الحديث ١٠٣.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤٣.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤٣.

بـوو.[1]

لە بەیعەتی ریضواندا بەشداری کرد.[2]

حوذەیفە دەڵێت: جارێک پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لامان و فەرمووی: نوێژ بکەن لەسەر برایەکتان کە لە خاکێکی جیا لەم خاکەی ئێوە مردووە، وتیان ئەو کەسە کێیە؟ فەرمووی: نەججاشیە،[3] حوذەیفە دەڵێت: ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لە دوای خۆیەوە ریزی کردین و نوێژی لەسەر کرد.[4]

سەبارەت بە نوێژی غائیب لەسەر مردوو ئەلبانی رای وایە ئەگەر کەسێکی موسڵمان لە وڵاتێک مرد و موسڵمانانی ئەوێ نوێژیان لەسەر کرد ئیتر لە شوێنانی تر نوێژی غائیبی لەسەر ناکرێت، بەڵام ئەگەر نوێژی لەسەر نەکرابوو ئەوە دەکرێت لە شوێنانی ترەوە موسڵمانان نوێژی غائیبی لەسەر بکەن.[5]

حوذەیفە دەڵێت: رۆژێک ئێمە لەناو خۆماندا قسەمان دەکرد کە پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لامان و فەرمووی: باسی چی دەکەن؟ وتمان: باسی رۆژی دوایی دەکەین، ئەویش فەرمووی: (إنها لن تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات - فذكر - الدخان، والدجال، والدابة، وطلوع الشمس من مغربها، ونزول عيسى ابن مريم، ويأجوج ومأجوج، وثلاثة خسوف خسف بالمشرق، وخسف بالمغرب، وخسف بجزيرة العرب، وآخر ذلك نار تخرج من اليمن، تطرد الناس إلى محشرهم)،[6] (رۆژی دوایی نایەت تا پێش ئەوە دە ئامـاژەو نیشـانە دەبینن، ئینجا باسی دووکەڵەکەو دەججال و ئاژەڵەکە و خۆرهەڵهاتن لە خۆرئاواوەو دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم و یەئجووج و مەئجووج و سێ رۆچوونی زەوی کرد، رۆچوونێک لە رۆژهەڵاتەوەو

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٦، ص ٢٤.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٥٧٠.

[3] مسند أحمد بن حنبل - أول مسند المدنيين(ﷺ) أجمعين - حديث أبي سريحة الغفاري حذيفة بن أسيد(ﷺ) ، الرقم ١٦٣٩٨، سنن ابن ماجه - أبواب الجنائز - باب ما جاء في الصلاة على النجاشي ، الرقم ١٥٣٧، صححه الألباني في إرواء الغليل ١٧٧/٣.

[4] مسند أبي داود الطيالسي - وحذيفة بن أسيد الغفاري، الرقم ١١٦٤.

[5] أحكام الجنائز، ٩٢/١- ٩٣/١.

[6] صحيح مسلم - كتاب الفتن وأشراط الساعة - باب في الآيات التي تكون قبل الساعة، الرقم ٢٩٠١.

ڕۆژچوونێک لە ڕۆژئاواوەو ڕۆچوونێک لە نیمچە دوورگەی عەرەب، کۆتایشیان ئاگرێکە لە یەمەنەوە دەردەچێت کە خەڵکی بەرەو مەحشەریان ڕاو دەنێت).

حوذەیفە دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبوو طالیبم بینی کە خۆر لە نیوەی ئاسمان لایدەدا-پاش نیوەڕۆ- چوار ڕکات نوێژی دەکرد، منیش پرسیارم لێکرد بۆ ئەمە دەکەیت؟ عەلی وت: من پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی ئەم نوێژەی دەکرد و منیش پرسیارم لێکرد بۆ ئەو نوێژە دەکەیت ئەویش فەرمووی: (إن أبواب السماء تفتح إذا زالت الشمس ، فلا ترتج حتى تصلي الظهر ، فأحب أن يرفع لي إلى الله عز وجل عمل)،[1] (کاتێک خۆر لە نیوەی ئاسمان لادەدات دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوەو داناخرێن تا نوێژی نیوەڕۆ دەکرێت، بۆیە منیش حەز دەکەم کردەوەم بۆ لای خوای گەورە بەرز بێتەوە).

حوذەیفە لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا لە فتووحاتدا بەشداری کرد، ئەوەتا لە فەتحی ئازەربایجاندا بەشدار بووەو یەکێک بووە لە سەرکردەکانی ناو سوپاکەی سوراقەی کوڕی عەمر و پاش ئەوەی گەیشتنە نزیک ناوچەی پاشا شەهر برازای پاشای ئەرمینیا داوای پەنای کردو بەوە ناوچەکە بێ جەنگ گیرا، ئەوکات سوراقە حوذەیفەو چەند سەرکردەیەکی تری نارد بۆ ئەو ناوچە شاخاویانەی لە دەوری ئەرمینیا بوون.[2]

ئەم هاوەڵە دواتر چوویە کووفەو لەوێ وەفاتی کرد و زەیدی کوڕی ئەرقەم نوێژی لەسەر کرد،[3] مردنەکەشی لە ساڵی چل و دووی کۆچیدا بوو.[4]

---

[1] المطالب العالية بزوائد المسانيد الثمانية - كتاب النوافل - باب رواتب الصلاة والمحافظة عليها، الرقم ٧٦٢.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٢٢-١٢٣.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٥٧٠.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤٣.

## ١٠٤٧. حوذەیفەی کوڕی ئەوس(ﷺ)

نـاوی حوذەیفـەی کـوڕی ئەوسـەو چەنـد فەرموودەیەکـی لـە پێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) گێڕاوەتـەوە.[١]

## ١٠٤٨. حوذەیفەی کوڕی یەمان(ﷺ)

نـاوی حوذەیفـەی کـوڕی حیسـل یـان حوسـەیلی کـوڕی جابیـری کـوڕی عمـری عەبەسـیە، کونیەکـەی ئەبـوو عەبدوڵایـە، زیاتـر بـە حوذەیفـەی کـوڕی یەمـان دێـت، بـەڵام یەمـان نازنـاوی حیسـلی باوکـی بـووە، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو بۆیـە باوکـی پێـی وتـراوە یەمـان چونکـە کەسـێکی کوشـتووەو رایکردووە بۆ مەدینـەو هاوپەمانـی کـردووە لەگـەڵ بەنـی عەبدولئەشـهەل ئیتـر هۆزەکـەی پێیـان وتـووە یەمـان لەبەرئـەوەی لەگـەڵ پشـتیوانان هاوپەیمانـی کـردووە لەکاتێکدا ئـەوان یەمەنیـن،[٢] حیسـلی باوکیشـی هاوەڵـی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـووەو لـە غـەزای ئوحـوددا بەشـداری کـردووە، بـەڵام بـە دەسـتی یەکێـک لـە هـاوەڵان کـوژرا چونکـە ئـەو هاوەڵـە نەیناسـیەوەو وایزانـی لـە بێباوەڕانـە، چونکـە سـوپای موسـڵمانان زۆریـان دەموچاویـان داپۆشـیبوو، بۆیـە دەبـوو نیشـانەیەکیان هەبوایـە تـا بناسـرێنەوە، ئەوەبـوو حوذەیفـە کاتێـک بینـی هێـرش بـرا بـۆ باوکـی هـاواری دەکـرد باوکـم باوکـم، بـەڵام دەنگـی نەگەیشـت و باوکـی بـە هەڵـە کـوژرا، دواتـر حوذەیفـە خوێـن بایـی باوکـی وەرنەگـرت و لـە موسـڵمانان خـۆش بـوو.[٣]

دایکیشـی هـاوەڵ بـوو و نـاوی ربابـی کچـی کەعـب بـوو،[٤] حوذەیفـە دەڵێـت: جارێـک دایکـم پێـی وتـم: لـە کەیـەوە نەچوویتەتـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ)؟

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤٣.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٥٧٢-٥٧٣.
[٣] سير أعلام النبلاء، ج٢،ص ٣٦٢.
[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٣١٧، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٣٩.

منیش وتم: ماوەیەکە، ئەوەبوو لێم تووڕە بوو، منیش وتم: باشە ئێستا دەچم بۆ لای پێغەمبەر و نوێژی لەگەڵ دەکەم بەڵکو داوای لێخۆشبوون بۆ من و تۆیش بکات، چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و لە دوایەوە نوێژی ئێوارەم کرد، ئینجا کە پێغەمبەر(ﷺ) چوو منیش شوێنی کەوتم، فەرمووی: ئەوە کێیە؟ وتم: حوذەیفەی کوڕی یەمان، فەرمووی: بۆچی هاتویت؟ منیش بۆم باس کرد دایکم چی پێ وتووم و چی روویداوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خوا لە تۆ و دایکیشت خۆش بێت).[1]

ئەم هاوەڵە یەکێکە لە گەورە هاوەڵە ناسراوو نزیکەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ).[2]

برایەکی هەبوو بە ناوی صەفوان کە ئەویش لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد.[3]

برایەکی تری ناوی عەبدولعەزیز بوو کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[4]

خوشکێکیشی هەبوو بە ناوی خەولە کە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە،[5] خوشکێکی تریشی ناوی لەیلا بوو کە دایکی هاوەڵی گەورەی پێغەمبەر(ﷺ) سەلەمەی کوڕی ثابتی کوڕی وەقش بوو،[6]خوشکێکی تری ناوی فاتیمە بوو کە ئەمیش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[7]

---

[1] صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله عليهم أجمعين - ذكر عمرو بن العاص السهمي(ﷺ) - ذكر دعاء المصطفى(ﷺ) لحذيفة بن اليمان بالمغفرة ، الرقم ٧١٢٦، صححه شعيب الأرناؤوط.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤٤.

[3] أسد الغابة، ج٣، ص ٣٣.

[4] أسد الغابة، ج٣، ص ٥٢٣.

[5] أسد الغابة، ج٧، ص ١٠٩.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٤١.

[7] أسد الغابة، ج٧، ص ٢٥٢.

حوزەیفە ژنێکی هەبوو بە ناوی جومانەی کچی موسەییب،[1] ژنێکی تریشی هەبوو کە کچی حیراش بوو و خوشکی ربعی بوو.[2]

کاتێک حوزەیفەو باوکی ویستیان بەرەو مەدینە کۆچ بکەن، ڕێیان کەوتە ئەبوو جەهل، ئەبووجەهل وتی: بۆ کوێ دەچن؟ ئەوانیش وتیان هەروا دەڕۆین، ئەویش وتی: دەزانم بۆ پاڵپشتی موحەممەد دەچن، بۆیە بەڵێنیان وەرگرت لە هەردووکیان کە نەبنە نەیاریان، ئەوەبوو کە باوک و کوڕ چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە.[3]

کاتێک حوزەیفە کۆچی کرد بۆ مەدینە پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان ئەوو عەمماری کوڕی یاسرەوە.[4]

**لە غەزای بەدردا**

حوزەیفە لە هەموو غەزاکاندا بەشداری کرد جگە لە غەزای بەدر، ئەویش لەبەرئەوەی کەمێک پێش غەزای بەدر حوزەیفە و باوکی کەوتنە دەست قورەیشیەکان، ئەوانیش بەو مەرجە ئازادیان کردن بەڵێنیان پێبدەن لەدژیان بەشدار نەبن، بۆیە کە گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و مەسەلەکەیان بۆ باسکرد، ئەویش فەرمانی کرد بەڵێنەکەیان ببەنەسەرو فەرمووی (انْصَرِفَا، نَفِي لَهُمْ بِعَهْدِهِمْ وَنَسْتَعِينُ اللَّهَ عَلَيْهِمْ).[5]

**لە غەزای ئوحوددا**

حوزەیفە هاودەم بە حیسلی باوکی لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد، بەڵام حیسلی باوکی بە دەستی یەکێک لە هاوەڵان کوژرا، ئەو هاوەڵە نەیناسیەوەو وایزانی لە بێباوەڕانە، چونکە سوپای موسڵمانان زۆریان دەموچاویان داپۆشیبوو، بۆیە دەبوو نیشانەیەکیان هەبوایە تا بناسرێنەوە،

[1] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٨، ص ٤٨٢.
[2] المستدرک علی الصحیحین، الرقم ٣٧١.
[3] سیر أعلام النبلاء، ج٢، ص ٣٦٣.
[4] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٣، ص ٢٥٠.
[5] صحیح مسلم - کتاب الجهاد والسیر - باب الوفاء بالعهد، الرقم ١٧٨٧.

حوذەیفە کاتێک بینی هێرش برا بۆ باوکی هاواری دەکرد باوکم باوکم، بەڵام دەنگی نەگەیشت و باوکی بە هەڵە کوژرا، دواتر حوذەیفە خوێن بایی باوکی وەرنەگرت و لە موسڵمانان خۆش بوو.[1]

لە ئوحوددا پێغەمبەر(ﷺ) حوسەیل و ثابتی کوڕی وەقشی دانابوو تا لای ژن و منداڵەکان بن چونکە ئەو دوانە بە تەمەن بوون،[2] جا ئەو دوانە خەزووری کوڕو کچی یەک بوون، واتە حوسەیل لەیلای کچی خۆی دابوو بە سەلەمەی کوڕی ثابت،[3] ئەوەبوو یەکێکیان بەوی تری وت: ماڵوێران بەخوا هیچکام لەم دوانەمان تەمەنێکی وامان بۆ نەماوەتەوەو ئەمڕۆ یان سبەی دەمرین، وەرە با شمشێرەکانمان هەڵگرین و بگەینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بەڵکو خوا شەهیدیمان پێ ببەخشێت، ئەوەبوو هەردوو نەوینە شمشێر و خۆیان گەیاندە پێغەمبەر(ﷺ) و چوونە ناو موسڵمانان و موسڵمانانیش وایاندەزانی ئەوان نەهاتوونەتە ناو جەنگەکەوە، ئەوەبوو ثابت بە دەستی بێباوەڕان شەهید بوو و حوسەیلیش بە هەڵە بە دەستی هاوەڵێک کوژرا.[4]

**لە غەزای خەندەقدا**

حوذەیفە لە غەزای خەندەقیشدا بەشدار بوو و لەگەڵ سەلمان و عەمر و نوعمان و چەند هاوەڵێکی تری پشتیواناندا لە بەشێکی خەندەقەکەدا سەرقاڵ بوون تا ئەوەی بەردێکی گەورەی سپییان هاتەڕێ و پێغەمبەریان(ﷺ) بانگکرد و ئەو شکاندی.[5]

لە غەزای خەندەقدا نێردراوی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بۆ هەواڵ وەرگرتنی دوژمن، ئەوەتا خۆی دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: لە خەندەقدا ڕەشەباو سەرمایەکی

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٢،ص ٣٦٢.

[2] أسد الغابة، ج٢، ص ٢٣.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٤١.

[4] أسد الغابة، ج٢، ص ٢٣.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٨٣.

سەخت بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ألا رجل يأتيني بخبر القوم جعله الله معي يوم القيامة)، (ئەرێ کەسێک هەیە هەواڵی دوژمنم بۆ بهێنێت تا لە رۆژی دواییدا خوا لەگەڵ من بیهێڵێتەوە؟) ئێمەش هەموو بێدەنگ بووین و کەسمان نەچووین، پێغەمبەر(ﷺ) دووبارە هەمان شتی دووبارە کردەوەو ئێمەش هەر بێدەنگ بووین، پێغەمبەر(ﷺ) بۆ جاری سێیەم ئەوەی دووبارە کردەوەو ئێمەش هەر بێدەنگ بووین، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی حوذەیفە هەستە بڕۆ هەواڵی دوژمنمان بۆ بهێنە)، منیش ئیتر چارم نەما، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) بە ناوهێنان ناوی هێنام تا هەستم و بڕۆم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بڕۆ هەواڵی دوژمنم بۆ بهێنەو مەیانوروژێنە لێم)[1] ترس و بیمێکی زۆرم هەبوو، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای بۆ کردم و فەرمووی: (خوایە لە بەردەم و دواوەو راست و چەپیەوە بیپارێزیت) ئیتر سوێند بەخوا چی ترس و بیم لە دڵماد هەبوو هیچی نەما،[2] منیش چووم و زۆر بە وریایی و لەسەرخۆیی دەچووم تا چوومە ناویانەوە، ئەبووسوفیانم بینی پشتی کردبووە ئاگرەکەو پشتی گەرم دەکردەوە،[3] کەسێکی گەورەو کەڵەگەت بوو و منیش ئەوکات نەمدەزانی ئەبووسوفیانە، ئەو دەیوت دەبێت بڕۆین،[4] منیش تیرێکم خستە ناو کەوانەکەوە و ویستم بیکوژم، بەڵام فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیر کەوتەوە کە فەرمووی: مەیانوروژێنە لێم، بۆیە نەمکوشت، ئەگینا بۆم بهاویشتایە بە دڵنیاییەوە دەمپێکا،[5] ئینجا چوومە نێوان دوو کەسیانەوە، کابرایەک وتی:

---

[1] صحيح مسلم - كتاب الجهاد والسير - باب غزوة الأحزاب ، الرقم ١٧٨٨، صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله عليهم أجمعين - ذكر عمرو بن العاص السهمي(ﷺ) - ذكر حذيفة بن اليمان(ﷺ)، الرقم ٧١٢٥.

[2] مستخرج أبي عوانة، الرقم ٥٤٨٧.

[3] صحيح مسلم - كتاب الجهاد والسير - باب غزوة الأحزاب ، الرقم ١٧٨٨، صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله عليهم أجمعين - ذكر عمرو بن العاص السهمي(ﷺ) - ذكر حذيفة بن اليمان(ﷺ)، الرقم ٧١٢٥.

[4] مستخرج أبي عوانة، الرقم ٥٤٨٧.

[5] صحيح مسلم - كتاب الجهاد والسير - باب غزوة الأحزاب ، الرقم ١٧٨٨، صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله عليهم أجمعين - ذكر عمرو

ئەمشەو هەواڵگر و شت دێن، بۆیە هەرکامتان پرسیار بکەن لەوەی پاڵ خۆتان بزانن کێیە؟ منیش خێرا بەوەی لای راستم وت: تۆ کێیت؟ بەوەی لای چەپیشم وت: تۆ کێیت؟[1] ئینجا دواتر گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵەکانم پێدا، سەرمایەکی سەختیشم چەشتبوو، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) عەبایەکی پێبوو کە نوێژی پێوە دەکرد ئەو عەبایەی دا بەسەرمدا، خەوم لێکەوت و تا بەیانی هەڵنەسام، کە بەیانی هەستام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هەستە خەواڵوو).[2]

**لە غەزای تەبووکدا**

حوذەیفە لە غەزای تەبووکیشدا بەشدار بوو، جا کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە تەبووکەوە بەرەو مەدینە دەگەڕایەوە، دەستەیەک لە دووڕووان ویستیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەناوبەرن و لە سەروو عەقەبەوە فڕێی دەنە خوارەوە، پێغەمبەری خواش(ﷺ) هەواڵی ئەوەی زانیبوو، ئەوەبوو فەرمانی کرد خەڵکی بچن و خۆی لەگەڵ دەستەیەک لە عەقەبەوە سەرکەوت، ئەو دەستە دووڕووەش دەموچاویان داپۆشیبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد هەریەک لە عەمماری کوڕی یاسر و حوذەیفەی کوڕی یەمان لەگەڵی بڕۆن، ئەو دوانەش بە پیادە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەچوون، کاتێک ئەو دەستەیە ناپاکییان نواند پێغەمبەر(ﷺ) تووڕە بوو و حوذەیفەش تووڕەییەکەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بینی، بۆیە گەڕایەوە بۆیان و بە کەوانەکەی دەستی کەوتە دەموچاوی سوارەکانیان، ئەوانیش زانییان دەستەکەیان ئاشکرا بووە، خێرا خۆیان تێکەڵ کردەوە بە خەڵکەکە، ئینجا حوذەیفە گەڕایەوەو پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمانی کرد خێرا بکەن تا عەقەبەیان بڕی و چاوەڕێی خەڵکەکەیان کرد، پێغەمبەر(ﷺ) بە حوذەیفەی فەرموو ئەو خەڵکەت ناسیەوە؟ ئەویش وتی:

---

بن العاص السهمي(ﷺ) - ذكر حذيفة بن اليمان(ﷺ)، الرقم ٧١٢٥.

[1] مستخرج أبي عوانة، الرقم ٥٤٨٧.

[2] صحيح مسلم - كتاب الجهاد والسير - باب غزوة الأحزاب ، الرقم ١٧٨٨، صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله عليهم أجمعين - ذكر عمرو بن العاص السهمي(ﷺ) - ذكر حذيفة بن اليمان(ﷺ)، الرقم ٧١٢٥.

تەنها سوارەکانیان دەناسەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بەسەرهاتەکەی باس کرد بۆ حوزەیفە و ناوی ئەو دووروانەی فەرموو بە حوزەیفە کە کێ و کێ بون،[١] ئەوانەش ژمارەیان دوانزە یان چواردە کەس بوو.[٢]

حوزەیفە دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: دووڕووەکانی ئەمڕۆ زۆر خراپترن لەوانەی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)، دووروان لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) بە شاراوەیی دووڕوو بوون، بەڵام ئەمڕۆ بە ئاشکرا نیشانی دەدەن.[٣]

حوزەیفە زۆر جار لە نزیک پێغەمبەرەوە(ﷺ) بوو، جار هەبوو دەبووە شایەتی پەیمانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەنووسران بۆ هۆزەکان کاتێک دەهاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[٤]

هەروەها لە میوانداری و کاتی نانخواردنیش جار هەبوو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو، حوزەیفە دەڵێت: ئێمە کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نانمان دەخوارد دەستمان نەدەبرد بۆ خواردنەکە تا پێغەمبەر(ﷺ) دەستی پێدەکرد.[٥]

حوزەیفە چەندین فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، نزیکەی دوانزە فەرموودەی لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە.[٦]

هەروەها حوزەیفە زۆر گوێی دەدا بە مەسەلەکانی فیتنەو مەترسیەکانی و بارو نارەحەتیەکانی ڕۆژی دوایی، ئەوەبوو هەمیشە لەو بارەوە پرسیاری دەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ)،حوزەیفە دەڵێت: خەڵکی هەمیشە سەبارەت بە خێر و چاکە پرسیاریان لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، بەڵام من سەبارەت بە فیتنە پرسیارم لێدەکرد لە ترسی ئەوەی نەبادا فیتنەم تووش بێت.[٧]

لە گێڕانەوەیەکی تردا دەڵێت (سوێند بەخوا لە هەموو کەس شارەزاترم

---

[١] البداية والنهاية لانب كثير، ج٥، ص ١٩.

[٢] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٢٠.

[٣] صحيح البخاري – كتاب الفتن – باب إذا قال عند قوم شيئا ثم خرج فقال بخلافه، الرقم ٧١١٣.

[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٣٥٢.

[٥] صحيح مسلم – كتاب الأشربة – باب آداب الطعام والشراب وأحكامها، الرقم ٢٠١٧.

[٦] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٣٦٢.

[٧] صحيح البخاري – كتاب المناقب – باب علامات النبوة في الإسلام، الرقم ٣٦٠٦.

بە هەر فیتنەیەک کە لەنێوان من تا رۆژی قیامەتدا روودەدات، بەڵام ئەوە هەیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە نهێنی هەندێ شتی بە من فەرمووە کە بە کەسی تری نەفەرمووە).[1]

**لە سەردەمی خیلافەتی عومەردا:**

حوذەیفە نهێنی پارێزی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و ناوی هەموو دووڕووەکانی دەزانی، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووبوو و فەرمانی پێکردبوو نهێنیەکان بپارێزێت، جا عومەری کوڕی خەططاب پرسیاری لێدەکرد ئەی حوذەیفە ئایا من لە دوورەکانم؟ ئەویش دەیوت نا، بەڵام ئیتر دوای تۆ لەو بارەوە وەڵامی کەس نادەمەوە.[2]

عومەری کوڕی خەتتاب پرسیاری لە حوذەیفە دەکرد دەیوت ئەرێ لەنێو کاربەدەستەکانمدا کەسی دووڕوو هەیە؟ ئەویش دەیوت بەڵێ یەکێک هەیە؟ عومەر وتی: کێیە؟ حوذەیفە وتی: پێت ناڵێم، ئەوەبوو دواتر عومەر ئەو کەسەی لابرد، حوذەیفە دەیوت دەتوت عومەر زانیویەتی دووڕووەکە ئەو کەسەیە.[3]

هەروەها کاتێک لە سەردەمی عومەردا کەسێک دەمرد عومەر دەوەستا تا بزانێت حوذەیفە ئامادەیە نوێژی لەسەر بکات، ئەگەر ئامادە بوایە ئەویش نوێژی لەسەر ئەکرد، ئەگەریش ئامادە نەبوایە عومەریش نوێژی لەسەر نەدەکرد نەبادا دووڕووو بێت و ئەو نوێژی لەسەر بکات.[4]

حوذەیفە لە جەنگی نەهاوەندا بەشداری کرد، جا کاتێک نوعمانی کوڕی موقەرەن کە ئەمیری سوپاکە بوو کوژرا، نوعەیمی کوڕی موقەرەن ئاڵاکەی لە دەستی برا شەهیدەکەی وەرگرت و دایە دەست حوذەیفە،[5] حوذەیفەش

[1] صحيح مسلم - كتاب الفتن وأشراط الساعة - باب إخبار النبي(ﷺ) فيما يكون إلى قيام الساعة، الرقم ٢٨٩١.

[2] سير أعلام النبلاء، ج٢، ٣٦٤.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٥٧٣.

[4] أسد الغابة، ج١، ص ٥٧٣.

[5] أسد الغابة، ج٥، ص ٣٦٤.

ئاڵاکەی گرتە دەست و سەرکردایەتی گرتە دەست،[1] حوزەیفە داوای کرد لە نوعەیم تا مەرگی براکەی بشارێتەوەو بە کەسی نەڵێت بۆ ئەوەی ورەی سوپاکە نەڕووخێت، ئینجا شەو داهات و سوپای بێباوەڕان شکان،[2] ئەوەبوو فەتحی هەمەدان و ڕەی و دەینەوەریش لەسەر دەستی ئەو بوو، هەروەها بەشداریش بوو لە فەتحی جەزیرەدا، دواتریش چووە نصیبین و لەوێ نیشتەجێ بوو و لەوێیش ئافرەتێکی بەهاوسەر گرت.[3]

حوزەیفە لە سەردەمی خیلافەتی عومەردا والی مەدائین بوو، عومەری کوڕی خەططاب ئەوی کرد بە والی مەدائین، حوزەیفە بەڵێنی خۆی خوێندەوە بۆیان، ئینجا خەڵکەکە وتیان چیت دەوێت داوای بکە، ئەویش وتی: تەنها خواردنی بۆ خۆم و ئالیکی بۆ گوێدرێژەکەمم دەوێت تا لەنێوتاندا بم، ئەوەبوو ماوەیەکی زۆر لەوێ بوو، ئینجا عومەر نامەی بۆ نارد وەرەوە، ئەویش گەڕایەوە، کاتێک عومەر بیستی دەگەڕێتەوە لەسەر ڕێ بە نهێنی دانیشت تا بیبینێت، بینی چۆن چووبوو هەر وا گەڕابوویەوە، لەسە گوێدرێژەکەی بوو و پارچە نانێکیشی بە دەستەوە بوو و قاچەکانی شۆڕ کردبوونەوە، عومەر چوو و باوەشی پیا کرد و وتی: تۆ برای منیت و منیش برای تۆم.[4]

حوزەیفە کە لە مەدائین والی بوو وتاری پێشکەش دەکرد بۆ خەڵک،[5] هەروەها جارێک کەسێکی مەدائین هات بۆ لای و وتی: ئێوە هاوەڵی پێغەمبەری خواتان کردووە؟ وتی: بەڵێ برازا، کابرا وتی: چۆن بوون لەگەڵی، ئەویش وتی: بەخوا زۆر هەوڵمان دەدا لەگەڵی چاک بین، کابرا وتی: بەخوا ئەگەر ئێمە دەگەیشتینە خزمەتی نەماندەهێشت پێ بنێتە سەر

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٥٧٣.
[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١١٠.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٥٧٣.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٣٦٦.
[5] ()- البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ١١٩.

زەوی و دەمانخستە قەلادۆشکانمان، حوزەیفە وتی: برازا بەخوا ئەگەر لە خەندەق لەگەڵمان دەبوویت، ئینجا باسی بەسەرهاتەکەی خەندەقی بۆ کرد کە پێغەمبەر(ﷺ) لە شەوێکی ساردا سێ جار داوای کرد کەسێک بچێت هەواڵی بۆ وەربگرێت بەڵام کەس ئامادە نەبوو تا پێغەمبەر(ﷺ) ناوی حوزەیفەی برد.[1]

**لە سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففاندا**

حوزەیفە لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانیشدا بەردەوام بوو لە گەیاندنی پەیامی خوا و وتنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها دەچوویە خزمەتی عوثمانی کوڕی عەففان، جارێک حوزەیفە کە لە فەتحی ئەرمینیاو ئازەربایجاندا لەگەڵ خەڵکی شام و عێراقدا بوو، دەیبینی هەریەکەو جۆرێک قورئانیان دەخوێندەوە ترسا لەو حاڵەیان، بۆیە گەڕایەوە بۆ لای عوثمانی کوڕی عەففان و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران فریای ئەم ئوممەتە بکەوە پێش ئەوەی وەک حاڵی جوولەکەو مەسیحیەکان ئەمانیش لەسەر قورئان ناکۆکییان تێبکەوێت، عوثمانیش بەگوێی کرد و ناردی بۆ لای حەفصەی دایکی باوەڕداران و وتی: نوسخەی قورئانەکە کە لاتە بینێرە بۆم تا لەبەری بنووسینەوەو دواتر دەیگێڕینەوە بۆت، حەفصەش ناردی و عوثمانیش بە چەند هاوەڵێکدا ئەو کارەی بەجێگەیاند.[2]

ئەشتەر لە مینبەری کووفەوە بە خەڵکی کووفەی ڕاگەیاند ئەی خەڵکینە وا من ئەبوو مووسای ئەشعەری دەکەمە پێشەوای نوێژتان تا بەرنوێژیتان بۆ بکات و لە سەنگەریشدا بەرپرستان بێت، حوزەیفەی کوڕی یەمانیش دەکەمە بەرپرسی فەیئتان،[3] کاتێکیش عوثمان شەهید کرا حوزەیفە لە مەدائین بوو،[4] نزای دەکرد خوایە ئەگەر کوشتنی عوثمان خێری تیا بووە

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١١٤.
[2] صحيح البخاري - كتاب فضائل القرآن - باب جمع القرآن، الرقم ٤٩٨٧.
[3] البطقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٣٣.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٦، ص ١٥.

ئەوە من هیچ پشکێکم نیە تیایدا، ئەگەریش کوشتنی خراپەی تێدایە ئەوە من هەر بەریم لەو کوشتنە.[1]

ربعی کە ژنبرای حوذەیفە بوو چوو بۆ لای حوذەیفە، حوذەیفە وتی: خزم و هۆزەکەت لەم حاڵی دەرچوونە لە عوثمان چییان کردووە؟ ئەویش وتی: خەڵکێک بەشدارن تیایدا، حوذەیفە وتی: دەی من بیستوومە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (من فارق الجماعة واستذل الإمارة لقي الله ولا حجة له عندالله)،[2] (هەرکەس لە کۆمەڵی موسڵمانان جیا بێتەوەو باری دەسەڵات-ی موسڵمانان- لاواز بکات ئەوە کە دەگاتەوە بە خوا لای خوا هیچ بەڵگەو بیانوویەکی پێ نیە).

**مردنی حوذەیفە**

حوذەیفە لەو نەخۆشیەیدا کە تیایدا مرد لە جێگەدا کەوتبوو، کەسێک لەلای بوو لەگەڵ ژنەکەی قسەی کرد، حوذەیفە چاوی کردەوەو وتی: چی دەڵێن؟ ئەوانیش وتیان خێرە، ئەویش وتی: شتێکم لێدەشارنەوە کە خێریش نیە، کابرا وتی: عوثمان کوژرا، حوذەیفە وتی: خوایە من دوورم لەم رووداوە، ئەگەر خێری تیا بووە با بۆ ئەوە بێت کە تیایدا بەشدار بووەو من بەریم لێی، ئەگەریش خراپە با بۆ بەشداربوووی بێت و من بەریم لێی.[3]

ئینجا حوذەیفە داوای کرد کفنێکی بۆ بکڕن، ئەوەبوو قوماشێکی گرانیان هێنا، ئەویش وتی: نامەوێت، بڕۆن دوو قوماشی سپیم بۆ بکڕن.[4]

حوذەیفە ماوەیەکی کەم دوای شەهید بوونی عوثمان لە مەدائین کۆچی دوایی کرد، ئەوەش چەند مانگێکی نەخایاند، ئەوەبوو هێشتا چل رۆژ بوو

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٨٣.

[2] المستدرک على الصحيحين - كتاب العلم - من فارق الجماعة واستذل الإمارة لقي الله ولا حجة له عند الله، الرقم ٤٠٩.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٩٢.

[4] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٣٦٩.

بەیعەت درابوو بە عەلی کە وەفاتی کرد، ئەمەش لە ساڵی سی و شەشی کۆچیدا بوو،[1] ئینجا لەو سەرەمەرگەیدا دەیوت ئەمە کۆتا ساتی ژیانی دنیامە، خوایە تۆ دەزانیت من تۆم خۆش دەوێت، دەی بەرەکەت بخەرە ساتی گەیشتنەوەم بە تۆ، دواى ئەوە مرد.[2]

**چەند فەرموودەیەک کە حوذەیفە گێڕاویەتەوە:**

حوذەیفە دەڵێت: خەڵکی هەمیشە سەبارەت بە خێر و چاکە پرسیاریان لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، بەڵام من سەبارەت بە فیتنە پرسیارم لێدەکرد لە ترسی ئەوەی نەبادا تووشم بێت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە جاران لە نەفامی و خراپەدا بووین و بە دواى ئەوەدا خواى گەورە ئەم خێرەی بۆ هێناین، جا ئایا دواى ئەم چاکەیە خراپە دێت؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: ئەی دواى ئەو خراپەیە کە دێت چاکە دێت؟ فەرمووی: بەڵێ ناروونیەکیشی تێدایە، وتم: ئەو ناروونی و لێڵیەی چیە؟ فەرمووی: (قَوْمٌ يَهْدُونَ بِغَيْرِ هَدْيِي تَعْرِفُ مِنْهُمْ وَتنكِرُ)، (خەڵکێکن ڕێی جیا لە ڕێی من دەگرنەبەر و چاکەو خراپشیان لێ دەبینیت)، وتم: ئەی دواى ئەو خێرە خراپەی تر دێت؟ فەرمووی: (نَعَمْ دُعَاةٌ إِلَى أَبْوَابِ جَهَنَّمَ مَنْ أَجَابَهُمْ إِلَيْهَا قَذَفُوهُ فِيهَا)، (بانگخوازانێکی بەردەرگای دۆزەخ هەن کە هەرکەس بچێ بە دەم بانگەوازەکەیانەوە دەیخەنە ناو دۆزەخەوە)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوانە وەسف بکە بۆمان تا بیانناسین، فەرمووی: (هم من جلدتنا، ويتكلمون بألسنتنا)، (ئەوانە هاوپێستی ئێمەن و بە زمانی ئێمەش قسە دەکەن) وتم: ئەی فەرمانم پێ دەکەیت چی بکەم ئەگەر گەیشتم بەو سەردەمە؟ فەرمووی: (تلزم جماعة المسلمين وإمامهم)، (پابەندی گرۆو پێشەوای موسڵمانان بە)، وتم: ئەی ئەگەر ئەو کات موسڵمانان پێشەوا و

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤٤.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٥٧٤.

کۆمەڵێکیـان نەبـوو؟ فەرمـووی: (فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّهَا وَلَوْ أَنْ تَعَضَّ بِأَصْلِ شَجَرَةٍ حَتَّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وَأَنْتَ عَلَى ذَلِكَ)،[1] (لـە هەمـوو ئـەو دەسـتەو تاقمانـە کەنـار بگـرە بـا ئەگـەر قەپیشـت کردبێـت بـە رەگـی دراێکـەوە تـا ئـەو کاتـەی دەمریـت هـەر لـەو بـارەدا بـە).

حوزەیفـە دەڵێـت: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (يَدْرُسُ الْإِسْلَامُ كَمَا يَدْرُسُ وَشْيُ الثَّوْبِ، حَتَّى لَا يُدْرَى مَا صِيَامٌ وَلَا صَلَاةٌ وَلَا نُسُكٌ وَلَا صَدَقَةٌ. وَلَيُسْرَى عَلَى كِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ فِي لَيْلَةٍ ، فَلَا يَبْقَى فِي الْأَرْضِ مِنْهُ آيَةٌ ، وَتَبْقَى طَوَائِفُ مِنَ النَّاسِ ، الشَّيْخُ الْكَبِيرُ وَالْعَجُوزُ ، يَقُولُونَ: أَدْرَكْنَا آبَاءَنَا عَلَى هَذِهِ الْكَلِمَةِ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ ، فَنَحْنُ نَقُولُهَا)[2]

(کاریگـەری ئیسـلام نامێنێـت و دەسـڕێتەوە وەک چـۆن نەخشـی جـل دەسـڕێتەوە، ئیتـر وای لێدێـت نازانرێـت رۆژوو چیـە ونوێـژ و حـەج و زەکات چیـە، لـە شـەوێکیشـدا قورئـان بـەرز دەکرێتـەوە ئیتـر یـەک ئایەتـی قورئانیـش لـە سـەر زەویـدا نامێنێـت، دەسـتەیەک لـە خەڵـک دەمێننـەوە، پیـر و پەککەوتـە، دەڵێـن ئـەم وشـەیەمان لـە باوباپیرانمـان بیسـتووە دەیانـوت لا الـە الا اللـە، وا ئێمـەش دەیڵێینـەوە)، ئینجـا صیلـە بـە حوزەیفـەی دەوت جـا ئـەو وشـەیە چ سـوودێکی هەیـە بۆیـان کـە نازانـن نوێژو رۆژوو و حـەج و زەکات چیـە؟ سێ جـار پرسـیاری کـرد و حوزەیفـە وەڵامـی نەدەدایـەوە، دواتـر حوزەیفـە وتـی: ئـەی صیلـە ئـەو وشـەیە لـە دۆزەخ رزگاریـان دەکات.

حوزەیفـە دەڵێـت: بیسـتم لـە پێغەمبـەر(ﷺ) دەیفەرمـوو:(إن الدجال يخرج، وإن معه ماء ونارا، فأما الذي يراه الناس ماء فنار تحرق، وأما الذي يراه الناس نارا فماء بارد عذب، فمن أدرك ذلك منكم فليقع في الذي يراه نارا، فإنه ماء عذب طيب)،[3]

(دەججـال دەردەچێـت و ئـاو و ئاگـری لەگەڵـە، جـا ئـەوەی خەڵـک بـە ئـاو دەیبینـن ئاگرێکـی سـووتێنەرە، ئـەوەش کـە خەڵـک بـە ئاگـری دەبینـن ئاوێکـی

---

[1] صحيح البخاري - كتاب المناقب - باب علامات النبوة في الإسلام، الرقم ٣٦٠٦.
[2] سنن ابن ماجه - أبواب الفتن - باب ذهاب القرآن والعلم ، الرقم ٤١٦٦، صححه الألباني.
[3] صحيح مسلم - كتاب الفتن وأشراط الساعة - باب ذكر الدجال وصفته وما معه، الرقم ٢٩٣٤.

ساردی سازگاره، جا هەرکام لە ئێوە گەیشت بەو سەردەمە با خۆی بخاتە ناو ئەوەی کە بە ئاگر دەیبینێت چونکە ئەوە ئاوێکی سازگاری پاکە).

## ١٠٤٩. حوذەیفەی ئەزدی(رضي الله عنه)

ناوی حوذەیفەی کوڕی یەمانی ئەزدیە،[١] ئەم هاوەڵە کاربەدەستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو.[٢]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) حوذەیفەی نارد تا زەکاتی ئەزدیەکان کۆبکاتەوە، ئەویش زەکاتەکەی لە دەوڵەمەندەکان کۆدەکردەوەو دەیدایەوە بە هەژارەکانیان، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد ئەوانە هەڵگەڕانەوەو ئامادە نەبوون زەکات بدەن، حوذەیفە نامەی نووسی بۆ خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەبووبەکری صدیق و هەواڵەکەی پێدا، ئەبووبەکریش عیکریمەی کوڕی ئەبوو جەهلی نارد بۆیان،[٣] عیکرمەش ژمارەیەک لەوانەی بەدیل گرت و بە حوذەیفەدا ئەوانی نارد بۆ لای ئەبووبەکر.[٤]

## ١٠٥٠. حورەیثی کوڕی زەید(رضي الله عنه)

ناوی حورەیثی کوڕی زەیدی کوڕی ثەعلەبەیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[٥] یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر،[٦] و ئوحودیش.[٧]

## ١٠٥١. حورەیثی کوڕی زەیدولخەیل(رضي الله عنه)

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤٥.
[٢] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٥٢٧.
[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ١٠١.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤٥.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٣.
[٦] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٩٧٧، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٣.
[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٣.

ناوی حورەیثی کوڕی زەیدولخەیلی کوڕی موهەلهەلە، هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بووەو پێغەمبەر(ﷺ) وەک نێردراو ناردوویەتی بۆ لای خەڵکی ئیلە، دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا بەشدار بوو.[1]

لـە سـەردەمی عومـەری کـوڕی خەتتابـدا بـوو کـە کەسـێک بـە نـاوی ئەبـوو سـوفیان نێـردراوی عومـەر بـوو دەچـوو داوای لـە خەڵکـی لادێـکان دەکـرد قورئـان بخوێنـن، هەرکـەس نەیزانیایـە قامچـی لێـدەدا، داوای لـە ئەوسـی کـوڕی خالیـد کـرد قورئـان بخوێنێـت و ئەویـش نەیخوێنـد، بۆیـە ئەبووسـوفیان قامچـی لێدا و بـەو هۆیـەوە ئـەوس مـرد، کاتێـک حورەیـث چـوو بـۆ ئـەوێ و هەواڵەکـەی بیسـت چـوو کەوتـە لێدانـی ئەبووسـوفیان و کوشـتی.[2]

## ١٠٥٢. حورەیثی کوڕی سەلەمە(ﷺ)

نـاوی حورەیثـی کـوڕی سـەلەمەی کـوڕی سـەلامەیە، لـە پشـتیوانانە لـە ئەشـهەلیەکان.[3]

## ١٠٥٣. حورەیثی کوڕی عەمر(ﷺ)

نـاوی حورەیثی کوڕی عەمری کوڕی عوثمانی کوڕی عەبدولای قورەیشـی مەخزوومیە،[4] کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەمر کە فەرمـوودەی لـە باوکیـەوە گێڕاوەتـەوە،[5] کوڕێکی تریشـی نـاوی سـەعید بـوو،[6] جا هـەم بـاوک و هـەم

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٣.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٥١.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٤.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٤.
[5] مستخرج أبي عوانة، الرقم ٢٠٣٣.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٤.

دوو کوڕەکەشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوون.[1]

حورەیث دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چووینە دەرەوە بۆ نوێژە بارانە، دوو رکات نوێژی کرد بۆمان و دواتر عەباکەی هەڵگێڕایەوەو دەستەکانی بەرز کردەوەو ئەم نزایەی کرد(اللهم ضاحت جبالنا واغبرت أرضنا وهامت دوابنا معطي الخيرات من أماكنها، ومنزل الرحمة من معادنها ومجري البركات على أهلها بالغيث المغيث أنت المستغفر الغفار فنستغفرك للحامات من ذنوبنا ونتوب إليك من عوام خطايانا، اللهم فأرسل السماء علينا مدرارا، واصل بالغيث واكفا من تحت عرشك حيث ينفعنا ويعود علينا غيثا مغيثا عاما طبقا مجللا غدقا خصيبا رايعا ممرع النبات).[2]

## ١٠٥٤. حورەیثی ئەسەدی(﵁)

ناوی حورەیثەو لە ئەسەدیەکانە، لەساڵی نۆی کۆچیدا وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).[3]

## ١٠٥٥. حورەیمیلەی کچی عەبدولئەسوەد(﵂)

ناوی حورەیمیلەی کچی عەبدولئەسوەدی خوزاعیە، ئەم ئافرەتە زوو موسڵمان بوو و بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) و لەگەڵ جەهمی کوڕی قەیسی هاوسەریدا کۆچی کرد بۆ حەبەشەو لەو مێردەی هەریەک لە عەبدوڵا و عومەر و حەرمەلەی بوو، ئیتر پێی دەوترا ئومموحەرمەلە، حورەیمیلە لە حەبەشە کۆچی دوایی کرد.[4]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٥٨٦.

[2] مستخرج أبي عوانة، الرقم ٢٠٣٣.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٦.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٠.

## ١٠٥٦. حوزابەی کوڕی نوعەیم(ﷺ)

ناوی حوزابەی کوڕی نوعەیمی کوڕی عەمرە، لە هاوەڵانی دانیشتووی فەلەستینە، لە ساڵی غەزای تەبووکدا موسڵمان بوو.[١]

## ١٠٥٧. حوزابەی سولەمی(ﷺ)

ناوی حوزابەی سولەمیەو لە وەفدی بەنی سولەیمەو وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و لە غەزای حونەیندا شیعرێکی وتووە.[٢]

## ١٠٥٨. حوسەیلی کوڕی جابیر(ﷺ)

ناوی حیسل یان حوسەیلی کوڕی جابیری کوڕی عمری عەبەسیە، باوکی حوذەیفەی هاوەڵی ناسراوی پێغەمبەری خوایە(ﷺ).[٣]

پێی وتراوە یەمان کە نازناوی بووە، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو بۆیە باوکی پێی وتراوە یەمان چونکە کەسێکی کوشتووەو رایکردووە بۆ مەدینەو هاوپەمانی کردووە لەگەڵ بەنی عەبدولئەشهەل ئیتر هۆزەکەی پێیان وتووە یەمان لەبەرئەوەی لەگەڵ پشتیوانان هاوپەیمانی کردووە لەکاتێکدا ئەوان یەمەنین.[٤]

سەبارەت بە ژنەکەشی ئەویش هاوەڵ بوو و ناوی ربابی کچی کەعب بوو،[٥]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی حوذەیفە کە نهێنی پارێزی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، کوڕێکی تریشی ناوی صەفوان بوو کە ئەویش بەشداری کرد لە غەزای

---

[١] أسد الغابة، ج٢، ص ٥.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٩.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٧٤.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٥٧٢-٥٧٣.

[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٣١٧، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٣٩.

ئوحوددا.[1]

کوڕێکی تری ناوی عەبدولعەزیز بوو کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[2]

کچێکیشی هەبوو بە ناوی خەولە کە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە،[3] کچێکی تریشی ناوی لەیلا بوو کە دایکی هاوەڵی گەورەی پێغەمبەر(ﷺ) سەلەمەی کوڕی ثابتی کوڕی وەقش بوو،[4] کچێکی تری ناوی فاتیمە بوو کە ئەمیش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[5]

کەمێک پێش غەزای بەدر حوسەیل و حوذەیفەی کوڕی کەوتنە دەست قوڕەیشیەکان، ئەوانیش بەو مەرجە ئازادیان کردن کە بەڵێنیان پێبدەن لەدژیان بەشدار نەبن، بۆیە کە گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و مەسەلەکەیان بۆ باسکرد، ئەویش فەرمانی کرد بەڵێنەکەیان ببەنەسەر، بۆیە لە غەزای بەدردا بەشدارییان نەکرد.[6]

حوسەیل لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و هەردوو کوڕەکەشی حوذەیفەو صەفوان لەگەڵیدا بەشدار بوون.[7]

لە ئوحوددا پێغەمبەر(ﷺ) حوسەیل و ثابتی کوڕی وەقشی دانابوو تا لای ژن و منداڵەکان بن چونکە ئەو دوانە بە تەمەن بوون،[8] جا ئەو دوانە خەزووری کوڕو کچی یەک بوون، واتە حوسەیل لەیلای کچی خۆی دابوو

---

[1] أسد الغابة، ج٣، ص ٣٣.
[2] أسد الغابة، ج٣، ص ٥٢٣.
[3] أسد الغابة، ج٧، ص ١٠٩.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٤١.
[5] أسد الغابة، ج٧، ص ٢٥٢.
[6] صحيح مسلم، الرقم ٣٤٢٩.
[7] سير أعلام النبلاء، ج٢،ص ٣٦٢.
[8] أسد الغابة، ج٢، ص ٢٣.

بە سەلەمەی کوڕی ثابت،[1] یەکێکیان بەوی تری وت: ماڵوێران بەخوا هیچکام لەم دوانەمان تەمەنێکی وامان بۆ نەماوەتەوەو ئەمڕۆ یان سبەی دەمرین، وەرە با شمشێرەکانمان هەڵگرین و بگەینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بەڵکو خوا شەهیدیمان پێ ببەخشێت، هەردوو نەوینە شمشێر و خۆیان گەیاندە پێغەمبەر(ﷺ) و چوونە ناو موسڵمانان و موسڵمانانیش وایاندەزانی ئەوان نەهاتوونەتە ناو جەنگەکەوە، ئەوەبوو ثابت بە دەستی بێباوەڕان شەهید بوو و حوسەیلیش بە هەڵە بە دەستی هاوەڵێک کوژرا،[2]چونکە ئەو هاوەڵە نەیناسیەوەو وایزانی لە بێباوەڕانە، چونکە سوپای موسڵمانان زۆریان دەموچاویان داپۆشیبوو، بۆیە دەبوو نیشانەیەکیان هەبوایە تا بناسرێنەوە، حوذەیفە کاتێک بینی هێرش برا بۆ باوکی هاواری دەکرد باوکم باوکم، بەڵام دەنگی نەگەیشت و باوکی بە هەڵە کوژرا، دواتر حوذەیفە خوێن بایی باوکی وەرنەگرت و لە موسڵمانان خۆش بوو.[3]

## ١٠٥٩. حوسەیلی کوڕی عورفطە(رضي الله عنه)

ناوی حوسەیلی کوڕی عورفطەی ئەسەدیە، چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناوی گۆڕ و ناوی نا حوسەین، ئەم هاوەڵە فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[4]

## ١٠٦٠. حوسەینی کوڕی عەلی(رضي الله عنه)[5]

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٤١.

[2] أسد الغابة، ج٢، ص ٢٣.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٢،ص ٣٦٢.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٧٦.

[5] لەوانەیە ئەو خوێنەرەی پێشتر لەم بەرگەدا ژیانی حەسەنی کوڕی عەلی خوێندبێتەوە، خێرا بڵێت خۆ ئەم بەشە سەرەتایانەی ژیانی حوسەین دووبارەی ئەوێن و نەدەبوو دابنرێتەوە، بەڵام ئێمە ئەوەمان کردووە چونکە زۆربەی ئەوانەی ئەم کتێبە بەکاردێنن بۆ ژیانی هاوەڵێک لە پێرستەوە بۆی دەچن، بۆیە لەوانەیە کەسێک تەنها ژیانی حوسەینی کوڕی عەلی مەبەست بێت، ئەگەر بڵێین بگەڕێتەوە بۆ ژیانی حەسەن ناگەڕێتەوەو لەوانەیە سارد بێت لەوە، بۆیە هەمان شت کە لێرەدا پێویست بووە دایدەنێینەوە.

پێشتر له ژیانی حەسەنی کوڕی عەلی برایدا سەبارەت به باوک و دایک و باپیرەو داپیرەو خاڵ و مام و خوشک و براکانی زانیاری پێویستمان هێناوه.

ناوی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبی کوڕی عەبدولموطەلیبی کوڕی هاشمی قورەیشی هاشیمیه،[1] کونیەکەی ئەبوو عەبدولایه.[2]

**ژنەکانی حوسەین**

روبابی کچی ئیمروئولقەیس.[3]

لەیلای کچی ئەبوو موررە.[4]

غەزاله کە ئوم وەلەد بوو.[5]

**ئایا حوسەین ژنی فارسی هەبووه؟**

زەمەخشەری گێڕانەوەیەکی هێناوە کە سێ کچی یەزگوردی کوڕی شەهریاری کوڕی کیسرا بە کەنیزەک گیرابوون و هێنران بۆ خەلیفەی باوەڕداران عومەری کوڕی خەططاب، ئەویش ویستی بیانفرۆشێت، بەڵام عەلی کوڕی ئەبوو طالیب وتی: کچانی پاشاکان نافرۆشرێن، بۆیه پارەی هەموویانی دا و دابەشی کردن لە نێوان حوسەینی کوڕی و موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکر و عەبدولای کوڕی عومەردا.[6]

رایەک دەڵێت: ناوی ئەو کچە سولافە بووەو زەینولعابیدینیش کوڕی ئەم ژنەیەتی،[7] یان دەوترێت ناوی غەزاله بووه.[8]

فەتحی مەدائین لە ساڵی شانزەی کۆچیدا بووه، لەدایکبوونی حوسەینیش له ساڵی چوارەمی کۆچی بووه، واته دەبێت حوسەین لە تەمەنی دوانزە یان سیانزە

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ٢٥.
[2] الطبقات لابن خياط، ج١، ص ٥.
[3] الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤٤٣.
[4] تاريخ الطبرى، ج٣، ص ٣٤٣.
[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٢١١.
[6] ربيع الأبرار للزمخشري، ج١، ص ٢٨١.
[7] الكامل في اللغة و الأدب لمحمد بن يزيد المبرد، ط٣، دار الفكر العربي (القاهرة- ١٩٩٧)، ج١، ص ١٤٠، ربيع الأبرار للزمخشري، ج١، ص ٦٤.
[8] سير أعلام النبلاء، ج٤، ص ٣٨٦.

ساڵێدا ئەو ئافرەتەی مارە کردبێت، پاشان زەینولعابدین لە ساڵی ٣٨ لەدایک بووە،[١] واتە بیست و دوو ساڵ دوای هاوسەرگیری حوسەین و ئەو ئافرەتە فارسە.

دەینەوەری دەڵێت: دایکی زەینولعابدین ئافرەتێکی سندی بووە بە ناوی سولافە یان غەزالە.[٢]

**منداڵەکانی حوسەین:**

ناوی ئەو منداڵانەی حوسەین کە لە کتێبەکاندا باسکراون:

عەلی ئەکبەر کە لەگەڵ باوکیدا لە کەربەلائدا شەهید کرا،[٣] دایکی ناوی لەیلای کچی ئەبوو موررە بوو.[٤]

زەینولعابیدین

جەعفەر

سەکینە کە دایکی ناوی رباب بوو.[٥]

عەبدوڵا کە دایکی ناوی روبابی کچی ئیمروئولقەیس بوو.[٦]

عەلی ئەصغەر کە دایکی ئوم وەلەد بوو وناوی غەزالە بوو.[٧]

ئەبووبەکر کە دایکی ئوم وەلەد بوو.[٨]

**لەدایکبوونی حوسەین:**

سەبارەت بە لەدایکبوونی حوسەین هاتووە تەنها چەند شەوێک لە شەعبانی ساڵی چوارەمی کۆچی تێپەڕ بووبوو حوسەین لەدایک بوو، ئەویش پێنج شەو، واتە لە پێنجی شەعبانی ساڵی چوارەمی کۆچیدا بوو،

[١] سير أعلام النبلاء، ج٤، ص ٣٨٦.
[٢] كتاب المعارف لابن قتيبة الدينوري، ص ٤٩.
[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٢١١.
[٤] تاريخ الطبري، ج٣، ص ٣٤٣.
[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٤٧٥.
[٦] الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤٤٣.
[٧] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٢١١.
[٨] تاريخ الطبري، ج٣، ص ٣٤٣.

رایەکی تریش دەڵێت: بەڵکو لە دوای شەش ساڵ و پێنج مانگ و پانزە رۆژ لە کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە لەدایک بووە.[١]

حوسەین ساڵێک و دە مانگ پاش لەدایکبوونی حەسەنی برای لەدایک بوو.[٢]

**ناونانی**

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی بیست فاطیمەی کچی منداڵی بووە خێرا چوو بۆ ماڵیان، فەرمووی: (أروني ابني ما سميتموه)،(ئادەی کوڕەکەم نیشان بدەن، ناوی چیتان لێ ناوە؟) عەلی کوڕی ئەبوو طالیبیش وتی: ناوم ناوە حەرب، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بل هو حسن)، (بەڵکو با ناوی حەسەن بێت)، بەوە ناوی نرا حەسەن، ئینجا کە حوسەین لەدایک بوو عەلی هەمدی ناوی نا حەرب، پێغەمبەر(ﷺ) هاتو فەرمووی: (أروني ابني ما سميتموه)،(ئادەی کوڕەکەمم نیشان بدەن، ناوی پیتان لێ ناوە؟) عەلی کوڕی ئەبوو تالیبیش وتی: ناوم ناوە حەرب، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بل هو حسين)،[٣] بەڵکو ناوی حوسەینە.

**خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ حوسەین**

ئوسامەی کوڕی زەید دەڵێت: شەوێک دام لە دەرگای ماڵی پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەرم(ﷺ) بە جۆرێک شتێکی لە خۆی گرمۆڵە کردبوو کە نەمدەزانی چیە، جا کە ئیشەکەم تەواو بوو وتم: بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە چیت پێیە وا بەرگت بۆ گرمۆڵە کردووە؟ پێغەمبەر(ﷺ) کە بەرگەکەی لابرد بینیم حەسەن و حوسەینی لە باوەش ناوەو فەرمووی: (هذان ابناي وابنا ابنتي اللهم أحبهما فأحبهما وأحب من يحبهما)،[٤] (ئەوە دوو کوڕەکەمن، کوڕانی کچەکەمن، خوایە من ئەم دوانەم خۆش دەوێن

---

[١] أسد الغابة، ج٢، ص ٢٦.

[٢] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩٣.

[٣] المستدرک على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - مناقب الحسن والحسين ابني بنت رسول الله(ﷺ) - حديث تسمية الحسن والحسين(ﷺ)، الرقم ٤٨٠١، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص، ضعفه الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٣٧٠٦، حسنه شعيب الأرناؤوط.

[٤] جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) - باب مناقب أبي محمد الحسن بن علي بن أبي طالب والحسين بن علي بن أبي طالب(ﷺ)، الرقم ٣٧٦٩ وقال حسن غريب.

دەی تۆیش خۆشت بوێن و ئەوەشت خۆش بوێت کە ئەم دوانەی خۆش دەوێن).

بەڕائی کوڕی عازب دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) رادەما لە حەسەن و حوسەین و دەیفەرموو (اللهم إني أحبهما فأحبهما)،[1] (خوایە من ئەم دوانەم خۆش دەوێن، دەی تۆیش خۆشت بوێن).

ئەبوو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (من أحب الحسن والحسين فقد أحبني، ومن أبغضهما فقد أبغضني)،[2] (هەرکەس حەسەن و حوسەینی خۆش بوێت ئەوە منی خۆش ویستووە، هەرکەسیش رقی بێت لێیان ئەوە رقی لە منە).

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: بەیانیەک پێغەمبەر(ﷺ) چوویە دەرەوەو جلێکی خوری لەبەر بوو کە لە مووی رەش دروستکرابوو، ئینجا حەسەنی کوڕی عەلی هات و پێغەمبەر(ﷺ) هێنایە ژوورەوە، دوای ماوەیەکی تر حوسەین هات و لەگەڵی هاتە ژوورەوە، دواتر فاتیمە هات و پێغەمبەر(ﷺ) ئەویشی هێنایەژوورەوە، ئینجا عەلیش هات و پێغەمبەر(ﷺ) ئەویشی هێنایە ژوورەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە (إنما يريد الله ليذهب عنكم الرجس أهل البيت و يطهركم تطهيرا).[3]

پێغەمبەر(ﷺ) نزای پەنادانی بۆ حەسەن و حوسەین دەفەرموو و دەیفەرموو: (باوکتان بەوە داوای پەنای ئیسماعیل و ئیسحاقی دەکرد: أعوذ بكلمات الله التامة من كل شيطان و هامة و من كل عين لامة).[4]

یەعلای عامیری دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەرچووم کاتێک بانگ کرابووین بۆ خواردنێک، لە رێدا بینیمان حوسەین لەگەڵ منداڵانا یاری ئەکات، دەچووە پێشەوەی ئەوانی تر و دەستەکانی دەکردەوەو منداڵ لەملاو لەولاوە

[1] جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) - ، الرقم ٣٧٨٢ و قال حديث حسن صحيح، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٣٧٨٢.

[2] سنن ابن ماجه - أبواب السنة - باب في فضائل أصحاب رسول الله(ﷺ) - فضل الحسن والحسين ابني علي بن أبي طالب(ﷺ)، الرقم ١٤٩، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٤٣.

[3] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب فضائل أهل بيت النبي(ﷺ) ، الرقم ٢٤٢٤.

[4] صحيح البخاري - كتاب أحاديث الأنبياء - باب حدثنا موسى بن إسماعيل، الرقم ٣٣٧، سنن أبي داود - كتاب السنة - باب في القرآن، الرقم ٤٧٣٧.

رایدەکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) بۆی پێدەکەنی و دواتر چوو حوسەینی گرتە باوەش و سەری لە باوەشیا دادەپۆشی و دەمی خستە سەر دەمی و ماچی کرد و فەرمووی: (حسين مني وأنا من حسين، أحب الله من أحب حسينا، حسين سبط من الأسباط)،[١] (حوسەین لە منەو منیش لە حوسەینم، خوا ئەوەی خۆش بوێت کە حوسەینی خۆش دەوێت، حوسەین یەکێکە لە نەوەکان).

ئەبی ئەییووب دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و حەسەن و حوسەینیش لە بەردەمیدا و لە ژوورەکەیدا یارییان دەکرد، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا خۆشت دەوێن؟ ئەویش فەرمووی: (وَكَيْفَ لَا أُحِبُّهُمَا وَهُمَا رَيْحَانَتَايَ مِنَ الدُّنْيَا أَشُمُّهُمَا) (ئەی چۆن خۆشم نەوێن کە دوو رەیحانەکەی دنیامن و بۆنیان دەکەم).[٢]

رۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی عائیشە دەرچوو و دای بە لای ماڵی فاتیمەی کچیدا، تەماشای کرد حوسەین دەگری، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەرێ نازانیت گریانی حوسەین ئازارم دەدات؟![٣]

عەلی رەزای خوای لێ بێت دەڵێت: حەسەن لە سەر سنگەوە تا سەر زۆر لە پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو، حوسەینیش لە سەر سنگەوە بەرەو خوار زۆر لە پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو.[٤]

رۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی ئوممو سەلەمە بوو، فەرمویو با کەس

---

[١] سنن ابن ماجه - أبواب السنة - باب في فضائل أصحاب رسول الله(ﷺ) - فضل الحسن والحسين ابني علي بن أبي طالب(رضي الله عنهم)، الرقم ١٤٤، المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(رضي الله عنهم) - أول فضائل الحسين بن علي(رضي الله عنهما) - استشهد الحسين يوم الجمعة يوم عاشوراء ، الرقم ٤٨٤٨، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص، ضعفه شعيب الأرناؤوط، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٤٤.

[٢] المعجم الكبير للطبراني - باب الخاء - من اسمه خالد - خالد بن زيد أبو أيوب الأنصاري - معمر بن حزم عن أبي أيوب، الرقم ٣٩٩٠.

[٣] المعجم الكبير للطبراني - باب الحاء - من اسمه الحسين - الحسين بن علي بن أبي طالب - ذكر مولده وصفته وهيأته(رضي الله عنه)، الرقم ٢٨٤٧.

[٤] مسند أحمد بن حنبل - مسند العشرة المبشرين بالجنة وغيرهم - مسند علي بن أبي طالب(رضي الله عنه) ، الرقم ٧٨٥، جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) - ، الرقم ٣٧٧٩و قال حديث حسن غريب، ضعفه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٣٧٧٩، قال شعيب الأرنؤوط : رجاله ثقات رجال الشيخين غير هانئ بن هانئ روى له أصحاب السنن.

نەیەتە ژوورەوە، حوسەین هات و دەستی کرد بە گریان، ئوممو سەلەمە ڕێی دا بچێتە ژوورەوە، چوویە ژوورەوەو لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت، جبریل فەرمووی: ئوممەتەکەت دواتر دەیکوژن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوانە دەیکوژن و باوەڕداریشن؟ (یقتلونه وهم مؤمنون) فەرمووی: بەڵێ، ئینجا خۆڵەکەی پێ نیشان دا.[1]

**حوسەینی کوڕی عەلی لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا**

عومەری کوڕی خەططابیش ڕێزێکی زۆری دەنا لە بنەماڵەی پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێک ویستی بەخششی خەڵک دیاری بکات، ڕاوێژی کرد بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، عەبدورەحمانیش وتی: لە خۆتەوە دەست پێ بکە، چونکە تۆ شیاوتریت، عومەریش وتی: نا سوێند بەخوا لە نزیکترین کەسەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەست پێ دەکەم، ئینجا لەوانەی بەشداری بەدر بوون، بەوجۆرە دەچم تا دەگاتە خۆم، ئەوەبوو یەکەمجار پێنج هەزاری بڕیەوە بۆ عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، دواتر بۆ هاشمیە بەشداربووەکانی بەدر.[2]

حوسەین دەڵێت: ڕۆژێک عومەر چوویە سەر مینبەرەکەی پێغەمبەر(ﷺ) و منیش چوومە سەرەوەو وتم: لە مینبەرەکەی باوکم دابەزەو بڕۆ بۆ مینبەرەکەی باوکی خۆت، عومەر وتی: دەی ئاخۆ باوکی من مینبەری نەبووە، ئینجا منی لای خۆی دانیشاند، دواتر کە دابەزی وتی: کوڕە شیرینەکەم کێ فێری کردیت ئەم قسەیە بکەیت؟ منیش وتم: کەس فێری نەکردوم، عومەر وتی: کوڕە شیرینەکەم خوای گەورە و پاشان ئێوە مووی لەسەر سەرمان ڕواندووە،-واتە ڕێزداری کردوین- ئینجا دەستی خستە سەر سەری حوسەین و وتی: کوڕی شیرینم وەرەو سەردانمان بکە.[3]

عومەر جارێک جلی بەخشی بە منداڵانی هاوەڵان، بەڵام لەناو جلەکاندا

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٨٩ و قال الذهبي إسناده حسن.

[2] مصنف ابن أبي شيبة - كتاب السير - ما قالوا فيمن يبدأ به في الأعطية، الرقم ٣٣٥٧٠.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٨٥ و قال الذهبي إسناده صحيح، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٧٨ و قال ابن حجر إسناده صحيح.

جلی شیاو به حەسەن و حوسەینی لێ نەبوو، بۆیە ناردی بۆ یەمەن لەوێ دوو جلی تایبەتیان هێنا بۆ حەسەن و حوسەین، ئینجا عومەر وتی: ئیتر ئێستا دڵم ئۆخەی کرد.[1]

بیلالی کوڕی ڕەباح کە چووبوو بۆ شام خەوی دی بە پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، لە خەوەکەیدا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو ئەو هەموو جەفاو دوورگرتنەت چیە ئەی بیلال، ئایا کاتی نەهاتووە سەردانم بکەیت، بیلال بە خەفەت و دڵداگیرانەوە لەخەو راچڵەکی، سواری وڵاخەکەی بوو بەرەو مەدینە، چوویە لای گۆڕەکەی پێغەمبەر(ﷺ) و دەگریا، لەو کاتەدا حەسەن و حوسەین-دوو ڕەیحانەکەی پێغەمبەر(ﷺ)- هاتن بۆ ئەوێ، بیلال دەیگوشین بە خۆیدا و ماچی دەکردن، حەسەن و حوسەین وتیان زۆر بە تاسەوەین بانگت ببیستین، ئەویش دڵی دوو ڕەیحانەکەی نەشکاند و بانگی دا، دەنگی بانگی بیلال لە مەدینەدا بەرزبوویەوە، هەر کە وتی: الله أكبر خەڵکی مەدینە ڕاپەڕین، تا گەیشتە أشهد أن محمدا رسول الله ئیتر گریان هەموانی گرتەوە، دوای پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆژێکی تری وا نەبینرابوو ئاوا گریان هەموان بگرێتەوە.[2]

**حوسەین لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا**

کاتێک هەواڵی شەهیدبوونی عوثمان گەیشت بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب، عەلی تەواو شڵەژا و هاودەم بە طەلحەو زوبەیر و سەعد چوون بۆ لای عوثمان و بینیان کوژراوە، عەلی تووڕە بوو لە حەسەن و حوسەین و وتی: ئێوە لەبەر دەرگا بوون و هێشتتان ئەمیری باوەڕداران بکوژرێت؟! ئەوانیش وتیان ئێمە ئاگادار نەبوین بە کوژرانی، عەلی دەستی بەرزکردەوەو زللەیەکی دا لە حەسەن و دای بەسەر سنگی حوسەینیشدا، قسەشی وت: بە موحەممەدی کوڕی طەلحەو عەبدوڵای کوڕی زوبەیر.[3]

**حوسەین لە سەردەمی خیلافەتی باوکیدا**

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٨٥.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٧، سير أعلام النبلاء، ج١، ص٣٥٨، قال الذهبي إسناده لين و هو منكر.

[3] () . الثقات لابن حبان، ج٢، ص ٢٦٥.

حوسەین لە سەردەمی خیلافەتی باوکیدا لەگەڵ باوکی بوو و پشتیوان و سەرخەرێکی تەواوی بوو، بەڵکو لە جەنگی جەمەلدا سەرپەرشتی بەرەی چەپی سوپاکەی دەکرد.[1]

**حوسەین لەسەردەمی خیلافەتی حەسەنی برایدا**

حەسەن و حوسەین خۆشەویستیەکی زۆر لە نێوانیاندا هەبوو و ڕێزی یەکتریان دەگرت، جا حەسەن بە حوسەینی دەوت خۆزگە کەمێک لەو دڵ زبریەی تۆم دەبوو، حوسەینیش دەیوت خۆزگە منیش کەمێک لەو زمان بەهێزیەی تۆم دەبوو.[2]

حوسەین نارازی بوو لەو هەڵوێستەی حەسەنی برای کە لە ڕێککەوتنی لەگەڵ موعاویە نواندی و وتی: تو خوا وا نەکەیت قسەی باوکم پشتگوێ بخەیت و قسەی موعاویەت لا راست بێت، حەسەنیش پێی وت: بێدەنگ بە من لە تۆ شارەزاترم بەم مەسەلەیە.[3]

هەرچەندە حوسەین رای وابوو دەبێت حەسەن بجەنگێت و ڕێکنەکەوێت، بەڵام ئەو رایەی خۆی خواردەوەو گوێڕایەڵی فەرمانی حەسەنی برای بوو و بەیعەتی دا بە موعاویەو دیاریەکانی موعاویەی وەردەگرت، موعاویەش بە چاوی ڕێزەوە بۆی دەڕوانی و ڕێزی دەگرت، ئینجا کە موعاویە دواتر بەیعەتی بۆ یەزیدی کوڕی وەرگرت حوسەین پێی نارازی بوو، هەروەها ئیبن ئەبی بەرک عەبدوڵای کوڕی زوبەیریش نارازی بوون، بەڵام موعاویە بە نابەدڵی بەیعەتی وەرگرت لێیان، بەڵام دواتر کە موعاویە مرد ئەوانە بەیعەتیان نەدا بە یەزید.[4]

پاش ڕێککەوتنەکە حوسەین لە ساڵی چل و یەکی کۆچی لەگەڵ حەسەنی برای گەڕانەوە بۆ مەدینەو لەوێ مایەوە، لەوێ ماوەی نۆزدە ساڵ و چەند

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٨٨.
[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٨٧.
[3] أسد الغابة، ج٢، ص ٢٨.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩١-٢٩٢.

مانگێک مایەوەو سەرقاڵ بوو بە حەجکردن و پەرستشەوە.[1]

لەو ماوەدا حوسەین ئامادەی ساتەوەختی مەرگی حەسەنی برای بوو، پێش مردنی حەسەن حوسەینی بانگ کرد و ئەم وەسیەتەی بۆ کرد:

(براکەم باوکمان بەر رەحمەتی خوا بکەوێت کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد خۆی بۆ ئەم بارە-دەسەلات- دانابوو و هیوای وابوو بۆ ئەو بێت، ئەوەبوو خوا دووری گرت لێی و دایە دەست ئەبووبەکر، کە ئەبووبەکر سەرەمەرگی هات هەمدی حەزی پێکرد، ئەوەبوو هەمدی دوورخرایەوە لێی بەر عومەر کەوت، کە عومەر سەرەمەرگی هات کردی بە شوورا لە نێوان شەش کەسدا کە باوکمان یەکێک بوو لەوان، ئەوەبوو بەر عوثمان کەوت، کە عوثمانیش کوژرا بەیعەتی پێدرا، دوایی ململانێی لەگەڵ کرا تا شمشێری بۆ هەڵکرد و لەسەری جەنگا، بارەکە بۆی لەبار نەبوو و هیچی لێ دەست نەکەوت، سوێند بەخوا وانابینم خوای گەورە پێغەمبەرایەتی و خیلافەتیش لە ناو ئێمیە ئالوبەیتدا کۆبکاتەوە، وادەبینم گەمژەکانی کووفە تۆیش کەم دەگرن و دەرت دەکەن، من داوام لە عائیشە کردووە ئەگەر مردم مۆڵەتم بدات لە ماڵەکەی ئەودا لەلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپەردە بکرێم، ئەویش رازی بووە، دەڵێم لەوانەیە لە شەرمدا وتبێتی بەڵێ و رازی بووبێت، بۆیە ئەگەر مردم برۆ بۆ لای و داوای هەمان شتی لێ بکەرەوە، ئەگەر پێی خۆش بوو ئەوە لە ماڵەکەی ئەودا ئەسپەردەم بکە، گومانم زۆرە کە خەڵکێک نەهێڵن ئەوە بکەیت، جا ئەگەر رێگرییان لێکردیت ئەوا لەسەر ئەوە لێیان مەپارێرەوەو لەسەری مەڕۆ و لە بەقیع ئەسپەردەم بکە، چونکە لەوێش کەسانی پێشەنگی لێیە).[2]

حوسەینی برای بەسەرسەریەوە بوو، حوسەینیش بە دڵگرانیەوە ئەیوت برا ئازیزەکەم خۆ تۆ وا دەچیت بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ)-باپیرەمان- و

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ٢٨.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩١-٣٩٢.

عەلی -باوکمان- و خەدیجە-ی داپیرەمان- و فاتیمە-ی دایکمان- و قاسم و طاهیری خاڵوانت و حەمزەو جەعفەری مامت، حەسەنیش پێی وت: ئای برا ئازیزەکەم، وا دەچمە حاڵێکەوە کە خوا داینـاوە هیچکات حاڵی لەو جۆرەم نەدیوە، برێ دروستکراوی خوا ئەبینم کە هیچکات شێوەی وەک ئەوانەم نەدیوە، ئیتر حوسەین خۆی پێ رانەگیرا و دەستی کرد بە گریان.[1]

سەبارەت بە پرسی ئەسپەردەکردنی حەسەنیش کێشە هەیە، چەند گێڕانەویەک هاتووە کە حەسەن داوای کرد لە حوسەین با لەلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپەردە بکرێت، ئەگەر زانی کێشەی لێدەکەوێتەوە ئەوا با لە بەقیع ئەسپەردە بکرێت، ئەوەبوو کاتێک ویستی لە لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپەردەی بکات ئومەویەکان رازی نەبوون، بۆیە جابیر بە حوسەینی وت: با فیتنە نەکەوێتەوەو لە بەقیع ئەسپەردەی بکە، ئەوەبوو لە بەقیع ئەسپەردە کرا، کاتێک ئەسپەردە کرا لەتاو قەرەباڵغیدا بەقیع کەسێکی تری نەدەگرت و هەموان دەگریان.[2]

وەک لە وەسیەتەکەیدا هێنامان، حەسەن داوای کردبوو لەلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپەردە بکرێت ئەگەر هاتوو عائیشە رازی بوو، ئەگەریش خەڵکەکە رێگر بوون ئەوا با لە بەقیع ئەسپەردەی بکات و لەسەر مەسەلەکە نەڕوات، بۆیە کاتێک حەسەن مرد، لەسەر وەسیەتی خۆی حوسەین چوو بۆ لای عائیشەو داوای لێکردەوە کە حەسەنی برای لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپەردە بکرێت، ئەویش رازی بوو و وتی: باشە، بەڵام مەڕوان کە ئەمەی بیست وتی: سوێند بەخوا نابێت حەسەن لەوێ ئەسپەردە بکرێت، نەیانهێشت عوثمان لەوێ ئەسپەردە بکرێت و ئێستا ئەمان دەیانەوێت حەسەن لەوێ ئەسپەردە بکەن؟ کە حوسەینیش ئەم قسەی بیست بە چەکەوە هاودەم بە چەند کەسێکی تر چوو، مەڕوانیش

---

[1] تأريخ دمشق، ج١٣، ص ٢٨٦.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٤٤.

خۆی ئامادە کرد، کە ئەبووهورەیرە بیستی بارەکە گەیشتوەتە ئەوە، وتی: سوێند بەخوا ئەوە ستەمێکە لە حەسەن دەکرێت، دەبێت رێ بدرێت لەگەڵ باوکیدا (واتە مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) بوو) کفن بکرێت، ئەو کچەزای پێغەمبەرە(ﷺ)، ئینجا چوو بۆ لای حوسەین و قسەی لەگەڵ کرد و سوێندی دا وازبهێنێت، وتی: مەگەر براکەت نەیوت ئەگەر زانیت جەنگی لێدەکەوێتەوە ئەوا بمبەنەوە بۆ گۆڕستانی موسڵمانان؟ زۆر لێی پاڕایەوە تا حوسەین رازی بوو و حەسەنیان برد لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردەی بکەن، حوسەین حەزی دەکرد خۆی نوێژی مردوو لەسەر تەرمی حەسەنی برای کرد، بەڵام سەعیدی کوڕی عاصی والی مەدینەی پێش خست و وتی: ئەگەر سوننەت نەبوایە تۆم رانەدەسپارد بۆ ئەو بەرنوێژیە، سەعیدی کوڕی عاصیش کە ئەمیری مەدینە بوو ئامادەی مەراسیمی نوێژ و ئەسپەردەکردنی تەرمی حەسەن بوو، هەروەها خالیدی کوڕی وەلیدیش ئامادەی مەراسیمی ئەسپەردەکردنەکەی بوو، گۆڕەکەی حەسەن لەپاڵ گۆڕی فاطیمەی دایکیدا بوو.[1]

حوسەین قژ و ریشێکی رەشی هەبوو تەنها چەند تاڵێکی پێشەوەی ریشی نەبێت کە رەش نەبوو.[2]

جارێک حوسەین هاتە ناو مزگەوتەوە، جابیریش بە خەڵکەکەی وت: کێ حەز دەکات سەیری گەورەی گەنجانی بەهەشت بکات با سەیری حوسەین بکات، من ئەمەم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیست.[3]

### شۆڕشەکەی حوسەینی کوڕی عەلی

خەڵکی کووفە هەر لە سەردەمی موعاویەوە نامەیان دەنووسی بۆ حوسەین و داوایان لێدەکرد بچێت بۆ لایان تا بەیعەتی پێبدەن، بەڵام

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩٢.

[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٨١.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٨٢.

حوسـەین رازی نەدەبـوو، ئینجـا خەڵکێکیـان هاتـن بـۆ لای ئیبنولحەنەفیـەو داوایان لێکرد بچێت بۆ لایان، ئەویش رازی نەبوو، ئینجا ئیبنولحەنەفیە هات بۆ لای حوسـەین و هەواڵەکـەی بۆ باسـکرد، حوسـەینیش وتـی: ئـەو خەڵکـە دەیانەوێـت نـان بەسـەر ئێمـەوە بخـۆن.[1]

مەڕوانـی کـوڕی حەکـەم نامەیەکـی نووسـی بـۆ موعاویـەو وتـی: گومانـم هەیـە لـەوەی حوسـەین نیـازی ئاشـووبەیەکی هەبێت، بۆیـە موعاویـە نامـەی نووسـی بـۆ حوسـەین و تیایـدا وتـی:

ئـەوەی بەڵێنـی دابێـت بـە خـواو سـوێندی لەسـەر خواردبێت، شیاوی ئەوەیە وەفـای پـێ بـکات، بیسـتوومە خەڵکـی لـە کووفـە داوایـان لێکردویـت دووبەرەکـی بنێیتـەوەو جیـا ببیتـەوە، تـۆ ئەوانـەت بـۆ تاقـی بوەتـەوە کـە چـۆن خـراپ بـوون بەرامبەر باوکـت و براکـەت، دەی لـە خـوا بترسـەو بیری ئـەو بەڵێنـەت بێت.

لە وەڵامدا حوسەین نامەی نووسی بۆ موعاویەو تیایدا هاتبووو:

نامەکـەت گەیشـتە دەسـتم، مـن سـەرقاڵی ئـەوە نیـم کـە بـۆت باسـکراوەو نامەوێـت نـە لەگەڵـت بجەنگـم و نـە دژایەتیـت بکـەم، پێـم وانیـە لای خـوا بیانوویەکـم هەبێـت بـۆ ئـەوەی وازم هێنـاوە لـە جیهـاد بەرامبـەرت و پێـم وایـە دەسـەڵاتداری تـۆ گەورەتریـن فیتنەیـە.[2]

موعاویـە پێش مردنـی یەزیدی بانـگ کـرد و ئامـۆژگاری کـرد، وتـی: وریـای حوسـەین بـە چونکـە خۆشـەویسـترین کەسـە لـە ناو خەڵکدا، بەردەوام سـەردانی بکـەو لەگەڵـی نـەرم و نیـان بـە، ئەگەریـش بەزمێکـی هەبـوو بەرامبـەری ئـەوە خـوات بەسـە تـا بـە هـۆی ئەوانـەی باوکیـان کوشـت و پشـتی براکەیـان بـەردا لـە تـۆی دوور بخاتـەوە.[3]

کاتێـک موعاویـە مـرد یەزیـد نامـەی نـارد بـۆ وەلیـدی کـوڕی عوقبـە کـە

---

[1] البداية والنهاية، ج٨، ص ١٦١.

[2] - البداية والنهاية، ج٨، ص١٦٢، سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٥.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٥.

والی مەدینە بوو، داوای لێکرد بەیعەتی بۆ وەربگرێت، ئینجا وتی: سەرەتا لە کەسە بەناوبانگەکانەوە دەست پێ بکەو لەگەڵ حوسەین نەرمونیان بە، وەلیدیش ناردی بە شوێن حوسەین و ئیبن زوبەیردا، ئەو کاتەش هێشتا شەو بوو، داوای کرد لە هەردووکیان بەیعەت بدەن بە یەزید، ئەوانیش وتیان با بەیانی بێتەوە بزانین خەڵکی چی دەکەن، ئەوەبوو هەر ئەو شەوە لە مەدینە دەرچوون بەرەو مەککە، کە گەیشتنە ئەوی حوسەین لە ماڵی عەبباس دابەزی، عەبدوڵای کوڕی زوبەیریش لە ماڵی حجر دابەزی و بەیانی و ئێوارە سەردانی حوسەینی دەکرد و بەردەوام خەڵکی هاندەدا دژی ئومەویەکان، عەبدوڵا داوای لە حوسەین دەکرد بەرەو عێراق بچێت و دەیوت ئەوان هەواداری تۆن، بەڵام ئیبن عەبباس بەردەوام ڕێگری لێدەکرد و دەیوت کاری وا نەکەیت.[1]

بەڵام لە گێڕانەوەی تردا هاتووە کاتێک حوسەینی کوڕی عەلی ویستی بچێت بۆ عێراق، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر حوسەینی دواند کە بۆچی دەچێت، حوسەین وتی: بەیعەتی چل هەزار کەسم بۆهاتووە کە تەڵاق و بەڵێنی مەرگیان داوە لەگەڵ منن، عەبدوڵاش ئاگاداری دەکردەوەو دەیوت دەچیت بۆ لای خەڵکێک کە باوکی تۆیان کوشت و براکەشتیان دەرکردیت.[2]

**نیازی شۆڕشەکەی حوسەین:**

حوسەین کە ویستی بەرامبەر بە یەزید بوەستێتەوە چەند ئامانجێکی هەبوو وەک ئەوەی لە سەرچاوەکاندا هاتووە نەک وەک ئەوەی ڕەوت و ڕێبازێکی سیاسی یان ئایینی بۆی داناوە، چونکە مێژوو ئەوەیە کە ڕوویداوە نەوەک ئەوەی ئێمە بمانەوێت چۆن ڕوویدابێت:

یەکەم: حوسەین یەزیدی بە شیاوی ئەو پۆستە نەدەزانی.[3]

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٥.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٦١.

[3] العواصم من القواصم، ١٧٣.

دووەم: بۆ نەهێشتنی ستەم و بەرگرتن بە هەر هەنگاوێکی گەشەسەندنی ستەم،[1] وەک حەسەن خۆیشی دەڵێت: هیوام وایە خوای گەورە پاداشتی حەسەنی برام بداتەوە بەهۆی نیازی حەزی دەستگرتنەوەی لە جەنگ و پاداشتی منیش بداتەوە بەهۆی نیازی حەزم بۆ جیهادی دژ بە ستەمکاران.[2]

سێیەم: نیازی وەرگرتنی دەسەڵات، چونکە ئەو پێی وابوو خۆی شیاوترە لە یەزید، بەڵگەش بۆ ئەم نیازەی حوسەین ئەمانەن:

أ: حەسەنی برای کە لە کۆتا ساتەکانی ژیانیدا ئامۆژگاری حوسەینی برای دەکات پێی دەڵێت: کە هەوڵی دەسەڵات مەدە (براکەم باوکمان بەر رەحمەتی خوا بکەوێت کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد خۆی بۆ ئەم بارە- دەسەڵات- دانابوو و هیوای وابوو بۆ ئەو بێت، ئەوەبوو خوا دووری گرت لێی و دایە دەست ئەبووبەکر، کە ئەبووبەکر سەرەمەرگی هات هەمدی حەزی پێکرد، ئەوەبوو هەمدی دوورخرایەوە لێی بەر عومەر کەوت، کە عومەر سەرەمەرگی هات کردی بە شوورا لە نێوان شەش کەسدا کە باوکمان یەکێک بوو لەوان، ئەوەبوو بەر عوثمان کەوت، کە عوثمانیش کوژرا بەیعەتی پێدرا، دوایی ململانێی لەگەڵ کرا تا شمشێری بۆ هەڵکرد و لەسەری جەنگا، بارەکە بۆی لەبار نەبوو و هیچی لێ دەست نەکەوت، سوێند بەخوا وانابینم خوای گەورە پێغەمبەرایەتی و خیلافەتیش لە ناو ئێمەی ئالوبەیتدا کۆبکاتەوە، وادەبینم هەرزەکانی کووفە تۆیش کەم دەگرن و دەرت دەکەن).[3]

ب: ئیبن عومەر کە زانی حوسەین بە نیازە بچێت بۆ کووفە بە حوسەینی وت: خوای گەورە پێغەمبەری خۆی لە نێوان دنیا و ئاخیرەتدا سەرپشک کرد، ئەویش ئاخیرەتی هەڵبژارد، ئێوەش بەشێکن لە پێغەمبەر(ﷺ)، هەرگیز هیچکامتان دنیاتان بۆ نابێت، خوای گەورەش کە دنیای لێ دوور گرتون چاکتری بۆ داناون.[4]

[1] العواصم من القواصم، ١٧٣.
[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٦٢.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩١-٣٩٢.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٢.

چوارەم: تـا وەڵامـی ئـەو بەڵێن شـكاندنە بداتـەوە كـە موعاويـە ئەنجامـی دابـوو لـەوەی دواتـر خیلافـەت بگەڕێتـەوە بـۆ شـوورا، بـەڵام ئـەو بەيعەتـی وەرگـرت بۆ يەزيدی كوڕی، ئەمـەش تەنها بـە بەڵگـەی ئـەو دەقـە رێككەوتنـەی كـە ئيبن حەجـەری هەيتەمـی باسـی كـردووە.[1]

**ئامادەسازیەكانی حوسەین**

حوسـەین كـە لـە مەككـە بـوو بـەردەوام نامـەی خەڵكـی كووفـەی بـۆ دەهـات كـە داوايـان لێدەكـرد بچێت بـۆ لايـان، ئيتـر زيـاد لـە سـەدو پەنجـا نامـەی بـۆ نێردرا، دەيانـوت وا چاوەڕێتيـن تكايـە زۆر زوو وەرە، نێردراو دوای نێردراو دەهاتـن بـۆ لای، دواييـن نێردراوەكانيـش هانيئـی سـوبەيعی و سـەعيدی حەنەفی بـوون،[2] بۆيـە حوسـەين كەوتـە ئامادەسـازی، بـەو دوو كۆتـا نێردراوەشـدا نامەيەكـی نـارد بـۆ خەڵكـی كووفـە و تيايـدا نووسـيبووی: وا هانيئـو سـەعيد كـە كۆتـا نێردراوی ئێـوە بـوون هاتـن بـۆ لام و وا منيـش بـرا و ئامـۆزا و كەسـی جێمتمانـەی نـاو بنەماڵەكـەم دەنێـرم بـۆ لاتـان و فەرمانـم پێكـردووە بـاری ئێـوەم بـە نامەيەكـدا بـۆ بنێرێتـەوە، ئەگـەر بـۆی نووسـيم كـە رای زۆربـەو كەسـانی ديـار و پياوماقووڵتـان وەک ئەوەيـە كـە نێردراوەكانتـان پێيـان وتـوم ئـەوا پشـت بـە خـوا دێـم بـۆ لاتـان.[3]

ئامادەسازیەكانی حوسەین بۆ ئەو بوارە خۆیان لە سێ خاڵدا دەبینیەوە:

يەكەم: وەرگرتنـی رای هـاوەڵان و گـەورە كەسـانی ديـاری حيجـاز كـە دواتـر وەڵام و داواكاری ئـەوان بەرامبـەر بـەم هەنگاوەی دەخەينـەڕوو.

دووەم: ناردنـی موسليمی ئامـۆزای بـۆ كووفـە تـا لـەوێ بەيعەتـی بـۆ وەربگرێـت و ئامادەسـازی بـۆ بكات.

سێيەم: كۆكردنـەوەی ژن و منـاڵ و خزمانـی تـا لەگـەڵ خۆيـدا بيانبـات وەک

---

[1] الصواعق المحرقة، ج٢، ص ٣٩٩.

[2] المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ٣٢٧.

[3] المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ٣٢٨.

ئەوەی نیازی گەڕانەوەی نەبێت و هەر لە عێراق دەسەڵاتداری بکات و لەوێ بمێنێتەوە.

حوسەین سەرەتا موسلیمی کوڕی عەقیلی نارد و فەرمانی پێکرد لای هانیئی کوڕی عورروە دابەزێت و هەواڵی خەڵکی کووفەی بۆ بنێرێت،[1] موسلیمیش کەوتەڕێ تا گەیشتە مەدینەو لەوێ دوو کەسی بۆ ڕێنیشاندەر لەگەڵ خۆی برد، لەڕێدا لە تینواندا یەکێکیان مرد،[2] بۆیە موسلیم داوای لە حوسەین کرد بگەڕێتەوە، بەڵام حوسەین پێی وت: بەردەوام بە لە ڕۆیشتنەکەت،[3] موسلیم بە دزیەوە چوویە کووفە و هەوادارانی حوسەین دەهاتن بۆ لای و بەیعەتیان پێدەدا، موسلیم کە بینی خەڵکی بە لێشاو دێن بۆ بەیعەت، نامەی نووسی بۆ حوسەین و وتی: تا ئێستا هەژدەهەزار کەس بەیعەتیان پێداوم، بۆیە زوو وەرە و هیچ ڕێگرێکیش نیە لە ڕێی کووفەدا.[4]

ئەوکات والی کووفە نوعمانی کوڕی بەشیر بوو، یەزید ترسی هەبوو نوعمان هەڵوێستی نەبێت بەرامبەر بە حوسەین، بۆیە نوعمانی کوڕ بەشیری لابرد و عوبەیدوڵای والی بەصرەی کرد بە بەر پرسی کووفەیش و داوای لێکرد خێرا خۆی بگەیەنێتە کووفە، ئەوەبوو عوبەیدوڵاش خێرا خۆی گەیاندە کووفە، کە گەیشتە ئەوێ خەڵکی لێی کۆبوونەوەو وایاندەزانی ئەوە حوسەینە و هاواریان دەکرد ئەی کچەزای پێغەمبەر(ﷺ) سوپاس بۆ خوا کە خوا تۆی نیشان داین، ئینجا قاچ و دەستیان ماچ دەکرد، ئیتر عوبەیدوڵا هەستی کرد بە مەترسی بارەکە، بۆیە چوویە مزگەوت و دوو ڕکات نوێژی کرد و دواتر چوویە سەر مینبەر و ڕووپۆشەکەی سەر سەری لابرد.[5]

دواتر چوو بۆ کۆشک و مەولایەکی خۆی بانگ کرد و سێ هەزار

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٩.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٧٨.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٦.

[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٩.

[5] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٩.

درهەمی پێدا و وتی: بڕۆ بزانە کێ بەیعەت لە خەڵکی کووفە وەردەگرێت، بڵێ من ڕێبوارم و ئەم پارەیەم هێناوە تا هاوکاری بکەم، ئەویش چوو و لە ڕێی کەسێکەوە خۆی گەیاند بە موسلیم و پارەکەی پێدا و بەیعەتی پێدا و دواتر گەڕایەوە بۆ لای عوبەیدوڵا و هەواڵەکەی بۆ باسکرد.[1]

**هەڵوێستی هاوەڵان و دەوروبەر بەرامبەر دەرچوونی حوسەین**

ئیبن عومەر هاتە مەدینەو هەواڵی حوسەینی پرسی، پێی وترا بەرەو عێراق کەوتووەتەڕێ، ئەوەبوو ئیبن عومەر خێرا چوو بە دوایدا و پاش دوو ڕۆژە ڕێ ئینجا گەیشت بە حوسەین، پێی وت: بۆ کوێ دەچیت؟ وتی: بۆ عێراق، ئیبن عومەر وتی: مەڕۆ بۆ لایان، حوسەین وتی: ئەوە نامەکانیانن و بەیعەتیان بۆ ناردوم، ئیبن عومەر وتی: خوای گەورە پێغەمبەری خۆی سەرپشک کرد لەنێوان دنیا و ئاخیرەتدا، ئەویش ئاخیرەتی هەڵبژارد، ئێوەش بەشێکن لە پێغەمبەر(ﷺ)، هەرگیز هیچکامتان دنیاتان بۆ نابێت، خوای گەورەش کە دنیای لێ دورو گرتون چاکتری بۆ داناون، ئینجا خەڵکی عێراق خەڵکێکی خراپن و باوکتیان کوشت و دایان لە براکەشت و ئەوەو ئەوەیان کرد، بەڵام حوسەین قەناعەتی نەکرد و ڕازی نەبوو، دواجار ئیبن عومەر کە زانی حوسەین هەر دەڕوات دەستی کردە ملی وتی:ماڵئاوایی کوژرانت لێدەکەم-وەک کوژراوێک ماڵئاواییت لێدەکەم-.[2]

حوسەین هەر کە چوو بۆ لای ئیبن عەبباس ڕاوێژی پێکرد سەبارەت بەو کارەی، لە وەڵامدا ئیبن عەبباس ڕای وابوو کاری وا نەکات چونکە مەرگی ئەوی لێدەکەوێتەوە، بەڵام حوسەین پێی وت: مەرگم لا خۆشترە لەوەی بەو بارە ڕازی بم.[3]

ئینجا عەبدوڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵای کوڕی عەییاش کە لە عومرەوە دەهاتنەوە چوون بۆ لای حوسەین و عەبدوڵای کوڕی زوبەیر،

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٧.

[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٢-٢٩٣.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٢.

ئیبن عومەر وتی: بۆ خاتری خوا بگەڕێنەوە بۆ ئەو بارەی خەڵکی تێدان و بۆ خەڵک باشترە و پەلە مەکەن، ئەگەر خەڵکی هەموو رازی بوون پێی ئەم دوانەش خۆتان جیا مەکەنەوە، ئەگەریش خەڵکی هەموان لەسەری رازی نەبوون ئەوکات ئەوەی دەتانەوێت بیکەن.[1]

ئینجا ئیبن عەبباس پێی وت: کوڕی فاتیمە بۆ کوێ دەچیت؟ وتی: دەچم بۆ عێراق بۆ لای هەوادارنم، ئەویش وتی: پێم خۆش نیە ئەم دەموچاوەی تۆ بچێت بۆ لای خەڵکێک کە باوکتیان کوشت، ئینجا زۆر قسەی بۆ کرد.[2]

پێی وت: ئەگەر ئەو خەڵکەی داوایان لێکردویت بچیت بۆ لایان ئەمیرەکەی ئێستایان کوشتووەو باری وڵاتیان رێکخستووەو دوژمنیان دەرکردووە ئەوە برۆ بۆ لایان، بەڵام ئەگەر لە کاتێکدا بانگت دەکەن کە هێشتا ئەمیرەکەیان ماوەو کاربەدەستانی سەرقاڵی سامان وەرگرتنن لە خەڵکی وڵاتەکە، ئەوە تەنها تۆ بۆ جەنگ بانگ دەکەن و منیش هیچ دڵنیا نیم لەوەی لەخشتەت نەبە نو لە قسەت دەرنەچن و پشتت بەرنەدەن و لەدژیت نەجەنگن و ببنە سەرسەختترین دوژمن بۆت، حوسەینیش وتی: نوێژی ئیستیخارە دەکەم بزانم چۆن دەبێت.[3]

ئیبن عەبباس هەر خۆی پێ رانەگیرا و بۆ بەیانیەکەی هاتەوە بۆ لای وتی: ئامۆزا گیان زۆر خۆم راگرت بەڵام خۆم پێ راناگیرێت و ئارامم بڕاوە، من زۆر دەترسم بەم کارەت لەناو بچیت، چونکە خەڵکی عێراق ناپاکن، لێیان نزیک مەبەرەوەو لەم خاکەدا بمێنەرەوە، تۆ سەییدی خەڵکی حیجازیت، ئەگەر خەڵکی عێراق راست دەکەن تۆیان دەوێت نامەیان بۆ بنێرە داوا بکە تا بەرپرسەکەیان دووربخەنەوەو دواتر برۆ بۆ لایان، ئەگەر ئەوەش ناکەیت دەی بڕۆ بۆ یەمەن چونکە لەوێ قەڵا و شیوی لێیەو

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٦.

[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٦.

[3] الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٣٩٩.

خاکێکی فراوان و گەورەیە و هەوادارانێکی باوکیشت لەوێن و دووریت لەو خەڵکەو لەوێوە پەیام و بانگخوازانت بڵاو بکەرەوە، پێم وایە ئەمەت بۆ باشترە، بەڵام حوسەین وتی: ئامۆزا گیان دەزانم تۆ دڵت بۆم دەسووتێت و ئامۆژگاریم دەکەیت، بەڵام من خۆم پێچاوەتەوەو یەکلا بوومەتەوە کە بچم، ئیبن عەبباس وتی: دەی هەر دەڕۆیت ژن و منداڵەکانت مەبە، دەترسم وەک چۆن عوثمان کوژرا تۆش ئاوا لەناو ژن و منالەکانتا بکوژرێیت و ئەوانیش تەماشا بکەن.[1]

ئەبوو سەعید پێی وت: لەخوا بترسەو لە ماڵی خۆت دابنیشە.[2]

عەبدوڵای کوڕی زوبەیر چوو بۆ لای حوسەین و وتی: پێم باشە نەچیت بۆ کووفەو لە حیجازەوە ئەو کارە دەست پێ بکەیت و ئێمەش دژایەتیت ناکەین و پشتیوانت دەبین و بەیعەتت پێ دەدەین، بەڵام حوسەین زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی جەنگ و ئاژاوەیەک رووبدات نەکەوێتە مەککەو مەدینەوە، بۆیە ئامادەیی نەبوو لە حیجازەوە دەست پێ بکات.[3]

ئەبوو سەعیدی خودری هات بۆ لای حوسەین و وتی: ئەی ئەبووعەبدوڵا من ئامۆژگاریت دەکەم و چاکەی تۆم دەوێت و دڵم بۆت دەسووتێت، بیستوومە خەڵکێ لە هەوادارانت نامەیان بۆ نوسیویت تا بچیت بۆ لایان، مەڕۆ بۆ لایان، چونکە من لە باوکتم بیست لە کووفە بوو دەیوت بەخوا لێیان بێزار بووم و ئەوانیش لێم بێزار بون، لێیان تووڕەم و لێم تووڕەن، هیچ وەفایەکم لێ بەدی نەکردن و هیچ سووربوون و خۆڕاگری و پێچەسپاویم لێ بەدی نەکردن.[4]

عومەری کوڕی عەبدورەحمانی کوڕی حارث هات بۆ لای و پێی وت: ئەگەر برای منت پێ دڵسۆزانەیە با قسەیەک بکەم و ئەگەر وام نابینیت

[1] الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤٠٠-٤٠١.
[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٦.
[3] الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤٠٠.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٤.

با بێدەنگ بم، حوسەین وتی: قسەکەت بکە بەخوا وانابینم کەسێکی ئارەزووبێژ بیت، عومەر وتی: بیستوومە دەتەوێت بچیت بۆ عێراق، من دڵم بۆت دەسووتێت، دەچیت بۆ وڵاتێک هێشتا کاربەدەستەکانی لەوێن، بەیتولمالی تیا ماوەو خەڵکیش کۆیلەی دیناور درهەمن، من دەترسم ئەوەی بەڵێنی سەرخستنی پێداویتلە دژت بجەنگن، حوسەین لە وەڵامدا پێی وت: خوا پاداشتت بداتەوە ئامۆزا گیان، دەزانم تۆ دڵسۆزانە هاتویت و ژیرانەش قسە دەکەیت، با بزانم چۆن دەبێت، یان راکەت وەردەگرم و یان رای خۆمم دەبێت، بەهەرحاڵ من تۆ بە باشترین ئامۆژگاریکەر تەماشا دەکەم.[1]

دواتر هەریەک لە جابیری کوڕی عەبدوڵا و ئەبوو واقیدی لەیپی داوایان لێکرد نەچێت، ئیبنولموسەییبیش دەیوت نەچوایە بەرەو عێراق زۆر باشتر بوو بۆی.[2]

عەبدوڵای کوڕی جەعفەریش نامەی نووسی بۆ حوسەین و وتی: لەبەر خوا داوات لێدەکەم نەچیت، لە وەڵامدا حوسەین وتی: خەوێکم دیوە بە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە تیایدا فەرمانی پێکردوم بە شتێک دەبێت بچم بۆی.[3]

ئیبن زوبەیریش بە حوسەینی وت: بۆ کوێ دەڕۆیت؟ بۆ لای خەڵکێک کە باوکتیان کوشت و براکەتیان بریندار کرد؟ حوسەین وتی: ئەگەر بکوژرێم لام خۆشترە لەوەی مەککە هێرشی بکرێتەسەر.[4]

جابیری کوڕی عەبدوڵا داوای لێکرد نەچێت و واز بهێنێت، ئەبوو واقیدی لەیثیش هەمان داوای لێکرد، بەڵام حوسەین رازی نەبوو دابنیشێت.[5]

پێش ئەوەی لە مەککەوە دەربچێت، لە رێدا کە حوسەین دەچوو بەرەو مەککە عەبدوڵای کوڕی موطیع پێی وت: بۆ کوێ نیازتە؟ حوسەین وتی:

[1] الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٣٩٩.
[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٦.
[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٧.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٣.
[5] تاريخ الإسلام، ج٥، ص ٨.

ئێستا بەرەو مەککە دەچم و دوای ئەوەش ئیستیخارە دەکەم بزانم خوا چیم دێنێتە ڕێ، عەبدوڵاش وتی: خوا خێرت بێنێتە ڕێ و بە قوربانت بین، کە چوویتە مەککە روو نەکەیتە کووفە چونکە وڵاتێکی شوومەو لەوێ باوکت کوژرا و پشتی براکەت بەردرا،[1] بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم خۆتمان لێ دوور مەگرەو مەڕۆ، بەخوائەگەر تۆ بکوژرێیت دەمانکەنە کۆیلەو خزمەتکار.[2]

موحەممەدی برایشی چوو بۆ لای و لە مەککە پێی گەیشت و وتی: دەرچوونت لەمڕۆدا باش نیە، بەڵام حوسەین بەگوێی نەکرد، ئینجا موحەممەد ویستی ڕێگری بکات لە کوڕەکەی خۆی، بەڵام حوسەین سەرکۆنەی کرد لەسەر ئەو هەڵوێستەی.[3]

**هەڵوێستی ئومەویەکان بەرامبەر دەرچوونی حوسەین**

یەزیدی کوڕی موعاویە کە هەواڵی زانی حوسەین نیازی دەرچوونی هەیە نامەیەکی نووسی بۆ ئیبن عەبباس و هەواڵی پێدا کە تۆ گەورەی بنەماڵەکەتیت و رات وەرگیراوە، دەی ڕێی لێبگرەو مەهێڵە دووبەرەکی بنێتەوە، لە وەڵامیشدا ئیبن عەبباس نامەی بۆ نووسی من هیوام وایە دەرچوونی حوسەین و هاتنی بۆ شتێک نەبێت کە تۆ پێی بێزار بیت و بێبەشیشی ناکەم لە ئامۆژگاری.[4]

مەڕوانی کوڕی حەکەمیش نامەی نارد بۆ عوبەیدوڵای کوڕی زیاد و تیایدا نووسیبوو:

وا حوسەین بەرەو لای تۆ دێت، سوێند بەخوا کەس نیە هێندەی حوسەین لامان خۆشەویست بێت، دەی وریابە بەرامبەری نەورووژێیت و خۆتت پێ

---

[1] المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ٣٢٧.
[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٦.
[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٤.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٤.

ڕانەگیرێت.[1]

هاوکات یەزید نامەی نارد بۆ ئیبن زیاد و هەواڵی پێدا کە وا حوسەین بەرەو ئەوێ دێت.[2]

پاش ئەوەی عەبدوڵای کوڕی جەعفەر داوای لێکرد، عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاص نامەی نووسی بۆ حوسەین و وتی: هیوام وایە خوای گەورە پێگەیشتوویی و تێگەیشتوویت پێ ببەخشێت و دوورت بخاتەوە لەو نیازەت، بیستوومە نیازی چوون بۆ عێراقت هەیە، لەبەر خوا داوام لێتە دووبەرەکی نەنێیتەوە، ئەگەریش ترست هەیە ئەوە وەرە بۆ لای من و لای من پەنا و دڵنیایی و چاکەو خزمایەتیت دەست دەکەوێت، لە وەڵامدا حوسەین وەڵامی دایەوە ئەگەر نیازت لەم نامەت بۆ چاکەو خزمایەتیتە لەگەڵم خوا لە دنیا و قیامەتدا پاداشتت بداتەوە، ئەوەی بانگەواز بۆ لای خوا دەکات و کاری چاکە دەکات و دەڵێت: من لە موسڵمانانم دووبەرەکی نانێتەوە، چاکترین پەناش پەنای خوایە، ئەوەی لە دنیادا لە خوا نەترسێت بڕوای بە خوا نیە، بۆیە لەخواترسانێکی دنیامان لە خوا دەوێت کە پەنای ڕۆژی دوایی لەگەڵ بێت.[3]

پاش ئەوەی عوبەیدوڵا دڵنیا بوو لە هاتنی حوسەین، سوپایەکی چوار هەزار کەسی ئامادە کرد بۆ لێدانی حوسەین، ئەو سوپایە بە نیاز بوون بۆ جیهاد بچن بۆ دەیلەم، بەڵام عوبەیدوڵا ڕێی پێ گۆڕین بۆ ئەو جەنگەی حوسەین.[4]

**دەرچوونی حوسەین بەرەو عێراق**

پاش ئەوەی حوسەین هەواڵی موسلیمی پێگەیشت، لە مەککەوە ڕێی گرتەبەر.[5]

حوسەین هەواڵی نارد بۆ مەدینە تا هاوڕاکانی لەوێ پەیوەستی

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص٣٠٤.
[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٥.
[3] تاريخ الطبري، ج٣، ص ٢٩٧.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٥.
[5] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٨.

بن، ئەوەبوو نزیکەی نۆزدە ژن و پیاو و منداڵی بەنی عەبدولموتەلیب بەڕێکەوتن بۆ لای، موحەممەدی برایشی چوو بۆ لای و لە مەککە پێی گەیشت و وتی: دەرچوونت لەمڕۆدا باش نیە، بەڵام حوسەین بەگوێی نەکرد، ئینجا موحەممەد ویستی ڕێگری بکات لە کوڕەکەی خۆی، بەڵام حوسەین سەرکۆنەی کرد لەسەر ئەو هەڵوێستەی.[1]

حوسەین لە دەی ذیلحیججەدا بە ژن و منداڵ و کەسوکارو شەست کەسی ترەوە بەڕێکەوت.[2]

سەرەتا کاروانی عەمری کوڕی سەعید کە ئەمیری حیجاز بوو ڕێی گرت بە دەرچوونی حوسەین و خەریک بوو جەنگ ڕووبدات، بەڵام حوسەین نەیهێشت جەنگ ڕووبدات، دواتر لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو تا گەیشتە کاروانێکی یەمەنیەکان کە جل و بەرگیان پێ بوو و دەچوون بۆ لای یەزید، حوسەین جل و بەرگەکەی کڕی لێیان و وتی: کێ حەز دەکات لەگەڵمان بێت با بێت و کێش نایەوێت دەتوانێت بگەڕێتەوە.[3]

لە ڕێدا حوسەین گەیشت بە کابرایەکی ثەعلەبی، کابرا پێی وت: ئەی کچەزای پێغەمبەر(ﷺ)دەتبینم خەڵکێکی کەمت لەگەڵە، بەڵام حوسەین ئاماژەی کرد بە کۆڵێک کە پێی بوو وتی: ئەوە پڕە لە نامە[4](ی پشتیوانی خەڵکی عێراق).

فەرەزدەق دەڵێت: لە ڕێدا گەیشتم بە حوسەین، حوسەین وتی: بە ڕای تۆ خەڵکی کووفە چۆن دەبن لەگەڵم، بارێک نامەی ئەوانم پێیە کە بۆیان ناردوم، منیش وتم: مەڕۆ پشتت بەردەدەن،[5] هەروەها پێم وت: دڵەکان

---

[1] سیر أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٤.
[2] سیر أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٤.
[3] الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤٠١.
[4] سیر أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٥.
[5] سیر أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٤.

لەگەڵ تۆن و شمشێرەکان لەگەڵ ئومەویەکانن.[١]

**بەیەکگەیشتنی هاشمی و ئومەوی**

لە ڕێدا حوسەین نێردراوێکی نارد بۆ کووفە تا بەخەڵک بڵێت وا بەڕێوەیە و ئامادە بن، کەچی نێردراوەکە کەوتە دەست سەربازانی ئیبن زیاد و کوژرا.[٢]

لەولاشەوە موسلیم کە هەواڵی جموجوولی عوبەیدوڵای بیست بە چوار سەد کەسەوە بەرەو کۆشک چوو، کەچی تا گەیشتە کۆشک تەنها شەست کەسی لەگەڵ مایەوە، ئیتر دەمەو ئێوارە بوو، جەنگێکی سەختیان کرد و دواجار شکستیان خوارد و موسلیم رایکرد و پەنای بردە بە ماڵی ئافرەتێکی کیندی،[٣] ئەو ئافرەتە کوڕێکی هەبوو کە مەولای موحەممەدی کوڕی ئەشعەث بوو، ئەو کوڕە چوو هەواڵی لە موسلیم دا، بۆیە عوبەیدوڵا خێرا پۆلیسی نارد و موسلیمیش لەگەڵیان جەنگا، بەڵام موحەممەد پەنای بەخشی بە موسلیم، بۆیە موسلیم خۆی دا بە دەستەوە، کەچی موسلیمی برد بۆ عوبەیدوڵا،[٤] پێش ئەوەی بکوژرێت موسلیم داوای کرد لە ئیبن سەعد تا هەواڵ بگەیەنێتە حوسەین نەیەت و بگەڕێتەوە، چونکە ئەو خەڵکە درۆیان لەگەڵ کردووە، ئەویش خێرا کەسێکی نارد بۆ حوسەین، ئەوەبوو ئەو کەسە خۆی گەیاندە حوسەین و هەواڵەکەی پێدا،[٥] هاوکات هەواڵی ئەوەشی پێدرا کە نێردراوەکەشی لە ڕێدا ناردبووی ئەویش کوژراوە،[٦] عەلی ئەکبەری کوڕی حوسەین وتی: بابە گیان بگەڕێرەوە ئەوانە خەڵکی عێراقن، ناپاکی و کەموەفاییان ناسراوە،[٧] بەڵام بەنی عەقیل کە زانییان

---

(١) سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٢٩٧.
(٢) الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤٠٢.
(٣) سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٠.
(٤) سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٨.
(٥) سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٠.
(٦) الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤٠٤.
(٧) سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٠.

موسلیم کوژراوه وتیان گەڕانەوه نیه،[1] بۆیه حوسەینیان گەرم دەکرد تا هەر بڕوات، دواجار حوسەین بڕیاریدا کێ دەیەوێت با بگەڕێتەوەو کێش دێت با بێت، ئەوەبوو خەڵکێک گەڕانەوە.[2]

ئیبنولجەوزی دەڵێت: زانایانی ژیاننامە (مێژوو) دەڵێن کاتێک حوسەین زانی چی بەسەر موسلیمدا هاتووه ویستی بگەڕێتەوە، بەڵام براکانی موسلیم وتیان بەخوا ناگەڕێینەوه تا تۆڵەی خۆمان نەکەینەوە، حوسەینیش وتی: دوای نەمانی ئێوه خێر لە ژیاندا نیە، بۆیە درێژەی دا بە ڕۆیشتنەکەی.[3]

هەموو ئەوانەی لەگەڵ حوسەین بوون پەنجا کەس بوون، نۆزدەیان لە بنەماڵەی خۆی بوون، حوسەین وتی: خەڵکینە واز بێنن با بگەڕێینەوە، بەڵام ئەوان وتیان ناگەڕێینەوە.[4]

لەولاشەوە عوبەیدوڵا ئامادەسازی دەکرد و سەربازانی کۆکردەوەو سامانێکی زۆری دا پێیان، هەروەها چوار هەزار سەربازی دایە دەست عومەری کوڕی سەعد، بەڵام عومەر رازی نەبوو جەنگی حوسەین بکات، عوبەیدوڵا وتی: ئەگەر وانەکەیت کەنارت دەخەم و لەسەر دەسەڵات لاتدەبەم و ماڵەکەشت دەڕووخێنم و لە گەردنیشت دەدەم،[5] بەرامبەر بەوەش تەماعی خستە بەردەم کە ئەگەر ئەو کارە بکات ئەوا ناوچەی (رەی)ش دەخاتە ژێر دەستی.[6]

دواتر کە حوسەین هەر بەردەوام بوو لە ڕێدا گەیشت بە کاروانێکی سوپایی ئومەویەکان بە سەرکردایەتی حەرری کوڕی یەزیدی تەمیمی کە هەزار سەربازی لەگەڵ بوو، بەڵام نێوانیان تێکنەچوو، بەڵکو زۆر نەرمونیان

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨٠

[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٠.

[3] المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ٣٢٩.

[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٠.

[5] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٠.

[6] أسد الغابة، ٢، ص ٢٩.

بوون پێکەوە، تەنانەت کە کاتی نوێژی نیوەڕۆ هات و بانگ درا حوسەین چوویە دەرەوەو وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: من لەسەر داوای ئێوە هاتوم جا ئەگەر بەڵێنتان بیەنە سەر باشە، ئەگەریش بەڵێنتان نابەنە سەر یان حەز بە هاتنم ناکەن لەکوێوە هاتوم دەگەڕێمەوە، ئینجا حوسەین بە حەڕری وت: بەرنوێژی بکە بۆ سوپاکەت، حەڕر وتی: بەڵکو تۆ بەرنوێژی بکە بۆ سوپاکەی خۆت و ئێمەش، ئەوەبوو حوسەین بەرنوێژی کرد و هەردوو سوپا پێکەوە ریزیان بەست، دواتر حەڕر گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، نوێژی عەسریشیان بە هەمان شێوە پێکەوە کرد، ئینجا حوسەین پاش نوێژی عەسر وتارێکی تری پێشکەش کردن و دووبارە باسی کرد کە من بە نامەی ئێوە هاتوم و ئەگەریش حەز ناکەن دەگەڕێمەوە، حەڕریش وتی: بەخوا ئێمە ئاگاداری ئەو نامەو نێردراوانە نین، حوسەینیش دوو باوەش لەو نامانەی دەرکرد کە بۆی هاتبوون و لەبەردەستیاندا بڵاوی کردنەوە، حەڕر وتی: ئێمە لەوانە نین ئەم نامانەیان ناردون بۆت، فەرمانیشمان پێکراوە کە گەیشتین بە تۆ لەگەڵت بین تا دەتبەینە کووفە، بەڵام حوسەین رازی نەبوو و فەرمانی کرد بە یاوەرانی تا بگەڕێنەوە، بەڵام حەڕر رێی نەدا بگەڕێنەوە و وتی: هەر دەبێت بێیت بۆ لای ئیبن زیاد، حوسەین دەیوت نایەم و حەڕریش دەیوت منیش دەستبەردار نابم تا بێیت، دواجار حەڕر وتی: فەرمانم پێ نەکراوە لەگەڵت بجەنگم تەنها فەرمانم پێکراوە بتبەم بۆ کووفە، بۆیە ئەگەر هەر نایەیت ئەوە رێیەکی تر بگرە بەر کە نەچێتە کووفەو نەشگەڕێیتەوە بۆ مەدینە تا من نامە بنووسم بۆ ئیبن زیاد و تۆش خۆت نامەیەک بنووسە بۆ ئیبن زیاد یان بۆ یەزید، ئیتر حوسەین رێی گرتەبەر و حەڕریش لەولاوە هەمان رێی گرتەبەر، حوسەین قسەی دەکرد بۆ خەڵکەکەو حەڕریش دەیوت با نەکاتە جەنگ و بکوژرێیت، حوسەینیش دەیوت من ترسی کوژرانم نیە، بۆیە حەڕر کاریگەر بوو بە

قسەکانی حوسەین و کەناری گرت، لە ڕێدا چەند کەسێک لە کووفەوە هاتن و حوسەین پرسیاری لێکردن هەواڵ چیە، یەکێکیان وتی: دڵی خەڵک لەگەڵ تۆیە و شمشێرەکانیان لە دژت هەڵکراون.[1]

ئینجا بەو جۆرە بەردەوام چوون تا گەیشتنە نەینەوا، لەوێ ئیبن زیاد نامەیەکی نووسی بۆ حەڕر و داوای لێکرد حوسەین و هاوەڵانی لە شوێنێکی بێ ئاو رابگرێت تا فەرمانی نوێی پێدەگات، حەڕریش ئەو فەرمانەی وت: بە حوسەین و پەیڕەیوشی کرد، زوهەیر کە لەگەڵ حوسەین بوو وتی: ئەی نەوەی پێغەمبەر(ﷺ) جەنگی ئەمانە بکەین ئاسانترە تا ئەوەی یارمەتیتیان بۆ بێت، حوسەین وتی: بەڵام من دەست ناکەم بە جەنگەکە، زوهەیر وتی: دەی بمانبە بۆ ئەو گوندەی ئەوێ کە لە کەناری فوراتەو شوێنێکی باشە، ئەگەر ڕێمان لێ بگرن لەگەڵیان دەجەنگین ، بەڵام حوسەین بە گوێی نەکرد، ئەوەبوو بۆ بەیانیەکەی عومەری کوڕی سەعد هات و خۆی گەیاند بە سوپاکە، هەرچەندە زۆر لە کەسانی نزیکی داوایان لێکردبوو نەچێت بۆ جەنگی دژ بە حوسەین بەڵام هەر هات.[2]

تینوێتی زۆری هێنا بۆ حوسەین و یاوەرانی، سوپای بەرامبەریش نەیدەهێشت بچن ئاو بهێنن، حوسەین داوای کرد لە عومەر شەوێک مۆڵەتی بدات، ئەوەبوو کۆبوونەوەو زۆر قسەیان کرد، تەنانەت سەربازەکانیش تێکەڵ بوون و قسەیان دەکرد، لەوێ حوسەین پێشنیازی بۆ عومەر کرد کە یەکێک لە سێ داواکەی قبووڵ بکات،یان خۆی بچێت بۆ لای یەزید، یان بچێت بۆ سەنگەرێکی جیهاد، یان بگەڕێتەوە بۆ مەدینە، پاش نزیکەی سێ بۆ چوار جار دانیشتنی حوسەین و عومەر دواجار عومەر ئەو پێشنیازانەی بە نامەیەکدا نادر بۆ ئیبن زیاد.[3]

[1] الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤٠٧-٤٠٩.
[2] الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤١١-٤١٢.
[3] الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤١٣.

عوبەیدوڵا بیستی حوسەین نیازی هەبووە بگەڕێتەوە هەڵوێستی گۆڕاو وتی: با بۆ کوێ حەز دەکات بڕوات، بەڵام شیمر کە لەلای بوو وتی: نابێت دەرفەت لەدەست بدەیت و لە دەستت دەرنەچێت،[1] ئەو لە خاکی تۆدایە بۆیە وا دەڵێت، ئەگەر ئێرە جێبهێڵێت و بەیعەتت پێ نەدات بەهێزتر دەبێت و دێتەوە بۆت، جا باشترە لە لاوازیدا لێی بدەیت و دەرفەتی پێ مەدە، با بە بڕیاری تۆ رازی بێت،[2] ئەم قسانە کاریان کردە سەر ئیبن زیاد، بۆیە داوای کرد لە عومەر هێرش بباتە سەر حوسەین،[3] پێی وت: تۆم نەناردووە تا دەست بگریتەوە لە حوسەین و دەرفەتی پێبدەیت و لای من سکاڵای بۆ بکەیت، بزانە ئەگەر حوسەین بە بڕیارەکەم رازی بوو باشە و بیانهێنە بۆ لام، ئەگەر نا بدە بەسەریاندا و بیانکوژە، ئەگەریش ئەوەت پێ ناکرێت واز بێنەو کەنار بگرە با شیمر ئەو کارە بکات،[4] بەڵام ئەو رازی نەبوو، خێرا عوبەیدوڵا بە شیمری وت: بڕۆ ئەگەر عومەر جەنگی دژ بە حوسەینی کرد باشە، ئەگەرنا عومەر بکوژەو خۆت ببەرە بەرپرسی خەڵکەکە.[5]

کاتێک شیمر هات و نامەکەی دا بە عومەر، عومەر پێی وت: بەخوا دەزانم تۆ بویتە رێگری ئەو پێشنیازەو بارەکەت شێواند، ئێمە هیوامان وابوو خوای گەورە بارەکە چاک بکات.[6]

ئەو ماوە وا رۆیشت و شەو هات و هەردوو لا چاوەڕێی رووداوەکانی بەیانی بوون،[7] حوسەین ئیتر بەرەبەرە هەستی کرد بە ناپاکی بەڵێنەکانی عێراقیەکان، لە شوێنی مانەوەی خۆی دانیشتبوو و سەرقاڵی خوێندنی قورئان بوو و فرمێسکیش بەسەر کوڵمەکانیدا دەخلیسکا، کابرایەک هاتە ژوور و

(1) سیر أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٠.
(2) الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤١٤.
(3) سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٠.
(4) الكامل في اتاريخ، ج٣، ص ٤١٤.
(5) سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٠.
(6) الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤١٥.
(7) الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤١٧.

پێی وت: بە دایک و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی کچەزای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆچی هاتویتەتە ئەم وڵاتە، ئەویش وتی: ئەوە هەمووی نامەی خەڵکی کووفەیە کە بۆیان ناردووم کەچی ئێستا وا دەبینم نیازی کوشتنی منیان هەیە، ئەگەریش ئەوە بکەن هیچ سنوورێکی خوا نامێنێت نەیبەزێنن و خوای گەورەش کەسی وا زاڵ دەکات بەسەریاندا کە سەرشۆڕیان بکات.[1]

سەربازانی ئومەوی هاتن بەرەو لای حوسەین، حوسەینیش بە عەبباسی برای وت: بزانە بۆچی هاتون، ئەویش پرسیاری کرد لێیان، ئەوانیش وتیان نامەی ئەمیرمان پێگەیشتووە فەرمانی پێکردوین داوات لێبکەین ملکەچی بڕیاری بیت یان لەگەڵت بجەنگین، ئەویش وتی: ئەمشەو مۆڵەتمان بدەن، ئەوانیش مۆڵەتیان پێدان و گەڕانەوە.[2]

شەوی عاشوورا بوو، حوسەین هاوەڵانی کۆکردەوەو سوپاسی خوای کرد و وتی: من وایدەبینم ئەو خەڵکە سبەینێ لەگەڵتان دەجەنگن، منیش مۆڵەتی هەمووتانم داوەو گەردنتان ئازاد بێت، کام لەئێوە هێز و توانای هەیە با یەکێک لە ئالوبەیتم بباتە لای خۆی و هەموو بڵاوەی لێ بکەن، چونکە ئەوان تەنها بۆ من دەگەڕێن، بەڵام کەسوکارەکەی وتیان دوای تۆ ژیانمان ناوێت بەخوا لێت جیا نابینەوە، هاوەڵەکانی تریشی هەمان شتیان وت.[3]

ئەو شەوە تا بەیانی حوسەین و یارانی سەرقاڵی نوێژ و پەرستش بوون.[4]

بەیانی هات و حوسەین ئەم نزایەی کرد: خوایە تۆ متمانەی منیت لە هەموو نارەحەتیەک و دەربازکەری منیت لە هەموو سەختیەک، لەم بارەی تووشم بووە تۆ پەنای منیت، تۆ خاوەنی هەموو بەخششێک و خاوەنی

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٦٩.
[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠١.
[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠١.
[4] المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ٣٣٨.

هەموو چاکەیەکیت.

ئینجا روویکردە عومەری کوڕی سەعید و پێی وت: پەلە مەکەن، سوێند بەخوا من تەنها بە نامەی کەسانی وەک ئێوە هاتوم کە دەیانوت سوننەت مردووەو دووروویی زاڵ بووەو سنوورەکانی شەریعەت پەیڕەو ناکرێن دەی وەرە بۆ لامان بەڵکو خوا بە هۆی تۆوە باری ئوممەت چاک بکات، بۆیە منیش هاتوم، جا ئەگەر حەز بەوە ناکەن ئەوە من دەگەڕێمەوەو ئێوەش بزانن دروستە من بکوژن یان خوێنم حەڵاڵ بکەن؟ مەگەر من کچەزای پێغەمبەرەکەتان نیم، کوڕی ئامۆزای پێغەمبەر(ﷺ) نیم؟ مەگەر حەمزەو عەبباس و جەعفەر مامەکانم نیم؟ مەگەر نەتانبیستووە پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە من و براکەم دەیفەرموو ئەم دوانە گەورەی گەنجانی بەهەشتن؟

بەڵام شیمر گاڵتەی دەهات بە قسەکانی حوسەین، عومەریش بە حوسەینی وت: ئەگەر بە دەستی من دەبوو بە گوێم دەکردیت، حوسەینیش نزای کرد لە خەڵکی عێراق و وتی: خوایە خەڵکی عێراق لەخشتەیان بردم و ئەوەیان کرد بە براکەم کە کردیان، خوایە ریزیان تێکبدەو لەناویان بەرە.[1]

عومەریش نوێژی بەیانی کرد و حوسەینیش بەرنوێژی کرد بۆ یارانی، حوسەین و هاوەڵانی وا کۆبووبوونەوە، زوهەیر لای راستەوەو حەبیبی کوڕی موتەههەر لای چەپ و عەبباسی برای حوسەینیش ئاڵاکەی بەدەستەوە بوو و ژن و مناڵەکانیش لە پشتەوە بوون.[2]

لە بەرامبەردا سوپاکەی عومەر وابوو: عەمری کوڕی حەججاج لای راستی سوپا، شیمر لای چەپی سوپا، عوروەی کوڕی قەیس بەرپرسی سوارەکان، شبتی کوڕی ریبعی بەرپرسی پیادەکان، ئاڵاکەیش بە دەستی

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٢.

[2] الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤١٧.

دورەیدەوە بوو.[1]

حەرری کوڕی یەزید کە لە سوپای ئومەویدا بوو کاتێک پێشنیازەکانی حوسەینی بینی و سەیری کرد راکەی وەرنەگیرا وتی: ئەریٚ لەخوا ناترسن ئەو رایەیان وەرناگرن سوێند بەخوا ئەگەر تورک و دەیلەم داوای وایان بکردایە بۆتان نەبوو رازی نەبن، کەچی ئەوان هەر سوور بوون راکەی ئیبن زیاد پەیڕەو بکەن، بۆیە حەڕ هەڵگەڕایەوە لە ئومەویەکان و کەوتە کوشتنیان و دوان لەوانی کوشت و خۆیشی کوژرا.[2]

**شەهیدکردنی حوسەین**

لە کەربەلائی خاکی جەنگەکەدا ژمارەی ئەوانەی لەگەڵ حوسەین بوون نزیکەی چل و پێنج ئەسپ سوار و سەد کەسی پیادە بوون.[3]

حوسەین لەویٚ دوا وتەکانی خۆی بۆ هاوەڵانی پێشکەش کردو وتی: گوێم لیٚ بگرن و پەلەم لیٚ مەکەن تا ئامۆژگاریتان بکەم و پۆزشتان بۆ بهێنمەوە بەهۆی ئەم هاتنەمەوە، ئینجا کە قسەکانی تەواو بوو خوشکەکانی دەستیان کرد بە گریان، حوسەین عەبباسی برای و عەلی کوڕی نارد تا بێدەنگیان بکات.[4]

یەکەم کەس کە دەستی کرد بە جەنگەکە مەولایەکی عوبەیدوڵای کوڕی زیاد بوو، عەبدوڵای کوڕی تەمیمی کەلبی چوو بۆی و کوشتی،[5] بەڵام رایەکی تر دەڵێت: عومەر یەکەم کەس بوو تیرێکی وەشاند و وتی: شایەت بن من یەکەم کەس بووم تیرەکەم وەشاند.[6]

حوسەین دانیشتبوو و تیر بەملاوبەولایدا دەهاوێژرا، یەکیٚ: لە تیرەکان بە کوڕێکی سیٚ ساڵەی کەوت، ئەوکات ئیتر حوسەین جلی جەنگی پۆشی

[1] الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤١٨.
[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٧٠.
[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨١.
[4] الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤١٨.
[5] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٢.
[6] الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٤٢١.

و دەستی کرد بە جەنگ کردن هەتا هەموویان کوژران، عەلی کوڕیشی بەشداری جەنگەکە بوو، حوسەین تینووی بوو، کەسێک ئاوی بۆ هێنا و دایە دەستی، لەولاوە حوصەینی کوڕی تەمیم تیرێکی وەشاند و تیرەکە دای لە ناو دەمی حوسەین و خوێن لە دەمیەوە دەچۆڕایە ناو دەستی، حوسەین سوپاسی خوای دەکرد و ڕوویکردە ئاوی فورات تا خۆی بگەیەنێتە ئەوێ، سەربازان ڕێیان لێگرت بچێت بەرەو ئاوەکە، کەسێکی تر تیرێکی بۆ وەشاندو پێکای، دواجار گەمارۆ درا هەرچەندە ئەو هەر بەردەوام بوو لە جەنگ کردن و دووری دەخستنەوە، دواجار شیمر هاواری کرد دایکتان ڕۆڵە ڕۆتان بۆ بکات چاوەڕێی چین بیکوژن، ئەوەبوو زورعەی تەمیمی چووە پێشەوەو شمشێرێکی دا لە باڵی، حوسەینیش شمشێرێکی دا لەسەر شانی، ئینجا سینانی نەخەعی هاتە پێشەوەو دوو شمشێری لێداو خستی، دواتر دابەزی تا سەریشی لێبکاتەوە، بەڵام خەولی ئەصبەحی هات و سەری حوسەینی لێکردەوەو بردی بۆ عوبەیدوڵای کوڕی زیاد، هیوای وابوو خەڵاتی بکات، بەڵام عوبەیدوڵا هیچی پێنەدا، جەستەی حوسەین هەمووی شوێن پێکان بوو نزیکەی سی و سێ جار پێکرابوو.[١]

سەبارەت بە کاتی شەهید بوونی لە ڕۆژی عاشووورای ساڵی شەست و یەکی کۆچیدا بوو،[٢] دەوترێت ئەو ڕۆژە شەممە بووە، ڕایەکی تر دەڵێت: بەڵکو ڕۆژی دووشەممە بوو.[٣]

لەگەڵ حوسەیندا ئەم کەسە نزیکانەشی لەگەڵیدا شەهید بوون:

جەعفەر و حوسەین و عەبباس و موحەممەد و عوثمان و ئەبووبەکر کە برای حوسەین بوون، عەلی ئەکبەر و عەبدوڵای کوڕانی حوسەین،[٤]

---

[١] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٢.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨١.

[٣] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣١٨.

[٤] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٨٩.

ئەبووبەکری کوڕی حوسەین،[1] عەبدوڵا و قاسم و ئەبووبەکری کوڕانی حەسەنی برای.[2]

**پاش شەهیدبوونی حوسەین**

شینی درۆزنانەی عێراقیەکان خۆی دەنواند، یەکێک لە سەربازانی عێراقی جلوبەرگەکەی فاتیمەی کچی حوسەینی دەبرد و دەشگریا، فاتیمە پێی وت: بۆچی دەگریت؟ سەربازەکە وتی: چۆن دەبێت کەلوپەلی نەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بە تاڵان بەرم و نەگریم؟ فاتیمە وتی: دەی مەیبەو دایبنێ، سەربازەکە وتی: ئاخۆ دەترسم کەسێکی تر بیبات.[3]

عومەری کوڕی سەعد زۆر پەشیمان بوو لەو کارەی کردی و سەرکۆنەی خۆی دەکرد کە بۆچی بە گوێی ئیبن زیادی کردووە.[4] ئینجا عومەر سەری حوسەینی نارد بۆ لای ئیبن زیاد و ئەویش بە دارێکی دەستی لێوەکانی سەری حوسەینی دەجووڵاند، کە زەیدی کوڕی ئەرقەم ئەوەی دی وتی: ئەو دارەت لابەرە سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەکی تر نیە لێوەکانی پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی لەسەر ئەو لێوانە بوون و ماچی دەکردن، ئینجا دەستی کرد بە گریان.[5]

ئینجا هەواڵ برا بۆ یەزید کە حوسەین کوژراوە، فرمێسکەکانی یەزید لە چاوانی دابارین و وتی: من رازی بووم بێ کوشتنی حوسەین تەواو بێت و ئێوە گوێڕایەڵم بن.[6]

ئەوانەی لەناو کەسەکانی حوسەیندا مابوونەوەو نەکوژرابوون بریتی بوون لە عەلی ئەصغەری کوڕی و حەسەنی برازای و عەمری برای و قاسمی کوڕی عەبدوڵای کوڕی جەعفەر و موحەممەدی کوڕی عەقیل و

[1] تاريخ الطبري، ج٣، ص ٣٤٣.
[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٨٩.
[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٣.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٣.
[5] أسد الغابة، ج٢، ص ٢٩.
[6] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٣.

زەینەب و فاتیمەی کچانی عەلی و فاتیمەو سەکینەی کچانی حوسەین و روبابی کەلبی ژنی و ئوممومحەممەدی برازای و دوو کۆیلەیان.[1]

سەبارەت بە رووداوەکانی پاش شەهیدبوونی یەزید گێڕانەوەی زۆر هەن کە بەشێکی زۆریان هی ئەبوو موخنەفن کە کەسێکی را وەرگیراو و جێمتمانەی لای زانایانی فەرمووده نیە، هەروەها گێڕانەوەکانیشی پێچەوانەی یەکن، هەندێ گێڕانەوەی تریش هەر هاتون، ئێمە چەند نمونەیەکی کەم دەخەینە بەرچاو و دواتر رای روون لەو بارەوە دەخەینەڕوو:

هاوکات سەری حوسەینیش نێردرا بۆ یەزید،[2] ئەویش بە دارێکی دەستی سەری دەجووڵاند و دارەکەی دەدا لە دەمی حوسەین، ئەبوو بورزە لەوێ بوو وتی: ئەو دارەت لابەرە، من پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی دەمی لە سەر دەمی حوسەین دانابوو،[3] بەڵام ئیبن کەثیر دەڵێت: را و بەڵگەی دروست ئەوەیە کە سەری حوسەین نەنێردرا بۆ شام.[4]

راستی ئەمەش لەوەدا دەردەکەوێت کە ئیبن تەیمیە باسی دەکات و دەڵێت: ئەو رووداوە بۆ یەزید راستی نیە چونکە ئەو کاتە ئەبوو بورزە لە عێراق بووە نەک لە شام.[5]

ئیبن تەیمیە دەڵێت: ئەوەی سەری براوە بۆ لای ئیبن زیاد دروستە، بەڵام ئەوەی سەری برابێت بۆ لای یەزید ئەوە درۆی تیایە و سەنەدی دروستی لەسەر نیە، بەڵکو هەموویان سەنەدیان مونقەتیعە.[6]

فاتیمە دەڵێت: کە چووین بۆ لای یەزید لە بەردەم خۆی داینیشاندین و نەرمی و سۆزی بەرامبەر نواندین و فەرمانی کرد شتمان بۆ هێنرا، دواتر

---

[1] سیر أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٣.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨١
[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٩.
[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٦٥.
[5] كتب و رسائل و فتاوى ابن تيمية في الفقه، ج٢٧، ص ٤٧٠.
[6] مجموع الفتاوى لابن تيمية، ج٢٧، ص ٤٧٨.

یەزید وتی: ئەی نوعمانی کوڕی بەشیر چییان پێویستە بۆیان دابین بکەو کەسێکی پاک و دڵنیاو خواناس بنێرە لەگەڵیان و دەستەیەکی سوارەش بنێرە لەگەڵیان تا بیانبەنەوە بۆ مەدینە، لەو ماوەی پێش چوونیان یەزید هەرکات نانی بخواردایە بەیانی و ئێوارە عەلی کوڕی حوسەینی بانگ دەکرد بۆ لای خۆی تا لەگەڵیدا نان بخوات، دواتر کە ویستیان بچن یەزید عەلی بانگ کرد و وتی: نەفرەت لە کوڕی مەرجانە سوێند بەخوا ئەگەر من لای حوسەین بومایە چی داوا بکردایە قبووڵم دەکرد و ڕێگریم دەکرد لە لەناوچوونی با تەنانەت پێویستی بکردایە لەو پێناوەدا منداڵەکانیشم لەناوبچن، بەڵام ئەوە قەزای خوا بوو و ڕوویدا.[1]

ئەوانە بران بۆ لای یەزید، سەکینە پێی وت: ئەی یەزید دەتەوێت کچەزاکانی پێغەمبەر(ﷺ) بە کەنیزەک بگیرێن؟ ئەویش وتی: برازا بەخوا من زۆر زیاتر لە تۆ بەم بارە دڵگرانم، سوێند بەخوا ئەگەر نەکوشتنی حوسەین بەند بوایە بە لەدەستدانی هەندێ لە تەمەنم پێم خۆش بوو ئەو تەمەنەم لەدەست بدەم لە بری کوژرانی حوسەین.[2]

ئینجا سەیری عەلی ئەصغەری کرد و وتی: باوکت دژایەتی دەسەڵاتی کردم، کابرایەک لەولاوە هەستاو وتی: کچەکانیان حەڵاڵن بۆمان، عەلی وتی: درۆ دەکەیت مەگەر ئەوەی بێباوەڕ بیت ئینجا، یەزید فەرمانی کرد ژنەکان بران بۆ ناو ژن و منداڵەکانی خۆی، ئینجا سێ ڕۆژ پرسە گێردرا بۆ حوسەین.[3]

دواتر یەزید فەرمانی کرد بارگەو کەلوپەل پێچرایەوە بۆیان و بەرەو مەدینە بەڕێکران،[4] هەروەها سەری حوسەینی نارد بۆ والی مەدینەو لە

---

[1] تاريخ الطبري، ج٣، ص ٣٤٠.

[2] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٣.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٣- ٣٠٤.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨١

پاڵ فاتیمەی دایکی و حەسەنی برایدا سەری ئەسپەردە کرا.[1]

رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو سەری حوسەین لە دیمەشق ئەسپەردە کراوە.[2]

ئەوەی من لە گێڕانەوەکانی پەیوەست بە هەڵوێستی یەزید و ناردنی سەری حوسەینەوە دەیبینم لەم چەند خاڵەدا دەیخەمەڕوو:

یەکەم: یەزید تەنها زمانی بەکاردەهێنا بۆ دڵنەوایی کەسوکاری حوسەین، ئیتر ئایا بۆ رازیکردنیان بووبێت تا هەستی خەڵک زیاتر نەورووژێت، یان پەشیمان بووبێت و بەو جۆرە دەربڕیبێت، یان بە بینینی دیمەنی جەرگبڕانەی ئەو دەستە ژن و منداڵانە هەستی جووڵابێت و رای گۆڕابێت، بەڵام ئەوە تەنها سوودی بریتی بوو لە نەرشتنی خوێنی ئەو ژن و منداڵانەو زیاترنەکردنی خوێن رێژی، ئەگەرنا هیچ هەڵوێستێکی جددی نەنواند بۆ راستی پەشیمانی و حەزنەکردنی بەو کارەی، چونکە نە سزای بکوژنی دا، نە پەندی لەو رووداوە وەرگرت و ئەوەبوو دوای ئەوەش کوشتاری تری هاوەڵانی کرد، نە قەرەبووی بەرچاوی بنەماڵەی حوسەینی کرد.

دووەم: هەرچەندە یەزید ستەمکار بووەو خراپەی زۆر بووە، بەڵام ئەوەی دەوترێت سەری حوسەینی بۆ براوەو بە دارێک یاری پێکردووە ئەمە راست نیە، چونکە هەم ئەو پێویستی نەبووە بەو سەرە، ئەگەریش نێردرابێت، یەزید ژمارەیەکی بەرچاوی هاوەڵانی لە دەوروبەر بوو، دەیزانی حوسەین چەندە خۆشەویستە لای خەڵک، ئەگەر تەنها بۆ راگرتنی هەستی دەوروبەرو کۆمەڵگەکەش بووبێت خۆی دوورگرتووە لە سووکایەتی کردن بە سەری براوی رەیحانەکەی پێغەمبەر(ﷺ)، نەک لەبەر چاکی خۆی، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو هەڵوێستە بۆ ئەو تەنها هەست وروووژاندنی خەڵکی لێدەکەوتەوە، خواش زاناترە کە دەشگونجێت شتی وا

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣١٥.

[2] المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ٣٤٤.

روویدابێت، بەڵام ناروونیەک لە گێڕانەوەکاندا هەن.

**تاوانبارانی خوێنی حوسەین کێ بوون؟**

گرنگترین ئەو کەسانەی تاوانبار بوون لە شەهیدبوونی حوسەیندا بریتی بوون لە:

یەکەم: شیمر

دووەم: عوبەیدوڵای کوڕی زیاد کە باوکی عەرەب و دایکیشی فارس بوو ناوی مەرجانە بوو و لە کچانی گەورە بەرپرسانی پێشووی فارسەکان بوو.[1]

سێیەم: عەمری کوڕی سەعد کە سەرەتا نیازی شەڕکردنی نەبوو، بەڵام ترساندن و خەڵاتبەخشی ئیبن زیاد کردیە بەشداری کاری جەنگەکە.

چوارەم: هەموو سەربازانی بەشداربووی ناو ئەو جەنگە بەتایبەت بکوژە رەسمیەکانی کە بریتی بوون لە حوصەینی کوڕی تەمیم، زورعەی تەمیمی، سینانی نەخەعی، خەولی ئەصبەحی.

پێنجەم: یەزیدی کوڕی موعاویە کە بێدەنگیەکی گەورەی نواند لە ئاست هاتنی حوسەیندا و دەبوو خۆی بڕۆیشتایە چونکە ئەوە رەیحانەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، هەروەها دوای شەهیدبوونیشی هیچ سزایەکی بکوژانی نەدا.

شەشەم: ئەو هەموو ناپاکانەی ناو کووفە کە نزیکەی هەژدە هەزار کەس دەبوون و بەیعەتیان دابوو بە حوسەین و دواتر پشتیان تێکرد.

**چەند رایەک سەبارەت بە شەهید بوونی حوسەین:**

ئیبراهیمی نەخەعی دەڵێت: ئەگەر من لەناو ئەو سوپایەدا بوومایە کە حوسەینی کوشت و دواتریش بچوومایەتە بەهەشتەوە لەوێ شەرمم دەکرد سەیری ناوچاوانی پێغەمبەر(ﷺ) بکەم.[2]

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٥٩٥.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨١.

ئیبن تەیمیە دەڵێت: وەک چۆن کوژرانی عوثمان بوویە هۆیەکی گەورەی کەوتنەوەی ئاشووب، هەروەها کوژرانی حوسەین ئاشووبی نێوان خەڵکی لێکەوتەوە.[1]

هەروەها ئیبن تەیمیە سەبارەت بە یەزید دەڵێت: ئەو نە فەرمانی کرد بە کوژرانی حوسەین و نە بە کوژرانیشی خۆشحاڵی دەربڕی، هەروەها ئەوەی هاتووە بە دارێک گەمەی بە لێوەکانی کردبێت راست نیە،هەروەها سەری حوسەینیش نەبرا بۆ شام.[2]

پرسیار کرا لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئایا یەزیدت خۆش ئەوێت؟ ئەویش وتی: جا کەس هەیە بڕوای بە خوا و رۆژی دوایی هەبێت و یەزیدی خۆش بوێت؟ وترا ئەی ئیتر بۆچی نەفرینی لێ ناکەیت؟ ئەویش وتی: –بە کوڕەکەی– مەگەر تا ئێستا دیوتە باوکت نەفرین لە کەس بکات؟[3]

ذەهەبی دەڵێت: یەزید یەکێکە لەوانەی کە نە قسەی پێ دەڵێین و نە خۆشمان دەوێت.[4]

ئیبن کەثیر دەڵێت: پێویستە هەموو موسڵمانێک دڵگران بێت بە کوژرانی حوسەین رەزای خوای لێ بێت چونکە لە گەورانی موسڵمانان و زانایانی ناو هاوەڵان و کچەزانی پێغەمبەر(ﷺ) بووە، خواناس و سەخاوەت بووە، بەڵام ئەو خەفەت و خۆئازاردانەی شیعە بۆی دەکەن باش نیە کە لەوانەیە زۆربەی تەنها خۆنواندن و رووپامایی بێت.[5]

ئەهلی سوننە لەبەر بوونی تاوان کەسێک کافر ناکەن، واتە یەزید بە کافر نازانن لەبەر ئەوەی کوفری روونی لێ نەبینراوە، لەسەر تاوانەکانیشی

---

[1] إقامة الدليل على إبطال التحليل لابن تيمية، ج٤، ص ٢٠١.

[2] مجموع الفتاوى لابن تيمية، ج٣، ص ٤١١.

[3] مجموع الفتاوى، ج٢٧، ص ٤٧٨.

[4] سير أعلام النبلاء، ج٤، ص ٣٦.

[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨ ص ٢٠٣.

که کردوویەتی رقیان لێیەتی.[1]

سەبارەت بەوانەش کە حوسەینیان کوشت ئیبن تەیمیە دەڵێت: لە خراپترین دروستکراوانی خوا بوون.[2]

## ١٠٦١. حولەیس(رضي الله عنه)

ناوی حولەیسەو فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[3]

## ١٠٦٢. حومامی کوڕی عومەر(رضي الله عنه)

ناوی حومامی کوڕی عومەری ئەسلەمیە، لە سەردەمی نەفامیدا کە زینا زۆر بووە کابرایەک چوویە لای ئافرەتێک و منداڵێکی لێی بوو ناوی نا حومام، ئینجا کە ئیسلام هات کابرا هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و سەبارەت بەو منداڵە پرسیاری لێکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمانی پێکرد ئەو منداڵەی بباتەوە لای خۆی.[4]

## ١٠٦٣. حومامی کوڕی جەمووح(رضي الله عنه)

ناوی حومامی کوڕی جەمووحی کوڕی زەیدە، لە پشتیوانانە، لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو و تیایدا شەهید بوو.[5]

## ١٠٦٤. حومەمەی دەوسی(رضي الله عنه)

ناوی حومەمەی دەوسیە، هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بووە، دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا لە فەتحی

[1] مجموع الفتاوى لابن تيمية، ج٢٧، ص ٤٧٨.
[2] مجموع الفتاوى لابن تيمية، ج٣، ص ٤١١.
[3] الإصابة في تمييزالصحابة، ج٢، ص
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١٩.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢٠.

ئەصبەهاندا بەشداری کرد، جا لە جەنگەکەدا نزای کرد و وتی: خوایە حومەمە بانگەشەی ئەوە دەکات حەزی بە دیداری تۆیە، خوایە ئەگەر راست دەکات ویستەکەی بهێنەرە دی، خوایە ئەگەریش درۆ دەکات لەناوی بەرە با حەزیش نەکات، خوایە حومەمە لەم گەشتەی نەگەڕێنیتەوە، ئەوەبوو لەو گەشتەیدا مرد، ئەبوو موسای ئەشعەریش دەیوت ئەی خەڵکینە ئەی خەڵکینە سوێند بەخوا ئەوەی لە پێغەمبەرمان بیستووە و هێندەی شارەزاییمان هەبێت حومەمە شەهیدە، تەرمەکەی حومەمە لە ئەصبەهان ئەسپەردە کرا.[1]

## ١٠٦٥. حومەیدی کوڕی ثەور(ﷺ)

ناوی حومەیدی کوڕی ثەوری کوڕی حەزنە، کونیەکەی ئەبولموثەننایە، وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو، شاعیرێکی ناسراو و زۆر بەهێز بوو، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاوە، رایەک دەڵێت: لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا مردووە، رایەکی تریش دەڵێت: تا سەردەمی ئومەوی ژیاوە.[2]

## ١٠٦٦. حومەیدی کوڕی عەبدورەحمان(ﷺ)

ناوی حومەیدی کوڕی عەبدورەحمانی عامریە، هاودەم بە جونەیدی برای هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).[3]

## ١٠٦٧. حومەیلی کوڕی بەصرە(ﷺ)

ناوی حومەیلی کوڕی بەصرەی کوڕی ئەبی بەصرەی غیفاریە، خۆی

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ٧٥.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢٦-١٢٧.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢٨.

و باوکیشی و باپیریشی هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بون، ئەبووبەصرەی باپیری لە غەزای خەیبەردا بەشدار بوو.[1]

## ١٠٦٨. حومەیمەی کچی صەیفی(رضي الله عنها)

ناوی حومەیمەی کچی صەیفی کوڕی صەخرە، هاوسەری بەرائی کوڕی مەعروورە، بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ).[2]

## ١٠٦٩. حومەینەی کچی ئەبی طەلحە(رضي الله عنها)

ناوی حومەینەی کچی ئەبی طەلحەیە، ژنی خەلەفی کوڕی ئەسەد بوو، جا کاتێک خەلەف مرد ئەسوەدی کوڕی خەلەف حومەینەی باوەژنی خۆی بە هاوسەر گرتەوە، هێشتا ئەو کات ئەوە حەرام نەکرابوو، ئەوەبوو ئایەتی خوا دابەزی (ولا تنكحوا ما نكح اباءكم من النساء إلا ما قد سلف) ئیتر لەیەک جیابوونەوە.[3]

## ١٠٧٠. حومەییری کوڕی عەددی(رضي الله عنه)

ناوی حومەییری کوڕی عەددی قاریە، کاتێک عەبدوڵای کوڕی ئەبی سەلوول مرد حومەییر هاوسەرەکەی ئەوی بەهاوسەرگرتەوەو چەند منداڵێکی لێی بوو.[4]

## ١٠٧١. حومرانی کوڕی جابیر(رضي الله عنه)

ناوی حومرانی کوڕی جابیری یەمامیە، وەک وەفد هاتووەتە خزمەت

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٠.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٧.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٨٧.
[4] أسد الغابةن ج٢، ص ٧٨.

پێغەمبەر(ﷺ)، حومران دەڵێت: بیستم پێغەمبەر(ﷺ) سێ جار فەرمووی: وەیل بۆ بەنی ئومەییە.[1]

## ١٠٧٢. حومرانی کوڕی حارثە(رضي الله عنه)

ناوی حومرانی کوڕی حارثەی ئەسلەمیە، ئەمانە هەشت برا بوون کە هەموویان موسڵمان بوون و هەموویشیان لە بەیعەتی ریضواندا بەشدار بوون.[2]

## ١٠٧٣. حویەی کوڕی جاریە(رضي الله عنه)

ناوی حویەی کوڕی جاریەیە، لە جەنگی یەمامەدا شەهید بوو.[3]

## ١٠٧٤. حیببانی کوڕی بوح(رضي الله عنه)

ناوی حیببانی کوڕی بوححە، حیببان دەڵێت: هۆزەکەی من بێباوەڕ بوون، بیستم پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوپایەکی ئامادە کردووە تا هێرش بکات سەریان، منیش هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتم: هۆزەکەی من موسڵمانن؟ ئەویش فەرمووی: جا وایە؟ وتم: بەڵێ، شەو بە دوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) بووم تا بەیانی، بۆ نوێژی بەیانی بانگم دا، پێغەمبەر(ﷺ) جامێکی پێدام و منیش دەستنوێژم تێدا گرت، پێغەمبەریش(ﷺ) پەنجەکانی دەخستە ناو جامەکەوە، ئیتر دەتوت چەند کانیاوێک تەقیوە، ئینجا فەرمووی: (هەرکامتان دەیەوێت دەستنوێژ بگرێت با دەستنوێژ بگرێت)، منیش دەستنوێژم گرت و نوێژم کرد، ئینجا صەدەقەی هۆزەکەمی دایە دەست من تا کۆی بکەمەوە.[4]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢٠.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢٠.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢٠.

[4] مسند أحمد بن حنبل - مسند الشاميين(ﷺ) - حديث حبان بن بح الصدائي عن النبي(ﷺ) ، الرقم ١٧٨٠٨، ضعفه شعيب الأرناؤوط، ضعفه الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة، ١٠/٣٤١-٣٤٢.

حیببان له فەتحی میصردا بەشداری کرد و دواتریش هەر لەوێ نیشتەجێ بوو.[1]

## ١٠٧٥. حیببانی کوڕی حەکەم(ﷺ)

ناوی حیببانی کوڕی حەکەمی سولەمیە، لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا بەشدار بووە، پێغەمبەر(ﷺ) ئاڵای بەنی سولەیمی دایە دەست حیببان، بەڵام دواتر ئاڵاکەی لێسەندەوەو دایە دەست یەزیدی کوڕی ئەخنەس، دواتریش حیببان لە غەزای حونەینیشدا بەشداری کرد.[2]

## ١٠٧٦. حیذمی کوڕی حەنیفە(ﷺ)

ناوی حیذمی کوڕی حەنیفەی مالیکیە،[3] هەم خۆی و باوکیشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بون، کوڕێکی هەبوو بە ناوی حەنظەلە کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[4]

حەنظەلە دەڵێت: حەنیفەی باپیرم بە حیذیمی باوکمی وت: کوڕەکانم بۆ کۆبکەرەوە دەمەوێت وەسیەتیان بۆ بکەم، ئەویش هەموویانی کۆکردەوە، حەنیفە وتی: وەسیەتم بۆتان ئەوەیە ئەم هەتیوەی لە ماڵەکەمدایە سەد وشتری بۆ هەیە، حیذیم وتی: بابە گیان من بیستوومە منداڵەکانت دەڵێن لای باوکمان دەڵێین باشە، ئینجا کاتێک مرد ئەوە دەکەین کە دەیکەین و وەسیەتەکەی ناهێنینە دی، ئەویش وتی: دەی با داوەری نێوان من و ئێوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بێت، حیذیم وتی: رازین، ئەوەبوو حیذیم و حەنیفەی باوکی چوون و حەنظەلەش لەگەڵیان بوو ئەوکات هێشتا منداڵ بوو و لە پشت باوکیەوە بوو، کە چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەلامیان لێکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبوو حیذیم بۆچی هاتویت؟ ئەویش وتی: لەبەر ئەمە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)،

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣.
[3] أسد الغابة، ج٢، ص ٨١.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٣٣.

ئینجا دای بەسەر رانی حیذیمدا، حەنیفە وتی: من دەترسم کتوپڕ بمرم، بۆیە ویستم وەسیەت بکەم و وەسیەتم کرد بۆ ئەو هەتیوەی لە ماڵەکەمدا هەیە سەد وشتری بۆ ببێت کە ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا پێمان دەوت موطەییەبە، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر تووڕە بوو تا ئەوەی تووڕەییمان لەنێو چاوانیەوە بەدیکرد، دانیشتبوو، خێرا جووڵا و لەسەر ئەژنۆکانی دانیشت و فەرمووی: (لا، لا، لا الصدقة خمس، وإلا فعشر، وإلا فخمس عشرة، وإلا فعشرون، وإلا فخمس وعشرون، وإلا فثلاثون، وإلا فخمس وثلاثون، فإن كثرت فأربعون)، (نا، نا، نا، صەدەقە پێنج بێت، ئەگەر نا زۆر بوو با دە بێت، یان زۆرتر بوو با پانزە بێت، یان با بیست بێت، یان با بیست و پێنج بێت، یان با سی بێت، یان با سی و پێنج بێت، یان ئەگەر هەر زۆر بوو با چل بێت)، ... ئینجا حەنظەلەی نزیک کردەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: من منداڵی پێگەیشتوو و منداڵی بچووکتریشم هەیە، بچووکترینیان ئەمەیە، دەی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای بۆ بکە، پێغەمبەریش(ﷺ) دەستی هێنا بەسەریدا و فەرمووی: (بارك الله فيك)، ذیال دەڵێت: دەی دەمبینی کەس دەهێنرا بۆ لای حەنظەلە کە وەرەمی هەبوو یان ئاژەڵ دەهێنرا کە وەرەمی هەبوو، حەنظەلە تفی دەکردە سەر دەستی و دەیوت بەناوی خوا و دەستی دەخستە سەر سەری و لەسەر ئەو شوێن دەستەی پێغەمبەر(ﷺ) دەستی دادەنا و دواتر دەیهێنا بەسەر ئەو شوێنەداو ئەو وەرەمە نەدەما.[1]

## ١٠٧. حیذیمی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

ناوی حذیمی کوڕی عەمری ساعیدیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی زیاد.[2]

حیذیم لە حەجی ماڵئاواییدا بەشدار بوو، دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە وتارەکەیدا فەرمووی: (ألا إن دماءكم وأموالكم وأعراضكم عليكم حرام، كحرمة يومكم هذا،

---

[1] مسند أحمد بن حنبل - مسند البصريين(رضي الله عنهم) - بقية حديث حنظلة بن حذيم(رضي الله عنه) ، الرقم ٢٠٩٩٦، صححه شعيب الأرناؤوط.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٤٦.

وكحرمة شهركم هذا، وكحرمة بلدكم هذا)،[1] (وریابـن خوێـن و مـاڵ و ئابڕووتـان لەسـەرتان حەرامـە وەک حەرامـی ئەمڕۆتـان و ئـەم مانگەتـان و ئەم وخاکەتان).

## ١٠٧٨. حیصنی کوڕی قەطەن(ﷺ)

نـاوی حیصنـی کوڕی قەطەنـی کوڕی زابیـری کەلبیـە، لەگـەڵ حارثـەی برای وەک ئەندامێکـی وەفدی کەلبیـەکان هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ)،[2] پێغەمبـەری خـواش(ﷺ) نامـەی بـۆ نووسـی، هـاوکات لەگـەڵ خۆیدا براکەشـی لەگەڵدا بوو.[3]

## ١٠٧٩. حیماس(ﷺ)

ئـەم هاوەڵـە تەنهـا نـاوی هاتـووە، کوڕێکـی هەبـوو بـە نـاوی حەمیـد کـە فەرموودەیەکی لـە باوکیـەوە گێڕاوەتـەوە، حیمـاس دەڵێت: ئێمـە راکشـابووین پێغەمبـەر(ﷺ) هاتـە ژوورەوە بـۆ لامـان و فەرمـووی: ئـەی کوڕە شـیرینەکانم فەرمـان بـە چاکـە بکـەن و ڕێگـری لـە خراپـە بکـەن.[4]



[1] مسند أحمد بن حنبل - أول مسند الكوفيين(ﷺ) - حديث حذيم بن عمرو السعدي(ﷺ)، الرقم ١٩٢٦٩.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٣٣٤.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٥٢٣.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١١٩.

## ١٠٨٠. خاریجەی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

ناوی خاریجەی کوڕی عەمرە، ئەمیش فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی خەڵکینە صەدەقە-زەکات- بۆ من و بنەماڵەکەم-ئەهل و بەیتەکەم- حەڵاڵ نیە).[١]

ئەم فەرموودە لە عەمری کوڕی خاریجەشەوە هاتووە،[٢] ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەمە لە خاریجەی کوڕی عەمریشەوە هاتووە،[٣] چونکە چەند کەسێک ئەو فەرموودەیان گێڕاوەتەوە.

## ١٠٨١. خاریجەی کوڕ عەمری جومەحی(رضي الله عنه)

ناوی خاریجەی کوڕی عەمری جومەحیە، فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، دەڵێت: لە رۆژی فەتحی مەککەدا من لای وشترەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بووم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: : (ليس لوارث وصية قد أعطى الله عز وجل كل ذي حق حقه وللعاهر الحجر، من ادعى إلى غير أبيه أو تولى غير مواليه فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين، لا يقبل الله منه صرفا ولا عدلا يوم القيامة)،[٤] (میراتگر وەسیەتی بۆ نیە، خوای گەورە مافی بۆ هەموو خاوەن مافێک داناوە، زیناکاریش – کە هاوسەرگیری کردبێت- بە بەرد رەجم کردنی بۆ دەبێت، هەرکەس بانگەواز بکات بۆ باوکێک جگە لە باوکی خۆی، یان مەولایەکی تری دایە پاڵ خۆی، ئەوە نەفرینی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکیشی لەسەرە، خوای گەورە لە رۆژ دواییدا هیچی لێ قبووڵ ناکات).

---

[١] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢٢٤٧.

[٢] مسند أحمد بن حنبل.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢٥.

[٤] المعجم الكبير للطبراني – باب الخاء – من اسمه خارجة – خارجة بن عمرو الجمحي، الرقم ٤١٤٠.

## ١٠٨٢. خاریجەی کوڕی حوذافە(رضي الله عنه)

نـاوی خاریجـەی کـوڕی حوذافـەی کـوڕی غانیمـی قورەیشـی عەدویـە، دایکـی نـاوی فاتیمـەی کچـی عەمـرە، یەکێـک بـوو لـە سـوارچاکە بەهێـز و ناسـراوەکان.[١]

حوذافە یەکێکە لە موسڵمانبوانی ڕۆژی فەتحی مەککە، دواتر لە فتووحاتی ئیسلامیدا بەشداریەکی کارای هەبوو، بەتایبەت لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا، کاتێک عەمری کوڕی عاص داوای یارمەتی سوپایی کرد لە عومەری کوڕی خەططاب و داوای سێ هەزار سوارەی کردبوو، خەلیفە خاریجەی کوڕی حوذافە و زوبەیری کوڕی عەووام و میقدادی کوڕی ئەسوەدی بۆ پشتیوانی عەمر نارد،[٢] لەگەڵ هەریەک لەوانەدا دەستەیەک لە سوپای نارد.[٣]

هەروەها خاریجە لە فەتحی میصردا بەشداری کرد،[٤] ئەمەش لە ساڵی بیستەمی کۆچیدا بوو،[٥] بوو بە دادوەری عەمری کوڕی عاص و لەوێ مایەوە تا ئەوەی کاتێک سێ خەواریجەکە بڕیاریاندا هەریەک لە عەلی کوڕی ئەبووطالیب و موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان و عەمری کوڕی عاص بکوژن، ئەوەی هات عەمر بکوژێت بە هەڵە خاریجەی کوشت، چونکە وایزانی عەمرە، کەچی کە دواتر گیرا و برا بۆ لای عەمر، وتی: بۆ من کێم کوشتووە؟ وتیان: خاریجەت کوشتووە، ئەویش وتی: من نیازم بوو عەمر بکوژم، بەڵام خوا ویستی خاریجە بێت.[٦]

---

[١] أسد الغابة، ج٢، ص ١٠٢ – ١٠٣.

[٢] أسد الغابة، ج٢، ص ١٠٣.

[٣] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٦١٨.

[٤] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٩٧.

[٥] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ١٩٧.

[٦] أسد الغابة، ج٢، ص ١٠٣.

## ١٠٨٣. خاریجەی کوڕی حیصن(ﷺ)

ناوی خاریجەی کوڕی حیصنی کوڕی حوذەیفەیە،[١] کوڕێکی هەبوو بە ناوی ئەسماء، کە گومان هەیە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بووبێت.[٢]

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە تەبووکەوە دەگەڕایەوە، وەفدی بەنی فزارە کە زیاد لە سیانزە کەس دەبوون هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و خاریجەی کوڕی حیصنیش یەکێک بوو لەوان، هاتن و موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی وڵاتەکەی خۆیانی لێ پرسین، ئەوانیش وتیان: وشکەساڵیەو خەریکە ئاژەڵ و ماڵاتەکانیشمان دەفەوتێن، بەڵکو نزامان بۆ بکەیت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە سەر مینبەر نزای کرد بۆیان، باران دایکرد و ماوەی شەش ڕۆژ بەردەوام باران بوو، دواتر پێغەمبەر(ﷺ) چوویە سەر مینبەر و نزای کرد بارانەکە لەسەر مەدینە نەمێنێ ولە شاخ و دۆڵەکاندا بباریێ، نزاکەشی گیرا بوو.[٣]

## ١٠٨٤. خاریجەی کوڕی زەیدی خەزرەجی(ﷺ)

ناوی خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ئەبی زوهەیرە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، ڕایەک هەیە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) برایەتی خستوەتە نێوان خاریجەو ئەبووبەکرەوە،[٤] کاتێک ئەبووبەکری صدیق چوویە مەدینە، لای خاریجەی کوڕی زەید دابەزی و لەوێ مایەوە.[٥]

خاریجە خەزووری ئەبووبەکری صدیق بوو، کچێکی خۆی بە ناوی

---

[١] أسد الغابة، ج٢، ص ١٠٣.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٩٥.

[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٢٩٧.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢٣.

[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٧٤.

حەبیبە مارەی کرد لە ئەبووبەکری صدیق، ئەبووبەکریش لەم ئافرەتە منداڵێکی بوو بە ناوی ئوممکلثوم.[1]

خاریجە کوڕێکی هەبو وبە ناوی زەید، زۆریّ دەڵێن: ئەم بوو دوای مردن قسەی کرد،[2] خاریجە یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەیعەتی عەقەبە.[3]

ئەم هاوەڵە لە غەزای بەدر[4] و ئوحودیشدا بەشداری کرد و لە ئوحوددا شەهید بوو،[5] دواتر کە تەرمەکان دەخرانە ناو گۆڕ، تەرمی هەریەک لە خاریجەو سەعدی کوڕی رەبیعی ئامۆزای پێکەوە خرانە یەک گۆڕەوە.[6]

## ١٠٨٥. خاریجەی کوڕی عوقوفان(رضي الله عنه)

ناوی خاریجەی کوڕی عوقوفانی ثەقەفیە، هەم خۆی و باوکی و میرداسی برایشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوون و پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای کرد بۆیان.[7]

خاریجە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە نەخۆشی سەرەمەرگیدا بوو چووم بۆ لای و عارەقی دەکرد، فاطیمەش کە ئەو حاڵەی بینی وتی: باوکەڕۆ، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (لەمڕۆ بەدوا نارەحەتی لەسەر باوکت نەما).[8]

ئەم بەسەرهاتە لە کتێبەکانی فەرموودەدا لە ئەنەسی کوڕی مالیکیشەوە گێردراوەتەوە.[9]

---

(1) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٦٩.
(2) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٠٣.
(3) أسد الغابة، ج٢، ص ١٠٤.
(4) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢٣.
(5) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٤٤.
(6) أسد الغابة، ج٢، ص ١٠٤.
(7) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢٤.
(8) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢٤.
(9) صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب مرض النبي(ﷺ) ووفاته، الرقم ٤٤٦٢.

## ١٠٨٦. خالیدەی کچی عەمر(ﷺ)

ناوی خالیدەی کچی عەمرە، بەیعەتی داوە بە پێغەمبەر(ﷺ).[١]

## ١٠٨٧. خالیدەی کچی ئەسوەد(ﷺ)

ناوی خالیدەی کچی ئەسوەدی قورەیشیە، هاوەڵێکی زۆر خواناس بوو،[٢] دایکی ناوی ئامینەی کچی نەوفەلە.[٣]

خالیدە لە مەدینە موسڵمان بوو و باوەڕی هێنا بە پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێدا،[٤] عەبدوڵای کوڕی ئەرقەم ئەم ئافرەتەی بەهاوسەر گرت.[٥]

## ١٠٨٨. خالیدەی کچی ئەنەس(ﷺ)

ناوی خالیدەی کچی ئەنەسە، لە پشتیوانانە، جارێک خالیدە هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و داوای روقییەی لێکرد واتە روقییەی شەرعی، پێغەمبەریش(ﷺ) داواکەی بەجێگەیاند.[٦]

## ١٠٨٩. خالیدی کوڕی رەباح(ﷺ)

ناوی خالیدی کوڕی رەباحی حەبەشیە،[٧] برای بیلال کوڕی رەباحی بانگبێژی پێغەمبەری خوایە، کونیەکەی ئەبوو روەیحەیە،[٨] رایەک دەڵێت: برای حەق و دایکیەتی، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو برای ئایینی بووە،[٩] بەڵام

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٩٩.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٩٧.
[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢٤٨.
[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢٤٨.
[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢٤٨.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٩٨.
[٧] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٤٣٦.
[٨] معرفة الصحابة لابن مندة، ص ٤٦٥.
[٩] أسد الغابة، ج٢، ص ١١٥.

رای یەکەم راستترە، چونکە ئەگەر مەبەست برایەتی کۆچەران و پشتیوانان بێت ئەوا پێغەمبەر(ﷺ) بیلال و ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراحی کرد بە برای یەکتر، یان وەک گێڕانەوەیەکی تر بیلالی لەگەڵ ئەبوورووەیحە کرد بە برای یەکتر، ئەگەریش برایەتی گشتی ئایینی بێت ئەوا هەموو هاوەڵان برای ئایینی بیلال بوون.

هەروەک لە گێڕانەوەیەکیشدا هاتووە بیلال داوای ژنی کرد بۆ خالیدی برای، بە خاوەن ماڵەکەی وت ئێمە دوو برای کۆیلە بووین خوا ئازادی کردین، هەژار بووین خوا دەوڵەمەندی کردین، گومڕا بووین خوا ڕێنموونی کردین، ئەگەر کچمان بدەنێ سوپاس بۆ خوا، ئەگەریش جوابمان بکەن ئەوا دەڵێین (لا إله إلا الله)، ئەوەبوو کچەکەیان پێدا.[1]

بەڵام ئیبن حەجەر رای وایە برای ئایینی بیلال بووە بە بەڵگەی ئەوەی بیلال بە عومەری وتووە پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان من و ئەبوو رووەیحەوە.[2]

## ١٠٩٠. خالیدی کوڕی زەید(ئەبوو ئەیووبی ئەنصاری)(ﷺ)

ناوی خالیدی کوڕی زەیدی کوڕی کولەیبە،[3] لە پشتیوانانە لە خەزرەجییەکان لە بەنی نەججار،[4] دایکی ناوی هیندی کچی سەعیدە، کونیەکەی ئەبوو ئەیووبەو زیاتر بە ئەبوو ئەییووبی ئەنصاری ناسراوە.[5]

ئەبوو ئەیووب کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدورەحمان، ژنەکەشی ناوی ئومموحەسەنی کچی زەید بوو،[6] کوڕێکی تری ناوی خالید بوو کە

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ١١٥.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٣.
[3] () -معرفة الصحابة لابن مندة، ص ٤٥٥.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٠٢.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٤.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٨٤.

فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە،[1] هەروەها کچێکیشی هەبوو بە ناوی عەفراء.[2]

ئەبوو ئەییووب یەکێک بوو لە یەکەم موسڵمان بوانی پشتیوانان، یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەیعەتی عەقەبە و غەزای بەدر و لە هەموو غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد.[3]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) چوویە مەدینە یەکەمجار لە ماڵی خالید دابەزی و لەوێ مایەوە تا ئەو کاتەی مزگەوتی مەدینەو خانووی بۆ خۆی دروست کرد.[4]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) چوویە مەدینە، یەکە یەکەی لە پشتیوانان داوایان دەکرد پێغەمبەر(ﷺ) بچێتە ماڵی ئەوەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد وشترەکەی لەبەردەم ماڵی کێدا مۆڵی خوارد دەچێتە ئەوێ چونکە ئەو وشترە لەلایەن خواوە فەرمانی پێکراوە، وشترەکەش لەبەردەم ماڵی ئەبوو ئەیووبدا مۆڵی خوارد.[5]

خانووەکەی ئەبوو ئەیووب دوو قات بوو، ئەبوو ئەیووب پێغەمبەری خوای(ﷺ) لە قاتی یەکەم داناو خۆی و خێزانی چوونە قاتی سەرەوە، جارێک بڕێک ئاو لە ژوورەکەیاندا رژا، خێرا هەستان و بە بەرگ و راخەرێک کە هەیانبوو ئاوەکەیان هەڵدەمژیەوە، بەڵام هەر کەمێک لە ئاوەکە داچۆڕایە خوارەوە، بۆیە ئەبوو ئەیووب چوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) شیاو نیە ئێمە لە سەرەوە بین و تۆ لە خوارەوە بیت، دەبێت ئێوە بچنە سەرەوە،[6] پێم خۆش نیە بەسەر جەنابتانا بچمە سەرەوەو ئێوە

---

[1] صحيح ابن خزيمة.

[2] فتوح الشام للواقدي، ط١، دار الكتب العلمية(بيروت – ١٩٩٧)،ج٢، ص ٣٣.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٤.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٤.

[5] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٠٦.

[6] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٠٦.

لـە خـوارەوە بـن، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: خـوارەوە بـۆ مـن ئاسـوودەترە، ئەبوو ئەیووبیش وتـی: قـەت ناچمـە قاتـی سـەرەوە ئێوەش لـە خـوارەوە بـن، ئیتـر ئەبـوو ئەیـووب چوویـە خـوارەوە، زۆر جـار خواردنـی ئامـادە دەکـرد بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ) و بـۆی دەبـردە خـوارەوە، کاتێـک بـۆی دەگێڕایـەوە ئەبـوو ئەیـووب تەماشـای دەکـرد بزانێـت پێغەمبـەر(ﷺ) لـە کوێدا پەنجـەی دانـاوە تـا لـەو بەشـە بخـوات.[1]

ئەبوو ئەیـووب دەیـوت ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) کـە خواردنێـک دەنێریـت تەماشـا دەکـەم بزانـم جێ پەنجەکانت لـە کوێ داناوە منیش دەست بـۆ ئـەوێ دەبەم.[2]

ئەبـوو ئەیـووب دەڵێـت: کـە خواردنێـک دەهێنـرا بـۆ ماڵـی پێغەمبـەر(ﷺ)، لێـی دەخـوارد و زیادەکـەی دەنـارد بـۆ ئێمـە، رۆژێـک خواردنێکـی بـۆ هاتبـوو هەمـووی ناردبـوو و هیچـی لـێ نەخواردبـوو، چونکـە سیری تێدا بـوو، منیش وتـم: ئـەی پێغەمبـەر(ﷺ) بـۆ حەرامـە؟ فەرمـووی: (لا ولكني أكرهه من أجل ريحه)، (نـا، بـەڵام مـن لەبـەر بۆنەکـەی رقـم لێیەتـی)، ئەبـوو ئەیووبیـش وتـی: دەی منیـش حـەز بـە شـتێک ناکـەم کـە تـۆ حـەزی پـێ نەکەیـت.[3]

ئەبـوو ئەیـووب دەڵێـت: جارێـک خواردنێکـم بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ) و ئەبووبەکـر ئامـادە کـرد، تەنهـا بەشـی ئەوانیشـی ئەکـرد، خواردنەکـەم بـرد بۆیـان، پێغەمبـەر(ﷺ) پێـی فەرمـووم بـڕۆ و سـی کـەس لـە پیاوماقووڵانـی پشـتیوانانم بـۆ بانـگ بکـە، منیـش زۆر ئـەوەم لەسـەر سـەخت بـوو، چونکـە خواردنێکـی زیاتـر لـەوەم نەبـوو، بۆیـە خـۆم دا لـە گێلـی، بـەڵام پێغەمبـەر(ﷺ) هەمـان شـتی لـێ دووبـارە کردمـەوە، منیـش چـووم و بانگـم کـردن و ئەوانیـش هاتـن، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: بخـۆن، دەسـتیان کـرد بـە خـواردن تـا تێـر بـوون و

---

[1] صحيح مسلم - كتاب الأشربة - باب إباحة أكل الثوم، الرقم ٢٠٥٣.

[2] شرح معاني الآثار للطحاوي، الرقم ٤٣٨٥.

[3] صحيح مسلم - كتاب الأشربة - باب إباحة أكل الثوم، الرقم ٢٠٥٣.

گەڕانەوە دواوەو شایەتییان دا کە ئەوە پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، ئینجا پێش ئەوەی بچنە دەرەوە بەیعەتیان پێدا، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بڕۆ و شەست کەس لە پیاوماقوڵانی پشتیوانانم بۆ بانگ بکە، منیش چووم بانگم کردن و ئەوانیش هاتن، ئەوانیش نانیان خوارد و پێش ئەوەی بچنە دەرەوە بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بڕۆ و نەوەد لە پشتیوانانم بۆ بانگ بکە، چووم و ئەوانیشم بانگ کرد و ئەوانیش تێر نانیان خوارد، دواتر شایەتییان دا کە ئەو پێغەمبەری خوایەو پێش ئەوەی بچنە دەرەوە بەیعەتیان پێدا، بەوجۆرە سەد و هەشتا کەس لە پشتیوانان لەو نانەی منیان خوارد.[1]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە برایەتی خستە نێوان خالیدی کوڕی زەید و موصعەبی کوڕی عومەیرەوە،[2] رایەکی تر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان ئەبوو ئەیووب و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵاوە.[3]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) صەفییەی گواستەوە، ئەو شەوە تا بەیانی ئەبوو ئەیووب لەبەردەرگایماڵی پێغەمبەر(ﷺ) بە شمشێرێکەوە وەستا، کە بەیانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە ئەبوو ئەیووب تەکبیری کرد، ئینجا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من باوک و براو مێردی ئەم ئافرەتەم لە جەنگەکەدا کوشت و ئەم ئافرەتەشت تازە بەهاوسەرگرتووە، ترسم هەبوو زیانت پێ بگەیەنێت، پێغەمبەریش(ﷺ) کە ئەو هەڵوێستەی ئەبوو ئەیووبی بینی پێکەنی و نزای خێری بۆ کرد.[4]

---

[1] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣٩٨٠، دلائل النبوة للفريابي، الرقم ١١، قال الحافظ ابن كثير في البداية والنهاية ج٦، ص ١١١: وهذا حديث غريب جدا إسنادا ومتنا.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٤.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٤٧.

[4] المستدرک على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(رضي الله عنهم) - ذكر الصحابيات من أزواج رسول الله(ﷺ) وغيرهن(رضي الله عنهن) - ذكر أم المؤمنين صفية بنت حيي(رضي الله عنها)، الرقم ٦٨٧٢، صححه ووافقه الذهبي.

ئەبوو ئەیووب دەڵێت: جارێک لای پێغەمبەر(ﷺ) بووم کە کەسێک هات بۆ لای و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئامۆژگاریم بکە بەڵام ئامۆژگاریەکی کورت و پوخت، ئەویش فەرمووی: (إذا قمت في صلاتك فصل صلاة مودع ولا تكلم بكلام تعتذر منه وأجمع اليأس عما في أيدي الناس)،[1] (کاتێک هەستایت نوێژت کرد وەک ئەو کەسە نوێژ بکە کە نوێژی ماڵئاوایی دەکات-واتە کۆتا نوێژی ژیانی دەکات- قسەیەکیش مەکە کە دواتر پۆزشی بۆ بهێنیتەوە، تەواوی بێهیواییت کۆبکەرەوە بەرامبەر بەوەی لە دەستی خەڵکدایە-واتە هیچ چاوت نەبێت لەوەی لە دەستی خەڵکدایە-).

**ئەبوو ئەیووب دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)**

لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکری صدیقدا ئەبوو ئەیووب کۆیلەیەکی هەبوو بە ناوی ئەفلەح، ئەبوو ئەیووب لەگەڵ ئەفلەح رێککەوت کە بەرامبەر چل هەزار-درهەم- ئازادی بکات، ئەوەبوو ئەفلەح خۆی ئازاد کرد، ئەبوو ئەیووب لەو کارەی پەشیمان بوو، داوای لە ئەفلەح کرد ئەگەر رازی بێت رێککەوتنەکە هەڵبوەشێننەوە، ژن و منداڵەکانی ئەفلەح وتیان: دوای ئەوەی خوا رزگاری پێ بەخشیت دەتەوێت خۆت بکەیتەوە بە کۆیلە؟ ئەفلەح وتی: بەخوا ئەبوو ئەیووب چیم لێ داوا بکات بۆی دەکەم، ئەبووئەیووب پارەکەی دایەوە بە ئەفلەح و رێککەوتنەکەیان هەڵوەشاندەوە، هێندەی نەبرد ئەبوو ئەیووب هەواڵی نارد بۆ ئەفلەح وتی: تۆ ئازادیت و پارەکەش هەر بۆ خۆت.[2]

کاتێک عوثمانی کوڕی عەففان شەهید کرا، بۆ بەیانیەکەی هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بەیعەتیان دا بە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، یەکێک لەوانە ئەبوو ئەیووبی ئەنصاری بوو.[3]

---

[1] سنن ابن ماجه - أبواب الزهد - باب الحكمة ، الرقم ٤١٧١، ضعفه شعيب الأرناؤوط.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٨٦.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٣١.

لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا بەیعەتی دا بە عەلی و کاتێک عەلی چوو بەرەو عێراق ئەوی کرد بە بەرپرسی مەدینە، دواتر خالید خۆی گەیاندە عێراق بۆ لای خەلیفە عەلی و لە جەنگی دژ بە خەواریجدا لە ناو سوپای عەلیدا بەشداری کرد.[1]

کاتێک ئیبن عەبباس لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو تالیبدا ئەمیری بەصرە بوو، ئەبوو ئەیووب چوو بۆ لای، ئیبن عەبباسیش زۆر ڕێزی لێنا و وتی: بە دڵنیاییەوە دەبێت پاداشتی ئەو ڕێزگرتنەت بدەمەوە کە بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجامت دا، بۆیە چی شتێک لەناو ماڵەکەیدا هەبوو دای بە ئەبوو ئەیووب.[2]

هەرچەندە ئەبوو ئەیووب لە گەڵ عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا بوو، بەڵام لە جەنگی صفیندا بەشداری نەکرد،[3] ئیبنولکەلبی و ئیبن ئیسحاق پێیان وایە ئەبوو ئەیووب لەگەڵ عەلیدا لە جەمەل و صفینیشدا بەشداری کردووە، بەڵام شوعبە دەڵێت: لە صفیندا بەشداری نەکرد، بەڵکو لە جەنگی نەهرەواندا بەشدار بوو.[4]

لە سەردەمی موعاویەدا ئەبوو ئەیووب چوو بۆ دیمەشق.[5]

ئەبوو ئەییووب لە دواییەکانی تەمەنیدا نەخۆش کەوت، سوپایەک ئامادە کرا بۆ غەزا و سەرکردەی سوپاکە یەزیدی کوڕی موعاویە بوو، ئەو سوپایە بەرەو قوستەنتینیە بەڕێکرا، یەزید هات بۆ لای و وتی: چیت پێویستە؟ ئەبوو ئەیووب وتی: ئەگەر هاتوو مردم تەرمەکەم هەڵبگرەو ببیە لە خاکی دوژمندا ئەسپەردەم بکە، ئەوەبوو کە مرد یەزید تەرمەکەی برد و لەوێ ئەسپەردەی کرد.[6]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٤.
[2] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٠٤.
[3] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤١٠.
[4] أسد الغابة، ج٦، ص ٢٨.
[5] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٠٦.
[6] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٠٤ – ٤٠٥.

تەرمەکەی برا لە لێواری شووراکانی قوستەنتینیەدا ئەسپەردەکرا، پێشتریش یەزیدی کوڕی موعاویە نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد.[1]

پاشان یەزید فەرمانی کرد بڕێک سەرباز بە ئەسپەکانیان دەهاتن و دەچوون بەسەر گۆرەکەیدا تا شوێنەواری گۆڕەکەی دیار نەمێنێت نەبادا ڕۆمەکان دواتر تەرمەکەی دەربێنن.[2]

سەبارەت بە ساڵی مردنەکەی هەریەک لە ساڵانی پەنجا و پەنجاو یەک و پەنجا و دوو هاتووە.[3]

**چەند فەرموودەیەک کە ئەبوو ئەیووبی ئەنصاری گێڕاویەتیەوە:**

ئەبوو ئەیووب دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو:(**لا يحل لرجل أن يهجر أخاه فوق ثلاث ليال، يلتقيان فيعرض هذا ويعرض هذا، وخيرهما الذي يبدأ بالسلام**).[4]

(حەڵاڵ نیە بۆ هیچ کەسێک لە سەروو سێ ڕۆژەوە پشت لە براکەی بکات، ئیتر وایان لێ بێت کە دەگەن بە یەک هەرکامەو پشت بکاتە ئەویان، چاکترینیشیان ئەوەیە کە پێشتر سەلام دەکات).

کاتێک دوو کەس پێکەوە قسە ناکەن و لەیەک دڵگران دەبن، هۆکارەکەی تەنها زاڵبوونی شەیتانە، ئیتر یان شەیتان زاڵ بووە بەسەر هەردووکیاندا، یان زاڵ بووە بەسەر یەکێکیاندا، بەوەش لەیەکی کردون، جا ئەگەر یەکەمیان بوو ئەوە دەبێت کەسانی دەوروبەر دڵیان بۆیان بسووتێت و بچن نێوانیان چاک بکەنەوە، نەک وازبێنن تا شەیتان ئەو دوو کەسە لەناوبەرێ، ئەگەریش حاڵەتی دووەم بوو ئەوە دەبێت کەسە ڕاستەکە لاری بەرامبەرەکەی نەکاتە دڵگرانی و رق، بەڵکو دڵی بۆی بسووتێت و لەبری یارمەتیدانی شەیتان، لەپێناو خوادا براکەی ئاشت بکاتەوە، ئەمەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویت: :

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤١٢.

[2] أسد الغابة، ج٦، ص ٢٩.

[3] أسد الغابة، ج٢، ص ١١٨.

[4] صحيح البخاري – كتاب الأدب – باب الهجرة وقول رسول الله لا يحل لرجل أن يهجر أخاه فوق ثلاث، الرقم ٦٠٧٧، صحيح مسلم – كتاب البر والصلة والآداب – باب تحريم الهجر فوق ثلاث بلا عذر شرعي، الرقم ٢٥٦٠.

چاکترینیان ئەوەیانە یەکەمجار سەلام دەکات، چونکە پڕۆژە و کاری شەیتان پەکدەخات.

ئەبوو ئەییووب دەڵێت: کابرایەک هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کارێکم پێ بڵێ کە بەهۆیەوە بچمە بەهەشتەوە، خەڵکەکەش وتیان: ئەو کابرا چیەتی، ئەوە چی دەڵێت؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (أرب ما له)، (چیە، ئیشی زۆر گرنگی هەیە) ئینجا فەرمووی: (تعبد الله لا تشرك به شيئا وتقيم الصلاة وتؤتي الزكاة وتصل الرحم)،[1] (خوا بپەرستیت و هیچ هاوەڵێکی بۆ دانەنێیت و نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت و پەیوەندی خزمایەتی ببەستیت و نەیپچڕێنیت)، کە کابرا چوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر پابەندی ئەوە بێت کە فەرمانی پێکرا ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە.[2]

ئەبوو ئەیووبی ئەنصاری دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (لو أنكم لم تكن لكم ذنوب يغفرها الله لكم لجاء الله بقوم لهم ذنوب يغفرها لهم).[3]

(ئەگەر ئێوە هیچ تاوانێکتان نەبوایە تا خوا لێتان خۆش بێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە خوای گەورە خەڵکانێکی دەهێنا تاوانیان هەبوایە تا لە تاوانەکانیان خۆش بوایە).

ئەمە مژدەو دڵخۆشیەکی گەورەیە کە پەروەردگار چەندە لێبوردەیەو چەندەش حەز بە لێخۆشبوونی بەندەکانی دەکات، هەروەک هیوابەخشیەکی گەورەیە بۆ موسڵمانی تاوانبار تا بە هۆی تاوانیەوە بێهیوا نەبێت، بەڵکو بزانێت خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، چونکە لێخۆشبوون لە تاوان دەبێت، ئایا تاوانەکە بەزاندنی سنووری خوا بێت، یان کەمتەرخەمی بێت لە بەجێگەیاندنی ئەرکدا، هەروەک ئەمە بەخشینی دنیابینیەکی فراوانە بە

---

[1] صحيح البخاري – كتاب الزكاة – باب وجوب الزكاة، الرقم ١٣٩٦، السنن الكبرى للنسائي – كتاب العلم – من يسأل عن علم وهو واقف على راحلته، الرقم ٥٨٤٩.

[2] صحيح مسلم – كتاب الإيمان – باب بيان الإيمان الذي يدخل به الجنة وأن من تمسك بما أمر به دخل الجنة، الرقم ١٣.

[3] صحيح مسلم – كتاب التوبة – باب سقوط الذنوب بالاستغفار توبة، الرقم ٢٧٤٨.

تاک و کۆمەڵگەی موسڵمان تا تێبگەن مرۆڤ شایەنی هەڵەیە و هەڵە لەناو کۆمەڵگەدا بە گشتی و لە کۆمەڵگەی ئیسلامیشدا هەر دەبێت و لێبوردنی خوای گەورەش هەیە بۆ هەڵەکان.

## ١٠٩١. خالیدی کوڕی عورفطە(ﷺ)

ناوی خالیدی کوڕی عورفطەیە بە منداڵی هاتووەتە مەککەو لەوێ نیشتەجێ بووە.[١]

خالید دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم (سيكون أحداث وفتنة وفرقة واختلاف فإذا كان ذلك فإن استطعت أن تكون المقتول لا القاتل فافعل)،[٢] (ڕۆژگارێ دێت بڕێک ڕووداو و فیتنەو ئاشووبەو دووبەرەکی ڕوودەدەن، جا ئەگەر ئەو شتە ڕوویدا ئەگەر توانیت وا بکەیت کە کوژراو بیت نەک بکوژ ئەوە وا بکە).

هەروەها خالید دەڵێت: من لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیست دەیفەرموو: (من كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من جهنم)،[٣] (هەرکەس دەست ئەنقەست درۆیەک بەدەم منەوە بکات با شوێنی خۆی لە دۆزەخ دیاری بکات).

خالید لە جەنگی قادسیەشدا بەشداری کرد و سەعدی سەرکردەی موسڵمانان لەو جەنگەدا بەرپرسیارێتی دایە دەست خالید،[٤] دواتریش کردی بە بەرپرسی کووفە.[٥]

لە سەردەمی موعاویەو لە ساڵی چل و یەکی کۆچیدا عەبدوڵای کوڕی ئەبیلحەوسا لە دەسەڵاتی موعاویە دەرچوو، ئەوەبوو خالید چوو بۆی و

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٤.

[٢] المستدرک على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذكر مناقب خالد بن عرفطة(ﷺ) - ستكون فتنة فإن استطعت أن تكون المقتول لا القاتل فافعل ، الرقم ٥٢٥٩، سكت عنه الذهبي في التلخيص، صححه الألباني في صحيح و ضعيف الجامع الصغير و زيادته، الرقم ٥٩٢٩.

[٣] مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار(ﷺ) - حديث خالد بن عرفطة(ﷺ) ، الرقم ٢٢٨٧٨، قال شعيب الأرناؤوط متن الحديث صحيح و إسناده ضعيف.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٤.

[٥] أسد الغابة، ج٢، ص ١٢٧.

لەگەڵی جەنگا تا کوشتی.[1]

سەبارەت بە کاتی مردنی خالید رایەک دەڵێت: لە ساڵی شەست بووەو رایەکی تریش دەڵێت: لە ساڵی شەست و یەکی کۆچیدا بووە.[2]

## ١٠٩٢. خالیدی خوزاعی(رضي الله عنه)

ناوی خالیدەو بە خالیدی خوزاعی ناسراوە،[3] کوڕێکی هەبوو بە ناوی نافع کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[4]

خالید بەشداربوویەکی بەیعەتی ریضوان بوو.[5]

خالید دەڵێت: رۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) بەرنوێژی بۆ کردین و نوێژەکەی درێژ نەکردەوە، بەڵام لە دانیشتندا زۆری پێچوو (واتە لە کاتی تەحیاتدا) ئینجا کە لە نوێژ بوویەوە وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دانیشتنەکەت لە نوێژەکەتدا زۆر درێژ کردەوە، ئەویش فەرمووی: (إنها صلاة رغبة ورهبة سألت الله فيها ثلاث خصال فأعطاني اثنتين ومنعني واحدة، سألته أن لا يسحتكم بعذاب أصاب من كان قبلكم فأعطانيها، وسألته أن لا يسلط على بيضتكم عدوا فيجتاحها فأعطانيها، وسألته أن لا يلبسكم شيعا ويذيق بعضكم بأس بعض فمنعنيها)،[6] (ئەوە نوێژی ترس و هیوا بوو، تیایدا داوای سێ شتم لە خوای گەورە کرد و ئەویش دوانی پێ بەخشیم و یەکێکیانی پێنەبەخشیم، داوام لێکرد بە سزای چەشنی گەلانی پێش خۆتان لەناوتان نەبات، ئەوەی پێ بەخشیم، داوام لێکرد دوژمنێک بەسەر زۆرینەتاندا زاڵ نەکات کە بەسەرتاندا تێپەڕێت -دەستی بەرووتاندا بکاتەوە- ئەوەشی پێ بەخشیم، داواشم لێکرد پەرتبوونتان تووش نەبێت و نەکەونە ویزەی یەکتر، بەڵام ئەوەی پێ نەبەخشیم).

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ١٢٧.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٤.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٧.
[4] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٤٠٠٢.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٧.
[6] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٤٠٠٢.

## ١٠٩٣. خالیدی کوڕی بوکەیر(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی بوکەیری کوڕی عەبدیالیلە، چەند برایەکی هەبوو بە ناوەکانی ئیاس و عامیر و غافیل کە ئەوانیش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، خالید یەکێک بوو لەوانەی زۆر زوو موسڵمان بوو، لە غەزای بەدردا بەشداری کرد، لە رۆژی رەجیع و لە تەمەنی سی و چوارساڵیدا شەهید کرا.[١]

## ١٠٩٤. خالیدی کوڕی ثابتی فەهمی(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی ثابتی فەهمیە، لە فەتحی میصردا بەشدار بوو و بەرپرسی بەشێکی سوپای فتوحاتەکە بوو، ئەمەش بەڵگەی هاوەڵبوونیەتی کە عومەری کوڕی خەططاب تەنها هاوەڵەکانی دەکردە ئەمیری سوپا.[٢]

## ١٠٩٥. خالیدی کوڕی ثابتی ئەنصاری(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی ثابتی کوڕی نوعمانە، لە پشتیوانانە، لە جەنگی بیئر مەعوونەدا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[٣]

## ١٠٩٦. خالیدی کوڕی جەبەل(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی جەبەلە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدورەحمان کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە،[٤] ئەم هاوەڵە دانیشتووی طائیف بووە، یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەیعەتی ریضوان، فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢٧.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢٨.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢٨.
[٤] معرفة الصحابة لابن مندة، ص ٤٦٣.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢٨.

## ١٠٩٧. خالیدی کوڕی حەواری(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی حەواری حەبەشیە، هاوەڵی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو،[١] ئەم هاوەڵە جارێک لەگەڵ ژنەکەی سەرجێیی کرد، دواتر گەیشتە سەرەمەرگ، وەسیەتی کرد وتی: دوو جار بمشۆن، شۆردنێک بۆ لابردنی لەشگرانیم، شۆردنێکیش شۆردنی مەرگم.[٢]

## ١٠٩٨. خالیدی کوڕی حیزام(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی حیزامی کوڕی خوەیلیدی قورەیشیە،[٣] برازای خەدیجەی کچی خوەیلیدی دایکی باوەڕدارانە.

دایکی کە بە ئوممو حەکیم ناسراوە ناوی فاخیتەی کچی زوهەیر بوو.[٤]

خالید برایەکی هەبوو بە ناوی حەکیم کە یەکێکە لە هاوەڵە ناسراوەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم).

خالید زۆر زوو موسڵمان بوو، لە کۆچی دووەمی حەبەشەدا بەشداربوو، لە ڕێی کۆچەکەیدا مارێک گەستی و بەو هۆیەوە مرد،[٥] بەڵام گومانێک هەیە لەسەر ئەو چوونەی بۆ حەبەشە کە ئایا بەشدار بووە یان نا.[٦]

## ١٠٩٩. خالیدی کوڕی سەعید(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصی کوڕی ئومەییەیە، لە قورەیشیەکانە لە ئومەویەکان، کونیەکەی ئەبوو سەعیدە، دایکی ناوی ئومموخالیدی کچی حوبابە.[٧]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣١.

[٢] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٤٠١٣، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢٢١٧.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢٩.

[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ١١٩.

[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ١١٩.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢،ص ٢٢٩.

[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٦.

خالید زۆر زوو موسڵمان بوو، دەوترێت چوارەم یان پێنجەم کەس بووە موسڵمان بووە.[1]

ژنەکەی خالید ناوی ئومەیمەی کچی خەلەف بوو کە ئەویش هاودەم بە مێردەکەی موسڵمان بوو.[2]

خالید و براکانی حەوت برا بوون، سێ لەو برایانەی بە بێباوەڕی مردن، چواریشیان گەیشتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)و بە موسڵمانی مردن،[3] برایەکی ناوی ئوحەیحە بوو کە لە جەنگی فیجاردا کوژرا،[4] عاص و عوبەیدەش کە دوو برای تری بوون لە جەنگی بەدر بە بێباوەڕی بە دەستی موسڵمانان کوژران، عەلی کوڕی ئەبوو طالیب عاصی کوشت و عوبەیدەش بە دەستی زوبەیر کوژرا.[5]

هەریەک لە ئەبان و عەمر دوو برای تری بوون کە هەر زوو لە مەککە موسڵمان بوون،[6] حەکەمی برایشی دواتر موسڵمان بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ناوەکەی گۆڕی و ناوی نا عەبدوڵا.[7]

سەبارەت بە هۆکاری موسڵمان بوونی خالید دەوترێت بەهۆی خەوێکەوە بووە کە بینیویەتی، لە خەویدا لە بەرزاییەکەوە بووە کە خوارەوە هەموو ئاگر بووەو باوکی ویستوویەتی بیخاتە ناو ئەو ئاگرەوە، لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) رزگاری کردووە، بۆیە کە بەیانی رۆژ بوویەوە خالید چوو بۆ لای ئەبووبەکری صدیق و مەسەلەکەی بۆ باس کرد، ئەبووبەکریش وتی: دەی شوێن موحەممەد بکەوە چونکە ئەو بووە بە پێغەمبەری خوا، بەوە تۆ رزگارت دەبێت بەڵام باوکت دەکەوێتە ناو چاڵە ئاگرینەکەوە،

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٦

[2] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٤٤.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٦٢-٦٣.

[4] أسد الغابة، ج١ص٦٠.

[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٦٢.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٦.

[7] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٦٣.

خالیدیش چوو بۆ لای پێغەمبەری خواو وتی: بانگەواز بۆ چی دەکەیت؟ ئەویش فەرمووی: بانگت دەکەم تا خوای تاک و تەنها بپەرستیت و هاوەڵی بۆ دانەنێیت و شایەتی بدەیت موحەممەد بەندەو نێردراوی خوایەو خۆت لە پەرستشی بەردێ داماڵیت کە نە دەبیستێت و نە سوود و زیان و بینینی هەیە و نە دەزانێت کێ دەیپەرستێت و کێ نایپەرستێت، خالیدیش وتی: دەی من شایەتی دەدەدم هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوا و تۆیش پێغەمبەری خوایت، پێغەمبەریش(ﷺ) زۆر دڵخۆش بوو بە موسڵمان بوونەکەی،[1] دواتر کە باوکی زانی موسڵمان بووە سزای دا و نان و خۆراکی لێ قەدەغە کرد، تەنانەت نەیدەهێشت براکانیشی قسەی لەگەڵدا بکەن، خالیدیش وتی: بەخوا با ئەوانەشم لێ بگریتەوە خوای گەورە هەر رۆژیەکم دەدات پێی بژیم، ئینجا چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و لەوێ مایەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) رێزی دەگرت،[2] دواتر دەرفەتی وەرگرت و لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کۆچی کرد بۆ خاکی حەبەشە، لەوێ خوای گەورە کچێکی پێ بەخشی کە ناسراوە بە ئومموخالید،[3] کوڕێکیشی پێ بەخشی بە ناوی سەعید.[4]

عەمری برایشی یەکێک بوو لە کۆچەرانی حەبەشە و هەر لەوێ مانەوە.[5]

سەعیدی کوڕی عاص کە باوکی خالید بوو زۆر دژایەتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەکرد، جا کە نەخۆش کەوت، دەیوت ئەگەر خوا ئەم جارە لەم نەخۆشیەم راستم بکاتەوە نابێت خواکەی ئیبن ئەبی کەبشە(مەبەستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو) لەناو مەککەدا بپەرسترێت، خالیدی کوڕیشی دەیوت خوایە راستی نەکەیتەوە.[6]

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٣٣.
[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٣٣.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٧.
[4] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٥٠٤٠.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٧.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٧.

لە حەبەشە کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) پەیامی نارد تا ئومموحەبیبەی لێ مارە بکرێت، خالیدی کوڕی سەعید کە ئامۆزای ئوممومحەبیبە بوو بەرپرسیارێتی مارەکردنی ئوممومحەبیبەی گرتەئەستۆو نەجاشیش وەکیلی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بۆ قبووڵی گرێبەستی هاوسەرگیریەکە، نەجاشی بە ئوممومحەبیبەی راگەیاند کەسێک راسپێرە تا مارەت بکەم لە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش هەواڵی نارد بۆ خالیدی کوڕی سەعید و ئەوی کرد بە وەکیل.[1]

لە غەزای خەیبەردا کە هاوەڵانی حەبەشە بەرەو مەدینە گەڕانەوە، هەریەک لە خالید و عەمری برای هاودەم بە جەعفەری کوڕی ئەبووطالیب گەڕانەوە بەرەو مەدینە، پێغەمبەری خوایش هەندێ بەرپرسیارێتی بەخشی بە خالید وەک کۆکردنەوەی زەکاتی خەڵکی موذحیج.[2]

سەعیدی باوکی خالید برێک کۆیلەی هەبوون، جا کە دواتر مرد و کۆیلەکان بە میرات گیران، خالید ئەوەی خۆی بەخشی بە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) قبووڵی کرد و کۆیلەکەی ئازاد کرد.[3]

خالیدی کوڕی سەعید نووسەری خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بوو و نامەکانی بۆ دەنووسی،[4] هەروەها سروشیشی بۆ دەنووسیەوە.[5]

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر دڵنیا بوو لە خالید، ئەوەتا لە کاتی گەمارۆی طائیفدا کاتێک ئەزرەقی کوڕی عوقبە هاتە خوارەوەو موسڵمان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) دایە دەست خالیدی کوڕی سەعید و رایسپارد تا پێویستیەکانی بۆ دابین بکات و زانیاریە ئایینیەکانی فێر بکات.[6]

کاتێک لە ساڵی نۆی کۆچیدا وەفدی ثەقیف هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)،

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٤٣-١٤٤.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٨.
[3] البداية و النهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣١٤.
[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣٤.
[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣٤٠.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٦.

خالیدی کوڕی سەعید لەنێوان ئەوان و پێغەمبەردا(ﷺ) دەڕۆیشت بە ڕێدا، چونکە لێیان دڵنیا نەبوو، جا کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) خواردنی دەنارد بۆ وەفدەکە هیچ کام لێیان نەدەخوارد تا خالیدی کوڕی سەعید لێی دەخوارد، دواجاریش کە ڕێککەوتن خالید نامەکەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) نووسی بۆیان.[1]

دواتر کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد و خالیدی لە یەمەنەوە گەڕایەوە، بینی ئەبوبەکر بەرپرسە، بە وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) دڵگران بوو و بە دەربڕینێکی هەڵە خەمباری خۆی دەربڕی، بۆیە عومەر لێی تووڕە بوو و ئەو قسانەشی گەیاند بە ئەبووبەکر کە رای خالید چۆن بووە، بەڵام ئەبووبەکر ئەو قسانەی نەگرتەدڵ و خەڵکی کۆکردەوەو وتارێکی پێشکەش کرد و باسی جیهادی کرد بۆیان، دواتر ئاڵای دەدایە دەست سەرکردەکان تا جەنگی هەڵگەڕاوەکان بکەن، ئاڵای یەکەمیشی دایە دەست خالیدی کوڕی سەعید تا بەرەو شام بڕوات، هەرچەندە عومەر هێشتا لێی تووڕە بوو و هەوڵیدا بەر بە راکەی خەلیفە بگرێت، بەڵام ئەبووبەکر لە نیازی خالید تێگەیشت و ئەوەی نەگرتەدڵ.[2]

خالیدی کوڕی سەعید لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا رۆڵێکی بەرچاوی بینی.[3]

خەلیفە ئەبووبەکر ئەوی کرد بە بەرپرسی بەشێک لە سوپای رۆژهەڵاتی شام،[4] خالیدی کوڕی سەعیدیش بەرەو تیما چوو و لەوێ کە لە هۆزە عەرەبیەکانی ناو رۆمەکان نزیک بوویەوە، زۆرێک لە هۆزەکانی ئەوێ بڵاوەیان لێکرد و زۆرێکیان موسڵمان بوون، خالیدیش هەواڵی نارد بۆ ئەبووبەکر، ئەبووبەکریش فەرمانی پێکرد پێشڕەوی بکات

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣٠.
[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٣.
[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١١٩.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٨.

و وەلیدی کوڕی عوتبەو عیکریمەی کوڕی ئەبوو جەهل و دەستەیەکی زۆریشی نارد بۆ یارمەتیدانی، خالید پێشڕەوی کرد و سەرکردەی ڕۆمەکانی لە ئیلیا شکاند کە ناوی ماهان بوو، ماهان بەرەو دیمەشق رایکرد و خالیدیش کەوتە دوای، تا گەیشتنە مەرج صەفرا، لەوێ بارەکە بە پێچەوانە شکایەوەو خالیدی کوڕی وەلید و سوپاکەی رایانکرد، بەڵام عیکریمە خۆی ڕاگرت و ڕاینەکرد، دواتر ئەبووبەکری صدیق شورەحبیلی کوڕی حەسنەی بەرەو شام نارد، کە گەیشتە لای خالید سوپاکەی خالیدی لەگەڵ خۆی برد، بڕێکیش لە سوپاکەی هەر مابوونەوە، دواتر ئەبووبەکر موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیانیشی نارد بەرەو شام، ئەویش پاشماوەی تری سوپاکەی خالیدی لەگەڵ خۆی بەرەو شام برد، ئینجا ئەبووبەکر مۆڵەتی دا خالید بگەڕێتەوە بۆ مەدینەو وتی: عومەر باشتر دەیناسی.[١]

خالید لە جەنگی ئەجنادەینیشدا بەشداری کرد و لەو جەنگەدا پێکراو شەهید بوو، جا ئەو کەسەی کە کوشتی دواتر موسڵمان بوو، دەیوت کاتێک کوشتم دەمبینی رووناکیەکی درەوشاوە لەوەوە تا ئاسمان بەرز بووبوویەوە،[٢] بەڵام لە رایەکی تردا هاتووە خالید لە جەنگی مەرج صوفردا کوژراوە،[٣] رایەکیش دەڵێت: بەڵکو لە جەنگی جسردا شەهید بووە.[٤]

جارێک لە جەنگێکدا خالید یەکێک لە بێباوەڕەکانی کوشت و جلەکەی کردە بەر، خەڵکی تەماشایان دەکرد بۆچی ئەو جلە جوانەی کردوەتەبەر، خالیدیش وتی: چیە بۆچی سەیر دەکەن، کێ حەزی بەوەیە با وەک خالید بێباوەڕێک بکوژێت و وەک ئەویش جلەکەی بپۆشێت.[٥]

---

[١] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٤.

[٢] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٦٠.

[٣] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٥٠٤٤.

[٤] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٥٠.

[٥] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٦٠.

## ١١٠٠. خالیدی کوڕی سەییار(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی سەییاری کوڕی عەبدعەوفی غیفاریە، زۆر جار جڵەوی وشترەکەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەگرت.[١]

## ١١٠١. خالیدی کوڕی سینان(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی سینانی کوڕی ئەبی عوبەیدە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، یەکێکە لە بەشدار بوانی غەزای ئوحود، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە جەنگی جسردا شەهید بوو.[٢]

## ١١٠٢. خالیدی کوڕی عاص(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی عاصی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی مەخزوومیە، باوکی لە جەنگی بەدرا بە بێباوەڕی کوژرا.[٣]

دایکی ناوی عاتیکەی کچی وەلید بوو.[٤]

خالید دوای فەتحی مەککە موسڵمان بوو و هەر لە مەککە مایەوە، عومەری کوڕی خەططاب پاش نافعی کوڕی عەبدولحارث ئەم هاوەڵەی کرد بە بەرپرسی مەککە، دواتریش عوثمانی کوڕی عەففان لە هەمان پۆستدا هێشتیەوە.[٥]

کە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب بوو بە خەلیفە نامەیەکی نووسی بۆ خالیدی کوڕی عاص و بە والی مەککە هێشتیەوەو داوای لێکرد بەیعەتی بۆ

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٩.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٩.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٠.
[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٤٤٥.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٠.

وەربگرێت، بەڵام خەڵکی مەککە ئاماد نەبوون بەیعەت بدەن،[1] دواتر عەلی خالیدی لە والیەتی لابرد و لە شوێنیدا ئەبووقەتادەی ئەنصاری دانا.[2]

خالید لە ماوەی دەسەڵاتی لە مەککە رۆژانی هەینی خۆی وتاری پێشکەش دەکرد، جا تا ساغ بوو بە پێوە وتاری دەدا و لەسەر زەویەکە بوو و نەدەچوویە سەر مینبەرەکەی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام کاتێک نەخۆش کەوت ئیتر لەسەر پلەیەکی پەیژەیەک دادەنیشت بۆ وتاردانەکەی.[3]

خالید تا سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیانیش ژیاو لە سەردەمی ئەویشدا والی مەککە بوو.[4]

## ١١٠٣. خالیدی کوڕی عەبدوڵای عەدوی(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی عەبدوڵای عەدویەو وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو.[5]

## ١١٠٤. خالیدی کوڕی عەبدوڵای قنانی(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی عەبدوڵای قینانیەو وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو.[6]

## ١١٠٥. خالیدی کوڕی عەبدولعوززا(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی عەبدولعوززای کوڕی سەلامەی کوڕی موڕڕەی خزاعیە، کونیەکەی ئەبوو خوناسە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی مەسعوود کە

---

[1] أنساب الأشراف، ج١، ص ٣٢٠.

[2] تاريخ مدينة دمشق لأبي القاسم الشافعي، دار الفكر (بيروت – ١٩٩٥)، ج٦٧، ص ١٥١.

[3] مصنف عبدالرزاق الصنعاني، الرقم ٥١١٣، أخبار مكة للفاكهي، الرقم ١٧٣٤.

[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٤.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٢.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٢.

دەوترێت ئەم بە ئەبوو خوناس ناسراو بووە.[1]

جارێک خالید ئاژەڵێکی سەربڕی بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، بۆ ئێوارە کە گەڕایەوە ماڵەوە تەماشای کرد گۆشت لای ژن و منداڵەکەی دانراوە،[2] جا ژن و منداڵەکانی زۆر بوون،[3] خالید بە ئوممو خوناسی ژنی وت ئەری ئەم گۆشتە چیە؟ ئەویش وتی: نیوەی ئەو ئاژەڵەیە کە سەرت بڕیبوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەو بۆی ناردین، خالید وتی: دەی با بتدایە منداڵەکان بیانخواردایە، ئەویش وتی: هەموویان تێریان خواردووەو ئەمەش ماوەتەوە، بە مەرجێک جاران جار هەبوو بە مەڕێ یان دوان تێر نەدەبوون.[4]

## ١١٠٦. خالیدی کوڕی عەددی(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی عەددی جوهەنیە، لەو هاوەڵانەیە کە لە مەدینە نیشتەجێ بوو.[5]

خالید دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیست دەیفەرموو:( مَنْ بَلَغَهُ مَعْرُوفٌ مِنْ أَخِيهِ مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ وَلاَ إِشْرَافِ نَفْسٍ فَلْيَقْبَلْهُ ، وَلاَ يَرُدَّهُ ، فَإِنَّمَا هُوَ رِزْقٌ سَاقَهُ اللهُ إِلَيْهِ)،[6] (هەرکەسێک لە براکەیەوە شتێکی چاکی پێگەیشت بێ ئەوەی خۆی داوای بکات یان هەوڵی بۆ خۆبردنی بۆ بدات، ئەوە با وەریبگرێت و نەیگێڕێتەوە، چونکە ئەوە ڕۆزیەکە خوای گەورە بۆی بڕیوەتەوە).

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٢.
[2] أخبار مكة للفاكهي، الرقم ٢٧٨٨.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٢.
[4] أخبار مكة للفاكهي، الرقم ٢٧٨٨.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٤.
[6] مسند أبي يعلى الموصلي – خالد بن عدي الجهني عن النبي(ﷺ) ، الرقم ٩٢٥، المستدرک على الصحيحين – كتاب البيوع – من بلغه معروف عن أخيه من غير مسألة ولا إشراف نفس فليقبله، الرقم ٢٣٧٦، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص، قال الحافظ ابن حجر في الإصابة إسناده صحيح، صححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ١٠٠٥.

## ١١٠٧. خالیدی کوڕی عەمری سولەمی(ﷺ)

ناوی خالیدی کوڕی عەمری کوڕی عەددیە، لە پشتیوانانە، یەکێکە لە بەشداربوانی بەیعەتی دووەمی عەقەبە و غەزای بەدر.[١]

## ١١٠٨. خالیدی کوڕی عەنبەس(ﷺ)

ناوی خالیدی کوڕی عەنبەسە، یەکێکە لە بەشداربوانی بەیعەتی ریضوان.[٢]

## ١١٠٩. خالیدی کوڕی عوقبەی ئومەوی(ﷺ)

ناوی خالیدی کوڕی عوقبەی ئومەویە، عوقبەی باوکی لە جەنگی بەدردا بە بێباوەڕی کوژرا،[٣] برای وەلیدی کوڕی عوقبەیە، لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو، دواتر لە ناوچەی رقە نیشتەجێ بوو و هەر لەوێ مایەوە.[٤]

## ١١١٠. خالیدی کوڕی غەلاب(ﷺ)

ناوی خالیدە، سەبارەت بە ناوی باوکی هەم بە غەلاب هاتووە، رایەکیش دەڵێت: باوکی ناوی حارثە، ئەم هاوەڵە خۆی نیشتەجێی طائیف بووە، چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[٥]

کاتێک خالید چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی فیتنەی دەکرد، خالیدیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزام بۆ بکە خوا دوورم بگرێت لە فیتنە، پێغەمبەریش(ﷺ) ئەم نزایەی بۆ کرد(اللهم اكفه الفتن ما ظهر منها وما بطن)،[٦] (خوایە دووری بگریت لە فیتنەی ئاشکرا و نهێنی).

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٦.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٦.
[٣] أسد الغابة، ج٢، ص ١٢٩.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٥.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٧.
[٦] أخبار أصبهان لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٨٠.

خالید لە سەردەمی خیلافەتی عومەردا بەرپرسی بەیتولمال بوو،[1] لە سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففانیشدا خەلیفە کردی بە والی ئەصبەهان،[2] هەر لەوێ بوو، کاتێک بینی ناحەزان دژ بە عوثمان کۆبوونەتەوە، بڕیاریدا بگەڕێتەوە مەدینە تا بەرگری لە خەلیفە بکات، بەڵام ئەوەبوو هەواڵی شەهیدبوونی عوثمانی پێگەیشت،[3] بۆیە وازی هێنا لە پۆستەکەی و گەڕایەوە بۆ طائیف و لەوێ نیشتەجێ بوو، رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو لەوێوە چوو بۆ بەصرەو لەوێ نیشتەجێ بوو.[4]

خالید کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەمر، عەمر لە کاتی جەنگی جەمەلدا چوو بۆ لای عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، خەلیفە وتی: ئەمە کێیە؟ وتیان: عەمری کوڕی خالیدە، وتی: کوڕەکەی خالیدی کوڕی غەلابە؟ وتیان: بەڵێ، عەلی وتی: شایەتی دەدەم باوکی ئەمم بینی لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بوو، پێغەمبەر(ﷺ) باسی فیتنەی دەکرد، خالیدیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزام بۆ بکە خوا لە فیتنە دوورم بگرێت، پێغەمبەریش(ﷺ) ئەم نزایەی بۆ کرد(خوایە دووری بگریت لە فیتنەی ئاشکرا و نهێنی) .[5]

## ١١١١. خالیدی کوڕی قەیس(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی قەیسی کوڕی مالیکە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، ئیبن ئیسحاق دەڵێت: یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەیعەتی عەقەبە و غەزای بەدر و ئوحودیش.[6]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٧.
[2] معرفة الصحابة لابن مندة، ص ٤٨٢.
[3] أسد الغابة، ج٢، ص ١٣١..
[4] أسد الغابة، ج٢، ص ١٣١.
[5] أخبار أصبهان لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٨٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٧.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٨.

## ١١١٢. خالیدی کوڕی قەیسی سەهمی(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی قەیسی سەهمیە، یەکێکە لە دڵراگیرکراوان.[١]

## ١١١٣. خالیدی کوڕی کەعب(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی کەعبی کوڕی عەمرە، لە پشتیوانانە لە بەنی مازن، لە ڕۆژی بیئر مەعوونەدا شەهید بوو.[٢]

## ١١١٤. خالیدی کوڕی موغیث(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی موغیثەو یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و فەرموودەیەکی لێوە گێڕاوەتەوە.[٣]

## ١١١٥. خالیدی کوڕی نوعمان(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی نوعمانە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، لە غەزای موئتەدا بەشدار بوو و تیایدا شەهید بوو.[٤]

## ١١١٦. خالیدی کوڕی هەوذە(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی هەوذەی کوڕی ڕەبیعەی عامیریە، برایەکی هەبوو بە ناوی حەرمەلە، ئەم دوو برایە پێکەوە هاتنە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و موسڵمان بوون، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) بە نامەیەک مژدەی موسڵمان بوونی ئەو دوانەی نارد بۆ خوزاعە.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٨.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٤٨.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٠.
[٤] تاريخ مدينة دمشق، ج١٦، ص ٢١٥.
[٥] أسد الغابة، ج٢، ص ١٣٩.

خالید کوڕێکی هەبوو بە ناوی عدا و کە پێغەمبەر(ﷺ) کۆیلەیەکی لێ کڕی، عەدائیش موسڵمان بوو و ئەویش لە هاوەڵان بوو.[1]

## ١١١٧. خالیدی کوڕی وەلید(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرەی کوڕی عەبدوڵای مەخزوومیە، ناسراوە بە شمشێری خوا، کونیەکەی ئەبوو سولەیمانە،[2] یەکێکە لە هاوەڵە زۆر گەورە و ناسراوەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە لە مێژووی ئیسلامیدا ڕۆڵێکی کارای هەبووە، یەکێک بوو لە ڕێبەرانی فتووحاتی ئیسلامی، گومان و تۆمەتی زۆریش سەبارەت بە ژیانی هەیە کە پێویست بە یەکلاکردنەوەیان دەکات.

**بنەماڵەکەی**

باوکی خالید کە ناوی وەلید بوو یەکێک بوو لە کەسایەتیە خانەدانەکانی ناو قورەیش و سامان و داراییەکی زۆریشی هەبوو و بەخشندەییشی زۆر بوو،[3] لەگەڵ ئەوەشدا یەکێک بوو لە سەرسەختترین نەیارەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێک بێباوەڕان ویستیان هێرشی ڕاگەیاندنی دژ بە پێغەمبەر(ﷺ) بکەن، کۆبوونەوەو لەنێویاندا وەلید دانیشتبوو کە بە تەمەن بوو، وەلید وتی: وا وەفدەکانی عەرەب بۆ سەردانی کەعبە دێن، ئەوانەش هەواڵی موحەممەدیان بیستووە، جا هەمووتان لەسەر یەک قسە یەکدەنگ بن نەبادا هەرکەسەو قسەیەک بکات و یەکتری بە درۆ بخەنەوە، ئەوانیش وتیان: دەی تۆ بڵێ چی بڵێین، ئەویش وتی: ئێوە بڵێن و منیش گوێتان لێ ئەگرم، یەکێکیان وتی: ئەڵێین کاهینە، وتی: من کاهینم دیوەو دەیانناسم، ئەو کاهین نیە، یەکێک وتی: دەڵێین

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ١٣٩.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥١.

[3] الإغاني لأبي الفرج الأصبهاني، ط٢، دار الفكر، بيروت، ج١٦، ص ٢٠٥.

شێتە، وتی: هەموومان شێتمان دیوەو ئەو شێت نیە، یەکێک وتی: دەڵێین شاعیرە، وەلید وتی: ئێمە دەزانین شیعر چۆنەو چیە، ئەو شاعیر نیە، یەکێک وتی: دەڵێین جادووگەرە، وتی: جادووگەریشمان دیوە، ئەو جادووگەر نیە، دوا پێشنیاز وتی: دەڵێین ئەمە جادوویەکی پێیە کە براو برا و باوک و کوڕ و تاک و هۆزەکەی لەیەک دەکات، هەموویان لەسەر ئەو قسە ڕێککەوتن.[1]

عەصمائی دایکی کە لوبابەی بچووکی کچی حارثی کوڕی حەربە خوشکی ئوممولفەضلی خێزانی عەبباسی مامی پێغەمبەری خوایە(ﷺ).[2]

خالید برایەکی هەبوو بە ناوی عومارە کە زۆر کەشخەو بەخۆ بوو، کاتێک قورەیش هەوڵیان دا ئەبووطالیب پشت بکاتە پێغەمبەر(ﷺ)، پێشنیازیان بۆ کرد دەستبەرداری پێغەمبەر(ﷺ) بێت و لە بریدا عومارەی بدەنێ، ئەویش وتی: زۆر نارەوان، کوڕەکەی خۆتان دەدەن بە من تا بەخێوی بکەم بۆتان و داوای کوڕەکەی من دەکەن تا بیکوژن؟![3] عومارە بێباوەڕ بوو و وەک وەلیدی باوکی لە هەوڵدا بوو بۆ دژایەتی کردنی پێغەمبەر(ﷺ) و بانگەوازەکەی، ئەوەبوو لەگەڵ عەمری کوڕی عاصدا چوو بۆ حەبەشە تا داوا بکەن لە نەجاشی موسڵمانانیان بدەنەوە دەست.[4]

برایەکی تری هەبوو بە ناوی وەلید کە لە خالید بەتەمەنتر بوو،[5] وەلید لە جەنگی بەدردا بە بێباوەری بەشداری کرد و بەدیل گیرا، ئەوەبوو خالید و هیشامی برای هاتن و بە پارە ئازادیان کرد، کاتێک ئازادیان کرد وەلید چوو و موسڵمان بوو، پرسیاری لێکرا بۆچی پێش ئازادکردنت موسڵمان

---

[1] تاريخ الإسلام، ج١، ص ١٥٦.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٣٩٤.

[3] تاريخ الطبري، ج١، ص ٥٤٥.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ١٠٦.

[5] أسد الغابة، ج٣، ص ٤٢٤.

نەبوویت؟ لە وەڵامدا وتی: حەزم نەکرد وا تەماشام بکرێت لە دیلی ترساوم و لە ترساندا موسڵمان بوم، ئەوەبوو بەهۆی ئەو موسڵمان بوونەیەوە لە مەککەدا وەلیدیان بەندکرد، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) هەمیشە نزای بۆ دەکرد، وەک چۆن نزای دەکرد بۆ کەسە بێدەسەڵاتە موسڵمانبووەکانی تری ناو مەککە، دواتر وەلید توانی خۆی رزگار بکات و خۆی بگەیەنێت بە پێغەمبەر(ﷺ).[1]

برایەکی تری ناوی هیشام بوو کە ئەویش لە بێباوەڕان بوو، رایەک دەڵێت: دوای فەتحی مەککە موسڵمان بووە.[2]

خوشکێکی هەبوو بە ناوی عاتیکە کە ژنی صەفوان بوو، کە صەفوان موسڵمان بوو شەش ژنی هەبوو، خێرا دوان لەوانی تەلاقدا، بەڵام عاتیکەی تەلاق نەدا.[3]

خوشکێکی تری ناوی فاطیمە بوو کە ژنی حارثی کوڕی هیشامی ئامۆزای خۆی بوو و لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو.[4]

خالید کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدورەحمان کە ئەویش یەکێک بوو لە سوارچاکەکانی قورەیش،[5] لە سەردەمی پێغەمبەی خوادا(ﷺ) منداڵ بوو، لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا لە ناو سوپای موعاویەدا بوو.[6]

کوڕێکی تری ناوی موهاجیر بوو کە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) منداڵ بوو، موهاجیر لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا بە پێچەوانەی عەبدورەحمانی برای لە ناو سوپای عەلیدا بوو.[7]

---

[1] أسد الغابة، ج٥، ص ٤٧١.

[2] أسد الغابة، ج٥، ص ٤٢١.

[3] () -- أسد الغابة، ج٧، ص ٢٠٤.

[4] أسد الغابة، ج٧، ص ٢٥١.

[5] أسد الغابة، ج٣، ص ٤٥٣.

[6] أسد الغابة، ج٥، ص ٢٩٣.

[7] أسد الغابة، ج٥، ص ٢٩٣.

خالید ژنێکی هەبوو بە ناوی ئەسمائی کچی ئەسەد کە دایکی عەبدوڕەحمان بوو.[1]

خالیدی کوڕی وەلید زۆر شێوەی لە عومەری کوڕی خەططاب دەچوو، تا ئاستێک هەندێ جار کەسانێ خالید و عومەریان لە یەک جودا نەدەکردنەوە، بۆ نموونە جارێ عەلقەمەی کوڕی عولاثە گەیشت بە عومەری کوڕی خەططاب و وایزانی خالیدەو وەک خالید ئەوی دواند.[2]

**خالید لە سەردەمی نەفامیدا**

خالید لە سەردەمی نەفامیدا لەناو قورەیشدا پێگەیەکی گرنگی هەبوو، ئەویش بریتی بوو لە بەرپرسیاریتی سەربازی، هەریەک لە ئامادەکاری سەربازی و مەشق و راهێنان و هەر وەها لە جەنگیشدا پێشڕەوی سوارەکانی بە دەستەوە بوو، ئیتر بەو هۆیەوە هەموو گرنگی خۆی دەدا بە بواری سەربازی و لەو بوارەدا زۆر هەڵکەوتە بوو.[3]

**لە جەنگی بەدردا**

هیچ لەو بارەوە نەهاتووە کە خالید بەشدار بووبێت لە جەنگی بەدردا، تەنها ئەوە هاتووە دوای جەنگەکە چووە بۆ ئازادکردنی وەلیدی برای، کاتێک وەلید لە جەنگی بەدردا بەدیل گیرا، خالید و هیشامی برای هاتن و بە پارە ئازادیان کرد.[4]

**لە جەنگی ئوحوددا**

لە جەنگی ئوحوددا یەکەم هەنگاوی دژایەتی خالید دژ بە موسڵمانان دەرکەوت، تیایدا خالید سەرکردایەتی سوارەی بێباوەڕانی دەکرد کە نزیکەی سەد سوارە بوون،[5]ئەمانە بەرەی راستی سوپاکە بوون، لە بەرەی چەپیشەوە سەد سوارەی تر هەبوون کە عیکریمەی کوڕی ئەبوو جەهل

[1] أسد الغابة، ج٣، ص ٤٥٢.
[2] الأغاني لأبي الفرج الأصبهاني، ج١٦، ص ٢٠٨.
[3] أسد الغابة، ج٢، ص ١٣٥.
[4] أسد الغابة، ج٥، ص ٤٧١.
[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٣.

سەرکردایەتی دەکرد،[1] کاتێک تیرهاوێژەکانی موسڵمانان کێوەکەیان چۆڵکرد، خالید تەماشای کرد ژمارەیەکی زۆر کەم ماونەتەوە، بۆیە لە پشتەوە هات بۆیان و ئەوانەی کوشت و هێرشی هێنا بۆ موسڵمانان، کاتێک بێباوەڕان بینییان وا خالید لە پشتووە کەوتوەتە ویزەی موسڵمانان گەڕانەوە، بەوە موسڵمانان کەوتنە نێوان دوو بەرەی جەنگی بێباوەڕانەوە، ئەم هەڵوێستەی خالید شکستی بێباوەڕانی لە ئوحوددا گۆڕی بۆ سەرکەوتن.[2]

**لە جەنگی خەندەقدا**

لە جەنگی خەندەقیشدا دووبارە خالید سەرکردایەتی سوارەی بێباوەڕانی دەکرد، هەرجارەو بەشێک لە سوپای بێباوەڕان هەنگاویان دەنا بۆ هێرش بردن، ڕۆژێک ئەبووسوفیان هێرشی دەبرد و ڕۆژێک خالیدی کوڕی وەلید و ڕۆژێک عەمری کوڕی عاص، زیاتریش پشتیان دەبەست بە تیرهاوێژەکانیان تا تیر بهاوێژن بۆ ئەوبەر خەندەقەکە،[3] ڕۆژێک لەو کەلەبەرەوە کە پەیدایان کردبوو دەستەیەکی سوپاکە بە سەرکردایەتی خالید هێرشیان هێنا بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ) و جەنگێکی سەختی لێکەوتەوەو تیایدا پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و ئێوارەو عیشایان نەکرد تا سوپای دوژمنیان شکاند، بەڵام خالید هەر وازی نەدەهێناو جارێکی تر بە بەشێک سوپاوە هەڵیکوتایە سەر دەستەیەکی موسڵمانان و ماوەیەک جەنگ لەنێوانیاندا ڕوویدا و بێباوەڕان هەمدی شکان، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە بیلال تا بانگ بدات و دەستی کرد بە نوێژی نیوەڕۆ و دوای ئەوە نوێژی عەسر و نوێژەکانی تریشی کرد.[4]

لە جەنگی خەندەقدا خالید ئەنەسی کوڕی ئەوسی کوڕی عەتیکی کوشت کە لە موسڵمانان بوو.[5]

---

[1] نفس المصدر، ج٤، ص ١٥.

[2] الكامل في التاريخ، ج٢، ص ٤٨.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٦٧.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٦٩.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٧٠.

لـەو هێرشەشـدا کـە پێغەمبـەر(ﷺ) بـردی بـۆ سـەر بەنـی لیحیـان، کاتێـک گەیشـتە ناوچـەی عوسـفان، خالیـد لـەوێ بـە سـوپایەکی سـوارەوە دووبـارە هاتـەوە بـەردەم موسـڵمانان.[1]

**لە رێککەوتنی حودەیبیەدا**

لە رێککەوتنی حودەیبیـەدا کاتێک پێغەمبـەر(ﷺ) ویسـتی بچێت بۆ عومرە و قورەیش بەوەیـان زانـی، بڕیاریـان دا رێ بگـرن لـە چوونـی پێغەمبـەر(ﷺ) بـۆ ئـەوێ، ئەوەبـوو سـوپایەکی سـوارەیان نـارد بـۆ ناوچـەی کوراعولغەمیـم کە خالیدی کوڕی وەلید سەرکردەی سوپاکە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) بڕیـاری دا رێڕەوی رۆیشتنەکە بگۆڕێت بۆ لای راست تـا تووشـی جەنگ نەبن، چونکە ئـەوان بـە نیـازی جەنـگ نەهاتبـوون،[2] واتـە تـا ئـەو کاتـەش خالیـد ئامـادەی هـەر هەنگاوێکی دژایەتیکردنی بانگـەوازی ئیسـلامی بـوو.

لە عومرەی دوای رێککەوتنی حودەیبیـەدا کە موسڵمانان چوون بۆ عومرە، هێشتا خالید نەیار و دوژمنی سەرسـەختی ئیسـلام و موسڵمانان بوو، چاوی بـەوە هەڵنەدەهـات پێغەمبـەر(ﷺ) و هـاوەڵان ببینێـت دێنـە نـاو مەککە، بۆیـە لـە مەککـە چوویـە دەرەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) لـەوێ بـە وەلیـدی بـرای خالیـدی فەرمـوو (خالیـد هـی ئـەوە نیـە خـۆی بێئـاگا بـکات لـە ئیسـلام، ئەگەریـش ئـەو بەهێزی و توانایـەی لەگـەڵ موسڵمانان دژ بـە بێبـاوەڕان بەکاربهێنایـە باشـتر بـوو بـۆی، بـە دڵنیاییشـەوە پێـش خەڵکـی ترمـان دەخسـت)، وەلیدیـش ئـەو هەواڵـەی دا بـە خالیـد، خالیـد کـە ئەمـەی بیسـت قسـەکە کاری تێکـرد و بوویـە هـۆکاری موسـڵمان بـوون و کۆچکردنـی بـەرەو مەدینـە.[3]

**موسڵمان بوونی خالید**

سـەبارەت بـە کاتـی موسـڵمانبوونی خالیـد چەنـد رایـەک هاتـووە، رایـەک دەڵێت: دوای حودەیبیـە بـووە، رایەکـی تـر دەڵێت: پێش فەتحـی خەیبـەر بـووە،

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ١٨.

[2] صحيح البخاري - كتاب الشروط - باب الشروط في الجهاد، الرقم ٢٧٣١.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٣٩٤.

رایەک دەڵێت: لە ساڵی پێنجەمی کۆچیدا موسڵمان بووە،[1] بەڵام ئەم رایە دروست نیە چونکە خالید لە رێککەوتنی حودەیبیەو لە عومرەی دوای حودەیبیەشدا هەر بێباوەڕ بووە.

بەڵام ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر(ﷺ) لە عومرەی پاش حودەیبیە کاری تێکرد و خالید بڕیاریدا موسڵمان بێت، بۆیە لەو بارەوە عوثمانی کوڕی طەلحەی دواند و هەردووکیان رێککەوتن کۆچ بکەن بۆ مەدینە، ئەوەبوو بەری بەیان هەردووکیان دەچوون بەرەو مەدینە، لە رێدا گەیشتن بە عەمری کوڕی عاص،[2] عەمر وتی: ئەی ئەبوو سولەیمان بەرەو کوێ دەچیت؟ خالدیش وتی: بەخوا موحەممەد پێغەمبەری خوایەو دەچم تا موسڵمان بم، تا کەی ئیتر؟ عەمریش وتی: دەی بەخوا منیش تەنها بۆ ئەوە هاتوم موسڵمان بم، ئەوەبوو چوون تا گەیشتنە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و خالید پێش کەوت و موسڵمان بوو و بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا عەمریش نزیک بوویەوەو لەسەر ئەوە بەیعەتی دا کە خوای گەورە لە تاوانەکانی پێشووی خۆش بێت، ئینجا عوثمانی کوڕی طەلحەش موسڵمان بوو،[3] پێغەمبەر(ﷺ) دڵخۆش بوو بە موسڵمان بوونیان و ئەوەی بە جەرگبڕانی قوڕەیش چواند.[4]

خالید خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کاتێک خوای گەورە خێری هێنایە رێم و ئیسلامی خستە دڵمەوە و ژیری پێ بەخشیم، خۆم بە خۆمم دەوت خۆ من چی جەنگی دژ بە موحەممەد هەیە بینیم، چی جاریش چووبم کە گەڕاومەتەوە دەروونم پێی وتوم ئەو کارو شوێنە هی من نیە، موحەممەدیش بەمزوانە سەردەکەوێت، ئەوەبوو کە پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو حودەیبیە هات بە

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ١٣٥.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٥٢.

[3] مسند أحمد بن حنبل - مسند الشاميين(ﷺ) - حديث عمرو بن العاص عن النبي(ﷺ) ، الرقم ١٨٠٥٥، حسنه شعيب الأرناؤوط.

[4] أسد الغابة، ج٣، ص ٥٩٩.

سوارەی بێباوەڕانەوە دەرچووم و لە ناوچەی عوسفان ڕێم پێگرت، دواتر کە قوڕەیش ڕێککەوتن لەگەڵی وتم: ئیتر بۆ کوێ بچم؟ بۆ لای نەجاشی کە ئەوانەی چوون بۆ لای نەجاشی لەوێ پارێزراون و خۆیشی بوەتە شوێنکەوتەی موحەممەد؟ یان بچم بۆ لای هیرەقل و واز لە ئایینی خۆم بهێنم و ببم بە نەصرانی و جوولەکە و شوێن عەجەم بکەوم، یان وەک ئەو خەڵکەی تر لە ماڵی خۆم بمێنمەوە، ئەوەبوو لە ماڵی خۆم مامەوە تا پێغەمبەر(ﷺ) بۆ عومرە هاتە مەککەو منیش چوومەدەرەوە، وەلیدی براشم لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) هاتبوو بۆ مەککە و بەدوامدا گەڕابوو، بەڵام منی بەدینەکردبوو، بۆیە نامەیەکی بۆ نووسیبووم و تیایدا نووسیبووی (زۆر سەرم سوڕ دەمێنێت چۆن ئیسلام هەڵنابژێریت... پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکردم کوا خالید؟ منیش وتم: خوا بیهێنێت، ئەویش فەرمووی: کەسی وەک ئەو هی ئەوە نیە بێئاگا بێت لە ئیسلام و ئەگەر ئەو بەهێزی و توانایەی لەگەڵ موسڵمانان دژ بە بێباوەڕان بەکاربهێنایە باشتر بوو بۆی و بە دڵنیاییشەوە پێش کەسانی ترمان دەخست) دەی براکەم فریا کەوە چەند دواکەوتووی قەرەبووی بکەرەوە)، خالید دەڵێت: کە نامەکەم خوێندەوە گوڕ و تین گرتمی تا بەرە وئیسلام بچم، ئینجا شەوەکەی خەوم بینی لە ناوچەیەکی وشک و رووتەنی تەنگەڵاندا بووم و چووم بەرەو خاکێکی سەوزایی بەرفراوان، کە چوومە مەدینە باسم کرد بۆ ئەبوبەکر، ئەویش وتی: وشکەڵانە تەنگەڵانەکە بێباوەڕیەکەت بوو، سەوزاییە بەرفراوانەکەش موسڵمان بوونەکەتە...ئینجا کە ویستم بچم بۆ مەدینە صەفوانی کوڕی ئومەییەم بینی و وتم: ئەی ئەبوو وەهب وانازایت ئێمە لە هەڵەداین، وا موحەممەد سەرکەوت بەسەر عەرەب و عەجەمدا، با بچین بۆ لای و شوێنی بکەوین، گەورەیی ئەو بۆ ئێمەشە، بەڵام ئەو زۆر بە سەختی بەرپەرچی دامەوەو وتی: ئەگەر تەنها من مابم شوێنی بکەوم شوێنی ناکەوم، منیش جێمهێشت و وتم: ئەم کابرایە لە بەدردا

براکەی کوژراوە، بۆیە وایە، ئینجا رێم کەوتە عیکریمەی کوڕی ئەبوو جەهل و چیم بە صەفوان وتبوو بەویشم وت، ئەویش هەمان وەلامی صەفوانی پێ وتم، منیش وتم: دەی ئەم قسانەم لای کەس باس مەکە، چوومەوە مالەوەو فەرمانم کرد سوارەکەم ئامادە کرا و دەرچووم تا گەیشتم بە عوثمانی کوڕی طەلحە، وتم: ئەمەیان هاورێمە، مەسەلەکەم بۆ باس کرد و ئەویش ئامادەبوو بێت، وتم: ئەم ئێوارە دەمەوێت دەربچم، ئەوەبوو بۆ بەرەبەیان چووین، ... لە رێدا عەمری کوڕی عاصمان بینی، ئەویش هاتبوو تا موسلمان بێت، ئەوەبوو لە مانگی صەفەری سالی هەشتی کۆچیدا گەیشتینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[1]

خالید دەلێت: کە چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وتم: ئە پێغەمبەری خوا(ﷺ) تۆ دەزانیت من لە چەند جەنگ و هەلوێستدا دژایەتیم کردویت، بۆیە لە خوا داوا بکە لەوانەم خۆش بێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئیسلام ئەوەی پێش خۆی دەسڕێتەوە)، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر ئەوە بەلێنم پێبدە کە ئەو نزایەم بۆ بکەیت، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (اللهم اغفر لخالد بن الوليد كل ما أوضع فيه من صد عن سبيلك)،[2] (خوایە لەهەموو ئەو رێگریانەی خالید خۆش بە کە خستیە بەردەم رێ و بانگەوازەکەت).

ئیتر لەو ساتە بەدواوە خالید لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بوو و دەیویست قەرەبووی دژایەتی پێشووی ئیسلام بە خزمەتکردنی ئیسلام بکاتەوەو ئەوەشی بەجێگەیاند.

پێغەمبەر(ﷺ) لە نزیک مالی خۆیەوە زەویەکی دانا بۆ خالید تا لێوەی نزیک بێت، ئەوەبوو کاتێک حارثەی کوڕی نوعمان پارچە زەویەکی بە میرات بۆ مایەوە، بەخشی بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش دابەشی کرد بە سەر چەند هاوەلێکیدا، یەکێک لەوانە خالید بوو.[3]

---

[1] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٤٧٤-٤٧٦، البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢٣٨-٢٣٩.

[2] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٦٨٢، البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢٤٠.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٥٣.

**خالید لە جەنگی موئتەدا**

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) حارثی کوڕی عومەیری ئەزدی وەک نێردراو نارد بۆ لای پاشای بوصرا تا بانگی بکات بۆ ئیسلام، لە موئتەدا شەهید کرا، شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسانی ڕێی پێ گرت و بەستیەوەو دای لە گەردنی و کوشتی، کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو هەواڵەی پێ گەیشت سوپای نارد بەرەو موئتە.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) سریەیەکی بە سەرکردایەتی زەیدی کوڕی حارثە ئامادەکرد کە نزیکەی سێ هەزار سەربازی لەبەردەستدا بوو، ئەمەش لە مانگی جەمادیلئوولای ساڵی هەشتەمی کۆچیدا بوو، ئینجا فەرمانی کرد ئەگەر زەید کوژرا با جەعفەری کوڕی ئەبوو طالیب ببێتە ئەمیر، ئەگەر ئەویش کوژرا با عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە ببێتە ئەمیر، ئەگەریش عەبدوڵا کوژرا، ئەوە با موسڵمانان لەنێو خۆیاندا کەسێک دیاری بکەن.[2]

کاتێک سوپاکە لەگەڵ دوژمندا جەنگان هەریەک لەو سێ هاوەڵە سەرکردەیە شەهید بوون،[3] پاش ئەوەی ئیبن ڕەواحە شەهید بوو خێرا ثابتی کوڕی ئەقرەم ئاڵاکەی گرت و نەیهێشت بکەوێتە زەوی و ئاڵاکەی دایە دەست خالیدی کوڕی وەلید.[4]

بەمجۆرە دەبینین خالید هێشتا دوو مانگ بوو هاتبوویە مەدینەو موسڵمان بووبوو، خێرا چوو بەشداری کرد لە جەنگێکدا دژ بە ڕۆمەکان کە گەورە زلهێزی ئەوکات بوون، چونکە خالید لە مانگی صەفەردا گەیشتە مەدینەو لە مانگی جەمادیلئوولادا چوو بۆ جەنگی موئتە.

کاتێک لە غەزای موئتەدا ثابت ئاڵاکەی هەڵگرتەوە هاواری دەکرد ئەی پشتیوانان، پاشان وتی: ئەی موسڵمانان لەسەر کەسێک ڕێککەون، ئەوانیش

[1] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٤، ص ٣٤٣.
[2] البدایة والنهایة، ج٤، ص ٢٤١.
[3] البدایة والنهایة، ج٤، ص ٢٤٥.
[4] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص ٣٨٣.

وتیان: تۆ، ئەویش وتی: نا من نایکەم، ئەوەبوو لەسەر خالیدی کوڕی وەلید ڕێککەوتن،[1] ئینجا سەیری خالیدی کوڕی وەلیدی کرد و وتی: ئەی ئەبوو سولەیمان ئاڵاکە بگرە، ئەویش وتی: من هەڵیناگرم تۆ شیاوتریت چونکە تەمەنت زیاترە و لە بەدریشدا بەشدار بویت، ثابت وتی: ئەی پیاو ئاڵاکە بگرە، سوێند بەخوا ئەم ئاڵایەم بە نیازی تۆ هەڵگرتووە، ئینجا هاواری کرد ئەی موسڵمانان رازین لەسەر خالید، هەموو وتیان: بەڵێ.[2]

ئەوکات پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە بوو، لەسەر مینبەر وتاری دەدا بۆ هاوەڵان، هەواڵی سوپای موسڵمانانی دەدا بە هاوەڵان و دەیفەرموو:( هەواڵی ئەو سوپا غەزاکارەتان پێبدەم؟) هەواڵی پێدان کە هەریەک لەو سێ سەرکردەی یەکەم شەهید بون، دواتر فەرمووی: (پاشان خالیدی کوڕی وەلید ئاڵاکەی گرتەدەست، ئەو یەکێک نەبوو لە ئەمیرە دەستنیشان کراوەکان، بەڵکو خۆی ئەمیرایەتی گرتەدەست...خوایە ئەو -خالید- شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خۆت، خوایە لەسەر دەستی سەرکەوتن ببەخشی)، لەو ڕۆژەوە خالید ناوی نرا شمشێری خوا (سیف اللە).[3]

خالید کە سەرکردایەتی سوپای گرتەدەست یەکەمجار سوپای موسڵمانانی لەدەست بێباوەڕە ڕۆم و عەرەبە بەکرێگیراوەکان ڕزگار کرد و پاشەکشەی کرد پێیان، بۆ بەری بەیان خالید دەستکاری ڕێکخستنی سوپاکەی کرد، لای ڕاست و چەپ و پێش و دواوەی سوپاکەی گۆڕی، بەوە ڕۆمەکان وایانزانی موسڵمانان سوپای هاوکارییان بۆ هاتووە،[4] بۆیە لەسەر دەستی موسڵمانان شکستێکی سەختیان تووش بوو.[5]

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢٤٥.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٥٣.

[3] السنن الكبرى للنسائي - كتاب المناقب - فضائل جعفر بن أبي طالب(ﷺ)، الرقم ٨١٠٣.

[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢٤٨.

[5] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٤٨٦.

خالید خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێت: لەو ڕۆژەدا نۆ شمشێر بە دەستمەوە شکان، تەنها شمشێرێکی یەمەنی بەدەستمەوە بەرگەی گرت.[1]

کاتێک سوپاکە بەرەو مەدینە گەڕانەوە، پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان چوون بۆ پێشوازییان، بەڵام موسڵمانان لەتاو خەفەتی ئەوەی کە بۆچی ئەو هەموو شەهیدەیان هەبووەو سەرنەکەوتون خۆڵیان فڕێ دەدا بەروویاندا و دەیانوت ئەی ڕاکردوان ڕاتانکرد و ڕێی خواتان بەردا؟! پێغەمبەریش(ﷺ) وەڵامی دانەوەو فەرمووی: (ليسوا بالفرار ولكنهم الكرار إن شاء الله)،[2] (ئەوانە ڕاکردوو نین، بەڵکو خوا بیەوێت هێرش دەبەنەوە).

**خالید لە فەتحی مەککەدا**

کاتێک بەنی بەکر بەرامبەر بە بەڵێنەکەیان ناپاکییان نواند و هێرشیان کردە سەر خوزاعەی هاوپەیمانانی پێغەمبەر(ﷺ)، لەوەشدا قورەیشییەکان هاوکار و پشتیوانیان بوون، ئەمەش بوو بە هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنەکەی حودەیبیە، پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر مەککە و فەتحی بکات.[3]

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد ئامادە بن و بە خەڵکەکەشی ڕاگەیاند کە نیازی هەیە بەرەو مەککە بچێت، نزیکەی دوانزە هەزار هاوەڵی کۆچەری و پشتیوانی و هاوەڵانی تر ئامادە بوون،[4] کاتێک لە نزیک مەککە مانەوەو ئەبوو سوفیان چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و لەوێ موسڵمان بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ویستی هێزی موسڵمانانی نیشان بدات، بۆیە عەبباسی ڕاسپارد تا لە دەروازەیەکەوە ئەبووسوفیان بوەستێنێت تا سوپاکە بەلایدا بڕوات و ببینێت، پێغەمبەر(ﷺ) سوپای سوارەی بۆ دوو دەستە دابەش کردبوو، بەشێکی لەگەڵ زوبەیری کوڕی عەووام بوون کە هاتن و ئەبووسوفیان سوپاکەی بینی، بەدوایدا بەشی دووەم هات کە سەرکردەکەی خالیدی

[1] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب غزوة مؤتة من أرض الشأم، الرقم ٤٢٦٥.

[2] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٧١٥، تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٤٩١.

[3] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٥٢٠-٥٢٢.

[4] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٥٢٥ و ٥٢٩.

کوڕی وەلید بوو و تێپەڕ بوون، ئەبووسوفیان وا شڵەژا بوو وتی: ئەی عەبباس ئەمە پێغەمبەری خوایە(ﷺ)؟ وتی: نا ئەوە خالیدی کوڕی وەلیدە.[1]

فەتحی مەککە یەکەم غەزا بوو کە تیایدا خالید لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری غەزا بکات و پێشتر لە هیچ غەزایەکدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نەبوو، چونکە ئەوکات بێباوەڕ بوو.[2]

پێغەمبەر(ﷺ) خالیدی کوڕی وەلیدی کردبوو بە بەرپرسی ئەو یەکەی کە هۆزەکانی ئەسلەم و قوضاعە و بەنی سولەیم و کەسانێکی تریشی لەخۆدەگرت و فەرمانی پێکردبوو لە خوارووی مەککەوە بچنە ناو مەککەوە کە بەنو بەکر لەوێوە بوون، پێغەمبەر(ﷺ) هەم بۆ خالید و هەم بۆ زوبەیریش فەرمانی کردبوو لەگەڵ کەس مەجەنگن تا ئەوان نەجەنگن، کاتێک خالید لەو بەرەیەوە چوو بەرەو ناو مەککە، بەنی بەکر بەرنگاری بوونەوە، بۆیە خالید جەنگی کرد لەگەڵیاندا و تووشی شکستی کردن و چوویە ناو مەککەوە،[3] بەڵام ئیبن کەثیر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد خالید لە سەرووی مەککەوە بچێتە ناو مەککەو خۆی لە خوارووی مەککەوە چوویە ناوەوە،[4] بەڵام بەپێی ئەو فەرموودانەی لە صەحیحی بوخاریدا هاتون وا هاتووە(پێغەمبەر(ﷺ) رۆژی فەتح لە سەرووی مەککەوە بەسەر ولاخەکەیەوە هات بەرەو مەککە)،[5] پێغەمبەر(ﷺ) کە بیستی جەنگ روویداوە فەرمووی: (مەگەر دوورەپەرێزیم نەکردبوو لە جەنگ کردن؟) هاوەڵان وتیا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) جەنگەکە لەبەرەی خالیدەوە بوو، جەنگیان بەرامبەر کرد، ئەویش بەرامبەریان جەنگا، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (قەزای خوا چاکترە) واتە قەزای خوا بووە رووبدات.[6]

---

[1] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٥٣٢.

[2] أسد الغابة، ج٢، ص ١٣٦.

[3] تاريخ الطبري، ج٢، ص ١٥٨.

[4] البداية والنهاية، ج٤، ص ٢٩٤.

[5] صحيح البخاري – كتاب المغازي – باب دخول النبي من أعلى مكة، الرقم ٤٢٨٩.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٣٦.

لەناوبردنی بتی عوززا

لە بیست و چواری ڕەمەزانی ساڵی هەشتەمی کۆچی و پاش فەتحی مەککە، پێغەمبەر(ﷺ) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد تا بتی عوززا لەناوبەرێت، لەگەڵیشیدا سی سوارە هەبوون، کە خالید و دەستەکەی گەیشتنە لای بتەکە، لەناویان برد و دواتر گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و خالید هەواڵی پێدا کە ئەرکەکەی بەجێگەیاندووە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو (ئایا هیچت بینی؟) خالید وتی: نا، فەرمووی: دەی لەناوت نەبردووە، بگەڕێرەوە بۆی و لەناوی بەرە، خالیدیش گەڕایەوە بۆی و شمشێرەکەی هەڵکردبوو، ئافرەتێکی رووتی رەشی قژ پژ بەرەو رووی هات، خالید لێیدا و کردی بە دوو لەتەوە، ئینجا گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بەسەرهاتەکەی بۆ باس کرد، ئەویش فەرمووی: (بەڵێ، ئەو ئافرەتە عوززا بوو و بێهیوا بوو لەوەی هەتا هەتایە لە وڵاتەکەتاندا بپەرسترێت).[1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە خالید هاتەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بگەڕێرەوە هیچت نەکردووە)، کە خالید گەڕایەوە دەبینێت خزمەتکارەکانی پەرستگا هاواریان لێدەکرد ئەی عوززا، ئەی عوززا، خالید کە چوو بۆی دەبینێت ژنێکی رووتی قژ پژە، خۆڵی دەکرد بەسەری خۆیدا، خالیدش کوشتی و گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش فەرمووی: (ئەوە عوززایە).[2]

چوونی بۆ بەنی جەذیمە

ئینجا کە خالید لەو کارەی تەواو بوو، لە مانگی شەووالدا واتە دوای رەمەزان، پێغەمبەر(ﷺ) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ لای بەنی جذیمە تا بانگیان بکات بۆ ئیسلام نەوەک بۆ ئەوەی لەگەڵیان بجەنگێت، هاودەم

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٤٥.

[2] مسند أبي يعلى الموصلي – مسند أبي الطفيل ، الرقم ٩٠٢، قال حسين سليم أسد إسناده صحيح، السنن الكبرى للنسائي – كتاب التفسير – سورة النجم – قوله تعالى أفرأيتم اللات والعزى ، الرقم ١١٤٨٣.

بەوەش سێ سەد و پەنجا هاوەڵی لە کۆچەران و پشتیوانان و بەنی سولەیم لەگەڵیدا نارد، بەڵام خالید کوشتارێکی کرد لێیان.[1]

هۆکاری ڕووداوەکە بە دوو گێڕانەوە هاتووە کە بریتین لە:

یەکەم: خالید کە چوویە ئەوێ وتی: ئێوە کێن؟ وتیان: موسڵمان بووین و نوێژ دەکەین و زەکات دەدەین بە موحەممەد و مزگەوتمان دروست کردووە و بانگی تێدا دەدەین، خالید وتی: ئەی ئەو چەکانە چیە پێتان؟ وتیان: لەگەڵ هۆزێکی عەرەبی دوژمنایەتیمان هەیە ترساین ئێوە ئەوان بن، خالید وتی: دەی چەکەکانتان دابنێن، ئەوانیش چەکیان دانا، خالید وتی: بەدیلیان بگرن، ئەوەبوو بەدیل گیران، بۆ بەری بەیان خالید وتی: کێ دیلی لایە با بە شمشێر تێی بکەوێت، ئەوەبوو بەنی سولەیم چی دیلیان لابوو کوشتیان، بەڵام کۆچەری و پشتیوانەکان دیلەکانیان ئازاد کردن، کە ئەمە گەیشتەوە بە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (اللهم انی أبرأ الیک مما صنع خالد)، خوایە من لەبەردەم تۆدا خۆ دوور دەگرم لەو کارەی خالید کردی، ئینجا عەلی کوڕی ئەبوو طالیبی نارد تا خوێن باییان بدات.[2]

دووەم: کاتێک خالید چوویە ئەوێ و بانگی کردن بۆ ئیسلام، ئەوان بە باشی نەیاندەزانی بڵێن (أسلمنا) موسڵمان بووین، بەڵکو دەیانوت (صبأنا، صبأنا)، واتە لە دین هەڵگەڕاینەوە، لە دین هەڵگەڕاینەوە، خالیدیش وایزانی بێباوەڕی خۆیان ڕادەگەیەنن، بۆیە کەوتە کوشتن و گرتنیان، دیلەکان لەناو هاوەڵاندا دابەش بوون، تا بۆ بەیانی خالید فەرمانی کرد هەرکەسەو دیلەکەی بکوژێت، ئەوەبوو هەندێ لە هاوەڵان دیلەکانی خۆیان نەکوشتن تا چوونە لای پێغەمبەر(ﷺ) و مەسەلەکەیان بۆ باسکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) دەستەکانی بەرز کردەوەو فەرمووی: (اللهم إنی أبرأ إلیک مما صنع خالد)،(ﷺ)، دوو جار ئەوەی فەرموو.[3]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٤٧-١٤٨.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٤٧- ١٤٨.

[3] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب بعث النبي(ﷺ) خالد بن الوليد إلى بني جذيمة، الرقم ٤٣٣٩.

ئەگەر بە دیدێکی زانستی تەماشا بکەین بۆمان دەردەکەوێت گێڕانەوەی دووەم دروستە، لەبەرئەوەی:

یەکەم: دەبینین گێڕانەوەی یەکەم لە کتێبەکانی فەرموودەدا نەهاتووە، بەڵام گێڕانەوەی دووەم لە چەندین کتێبی فەرموودەدا هاتووە بە تایبەت لە صەحیحی بوخاریدا.

دووەم: خوێن بایی کە دەدرێت بۆ کوشتنی هەڵەیە، ئەگینا کوشتنی ئەنقەست بە خوێن بایی چارەسەر ناکرێت.

سێیەم: ئەگەر کوشتنی ناحەق و ئەنقەست بوایە ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) تۆڵەی لێدەسەندەوە، بۆیە ئەوە تۆمەتێکە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە ئامادە نەبووە نزیکانی خۆی بخاتە بەر دادگای شەریعەت، ئەوەش دوورە لە شکۆی پێغەمبەری خواوە(ﷺ).

چوارەم: ئەوە ئیجتیهادێکی هەڵەی خالید بووە کە وایزانیوە بەو چەمکە لە ئیسلام دەستبەردار دەبن، بەوەش گوڕ و تین گرتوویەتی و کەوتووەتە کوشتنیان و دانەنیشتووە وردەکارییان لێبکات و بڵێت مەبەستتان لەو قسەیە چیە؟

**هەڵوێستی پێغەمبەر(ﷺ) بەرامبەر بە خالید و کارەکەی:**

یەکەم: پێغەمبەر(ﷺ) ناڕەوایی ئەو کارەی خالیدی ڕاگەیاند و لای خوا دوورگرتنی خۆی لەو کارە نیشاندا.

دووەم: پێغەمبەر(ﷺ) نەک خالیدی لەسەر ئەو کارەی نەکوشت، تەنانەت لە پۆستەکەشی لاینەبرد و دوای ئەوە چەند بەرپرسیارێتی تری پێ ڕاسپارد، چونکە ئەوەی خالید ئەنقەست نەبوو و ئیجتیهادێکی هەڵە بوو، ناشکرێت لەبەر هەڵەیەک ئەزموون و توانایەکی بەهێز پەک بخرێت، بەڵکو لەلایەکەوە دەبێت هەڵەکەی چارەسەر بکرێت، لەلایەکی ترەوە ئاگادار بکرێتەوە لەو هەڵەی و هەر هەڵەیەکی تری چاوەڕوانکراو.

سێیەم: پێغەمبەر(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبوو طالیبی بانگ کرد و ڕایسپارد تا خوێن بایی تەواوی ئەو هۆزە بدات و هەموو بارێکی سەردەمی نەفامی بخاتە ژێر پێی، عەلی چوو بۆ ئەوێ و هەرچی خوێن باییەک هەبوو پێی دانەوە، دواتر چی زیانی دارایی هەبوو هەمووی بۆ قەرەبوو کردنەوە، تەنانەت ئەگەر قاپی بەردەم سەگەکەشیان شکابوایە ئەوەشی بۆ قەرەبوو کردنەوە، دواتر کە تەواو بوو بڕێک سامان مایەوە، عەلی وتی: ئەو زیادەش بۆ ئێوە با ئەگەر شتێک ئێمە نەیزانین و ئێوە بیزانن بەوە قەرەبوو بێتەوە، ئینجا گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵی پێدا کە چی کردووە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (چاکت کردو پێکات).[1]

**خالید لە غەزای حونەیندا**

لە غەزای حونەیندا پێغەمبەری خوا(ﷺ) خالیدی کرد بە بەرپرسی بەنی سولەیم، بەڵام بێباوەڕان لە هەموو لاوە هێرشیان بردە سەر بەنی سولەیم و تووشی شکستیان کردن و بەنی سولەیم ڕایانکردو خەڵکێکی مەککەش کە لەگەڵیان هاتبوون ڕایانکرد،[2] بەڵام دواتر موسڵمانان گەڕانەوەو هەڵیانکوتایە سەر دوژمن و سەرکەوتن.[3]

**خالید لە غەزای طائیفدا**

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لە حونەینەوە ویستی ڕووەو طائیف بڕوات، بۆیە خالیدی کرد بە پێشڕەوی سوپاکە تا پێشتر بڕوات،[4] لە ڕێدا خالید لەگەڵ بێباوەڕاندا جەنگا و تیایدا ئافرەتێکیشی کوشت، کە دواتر پێغەمبەر(ﷺ) بەوێدا تێپەڕ بوو و ئەو ئافرەتە کوژراوەی بینی فەرمووی: نەدەبوو ئەوە بکوژرایە، ئینجا بە یەکێکی فەرموو خۆت بگەیەنە بە خالید و پێی بڵێ با

[1] السيرة النبوية لابن هشام، ج٥، ص ٩٦.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٥١.

[3] البداية و النهاية لابن كثير،ج٤، ص ٣٢٥-٣٢٨.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٥٨.

ژن و کرێگرتە-کۆیلەی ناچار هێنراو- نەکوژێت.[1]

**لەناوبردنی بتی لات**

کاتێک وەفدی ثەقیف هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) کە نزیکەی سیانزە کەسێک زیاتر دەبوون، دوای قسەکانیان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردن بتی لات لەناوبەرن، بەڵام ئەوان وتیان: ئێمە زاتی ئەوەمان نیەو دەترسین سزامان بدات، بۆیە تۆ خۆت ئەو بتە لەناوبەرە، پێغەمبەر(ﷺ) دەستەیەکی ئامادە کرد و خالیدی کوڕی وەلیدی کردە بەرپرسیان، لەنێویشیاندا موغیرەی کوڕی شوعبە هەبوو، کە چوونە ئەوێ بتەکەیان لەناوبرد و گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ).[2]

**خالید لە کێشەی بەنیلموصطەلەقدا**

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەلیدی کوڕی عوقبەی نارد بۆ لای بەنی موصطەلەق تا زەکاتیان لێ کۆبکاتەوە، کە چوو بۆ ئەوێ، ئەوانیش بەرەو لای هاتن، وەلید ترساو وایزانی هاتون تا لەگەڵی بجەنگن، بۆیە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وای گەیاند کە ئەوان ئامادە نەبون زەکات بدەن و هاتون تا لەگەڵی بجەنگن، پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا سوپا بنێرێت بۆیان،[3] بۆیە خالیدی کوڕی وەلیدی نارد و فەرمانی پێکرد پەلە نەکات و وردەکاری بکات، خالیدیش کەوتەڕێ، کە گەیشتە ئەوێ شەو بوو، هەواڵگری نارد تا هەواڵ بزانن، ئەوانیش کە هاتنەوە وتیان: خەڵکەکە وابەستەی ئیسلامن و بانگیان بیستراوەو نوێژ دەکەن، بۆ بەیانی خالید چوو بۆ لایان و بینی وایە، بۆیە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵی پێدا کە ئەوان موسڵمانن و هەڵنەگەڕاونەتەوە لە ئیسلام، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاند(يا أيها الذين ءامنوا إن جاءكم فاسق بنبأ فتبينوا...).[4]

---

[1] سنن أبي داود، الرقم ٢٦٦٩، قال الألباني حسن صحيح.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣٤.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢١٤.

[4] تفسير ابن كثير، ج٤، ص ٢١١.

### لەناوبردنی بتی وەد

بتی وەد ئەو بتە بوو کە هی بەنی کەلب بوو و لە دەومەتەلجەندەل بوو،[1] پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە غەزای تەبووکدا خالیدی کوڕی وەلیدی نارد تا ئەو بتە لەناوبەرێت، بەڵام بەنوعەبدود هاتنەڕێی خالید تا نەهێڵن لەناوی بەرێت، خالیدیش لەگەڵیان جەنگا تا لەناوی بردن، دواتر ئەو بتەی شکاند و شوێنەواری نەهێشت.[2]

### هێرشی خالید بۆ ئوکەیدر

پێغەمبەر(ﷺ) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ ئوکەیدری کوڕی عەبدولمەلیک و وەسفی ئەو کەسەی کرد بۆ خالید، کە خالید گەیشتە لای قەڵاکە مانگەشەو بوو، خالید بە وەسفەکەی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) کابرای ناسیەوە، ئەوەبوو بەدیل گیراو براکەشی کە ناوی حەسسان بوو رایکرد، بەڵام کوژرا و کڵاوە زێرپۆشەکەشی نێردرا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا خالید ئوکەیدری هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەویش خوێنی حەرام کرد و لەسەر پێدانی سەرانە لەگەڵی رێککەوت، ئینجا ئوکەیدر گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی.[3]

### چوونی خالید بۆ نەجران

پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی دەی کۆچیدا خالیدی کوڕی وەلیدی بە چوارسەد کەسەوە نارد بەرەو نەجران و فەرمانی کرد پێش ئەوەی لەگەڵیان بجەنگێت سێ رۆژ بانگیان بکات بۆ ئیسلام، ئەگەر رازی بوون ئەوا با وەریبگرێت و لەناویاندا بمێنێتەوەو قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوایان فێر بکات، ئەگەر رازی نەبوون ئەوە لەگەڵیاندا بجەنگێت، خالید چوو بۆ ئەوێ و وەفدی نارد تا لە هەموو شوێنێک بانگەواز بکەن بۆ ئیسلام، خەڵکەکەش چوون بە دەم بانگەوازەکەوەو خالید لەناویاندا مایەوەو قورئان و سوننەتی

---

[1] البداية و النهاية لابن كثير، ج٢، ص ١٩٠.

[2] الأصنام لابن الكلبي، ج١، ص ١٠.

[3] تاريخ الطبري، ج٢، ص ١٨٥.

پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەناویاندا بڵاو دەکردەوە، ئینجا خالید نامەی نووسی بۆ پێغەمبەر(ﷺ)

(بسم الله الرحمن الرحيم لمحمد النبي رسول الله من خالد بن الوليد السلام عليك يا رسول الله ورحمة الله وبركاته، فإني أحمد إليك الله الذي لا إله إلا هو أما بعد يا رسول الله صلى الله عليك بعثتني إلى بني الحارث بن كعب وأمرتني إذا أتيتهم ألا أقاتلهم ثلاثة أيام وأن أدعوهم إلى الإسلام فإن أسلموا قبلت منهم وعلمتهم معالم الإسلام وكتاب الله وسنة نبيه وإن لم يسلموا قاتلتهم وإني قدمت عليهم فدعوتهم إلى الإسلام ثلاثة أيام كما أمرني رسول الله وبعثت فيهم ركبانا قالوا يا بني الحارث أسلموا تسلموا فأسلموا ولم يقاتلوا وأنا مقيم بين أظهرهم وآمرهم بما أمرهم الله به وأنهاهم عما نهاهم الله عنه وأعلمهم معالم الإسلام وسنة النبي حتى يكتب إلي رسول الله والسلام عليك يا رسول الله ورحمة الله وبركاته)

(بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، بۆ موحەممەدی پێغەمبەری خوا لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە، سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا، سوپاسی خوای تاک و تەنهای بێ هاوەڵ دەکەم، پاشان ئەی پێغەمبەری خوا صەلاتی خوات لێ بێت، جەنابت منت نارد بۆ لای بەنی حارثی کوڕی کەعب و فەرمات پێکردم کە چووم بۆ لایان تا سێ ڕۆژ لەگەڵیان نەجەنگم و بانگیان بکەم بۆ ئیسلام، ئەگەر موسڵمان بوون لێیان قبووڵ بکەم و ڕێنماییەکانی ئیسلام و کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەری خوایان فێر بکەم، منیش بڕێ سوارەم نارد بۆ ناویان و دەیانوت ئەی بەنی حارث موسڵمان بن پارێزراو دەبن، ئەوانیش موسڵمان بوون و نەجەنگان، منیش لەنێویاندا مامەوەو فەرمانی خوام پێدەگەیاندن و ڕێگریم دەکرد لەوەی خوا ڕێگری لێکردووەو ڕێنماییەکانی ئیسلام و کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەری خوام فێر کردون و چاوەڕێی وەڵامی پێغەمبەری خوام، سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا).

لە وەڵامدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆی نووسی:

(بسم الله الرحمن الرحيم من محمد النبي رسول الله إلى خالد بن الوليد سلام عليك فإني أحمد الله إليك الذي لا إله إلا هو أما بعد فإن كتابك جاءني مع رسلك بخبر أن بني الحارث قد أسلموا قبل أن يقاتلوا وأجابوا إلى ما دعوتهم إليه من الإسلام وشهادة أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأن محمدا عبده ورسوله وأن قد هداهم الله بهداه فبشرهم وأنذرهم وأقبل وليقبل معك وفدهم والسلام عليك ورحمة الله وبركاته).

(بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، لە موحەممەدی پێغەمبەری خواوە بۆ خالیدی کوڕی وەلید، سەلامت لێ بێت، سوپاسی خوای تاک و تەنهای بێ هاوەڵ دەکەم، پاشان، نامەکەت لەگەڵ نێردراوانتدا گەیشتە دەستم و هەواڵی بەنی حارثم پێگەیشت کە موسڵمان بون پێش ئەوەی بجەنگن و هاتون بەدەم بانگەوازەکەتەوە کە بانگت کردن بۆ ئیسلام و شایەتییان داوە هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوای تاک و تەنهای بێهاوەڵ و موحەممەدیش بەندەو نێردراوی خوایە، خوا ڕێنمونی خۆی بەخشیوە پێیان، دەی موژدەیان پێبدەو –بە دۆزەخ- بیانترسێنەو هۆشیاریان بکەرەوە و خۆیشت وەرەوەو با لەگەڵیشتدا وەفدیان بێت، سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لێ بێت).

خالیدیش هاودەم بە وەفدی بەنی حارث هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ).[1]

**چوونی خالید بۆ یەمەن**

ئەمجار پێغەمبەر(ﷺ) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ یەمەن تا بانگەوازیان بکات بۆ ئیسلام، بەڵام ئەوان نەهاتن بە دەم بانگەوازەکەوە، شەش مانگ بەو جۆرە لە هەوڵدا بوو، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبوو تالیبی نارد و فەرمانی کرد خالید بگەڕێتەوەو هەرچیەک لە سوپاکەی خالیدیش ویستی بمێنێتەوە ئەوە با بمێنێتەوە.[2]

دیارە پێغەمبەری خوا(ﷺ) عەلی نارد بۆ لای خالید تا پێنج یەکی دەستکەوتەکان وەربگرێت، وەک لە فەرموودەی صەحیحی بوخاریدا هاتووەو وا لە خوارەوە ئاماژەی پێدەدەین:

---

[1] تاریخ الطبري، ج٢، ص ١٩٥.

[2] تاریخ الطبري، ج٢، ص ١٩٧.

بورەیدە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبووطالیبی نارد بۆ لای خالیدی کوڕی وەلید تا پێنج یەکی دەستکەوت دابەش بکات.[1]

بورەیدە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبووطالیبی نارد بۆ لای خالیدی کوڕی وەلید تا پێنج یەکی دەستکەوت دابەش بکات، کە بەیانی بوویەوە عەلی ئاو لەسەری دەچۆڕا، خالید بە بورەیدەی وت دەبینیت (عەلی) چی دەکات یان دەبینیت چی کردووە؟ بورەیدە دەڵێت: منیش رقم بوو لە عەلی، کاتێک گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵم پێدا عەلی چی کردووە، ئەویش فەرمووی: ئەی بورەیدە ئایا تۆ رقتە لە عەلی؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: رقت لێی نەبێت.[2]

لە گێڕانەوەکەی ئیمامی بوخاریدا وا هاتووە کە بورەیدە بە خالیدی وت نابینیت چی کردووە؟ جا کە گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەم بۆ باسکرد، ئەویش فەرمووی ئەی بورەیدە ئایا رقتە لە عەلی؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: رقت نەبێت لێی چونکە لە پێنج یەکدا بەشی لەوە زیاتریشی بۆ هەیە).[3]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە بورەیدە دەڵێت: هێندە رقم لە عەلی بوو کەسی تر نەبوو هێندە رقم لێی بێت، تەنانەت پیاوێک هەبوو لە مەککە بەس لەبەرئەوە خۆشم دەویست کە رقی بوو لە عەلی، جا لە سوپایەکدا هاودەمی ئەو پیاوەم کرد بەس تەنها لەبەرئەوەی کە رقی بوو لە عەلی، ئەوەبوو برێ دەستکەوتمان دەستکەوت، ئەو کەسە هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کەسێک بنێرە تا پێنج یەکەکەی دابەش بکات، پێغەمبەریش(ﷺ) عەلی نارد، لە دیلە ئافرەتیەکاندا ئافرەتێک هەبوو کە لە هەموویان جوانتر بوو، عەلی

---

[1] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب بعث علي بن أبي طالب وخالد بن الوليد إلى اليمن، الرقم ٤٣٥٠.

[2] فضائل الصحابة لأحمد بن حنبل، الرقم ١١٣٥، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٧٥، أسد الغابة، ج١، ص ٢٦٤.

[3] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب بعث علي بن أبي طالب وخالد بن الوليد إلى اليمن، الرقم ٤٣٥٠.

ئەوەی لە پێنج یەکەکە دانا و دابەشی کرد، دواتر هاتەدەر و سەری ئاوی لێدەچۆڕا، وتمان: ئەی ئەبولحەسەن ئەوە چیە؟ وتی: وەصیفە (ئافرەتەکە) نابینن کە لە کەنیزەکەکان بوو، من دابەشم کرد و بەر پێنج یەکەکە کەوت، دواتر بوو بە بەشی ئالوبەیتی پێغەمبەر(ﷺ) و دواتر بوو بە بەشی بنەماڵەی عەلی و منیش چوومە لای، پیاوە سەرکردەکە نامەی نووسی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و منیش وتم: من وەک نێردراو و پشت راست بنێرە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، کە نامەکەم دەخوێندەوەو دەموت راستی نووسیوە، پێغەمبەریش(ﷺ) دەستی گرتم و نامەکەشی گرتە دەستی و فەرمووی: ئایا رقتە لە عەلی؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: (دەی رقت لێی نەبێت، ئەگەریش خۆشت دەوێت زیاتر خۆشت بوێت، دە سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە پشکی بنەماڵەی عەلی لە پێنج یەکدا باشتر و زیاترە لە وەصیفە)، بورەیدە دەڵێت: سوێند بەخوا دوای ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کەس نەبوو هێندەی عەلی لام خۆشەویست بێت.[1]

جارێک عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و سکاڵای لە خالید کرد، پێغەمبەریش(ﷺ) بە خالیدی فەرموو (ئەی خالید بۆچی ئازاری کەسێک لە بەشداربوانی بەدر دەدەیت؟ خۆ ئەگەر هێندەی ئوحود زێڕ ببەخشیت ناگەیتەوە بە کردەوەی ئەودا)، خالیدیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەر دەنێنە سەرم و قسەم لەڕوودا دەکەن، منیش ناچار دەبم وەڵامیان بدەمەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (لا تؤذوا خالدا فإنه سيف من سيوف الله صبه الله على الكفار)،[2] (ئازاری خالید مەدەن، چونکە ئەو شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوا کە بەرووی بێباوەڕاندا هەڵیکردووە).

---

[1] السنن الكبرى للنسائي - كتاب الخصائص - الترغيب في حب علي وذكر دعاء النبي لمن أحبه ودعاءه على من أبغضه، الرقم ٨٤٢٨.

[2] صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله عليهم أجمعين - ذكر تسمية المصطفى(ﷺ) خالد بن الوليد سيف الله ، الرقم ٧٠٩١، صححه شعيب الأرناؤوط.

خالید دەڵێت: جارێک لەگەڵ عەممارى کورى یاسردا دەمەبۆڵەیەکمان بوو، عەمماریش چوو تا لاى پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵام لەسەر بکات، منیش هەر لێى تووڕە دەبووم، پێغەمبەریش(ﷺ) بێدەنگ بوو، ئیتر عەممار دەستى کرد بە گریان و وتى: ئەى پێغەمبەرى خوا(ﷺ) گوێت لێیە چیم پێ دەڵێت:؟ پێغەمبەریش(ﷺ) سەرى بەرەو رووى من بەرزکردەوەو فەرمووى: (هەرکەس دژایەتى عەممار بکات خوا دژایەتى دەکات و هەرکەسیش رقى لێى بێت خوا رقى لێى دەبێت)، منیش خێرا دەرچووم و ئیتر لەو ساتەوە هیچ شتێک هێندەى ئەوە لام خۆشەویست نەبوو کە عەممار رازى بکەم، خێرا خۆم گەیاند بە عەممار و رازیم کرد.[1]

رۆژێک خالید لە خزمەت پێغەمبەرى خوادا(ﷺ) بوو، عەلى کورى ئەبوو تالیب بڕێک دەستکەوتى لە یەمەنەوە ناردبوو، پێغەمبەر(ﷺ) دابەشى کرد لە نێوان چوار کەسدا، ئینجا کابرایەک لەوێ بوو وتى: ئێمە لەو کەسانە شیاوتر بووین وەرى بگرین، ئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووى: (ئایا لێم دڵنیانین لە کاتێکدا من ئەمینى ئەوەم کە لە ئاسمانە، بەیانى و ئێوارە هەواڵى ئاسمانم بۆ دێنێ)، کابرایەک لەوێ بوو هەستا و وتى: ئەى پێغەمبەر(ﷺ) لەخوا بترسە، ئەویش فەرمووى: (ویلك، أولست أحق أهل الأرض أن يتقي الله)، (قوڕ بەسەر، مەگەر من شیاوترین کەسى سەر زەوى نیم بۆ ئەوەى لە خوا بترسم)، ئینجا کابرا پشتى هەڵکرد و چوو، خالیدى کوڕى وەلید وتى: ئەى پێغەمبەرى خوا(ﷺ) با بدەم لە گەردنى، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: (نا، لەوانەیە نوێژ بکات)، خالید وتى: جا چەند کەس هەیە نوێژ دەکات و ئەوەى بە زمانى دەیڵێت لە دڵیدا نیە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: (إني لم أومر أن أنقب عن قلوب الناس ولا أشق بطونهم)، (من فەرمانم پێ نەکراوە پشکنین

---

[1] مسند أحمد بن حنبل – مسند الشاميين(ﷺ) – حديث خالد بن الوليد(ﷺ) ، الرقم ١٧٠٨٩، السنن الكبرى للنسائي – كتاب المناقب – عمار بن ياسر(ﷺ) ، الرقم ٨٢١١، صححه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في صحيح الجامع الصغير و زيادته.

بکەم بۆ ناو دڵی خەڵک و سکیان هەڵدڕم)، پاشان فەرمووی: (إنه يخرج من ضئضئ هذا قوم يتلون كتاب الله رطبا، لا يجاوز حناجرهم، يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية)،[1] (لە پشت و وەچەی ئەم کابرایەوە خەڵکانێ دێن کە زۆر بە جوانی و ئاسانی قورئان دەخوێننەوە، بەڵام لە قوڕگیان تێپەڕ ناکات، وەک چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت ئاوا لە دین دەردەچن).

لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ماعیزی کوڕی مالیک هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: زینام کردووەو دەبێت پاک بکرێمەوە، پێغەمبەر(ﷺ) جوابی کرد، بۆ بەیانیش هەر وا هاتەوەو هەمان شتی وتەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ لای هۆزەکەی تا بزانن ئایا ماعیز هیچ کێشەی عەقڵی نیە؟ وتیان: نا، کە جاری سێیەم ماعیز هاتەوە رەجم کرا، ئینجا ئافرەتێکی غامیدی هات و ئەویش وتی: زینام کردووەو داوا دەکەم پاکم بکەیتەوە، پێغەمبەر(ﷺ)زۆر هەوڵیدا مەسەلەکە وەلابنرێت، بەڵام ئافرەتەکە هەر دەهاتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی دا تا منداڵەکەی ببێت، دواتر تا شیری پێبدات تا دەکەوێتە نان خواردن، ئافرەتەکە هەر ئەو تەوبەی لەبیر نەکرد و هاتەوە تا رەجم بکرێت، ئەوەبوو خرایە ناو چاڵ تا رەجم بکرێت، خەڵکی بەردبارانیان کرد، خالیدی کوڕی وەلید بەردێکی بۆ وەشاند و دای لە سەری ژنەکەو خوێنی سەری ژنەکە بەر خالید کەوت، خالید قسەی وت بە ژنەکە، پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوەی بیست فەرمووی: (لەسەرخۆ خالید، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەو ئافرەتە تەوبەیەکی کردووە ئەگەر ئەو کەسەی دەیەک وەک باج وەردەگرێتوەرگر ئەو تەوبەی بکردایە لێخۆشبوونی بۆ دەبوو).[2]

خالید جگە لەوەی موجاهید و سەرکردەیەکی خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بوو، هاوکات نووسەری خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو و نامەی دەنووسی

[1] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب بعث علي بن أبي طالب وخالد بن الوليد إلى اليمن، الرقم ٤٣٥١.
[2] صحيح مسلم - كتاب الحدود - باب من اعترف على نفسه بالزنى، الرقم ١٦٩٥.

بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و لە کۆتایی نامەکەدا دەینووسی (خالیدی کوڕی وەلید بە فەرمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمەی نووسیوەوە).[1]

**خالید لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکردا**

پاش تەواوبوون لە ئەرکی سوپاکەی ئوسامەی کوڕی زەید، ئەوکات ئەبووبەکری صدیق یانزە لیوای بۆ جەنگی هەڵگەڕاوەکان پێکهێنا، ئینجا لیوایەکی تایبەت کرد بە خالیدی کوڕی وەلید و رایسپارد بچێت بەرەو لای طولەیحەی کوڕی خوەیلید، ئەگەریش لەو ئەرکەی لێبوویەوە ئینجا بڕوات بەرەو لای مالیکی کوڕی نوەیرە.[2]

ئەبووبەکر کاتێک خالیدی کردە بەرپرسی ئەو لیوایە بە خەڵکەکەی وت من بیستوومە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: (نعم عبدالله وأخو العشيرة خالد بن الوليد سيف من سيوف الله سله الله على الكفار والمنافقين)، (خالید بەندەیەکی چاکی خوا و پیاوماقووڵێکی ناو هۆزە، شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوا کە هەڵکێردووە بەڕووی بێباوەڕان و دووڕووانـدا)، ئینجا خالید کەوتەڕێ و ئەبووبەکر ماڵئاوایی لێکرد و بەڵێنی پێدا لە ناوچەی خەیبەر لەگەڵ سەرکردەکانی تر پێیدەگاتەوە، ئەم پلانەش بۆ ئەوەبوو دوژمن بترسێت.[3]

**لەناوبردنی فیتنەی طولەیحەی ئەسەدی**

خالید بە سوپاکەیەوە چوو بەرەو لای طولەیحە کە خەڵکێکی زۆری لە دەوری خۆی کۆکردبوویەوە.[4]

خالید کە نزیک بوویەوە لە بەنی طەیئ، عەددی کوڕی حاتەم هات بۆ لای و و تی سێ رۆژ مۆڵەتم بدە، چونکە ئەو خەڵکە دەترسن ئەگەر شوێن تۆ بکەون طولەیحە نێردراوەکەیان بکوژێت، خالیدیش مۆڵەتی دا، سێ رۆژەکە تەواو بوو، ئینجا عەددی بە پێنج سەد جەنگاوەرەوە هاتە

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣٤٤.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣١٥.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣١٧.

[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣١٧.

لای خالید، دواتر خالید چوو بەرەو لای بەنی جدیلە، ئەویش وتی: ئەی خالید چەند رۆژێک مۆڵەتم بدە بەڵکو خوا ئەمانیش وەک طەیئ رزگار بکات، موسڵمانەکانی ئەوێش دایانە پاڵ سوپاکەی خالید کە نزیکەی هەزار سوارەیان هەبوو، ئینجا لەوێوە خالید چوو تا گەیشتە ناوچەی بەئجەئو سەلما و لەوێ سوپاکەی رێکخست و لەوێ لە ناوچەیەک کە پێی دەوترێت بزاخە لەگەڵ طولەیحەدا پێکگەیشت،[1] جەنگ لەنێوانیاندا روویدا، لە کاتی جەنگەکەدا طولەیحە وایگەیاندبوو کە جوبرەئیل دێت بۆ لای و پەیامی بۆ دێنێت، عویەینە ساتێک لە جەنگەکەدا بوو و ساتێکیش دەچوویەوە بۆ لای طولەیحەو دەیوت جوبرەئیل هات بۆ لات؟ دواتر کە زانی راست ناکات پاشەکشەی کرد بە سوپاکەی، ئیتر سوپاکەی طولەیحە کەوتنە پەرت بوون، طولەیحەش خێرا ژنەکەی خۆی سوار کرد و رایکرد و بە سوپاکەی وت کامتان دەتوانن خۆتان و ژنتان رزگار بکەن، بەوە سوپای طولەیحە شکا، ئینجا هۆزەکانی لای طولەیحە خۆیان دا بەدەستەوەو وتیان: دەگەڕێینەوە ناو ئیسلام و رازین بە هەموو حوکمێکی ئیسلام، خالیدیش نامەی نووسی بۆ ئەبووبەکر و هەواڵەکەی پێدا، ئەبووبەکریش وەڵامی دایەوەو فەرمانی پێکرد لەخواترسی لە کردارەکانیدا زیاتر بکات و فەرمانیشی پێکرد کامیان پێشتر کوشتاری موسڵمانانی کردووە تۆڵەی لێ بکاتەوەو هەرکەسیش سنووری خوای بەزاندووە بەو جۆرەی خالید خۆی بە بەرژەوەندی بزانێت بڕیار بدات بە کوشتن یان مانەوەیان، خالیدیش ماوەی مانگێک لەوێ مایەوەو کێشەکانی ئەوێی چارەسەر دەکرد چ لە گێڕانەوەی مافی ستەم لێکراوان و چ لە سزادانی تاوانباران، تەنانەت ئەوەی موسڵمانانی سووتاندبوو خالید سووتاندیەوە، ئەوەی لە شاخەوە موسڵمانانی دەخستە خوارەوە خالید وای پێکردەوە.[2]

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣١٧.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣١٨ - ٣١٩.

**لەناوبردنی مالیکی کوڕی نومیره**

پاش ئەوە خالید چوو بەرەو لای مالیکی کوڕی نوەیرە، چونکە مالیکی کوڕی نوەیرە پاش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئیسلام هەڵگەڕابوویەوە، ئەوەبوو کاتێک خالید چوو بۆ ئەوێ قسەی لەگەڵدا کرد.

ئیتر لێرەوە راجیاییەکان پەیدا دەبن سەبارەت بە هەڵوێستی مالیک:

مالیک بە خالیدی وت سەبارەت بە نوێژ ئامادەم نوێژ بکەم، بەڵام سەبارەت بە زەکات ئامادە نیم زەکات بدەم.[1]

ئەمە هەڵوێستی پێشووتریشی بوو، ئەوەبوو کاتێک هۆزەکەی زەکاتیان کۆکردەوە تا بینێرن، مالیکی کوڕی نوەیرە رێی نەدا و هەر لەناو خۆیاندا دابەشی کرد.[2]

مالیکی کوڕی نوەیرە پەیوەندی بە سەجاحی ژنە شاعیرەوە هەبوو کە بانگەوازی پێغەمبەرایەتی کردبوو و بڕیاری دابوو بە شوێنکەوتەکانیەوە هێرش بباتە سەر مەدینە، مالیکیش چوو بەدەم بانگەوازەکەی سەجاحەوە، بەڵام کاتێک سەجاح پەیوەندی کرد بە موسەیلەمەی درۆزنەوە ئیتر مالیک پەشیمان بوویەوەو چوو بۆ ناوچەیەک کە پێی دەوترا بطاح، خالیدیش بڕیاری دا بچێت بۆ ئەوێ، بەڵام سوپای پشتیوانان کە لەگەڵ خالید بوون وتیان: ئێمە نایەین و تەنها ئەوە دەکەین کە ئەبووبەکر فەرمانی پێداوین، خالیدیش لە وەڵامدا وتی: ئەم کارە هەر دەبێت بکرێت و دەرفەتێکە دەبێت بە هەند وەربگیرێت، ئێستاش هیچ نامەیەکم لەو بارەوە بۆ نەهاتووە، من ئەمیرم و فەرمانەکانم بەدەستە، بەڵام ناچاریشتان ناکەم بێن لەگەڵم، وا من دەچم بەرەو بطاح، ماوەی دوو رۆژ رێی بڕی، ئینجا پشتیوانان رایان لەسەر ئەوە کۆک بوو کە دەبێت لەگەڵ خالید بچین چونکە ئەو ئەمیرە، خێرا نێردراویان نارد تا بە خالید بڵێت چاوەڕێیان بکات تا خۆیان دەگەیەننەوە

[1] تاریخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٣٣.
[2] شرح النووي على صحيح مسلم، ج١، ص ٢٠٣.

پێی، ئەوەبوو خۆیان گەیاندەوە بە خالید.[1]

خالید کە گەیشتە ئەوێ برێ کەسی نارد تا خەڵکەکە کۆبکەنەوە، خەڵکەکەش کۆبوونەوەو گوێڕایەڵی خۆیان بۆ نواند و ئامادە بوون زەکاتیش بدەن، تەنها مالیکی کوڕی نوەیرە نەبێت کە کەناری گرتبوو و خۆی یەکلا نەکردبوویەوەو نەیدەزانی چی بکات، ئەوەبوو خۆی و هاوەڵەکانی بە دیل گیران، ئەبووقەتادەی ئەنصاری دەڵێت: من شایەتیم دەدا کە نوێژیان دەکرد، کەسانێکی تر هەبوون شایەتییان دەدا کە نە بانگیان دەدا و نە نوێژیان دەکرد، شەوێک لە شەوەکان کە سەرمایەکی زۆر بوو هاوارکەرەکەی خالید هاواری کرد دیلەکانتان گەرم بکەنەوە، کەچی پاسەوانەکان وایانزانی مەبەستی ئەوەیە دیلەکان بکوژن، بۆیە کەوتنە کوشتنی دیلەکان، ضیراری کوڕی ئەوزیش مالیکی کوڕی نوەیرەی کوشت، هاوارکەرەکە کە هاواری کوشتنەکانی بیست خێرا هاتەدەرەوە، کەچی بینی تازە کار لەکار ترازاوە.[2]

رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو هۆکاری کوژرانەکەی مالیک ئەوەبوو کە خالید مالیکی بانگ کرد و پێی وت تۆ پێشتر شوێن سەجاح کەوتیت و ئامادە نەبوویت زەکات بدەیت، ئینجا خالید وتی: مەگەر نازانیت نوێژ و زەکات پێکەوە باس کراون؟ مالیکیش وتی: هاوەڵەکەی تۆ وای وتووە، خالید وتی: مەگەر ئەوە بەس هاوەڵی ئێمەیە و هی تۆ نیە؟ ئەی ضیرار بدە لە گەردنی، ئەویش دای لە گەردنی.

گێڕانەوەیەکی تر وا هاتووە کە خالید ئەبو قەتادەو دەستەیەکی تری نارد، کە گەیشتنە لای مالیک وتی: ئێوە کێن وتیان: موسڵمانانین، مالیکیش وتی: منیش بەندەی موسڵمانی خوام، ئەبوو قەتادە وتی: دەی چەکەکانتان دابنێن، ئەوانیش چەکەکانیان دانان و بەسترانەوەو بران بۆ لای خالید، لەوێ ئەبوو قەتادە وتی: ئەمانە موسڵمانن و پەنا دراون، بەڵام ئەندامانی تری دەستەکە

---

[1] البداية و النهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٢٠ – ٣٢٢.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٢٢.

وتیان: بەڵکو هیچ پەنایەکمان نەداون و بە زۆرەملێ هێنراون، بۆیە خالید فەرمانی کرد بە کوشتنیان.[1]

قەتادە بە کوشتارەکەی خالید نارازی بوو و لەو بارەوە مشتومڕی لەگەڵ کرد و گەڕایەوە بۆ لای ئەبووبەکر و سکاڵای لە خالید کرد، هەروەها ئەوانەی بۆ عومەریش باس کرد،[2] عومەریش چوو ئەبووبەکری دواند و وتی: خالید لابەرە چونکە شمشێرەکەی خوێن ڕێژی زیادە دەکات، ئەبووبەکر وتی: شمشێرێ کە خوا هەڵیکردووە بە ڕووی بێباوەڕاندا نایخەمەوە کالان، ئینجا براکەی مالیکیش هاتە لای ئەبووبەکر و سکاڵای خالیدی کرد، عومەریش پاڵپشتی دەکرد، ئەبووبەکریش خوێن باییەکەی مالیکی دا بە براکەی.[3]

کاتێک عومەر لای ئەبووبەکر دژی خالید قسەی کرد ئەبووبەکر وا وەڵامی دایەوە: لەسەرخۆ بە ئەی عومەر، خالید ئیجتیهادێکی کردووەو هەڵەی تێدا کردووە، دەی زمانت بگرەوە لە خالید، چونکە من شمشێرێک داناگرم کە خوا بە ڕووی بێباوەڕاندا هەڵیکردووە.[4]

سەبارەت بە کوژرانی مالیک ئەم چەند خاڵە دەخەینەڕوو:

یەکەم: ڕاجیایی هەیە ئایا مالیک بە بێباوەڕی کوژراوە یان بە موسڵمانی، بەڵام ئەگەر تەماشا بکەین لە هەموو گێڕانەوەکاندا ئەوە چەسپاوە کە مالیک ئامادەیی ئەوەی نەبووە زەکات بدات، جا ئەگەر گێڕانەوەی یەکەم بێت کە شەو لەگەڵ دیلەکانی تر کوژرابێت ئەوە بە هەمان چەشنی هەڵەکەی پێشووتری (صبأنا، صبأنا) بووەو وەک لە گێڕانەوەکەدا هاتووە خالید مەبەستی نەبووە بیکوژێت، ئەگەریش بە گێڕانەوەی دووەم بێت کە تیایدا مالیک لەبەردەم خالیددا حاشای کردووە لە واجب بوونی زەکات، ئەوە دەزانین ئەبووبەکر لەبەر نەدانی زەکات فەتوای جیهاد و کوشتنی

[1] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٣٧.

[2] الكامل في التاريخ، ج٢، ص ٢١٧.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٢٢.

[4] ابن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٢١٣.

ئەوانــەی دا کــە ئامــادەی زەکات دان نیــن.

دووەم: لەوانەیە رارایی زۆری مالیک وایکردبێت بارەکە ئاڵۆز بکات، سـەرەتا چوونـی بـۆ لای سـەجاح، دواتـر دەسـتبەرداربوونی لـە سـەجاح و گەڕانـەوە بـەرەو ئیسـلام، دواتـر بەرگرتـن لـە هۆزەکـەی تـا زەکات نـەدەن، هەروەهـا دواتـر هەڵوێستێکی وای بووە کە موسڵمانانی دوو لـەت کردووە، دەستەیەک بە موسڵمانیان داناوە وەک ئەبووقەتادە، دەستەیەکیش بە شیاوی کوشتنیان دانـاوە وەک خالید، لەسـەر ئـەو دوو بڕیـارە جیاوازەش حوکمـی دوو گـەورە هاوەڵـی پێغەمبـەر(ﷺ) لەسـەری جیـاواز دەبێت، عومـەر خالیـد بـە هەڵـەو تاوانبـار دەزانێت لـەو کوشـتنەدا و پێـی وایـە ئیتـر دەبێت خالید پۆسـتەکەی لـێ بسـەنرێتەوە، ئەبووبەکریش لەوپەڕی قەناعەتیدا بە ئیجتیهادێکی هەڵـەی خالیـدی دەزانێـت و ئامـادە نیـە خالید لابەرێـت و خوێـن بابیەکـەی مالیـک دەدات، ئـەم هەڵوێسـتەی ئەبووبەکریش راسـتتر بـوو، چونکـە پێغەمبـەر(ﷺ) پێشـتر لـە بارێکـی لـەو چەشـنەدا هەمـان هەڵوێسـتی ئەبووبەکـری هەبـوو، ئەبووبەکریـش پێشـەنگی کـرد بـە پێغەمبـەری خـواوە(ﷺ)، ئەوەبـوو کاتێـک خالید لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا(ﷺ) بـە ئیجتیهادێکی هەڵـە خەڵکانێکی کوشـت، پێغەمبـەر(ﷺ) خالیـدی لـە بەرپرسـیارێتیەکان لانەبـرد، هـاوکات خوێـن بابـی کوژراوەکانــی دا.

سێیەم: سـەبارەت بـە هەڵوێسـتی ئەبـوو قەتـادەی ئەنصـاری پێدەچێـت راراییەکـەی مالیک وای لە هەڵوێستی کردبێت، چونکە مالیکی کوڕی نوەیرە دوای دەسـتبەرداربوونی لـە سـەجاح رارا کەوتبـوو، لەلایەکـەوە دەیویسـت بەرنگاری سـوپای موسـڵمانان نەبێتـەوە، لەلایەکیشـەوە ئامـادە نەبـوو زەکات بـدات، پێدەچێت لـە دواندنـی ئەبووقەتـادەدا جۆرێـک لـە بڕوابوونـی بـە زەکات دەربڕیبێـت و لای خالیدیـش هەڵوێسـتی بڕوانەبوونـی هەبووبێـت.

بەهەرحاڵ هەڵوێستەکەی خالید خۆی لە دوو ئەگەردا دەبینێتەوە:

یان بە ئیجتیهادێکی هەڵە مالیکی کوڕی نوەیرەی کوشتووە.

یان بە حەق پەیڕەوی بڕیاری خەلیفەی کردووە بۆ کوشتنی ئەوانەی حاشا لە زەکات دەکەن.

بەڵام بە هەڵوێستی ئەبووقەتادەو عومەر و ئەبووبەکردا دەردەکەوێت ئەگەری زیاتر ئەوە بووە کە خالیدی کوڕی وەلید بە ئیجتیهادێکی هەڵە مالیکی کوڕی نوەیرەی کوشتووە، حوکمی ئەبووبەکر و عومەریش لە بارەی خالیدەوە جیاواز بوو و حوکمەکەی ئەبووبەکریش دروستتر بوو چونکە پێشەنگی کردن بوو بە هەڵوێستێکی پێغەمبەر(ﷺ) لە هەمان چەشنی ڕووداودا.

هەروەها بەڵگەیەکی تر ئەوەیە کەکاتێک عومەر لای ئەبووبەکر دژی خالید قسەی کرد ئەبووبەکر وا وەڵامی دایەوە: لەسەرخۆ بە ئەی عومەر، خالید ئیجتیهادێکی کردووەو هەڵەی تێدا کردووە، دەی زمانت بگرەوە لە خالید، چونکە من شمشێرێک داناگرم کە خوا بە ڕووی بێباوەڕاندا هەڵیکردووە.[1]

**هاوسەرگیری خالید و ژنەکەی مالیکی کوڕی نومیرە**

ئەم بابەتە لە مێژوودا بووەتە تانەیەک بۆ خالیدی کوڕی وەلید، کاتێک خالید مالیکی کوڕی نوەیرەی کوشت دواتر لەگەڵ ژنەکەیدا هاوسەرگیری کرد، جا دەستەیەک بە چەند بەڵگەیەک ئەوە بە ڕەوا دەزانن، دەستەیەکیش بە نارەوای دەزانن و دەڵێن خالید لەبەر ژنەکەی مالیکی کوشتووە.[2]

بەپێی گێڕانەوەیەک هاتووە خالید پاش کوشتنی مالیک وەستا تا ژنەکەی ماوەی پاکبوونەوەی تەواو بوو، بەڵام ئەبووبەکر سەبارەت بە هاوسەرگیریەکەی لێی تووڕە بوو.[3]

کاتێک مەسەلەکە لای ئەبووبەکر و عومەر قسەی زۆری لێکرا، ئەبووبەکر

---

[1] الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٢١٧.

[2] البدء و التاريخ، ج٥، ص ١٥٩.

[3] تأريخ الطبري، ج٢، ص ٢٧٣.

فەرمانی کرد خالید بێتەوە مەدینە، کە خالید هاتەوە عومەر پێی وت بە ناحەق موسڵمانێکت کوشتووەو ژنەکەیشت بردووە، دەبێت سزا بدرێیت، کاتێک خالید چوو بۆ لای ئەبووبەکر و دواندی، خالید بەڵگەی هێنایەوە بۆ کارەکەی و توانی قەناعەت بکات بە ئەبووبەکر، ئەبووبەکر بەڵگەکانی خالیدی پەسەند کرد و خوێن بایی مالیکی دا و وازی هێنا لە خالید و لە پۆستەکەیدا هێشتیەوە.[1]

بەهەرحاڵ بەپێی دەقە مێژووییەکان مەسەلەی کوشتنی مالیک هیچ پەیوەندیەکی نەبووە بە ژنەکەیەوە، بەڵکو هاوسەرگیری دوای ئەوە قسەی لەسەرە کە ئایا رەوا بووە یان نا، ئەمەش نارەزایی عومەر و ئەبووبەکریشی لەسەر بووە.

**جەنگی یەمامە**

ئینجا خالیدی کوڕی وەلید دوای ئەوەی لەلایەن خەلیفەوە پۆزشی قبووڵ کرا، بە فەرمانی خەلیفە ئەبووبەکری صدیق چوو تا فیتنەی موسەیلەمەی درۆزن لەناوبەرێت[2] کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد و خەڵکێکی زۆری لەخشتە بردبوو.

خەلیفە سوپایەکی زۆری لە پشتیوانان و کۆچەران و کەسانی هۆزەکان نارد بۆ لای خالید تا بچنە ناو سوپاکەی، کاتێک ئەوانە گەیشتنە لای خالید ئیتر بەرەو یەمامە چوو.[3]

جەنگ لەنێوان هەردوولادا روویدا و سەرەتا سوپای موسەیلەمە بەهێز بوون و گەیشتنە لای چادرەکەی خالید و ویستیان ژنەکەی بکوژن، بەڵام مەجاعە کە لەوێ بوو نەیهێشت.[4]

لە جەنگی دژ بە موسەیلەمەدا خالید سوپایەکی پێ بوو کە نزیکەی سیانزە

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٢٣.
[2] الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٢١٩.
[3] الكامل في التاريخ، ج٢، ص ٢١٩.
[4] الكامل في التاريخ، ج٢، ص ٢٢١.

هەزارێک دەبوو، بەڵام لە کاتی جەنگەکەدا زۆرێک لە عەرەبە خێڵەکیە تازە موسڵمان بووەکان رایانکرد، بۆیە کۆچەران و پشتیوانان لەو ترسنۆکیەی ئەوانە بێزار بوون و وتیان: ئەی خالیدی کوڕی وەلید تکایە ئەوانەمان لەکۆڵ بکەرەوە، خالیدیش سوپای کۆچەران و پشتیوانانی جیاکردەوە کە نزیکەی دووهەزار و پێنج سەد کەسێک دەبوون، ئیتر کۆچەران و پشتیوانان پێکەوەو جیا لە عەرەبەکانی تر هەڵیانکوتایە سەر دوژمن، هاواریان دەکرد ئەی هاوەڵانی سوورەتی بەقەرە وا ئەمڕۆ جادووەکە پووچەڵ کرایەوە، ئەوەبوو سەرکەوتن بەسەر دوژمندا و لە ناوچەیەکدا پەنگیان پێ خواردن، ئەو باخچەو شوێنە ناوی نرا باخچەی مەرگ، لەوێ سوپای موسەیلەمە گردبوونەوە،[1] بەرائی کوڕی مالیک وتی: ئەی موسڵمانان من بەرزبکەنەوە تا بچم بۆیان، ئەوەبوو بەرزیان کردەوەو بەسەر دیوارەکەدا سەرکەوت و کەوتە جەنگ دژ بە دوژمنان تا دەرگاکەی کردەوەو ڕێی کردەوە موسڵمانان توانیان بچنە ناوەوە و سەربکەون و دواجاریش موسەیلەمە کوژرا.[2]

خالیدی کوڕی وەلید لە جەنگی یەمامەدا بە بەرائی کوڕی مالیکی وت هەستە، ئەویش هەستاو بە سوارەکەیەوە راپەڕی و وتی: ئەی خەڵکی مەدینە ئەمڕۆ بەس خوای گەورە وبەهەشتتان بۆ هەیە و بەتەما مەبن بگەڕێنەوە بۆ شارەکەتان، هەڵمەتی برد و خەڵکیش کەوتنە شوێنی و دایان بەسەر خەڵکی یەمامەدا و سەرکەوتن.[3]

بەمجۆرە خالید و هێزی موسڵمانان لە کۆچەران و پشتیوانان و دەستەیەکی راستی سەربازانی تر توانییان فیتنەی موسەیلەمەی درۆزن لەناوبەرن.

---

[1] البداية والنهاية، ج٦، ص ٢٦٧-٢٦٨.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة ، ج١، ص٢٨١-٢٨٢.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨١.

**خالید لە فتووحاتی عێراقدا**

پاش ئەوەی خالیدی کوڕی وەلید لە جەنگی یەمامە لێبوویەوە، ئەبووبەکر فەرمانی بۆ نارد تا بەرەو عێراق بچێت و خەڵکی بانگ بکات بۆ ئیسلام، ئەگەر رازی بوون باشە، ئەگەرنا سەرانەیان لێ وەربگرێت، ئەگەر بەوەش رازی نەبوون ئەوە لەگەڵیان بجەنگێت، فەرمانیشی پێکرد کەس بە زۆر نەبات بۆ ئەو جەنگە و پشتیش نەبەستێت بە هەڵگەراوەکان با موسڵمانیش بووبنەوە، ئینجا لەولاشەوە خەلیفە کەوتە پێکهێنانی سوپا بۆ یارمەتیدانی خالید.[1]

خالید لە چوونی بۆ عێراق سوپاکەی کرد بە سێ بەشەوە تا بە سێ رێگەی جیاوازدا بچن، موثەننا پێش خۆی چووبوو، عەددی کوڕی حاتەم و عاصمی کوڕی عەمریش لەلایەکی ترەوە، خالیدیش خۆی لە کۆتای سوپاکەوە کەوتەڕێ و وادەیەکی دانا تا لە یەک شوێندا کۆببنەوە.[2]

لە ساڵی دوانزەی کۆچیدا خالید کەوتەڕێ و دای بەلای چەند گوندێکدا و سەرەتا جەنگ لەنێوانیاندا روویدا، بەڵام دواتر رێککەوتن سەرانە بدەن و خالیدیش نامەیەکی پەنادانی نووسی بۆیان، ئینجا لەوێوە خالید چوویە ناوچەی حیرەو بەرپرسی ئەوێ و خەڵکەکەی بانگهێشت کرد بۆ ئیسلام و سێ پێشنیازی موسڵمان بوون یان سەرانە یان جەنگی خستەڕوو بۆیان، قوبەیصەی بەرپرسی ئەوێ سەرانەی هەڵبژارد، دواتر خالید نامەی نووسی بۆ کاربەدەستانی کیسرای فارس لە مەدائین، تیایدا پێی راگەیاندن هەرکەس موسڵمان بێت ئەرک و مافی ئێمەی هەیە، ئەگەرنا بەرەورووی جەنگ دەبنەوە.[3]

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٤٢.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٤٤.

[3] البداية و النهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٤٣.

**خالید لە فتووحاتی شامدا**

خالید بەردەوام لە عێراقدا پێشڕەوی دەکرد و سەرقاڵی فتووحات بوو،[1] تا ئەوەی باری موسڵمانان لە بەرەی شامەوە سەخت بوو و داوای یارمەتییان لە خەلیفە کرد، بۆیە خەلیفە نامەی نارد بۆ خالید و فەرمانی پێکرد بۆ یارمەتیدانی موجاهیدان بچێت بۆ شام، خالیدیش موثەننای لە شوێن خۆی دانا تا بەرپرسیاریتی عێراق وەربگرێت و خۆی بە نۆ هەزار و پێنج سەد سەربازەوە بەرەو شام بەڕێکەوت، ڕێنیشاندەرەکەشی ڕافیعی کوڕی عومەیرە بوو، ڕێیەکی زۆر سەخت و وشکەڵانی پێ گرتەبەر کە کەسی پیایدا تێنەدەپەڕی، ئەمەش بۆ ئەوەی ڕێگەکە زۆر کورت بێتەوەو زوو بگەنە ئەوێ، هێندە نارەحەت بوون کە وشترەکانیان سەردەبڕین تا ئاوی هەڵگیراوی بۆ خواردنەوەو گۆشتەکەی بۆ خواردن بەکاربێنن، بەڵام توانییان بە پێنج ڕۆژ بگەنە ئەوێ، بە ڕێککەوتن ناوچەی تەدموری گرت و بە فتوحات ناوچەی غەسسانی گرت و پێنج یەکی دەستکەوتەکانی ناردەوە بۆ مەدینە، دواتر خالید و ئەبووعوبەیدەو چەند کەسێکی تریش چوون بۆ لای عەمری کوڕی عاص و لەگەڵ ڕۆمەکاندا جەنگی ئەجنادەینیان ئەنجامدا، ئەمەش لە بیست و هەشتی جومادیلئوولای سیانزەی کۆچیدا بوو و ژمارەیەکی زۆری هاوەڵان شەهید بوون و دواجاریش ڕۆمەکان شکان، ئینجا جەنگی یەرمووک ڕوویدا و تیایدا موسڵمانان سەرکەوتن، خالید لە بەرەی شامدا بەردەوام لە جیهادی ڕێی خوادا بوو تا کاتێ ئەبووبەکری صدیق وەفاتی کرد، خالید ئەو هەواڵەی لە موسڵمانان شاردەوە چونکە لە کاتی جەنگدا بوون بەرامبەر بە ڕۆمەکان، دواتر خالید بەرەو دیمەشق و دوای ئەوەش بەرەو حیمص چوو.[2]

---

[1] لێرەدا کورتبڕیەکمان گرتووەتەبەر لەبەرئەوەی ئەگەر وردەکاری فتووحاتەکانی شوێن بە شوێنی ناو عێراق و شامیش باس بکەین زۆر زۆر دەخایەنێت، بۆیە ئەوەی زانیاری وردی لەو بارەوە بوێت دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکان یان ئەو وەرگێڕانە کوردیانەی کە هەن.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٦-٢٠.

**خالید له سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا**

کاتێک عومـەری کوڕی خەططـاب بـوو بـە خەلیفە، خالیـدی کوڕی وەلیدی لـە پۆستەکەی لابرد و بـە نامەیـەک ئـەوەی نـارد بـۆ ئەبـوو عوبەیـدە، خالیدیـش لـە وەڵامـدا وتـی: گوێڕایەڵـی فەرمانـی ئەمیـری باوەڕدارانـم،[1] پـاش ئـەوەش لـە ژێر فەرمانـی ئەبـوو عوبەیـدەدا مایـەوەو بـەردەوام جیهـادی دەکـرد، وەک لـە فەتحـی دیمەشـقدا بەشـداری کـرد و ئەبووعوبەیـدەش بەرپـرس بـوو.[2]

کاتێک ئەبووعوبەیـدە ئـەو نامـەی پێگەیشـت کـە خالیـد لـە پۆسـتەکەی کەنـار بخرێـت خـۆی ئامـادە نەبـوو بیڵێـت بـە خالیـد، بۆیـە کەسـێکی تـر ئـەوەی گەیانـد بـە خالیـد، خالیـد چـوو بـۆ لای ئەبـوو عوبەیـدەو وتـی: ڕەحمەتـی خـوات لـێ بێـت بۆچـی خـۆت پێـت نەوتـم؟ ئەویـش وتـی: حـەزم نەکـرد هەواڵـی ناخۆشـت پێبـدەم.[3]

کاتێک ئەبووعوبەیـدە ئەمیـر بـوو لـە پیاوێـک تـووڕە بـوو و ئازارێکـی دا، خالیدیـش وتـی: وا مەکـە، پێـی وتـرا کـە ئەمیـرت تـووڕە کـردووە، بۆیـە چـوو بـۆ لای ئەبووعوبەیـدەو وتـی: مـن مەبەسـتم ئـەوە نەبـووە تـۆ تـووڕە بکـەم، بـەڵام بیسـتوومە لـە پێغەمبـەر(ﷺ) دەیفەرمـوو:(إن أشد الناس عذابا يوم القيامة أشد الناس عذابا للناس في الدنيا)،[4] (سـەختترین سـزای ڕۆژی دوایـی بـۆ ئـەو کەسـانەیە کـە لـە دنیـادا سـەختترین سـزای خەڵکیـان داوە).

**لابردنی خالیدی کوڕی وەلید**

لێرەدا تەمومژیـەک دروسـت کـراوە سـەبارەت بـە هـۆکاری لابردنـی خالیـدی کـوڕی وەلیـد لەلایـەن عومـەری کـوڕی خەتتابـەوە، جـا هەیانـە هۆکارەکـەی بـە کینەیەکـی سـەردەمی جاهیلـی دادەنێـن، هەیانـە هۆکارەکـەی دەبەسـتنەوە

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٩.
[2] تاريخ دمشق، ج٢٥، ص ٤٧٥.
[3] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٨٠.
[4] مسند أحمد بن حنبل - مسند الشاميين(ﷺ) - حديث خالد بن الوليد(ﷺ) ، الرقم ١٧٠٢٥، قال شعيب الأرناؤوط إسناده ضعيف.

بە کوشتنی مالیکی کوڕی نوەیرەوە، هەشیانە دەیبەستێتەوە بە گوێڕایەڵ نەبوونی خالید بۆ عومەر، وا لە خوارەوە گێڕانەوەکان دەخەینەڕوو:

کاتێک عومەر و خالید مێرمنداڵ بون زۆرانێکیان گرت، خالید قاچێکی عومەری شکاند، ئەو داخە لە دەروونی عومەردا مایەوە تا کە بوو بە خەلیفە تۆڵەی کردەوە.[1]

لە سەردەمی ئەبووبەکردا عومەر بە ئەبووبەکری وت نامەیەک بنێرە بۆ خالید و فەرمانی پێ بکە هیچ جووڵەیەک نەکات بە فەرمانی تۆ نەبێت، خالیدیش وەڵامی دایەوە یان لە هەڵسوکەوتمدا دەستم واڵا بکە یان لامبەرە، عومەریش وتی: دەی لایبەرە، ئەبووبەکر وتی: جا کێ جێی خالیدم بۆ دەگرێتەوە، لە سەردەمی عومەریشدا خەلیفە هەمان نامەی بۆ نووسی و خالیدیش هەمان وەڵامی بۆ عومەر نووسی کە بۆ ئەبووبەکری نووسیبوو، عومەریش لایبرد، پاش ماوەیەک داوای لە خالید کردەوە تا پۆست وەربگرێتەوە، بەڵام خالید ئامادەیی نەبوو مەگەر بەو مەرجەی دەستی واڵا بکات، عومەریش بەوە رازی نەدەبوو.[2]

بۆیە دەتوانین بڵێین تاکە هۆکاری لابردنی خالید لەلایەن عومەری کوڕی خەططابەوە بریتی بوو لەو جموجووڵە سەربەخۆییەی خالید لە کاتی جەنگ و فتووحاتیدا، عومەریش لای سەخت بوو لە پاڵ هەزار راستیدا ناحەقیەک هەبێت، بۆیە خالیدی لابرد، بەڵام ئەگەر تەماشا بکەین هۆکارێکی سەرکەوتنە گەورەکانی خالید ئەو جۆرە سەربەخۆیی و دەست واڵاییەی بوو کە هەیبوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەبووبەکری صدیقیش ئەو دەرفەتەیان بۆ هێشتەوەو لەگەڵ ئەوەشدا جۆرێک لە لێپێچینەوەو لێ توندکردنەوەیان بۆ بەکاردەهێنا، بەڵام لە پۆستەکەی لایان نەدەبرد، چونکە ئەوە شمشێری هەڵکراوی خوا بوو بە رووی

[1] السيرة الحلبية، دار المعرفة(بيروت – ١٤٠٠هـ)، ج٢، ص ٢١٣.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٥.

بێباوەڕاندا، دەبینین خالید بەو دەستوالآییەی بڕیاردانەی لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) چەند هەڵەیەکی کرد، بەلآم پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەناری نەخست، لە سەردەمی ئەبووبەکریشدا دووبارە لە کوشتنی مالیکی کوڕی نوەیرەدا ئیجتیهادی هەڵەی کرد، بەلآم ئەبووبەکر لای نەبرد، عومەریش کە بوو بە خەلیفە ئیجتیهادێکی کرد بە لابردنی خالید، ئایا پێکای یان نا، خوا زاناترە.

**مردنی خالیدی کوڕی وەلید**

خالید ماوەیەک پێش مردنی جارێک چوویەوە بۆ مەککەو عومرەیەکی کرد و گەڕایەوە بۆ حیمص،[1] لەوێ مایەوە تا کۆچی دوایی کرد.

خالیدی کوڕی وەلید لە ساڵی بیست و یەکی کۆچیدا وەفاتی کرد،[2] ئەو کات تەمەنی شەست ساڵان بوو.[3]

کاتێک خالید لە سەرەمەرگدا بوو دەیوت بەشداری ئەو هەموو جەنگەم کرد کەچی قەدەرم وابوو لەسەر جێگەکەم بمرم، دواتر وتی: ئەگەر مردم چەک و ئەسپەکەم دابنێن بۆ ڕێی خوا.[4]

خالید کە لە سەرمەرگیدا بوو تەنها شتێک لە ژیاندا هەیبوو بریتی بوو لە ئەسپەکەی و چەکەکەی و کۆیلەیەکی، کە ئەم هەواڵە دواتر گەیشت بە عومەری کوڕی خەططاب، وتی: ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئاوا نەبوو کە ئێمە گومانمان پێ دەبرد-واتە سامانی بۆ خۆی دانەنابوو-.[5]

خالید دەگریاو دەیوت لە ئەوەندە جەنگدا بەشداریم کرد، جەستەم بستێکی بێ برینی پێوە نەماوە، یان شمشێری بەرکەوتووە یان ڕم یان تیر، کەچی وا لەسەر جێگەکەم دەمرد.[6]

[1] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٨٣.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٣٩٧.
[3] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٦٧.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٥.
[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٣٩٧.
[6] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٨٢.

خالید پێش مردنی بەو بارە نەخۆشیەی سەرەمەرگیەوە قسەی دەکرد بۆ ئەوانەی کە لەلای بوون و دەیوت: لەم سەرزەویەدا هیچ شتێک نیە هێندەی ئەوە لام خۆشەویست بێت کە لە شەوێکی سارددا لە ناو دەستەیەکی سوپایی کۆچەراندا بم کە بەرامبەر دوژمن لە چاوەڕوانی جەنگدان، دەی گرنگی بدەن بە جیهاد.[1]

کاتێک خالید لە سەرەمەرگدا بوو وەسیەتێکی کرد بۆ عومەر، عومەریش وەسیەتەکەی جێبەجێ کرد-ئەمەش بەڵگەیەکە کە خالید لە مەدینە مردووە- و باسی خالیدی دەکرد و دەیوت رەحمەتی خوا لە خالید، کەسێک ئاماژەی بە عومەر دا بۆچی کاتێک مابوو لاتبرد؟ عومەر وتی: من تەنها لەبەرئەوە لامبرد چونکە دەستوالآیانە هەنگاوی دەنا و دەستوالآیانەش سامانی دەبەخشیەوە.[2]

خالید پێش مردنی دەیوت سەرقاڵ بوونم بە جیهاد بووە هۆکاری دواکەوتنم لە فێربوونی زۆربەی قورئان.[3]

گێڕانەوەیەک هاتووە دەڵێت: عومەر چوو بۆ ئەسپەردەکردنی تەرمی خالید، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی خالید لە مەدینە مردووە، بەڵام رای زۆرینە لەسەر ئەوەیە خالید لە حیمص مردووە،[4] ذەهەبی دەڵێت: رای راستتر ئەوەیە خالید لە حیمص مردووە.[5]

کاروانێکی حاجیانی شام هاتنە مەدینە و هەواڵیان دا بە عومەر کە کاتێک ئەوان هاتون خالید مردووە، عومەر دڵگرانیەک دایگرت و زوو زوو رەحمەتی بۆ دەنارد.[6]

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٤.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٥.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٥.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٥.
[5] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٨٤.
[6] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٨٣.

## ١١١٨. خالیدی کوڕی وەلیدی ئەنصاری(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی وەلیدە، لە پشتیوانانە، لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا یەکێک بوو لە بەشداربوانی جەنگی صفین.[١]

## ١١١٩. خالیدی کوڕی ئەبی خالید(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی ئەبی خالیدە، لە پشتیوانانە، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا لە ناو سوپای عەلیدا لە جەنگی صفیندا بەشداری کرد.[٢]

## ١١٢٠. خالیدی کوڕی ئەبی دوجانە(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی ئەبی دوجانەیە، لە پشتیوانانە، لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا لە ناو سوپای عەلیدا لە جەنگی صفیندا بەشداری کرد.[٣]

## ١١٢١. خالیدی کوڕی ئیساف(رضي الله عنه)

ناوی خالیدی کوڕی ئیسافی جوهەنیە،[٤] برایەکی هەبوو بە ناوی کولەیب،[٥] برایەکی تریشی ناوی خوبەیب بوو[٦] کە هاوەڵێکی ناسراوی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، ئەم هاوەڵە یەکێک بووە لە بەشدار بوانی غەزای ئوحود، دواتریش بەشداری غەزاکانی کرد،[٧] لە فەتحی مەککەشدا بەشدار

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٦.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٢.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٢.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢٥.

[٥] أسد الغابة، ج٤، ص ٥٢٤.

[٦] أسد الغابة، ج٢، ص ١٠٩.

[٧] أسد الغابة، ج٢، ص ١١٠.

بووە، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاو لە فتووحاتدا بەشداری کرد، سەبارەت بە کاتی مردنەکەی رایەک دەڵێت: لە جەنگی قادسیەدا کوژراوە، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو لە جەنگی جسر ئەبی عوبەیددا کوژراوە.[١]

## ١١٢٢. خالیدی ئەحدەب(ﷺ)

ناوی خالیدە، ناوی لەناو هاوەڵاندا هاتووەو فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[٢]

## ١١٢٣. خەبباب(ﷺ)

ناوی خەببابەو مەولای عوتبەی کوڕی غەزوانە، کونیەکەی ئەبوو یەحیایە، یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیاو لە ساڵی نۆزدەی کۆچیدا لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا کۆچی دوایی کرد و عومەر نوێژی مردووی لەسەر کرد.[٣]

## ١١٢٤. خەببابی کوڕی ئەرەت(ﷺ)

ناوی خەببابی کوڕی ئەرەتی کوڕی جەندەلەی کوڕی سەعدی تەمیمی یان خوزاعیە، کونیەکەی ئەبوو عەبدولڵایە،[٤] هاوەڵێکی گەورە و ناسراوی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) کە لە پێناو ئیسلامدا نارەحەتی زۆری چەشتووە.

خەبباب هەر بە منداڵی بەدیل گیرا و برا بۆ مەککەو لەوێ فرۆشرا، ئافرەتێک بە ناوی ئوممونەمار ئەوی کڕی،[٥] دواتر ئوممونەمار خەببابی

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٢٥.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٧.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٠.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٨.
[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٦٤.

ئازاد کرد.[1]

خەبباب منداڵێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) لەدایک بوو، دواتر بە دەستی خەواریجەکان شەهید کرا.[2]

کوڕێکی تری هەبوو بە ناوی عەبدورەحمان،[3] کچێکیشی هەبوو بە ناوی زەینەب کە فەرموودەی گێڕاوەتەوە.[4]

ژنەکەی خەبباب ناوی ملیکە بوو کە ئەویش موسڵمان بوو.[5]

## موسڵمانبوونی

ئەم هاوەڵە لە کۆچەرانەو زۆر زوو موسڵمان بووە، بەڵکو شەشەم کەسە موسڵمان بوو.[6]

پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بچێتە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم خەبباب موسڵمان بووبوو.[7]

خەبباب یەکێک بوو لەو کەسانەی کە لە مەککەدا موسڵمان بوونی خۆی ئاشکرا کرد و لەسەر ئەوەش سزا درا، بەڵکو لە ریزبەندی ئاشکراکردنی ئایینەکەیاندا ئاوا هاتووە(ئەبووبەکر، خەبباب، بیلال، صوهەیب، عەممار).[8]

سەبارەت بە کاتی موسڵمانبوونەکەی دەوترێت بیستەم کەس بووە موسڵمان بووە،[9] رایەکیش دەڵێت: بەڵکو شەشەم کەس بووە موسڵمان بووە.[10]

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر خەببابی خۆشدەویست و سەردانی دەکرد، کە خەڵکی

---

[1] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٦، ص ١٥.
[2] البدایة والنهایة لابن کثیر، ج٧، ص ٣١١.
[3] الإصابة في تمییز الصحابة، ج٥، ص ٣٥.
[4] الإصابة في تمییز الصحابة، ج٧، ص ٦٧٢.
[5] الإصابة في تمییز الصحابة، ج٨، ص ١٢٣.
[6] معرفة الصحابة لابن مندة، ص ٤٨٥.
[7] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٣، ص ١٦٥.
[8] سیر أعلام النبلاء، ج٢، ص ٣٢٤.
[9] سیر أعلام النبلاء، ج٢، ص ٣٢٤.
[10] أسد الغابة، ج٢، ص ١٤١.

ئەوەیان بینی هەواڵیان دا بە ئوممولئەنمار، ئەو ئافرەتەش کە زانی خەبباب موسڵمان بووە کەوتە ئازاردانی.[1]

خەبباب کە موسڵمان بوو هەر لە مەککە خەریکی پەرستش و بانگەواز کردن بوو بۆ ئیسلام، دەچوو بۆ ماڵی فاطیمەی خوشکی عومەری کوڕی خەططاب کە لەگەڵ سەعیدی کوڕی زەیدی مێردی موسڵمان بووبوون، خەبباب لەوێ قورئانی فێری فاطیمەو مێردەکەی دەکرد، رۆژێک عومەری کوڕی خەططاب کە هێشتا موسڵمان نەبووبوو چوو بۆ ماڵی فاطیمەی خوشکی کاتێک بیستبووی خوشکەکەی موسڵمان بووە، کە نزیک بوویەوە گوێی لە قورئان خوێندنەکەی خەبباب بوو، کە چوویە ژوورەوە دای لە فاتیمەی خوشکی و خوێن لە دەموچاوی هات، عومەر کە ئەوەی بینی پەشیمان بوویەوە، پاشان داوای کرد ئەو قورئانەی دەیانخوێند بیدەنە دەستی، فاطیمە وتی: تا خۆت نەشۆیت نایدەمە دەستت، عومەر خۆی شۆرد و قورئانەکەی وەرگرت و خوێندیەوە، وتی: وتەکانی چەند جوانن، خەبباب کە ئەمەی بیست خێرا وتی: ئەی عومەر سوێند بەخوا هیوانم هەیە خوای گەورە نزای پێغەمبەری بۆ گیرا کردبێت، چونکە من دوێنێ شەو گوێم لێ بوو نزای دەکرد و فەرمووی: خوایە بە موسڵمانبوونی ئەبولحەکەمی کوڕی هیشام یان بە موسڵمان بوونی عومەری کوڕی خەططاب پاڵپشتی ئیسلام بکە(ئیسلام سەربخە)، دەی عومەر دەرفەتە لەدەستی مەدە، عومەریش وتی: ئەی خەبباب دەی بمبە بۆ لای موحەممەد تا موسڵمان بم، خەبباببیش پێی وت پێغەمبەر(ﷺ) لە کوێیە، عومەریش چوو و موسڵمان بوو.[2]

لە مەککەدا جارێک پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ برێک لە هاوەڵانی دانیشتبوو کە خەببابیشیان تێدا بوو، ئەو هاوەڵانەش لە کەسە لاواز و بێکەسەکان بوون، ئەقرەعی کوڕی حابیس لە گەڵ عویەینە تێپەڕ دەبوون، سەیریان

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ١٤١.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٧٩-٨٠.

کرد پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ عەممار و صوهەیب و بیلال و خەبباب و چەند موسڵمانێکی تری لاوازدا دانیشتووە، ئەوانیش گاڵتەیان پێکرد و دەیانوت کە وەفدی عەرەب دێن شەرم دەکەین بمانبینن لەگەڵ ئەوانەدا دانیشتبیت، ئەگەر هاتین بۆ لات تۆ ئەوانە دەرکە، پێغەمبەریش(ﷺ) رازی بوو، ئەوانیش وتیان: دەی بەڵێنێکمان بۆ بنووسە، ئەویش ویستی بینووسێت و عەلی کوڕی ئەبوو تالیبی بانگ کرد تا بینووسێت، ئەوەبوو جبریل هات و ئەم ئایەتەی خوای بۆ هێنا (ولا تطرد الذين يدعون ربهم بالغداة والعشي يريدون وجهه ما عليك من حسابهم من شئ وما من حسابك عليهم من شئ فتطردهم فتكون من الظالمين وكذلك فتنا بعضهم ببعض ليقولوا أهؤلاء من الله عليهم من بيننا أليس الله بأعلم بالشاكرين)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەرەقەکەی فڕێ داو ئەو هاوەڵانەی بانگ کردەوەو پێی فەرموون (سلام عليكم)، ئەوانیش لێی نزیک بوونەوە.[١]

**نارەحەتیەکانی خەبباب لە مەککە:**

پاش ئەوەی خەبباب موسڵمان بوونی خۆی ئاشکرا کرد ئازار و نارەحەتی زۆری دەچەشت، چ لە سووکایەتی پێکردن، چ لە سزای جەستەیی، چ لە سزای ئابووری و کۆمەڵایەتی.

خەبباب دەڵێت: من لە مەککە ئاسنگەریم دەکرد، کارێکم کرد بۆ عاصی کوڕی وائیل و شمشێرێکم بۆ دروست کرد، ئینجا چووم تا پارەی شمشێرەکە وەربگرم، کەچی وتی: تا بێباوەڕ نەبیت بەرامبەر بە موحەممەد پارەکەت نادەمێ، منیش وتم: بمریت و زیندووش بیتەوە شتی وا ناکەم، ئەویش وەک رابواردن وتی: یانی من دەمرم و زیندووش دەبمەوە، وتم: بەڵێ، وتی: دەی کاتێک زیندوو بوومەوە ئەوکات پارەم دەبێت و پارەی شمشێرەکەت دەدەم، منیش چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و رووداوەکەم بۆ باس کرد، ئەوەبوو ئەم ئایەتە دابەزی (أفرأيت الذي كفر بآياتنا وقال لأوتين مالا وولدا).[٢]

---

[١] البداية والنهاية، ج٦، ص٥٧، حلية الأولياء، ١، ص١٤٧.

[٢] صحيح البخاري – كتاب البيوع – باب ذكر القين والحداد، الرقم ٢٠٩١، صحيح مسلم – كتاب صفة

جارێک عومەری کوڕی خەططاب خەببابی دانیشاند و وتی: لەم کۆڕەدا تەنها یەک کەس هەیە لە تۆ زیاتر شیاوی ئەم شوێنە بێت، خەبباب وتی: کێیە ئەی ئەمیری باوەڕداران، خەلیفە وتی: بیلال، خەبباب وتی: ئەی ئەمیری باوەرداران بیلالیش لە من لەپێشتر نیە، بیلال لەناو بێباوەڕاندا کەسێکی هەبوو کە بەرگریەکی لێ بکات، بەڵام من کەسم نەبوو، رۆژێک منیان برد و ئاگرێکیان بۆ کردمەوەو لەناویدا تلیان دام، دواتر کەسێکیان قاچی خستە سەر سنگم، ئیتر ئەو زەویەی بەو ئاگرە گەرم بووبوو بە پشتی من سارد بوویەوە، ئینجا خەبباب پشتی خۆی هەڵکرد هەموو پێستی پشتی پەڵە بوو.[1]

جار هەبوو جلی ئاسنینیان دەکردە بەر خەبباب و بە گەرمای مەککەدا دەیانبرد و لەبەر خۆر دایاندەدا، ئیتر گەرمای خۆر و گەرمبوونی ئاسن یەکیان دەگرت بۆ برژاندنی جەستەی خەبباب.[2]

ئەو ژنەی کە خەببابی کڕیبوو ئاسنی گەرم دەکرد و سەری خەببابی پێ داخ دەکرد، خەبباب زۆری بۆ هات و لای پێغەمبەر(ﷺ) شەکوای حاڵی خۆی کرد، پێغەمبەریش(ﷺ) نزای بۆ کرد(خوایە خەبباب سەر بخە)، ئەوەبوو ئومموئەنمار تووشی ژانەسەرێک بوو دەتلایەوە، چارەسەرەکەی ئەوەبوو دەبوایە خەبباب ئاسنێک گەرم بکات و سەری ئوممو ئەنماری پێ داخ بکات.[3]

رۆژێک خەبباب و چەند موسڵمانێکی تر کە ئاوا ئازار دەدران تەواو بێزار بوون و بڕیاریان دا بچن تا لای پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵا بکەن، چوون دەبینن پێغەمبەر(ﷺ) لە پاڵ کەعبەدایە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆچی نزایەکمان بۆ ناکەیت تا خوا سەرمان بخات؟[4] پێغەمبەریش(ﷺ)

---

القيامة والجنة والنار - باب سؤال اليهود النبي(ﷺ) عن الروح، الرقم ٢٧٩٥.

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٦٥.

[2] أسد الغابة، ج٢، ص ١٤١.

[3] أسد الغابة، ج٢، ص ١٤١.

[4] صحيح البخاري - كتاب المناقب - باب علامات النبوة في الإسلام، الرقم ٣٦١٢.

ڕەنگی سوور هەڵگەڕاو[1] فەرمووی: (كَانَ الرَّجُلُ فِيمَنْ قَبْلَكُمْ يُحْفَرُ لَهُ فِي الْأَرْضِ فَيُجْعَلُ فِيهِ فَيُجَاءُ بِالْمِنْشَارِ فَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ فَيُشَقُّ بِاثْنَتَيْنِ وَمَا يَصُدُّهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ . وَيُمْشَطُ بِأَمْشَاطِ الْحَدِيدِ مَا دُونَ لَحْمِهِ مِنْ عَظْمٍ أَوْ عَصَبٍ وَمَا يَصُدُّهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ وَاللهِ لَيُتِمَّنَّ هَذَا الْأَمْرَ حَتَّى يَسِيرَ الرَّاكِبُ مِنْ صَنْعَاءَ إِلَى حَضرَمَوْتَ لَا يَخَافُ إِلَّا اللهَ أَوِ الذِّئْبَ عَلَى غَنَمِهِ وَلَكِنَّكُمْ تَسْتَعْجِلُونَ)،[2] (کەسانی پێش ئێوە وابوون، کەسی وایان دەبرا چاڵێکی بۆ هەڵدەکەنرا و دەخرایە ناویەوە، ئینجا مشاریان دەهێنا و لە سەریەوە بۆ خوارەوە دەیانکرد بە دوو لەتەوە، تووڵە ئاسن دەکرا بە نێوان گۆشت و ئێسقانیدا، کەچی ئەوە نەدەبوویە هۆی وازهێنانی لە ئایینەکەی، سوێند بەخوا ئەم کارە(ئیسلام) دەگاتە ئەنجام تا ئەوەی سوار لە صەنعاوە بۆ حەزرەمەوت دەڕوات لە خوا نەبێت لە کەس ناترسێت، تەنها ترسیشی ئەوە دەبێت گورگ نەچێت بۆ مەڕوماڵاتەکەی، بەڵام ئێوە پەلەتانە).

**کۆچکردنی خەبباب بۆ مەدینە:**

کاتێک خەبباب کۆچی کرد بۆ مەدینە پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان خەببابی کوڕی ئەرەت و جابری کوڕی عەتیکەوە.[3]

خەبباب دەڵێت: شەوێک بینیم پێغەمبەر(ﷺ) نوێژێکی کرد هەرگیز نەمدیبوو ئەو نوێژەی کردبێت، ئینجا نوێژی بەیانی بۆ کردین، کە سەلامی دایەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم، ئەمشەو نوێژێکت کرد کە پێشتر نەمدیبوو نوێژی وا بکەیت، ئەویش فەرمووی: (أجل إنها صلاة رغب ورهب سألت ربي فيها ثلاث خصال، فأعطاني اثنتين ومنعني واحدة، سألته أن لا يهلكنا بما أهلك به الأمم قبلها فأعطانيها، وسألته أن لا يظهر علينا عدوا من غيرنا فأعطانيها، وسألته أن لا يلبسنا شيعا فمنعنيها)،[4]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب مناقب الأنصار - باب ما لقي النبي(ﷺ) وأصحابه من المشركين بمكة، الرقم ٣٨٥٢.

[2] صحيح البخاري - كتاب المناقب - باب علامات النبوة في الإسلام، الرقم ٣٦١٢.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٦٦.

[4] سنن النسائي - كتاب قيام الليل وتطوع النهار - باب إحياء الليل ، الرقم ١٦٣٧، صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله عليهم أجمعين - باب فضل

(بەڵێ، ئەوە نوێژی ترس و هیوا بوو، تیایدا داوای سێ شتم کرد لە خوای گەورە و ئەویش دوانی پێ بەخشیم و یەکێکیانی پێنەبەخشیم، داوام لێکرد بە سەزای چەشنی گەلانی پێش خۆتان لەناوتان نەبات، ئەوەی پێ بەخشیم، داوام لێکرد دوژمنێک جیا لە خۆمان بەسەر زۆرینەتاندا زاڵ نەکات، ئەوەشی پێ بەخشیم، داواشم لێکرد پەرتبوونتان تووش نەبێت و نەکەونە وێزەی یەکتر، بەڵام ئەوەی پێ نەبەخشیم).

**بەشداری غەزاکان:**

خەبابی کوڕی ئەرەت یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەدر و ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی تر.[1]

زەینەبی کچی خەبباب دەڵێت: لە غەزایەکدا لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) باوکم چوو بۆ غەزا، ئێمەش بزنێکمان هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) دەهات بۆ لامان و بزنەکەی بۆ دەدۆشین و شیرەکەی قاپەکەی پڕ دەکرد، دواتر کە باوکم هاتەوە بزنەکەی دەدۆشی شیرەکەی وەک جاران بوو (واتە قاپەکەی پڕ نەدەکرد).[2]

**خەبباب دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ)**

جارێک خەڵکی لە مزگەوت کۆبووبوونەوە تا خەبباب بێت و قسەیان بۆ بکات، کە خەبباب هات لە کونجێکەوە کەناری گرت و بێدەنگ بوو، خەڵکەکە وتیان: ئەو خەڵکە کۆبوونەتەوە تا فەرموودەیان بۆ بگێڕیتەوە یان فەرمان بە چاکەیان پێ بکەیت، ئەویش وتی: فەرمانی چییان پێ بکەم، لەوانەیە بڵێم فلانە شت بکەن و خۆشم نەمکردبێت.[3]

---

الأمة - ذكر سؤال المصطفى(ﷺ) ربه جل وعلا أن لا يهلك أمته بما أهلك به الأمم قبله ، الرقم ٧٢٣٦، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن النسائي، الرقم ١٦٣٨، صححه شعيب الأرناؤوط.

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٦٦.

[2] الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ٢٨٤١.

[3] أسد الغابة، ج٢، ص ١٤٣.

خەبباب لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویستی زۆری هەبوو، گوێی دەگرت لێیان، جارێک ئیبن مەسعوود هات بۆ لای خەبباب، خەببابیش خاتەمێکی زێڕی دەکردە پەنجەی، ئیبن مەسعوود وتی: ئیتر کاتی نەهاتووە ئەو خاتەمە فڕێ بدەیت؟ خەبباب وتی: ئیتر جارێکی تر نایبینیت لە دەستما.[1]

**مردنی خەبباب**

خەبباب لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا نەخۆش کەوت، نەخۆشیەک کە ئازاری زۆری دەدا، حەوت جار سکی داخ کرابوو، تا ئاستێک خەبباب دەیوت ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە گوێم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووە دەیفەرموو: کەستان داوای مەرگ مەکەن، بە دڵنیاییەوە نزای مەرگم دەکرد، ئینجا داوای کرد کفنەکەی هێنرا، خەبباب دەستی کرد بە گریان و وتی: حەمزەی مامی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کفنەکەی بەرگێک بوو کە راماندەکێشا تا سەی دابپۆشێت قاچەکانی دەردەکەوتن، کە قاچەکانیمان دادەپۆشی سەری دەردەکەوت (واتە پێی ناخۆش بوو کفنەکەی ئەو لەوەی حەمزە باشتر بوو)، سەردەمێ لە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووم دینار و درهەمێکیش چی بوو نەمبوو، ئێستاش لەماڵەکەمدا چل هەزارم هەیە، ئەترسم خوا خۆشیەکانی بۆ خستبینە ژیانی دنیاوە.[2]

نەخۆشیەکەی خەبباب ماوەیەکی زۆری خایاند و ماوەیەک لە جێگەدا کەوت.[3]

یەکێک لەوانەی لای خەبباب بوو دڵخۆشی خەببابی دەدایەوەو دەیوت مۆژدەت لێ بێت سبەینێ دەچیتەوە لای براکانت، خەببابیش دەستی کرد بە گریان و وتی: خۆ گریانی ئازارم نیە، بەڵام باسی کەسانێکتان بۆ کردم کە بە پاداشتی خۆیانەوە چوونەوە لای خوا، بەڵام من دەترسم بەو دەستکەوتەی دوای ئەوان دەستمان کەوتووە پاداشتەکەمان وەرگرتبێتەوە.[4]

---

[1] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٥٦٤.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٦٦.
[3] أسد الغابة، ج٢، ص ١٤٣.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٦٦.

ئینجا خەبباب بە کوڕەکەی وت (کوڕی شیرینم کە مردم لە چۆڵەوانی کووفە ئەسپەردەم بکە با بڵێن هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ) لە چۆڵەوانی (دەرەوە)ی کووفە ئەسپەردە کراوە)، چونکە خەڵکی لە کووفە کە کەسێکیان دەمرد لە ناوشارەکە ئەسپەردەیان دەکرد.[1]

عەلی دای بە لای چەند گۆڕێکدا، وتی: ئەو گۆڕانە چین؟ وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە گۆڕی خەببابی کوڕی ئەرەتە، دوای ئەوەی تۆ دەرچوویت بۆ صفین ئەو کۆچی دوایی کرد و وەسیەتی کرد لە دەرەوەی کووفە ئەسپەردە بکرێت تا خەڵکیش ئیتر لە دەرەوە مردووەکانیان ئەسپەردە بکەن، عەلی وتی: رەحمەتی خوا لە خەبباب بە ویستی خۆی و بێ زۆرکردن موسڵمان بوو، بە موجاهیدی ژیا، جەستەی تووشی ئازار و نەخۆشی بوو، خوای گەورە هەرگیز کەسی چاکەکار زایە ناکات، ئینجا لە گۆڕەکەی خەبباب نزیک بوویەوەو نزای سەرگۆڕستانی کرد (السلام علیکم أهل الدیار...).[2]

سەبارەت بە مردنەکەی رایەک هاتووە کە لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا مردووە، بەڵام ئەوە راست نیە، چونکە ئەو خەببابە کە عومەر نوێژی لەسەر کرد خەببابی مەولای عوتبەی کوڕی غەزوانەو ئەویش هاوەڵێکی کۆچەری بوو، بەڵکو لەساڵی سی و حەوت لە کووفە کۆچی دوایی کردو عەلی کوڕی ئەبوو طالیبیش نوێژی مردووی لەسەر کرد.[3]

بەڵام دەبێت نوێژ لەسەرکردنەکەی عەلی کوڕی ئەبوو تالیب دوای ئەسپەردەکردنی بوو بێت، چونکە کاتێک خەبباب مرد عەلی لە کووفە نەبوو و کە هاتەوە دواتر هەواڵی پێدرا ئەوە گۆڕی خەببابەو مردووە.

دەوترێت تەمەنی حەفتا و سێ ساڵ بووە،[4] رایەکی تریش دەڵێت: کە مرد تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو.[5]

---

[1] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٣، ص ١٦٧.

[2] أسد الغابة، ج٢، ص ١٤٣.

[3] سیر أعلام النبلاء، ج٢، ص ٣٢٣-٣٢٤.

[4] سیر أعلام النبلاء، ج٢، ص ٣٢٣.

[5] البدایة والنهایة لابن کثیر، ج٧، ص ٣١١.

**ئایا خەبباب لە جەنگی صفیندا بەشدار بووە؟**

ئەگەرچی گێڕانەوەیەک هاتووە کە دەڵێت: خەبباب لە جەنگی صفیندا بەشدار بووە و دوای ئەوە وەفاتی کردووە،[1] بەڵام ئەمە لە رووی مێژووییەوە هەڵەیە، ئەمەش بە چەند بەڵگەیەک:

یەکەم: خەبباب لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا نەخۆش کەوتبوو و نەخۆشیەکەشی ماوەیەکی زۆر لە جێگەدا خستی تا ئاستێک حەوت جار داخکردنی بۆ بەکارهێنرا، بۆیە کەسێک بەو هەموو نەخۆشیەوە ناتوانێت بەشداری جەنگ بێت.

دووەم: لە زۆربەی سەرچاوەکاندا هاتووە کە عەلی کاتێک دەرچوو بۆ صفین لەو ماوەدا خەبباب کۆچی دوایی کردووە، هەروەها کاتێک عەلی لە صفینەوە هاتەوە گۆڕەکەی خەبابی لە دەرەوەی کووفە بینی، ئەمەش بەڵگەیە کە خەبباب بەشداری جەنگی صفین نەبووە.

## ١١٣٥. خەببابی کوڕی عەمر(ﷺ)

ناوی خەببابی کوڕی عەمری کوڕی حەممەی دەوسیە، لە جەنگی یەرمووکدا خالید خەببابی کرد بە بەرپرسی بەشێک لە سوپا، ئەمەش بەڵگەی هاوەڵ بوونیەتی، چونکە لە سەردەمی خەلیفە راشیدیەکاندا تەنها هاوەڵەکانیان دەکردنە ئەمیری فتووحات.[2]

## ١١٣٦. خەدیجەی کچی حوصەین(ﷺ)

ناوی خەدیجەی کچی حوصەینە، بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ)، لە غەزای خەیبەردا پێغەمبەر(ﷺ) بڕی سەد کۆڵ خورمای بۆ خەدیجەو هێندی خوشکی بڕیەوە.[3]

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ١٤٣.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٩.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٢٢٧.

## ١١٢٧. خەدیجەی کچی خوەیلید(دایکی باوەڕداران)(رضي الله عنها)

ناوی خەدیجەی کچی خوەیلیدی کوڕی عەبدولعوززای قورەیشی ئەسەدیە،[١] خێزانی یەکەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و یەکەم ئافرەتی موسڵمان بووە، دایکی ناوی فاطیمەی کچی زائیدەیە.[٢]

خەدیجە برایەکی هەبوو بە ناوی عەووام کە باوکی زوبەیر و سائیب بوو.[٣]

**خەدیجە(رضي الله عنها) پێش هاوسەری لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)**

خەدیجە سەرەتا هاوسەری ئەبی هالەی کوڕی زورارە بوو، دوای ئەو شووی کرد بە پیاوێکی تر کە ناوی عەتیقی کوڕی عابید بوو، ئەو پیاوەی مرد ئینجا هاوسەرگیری لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کرد.[٤]

خەدیجە لە مێردی یەکەمی کوڕێکی هەبوو بە ناوی هالە کە هاوەڵی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)،[٥] لە مێردی دووەمی کچێکی هەبوو بە ناوی هیند.[٦]

خەدیجە لەناو هۆزەکەیدا زۆر ناسراو بوو، چونکە هەم لە خێزانێکی ناسراو بوو، هەم سامانێکی زۆر زۆری هەبوو و هەموان حەزیان دەکرد ئەو ئافرەتە بخوازن.[٧]

خەدیجە هێندە بە پاکداوێن ناسرابوو کە لەناو هۆزەکەیدا بە ئافرەتە پاکەکە ناوی دەرچووبوو.[٨]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٠.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٠.
[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ١١٩.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٠.
[٥] أسد الغابة، ج٥، ص ٣٩٣.
[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ١٥.
[٧] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ١٣١.
[٨] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ١٥.

**سەرەتای یەکترناسین**

خەدیجە سامانێکی زۆری هەبوو، بۆیە داوای لە پیاوانێکی شارەزا دەکرد تا کاری بازرگانی بۆ بکەن، بەرامبەر بەوە بڕێک قازانجی دەدا پێیان، جا کاتێک ڕاستگۆیی و دەستپاکی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیست بڕیاریدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) مامەڵە بکات،[1] بۆیە داوای کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) تا کاری بازرگانی بۆ بکات، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕازی بوو، ئەوکات هێشتا نەبووبوو بە پێغەمبەر و لە تەمەنی لاویدا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ مەیسەرەی مەولای خەدیجەدا چوو بۆ شام تا کاری بازرگانی بکات بۆ خەدیجە، کە گەیشتنە شام پێغەمبەر(ﷺ) لە ژێر سێبەری دارێکدا دانیشت، کابرایەکی ڕاهیب ئەوی بینی، بە مەیسەرەی وت ئەم کابرایە کێیە؟ ئەویش وتی کەسێکی قورەیشیە، ڕاهیبەکە وتی: تەنها پێغەمبەران لەژێر سێبەری ئەم دارەدا دانیشتون، ئینجا وتی: ئایا سوورایيەک لەنێوچاوانیدا هەیە؟ مەیسەرە وتی: بەڵێ، ڕاهیبەکە وتی: دەی هەرگیز لێی جیا مەبەرەوە، ئەوە کۆتای پێغەمبەرانە و خۆزگە منیش دەگەیشتمە کاتی پێغەمبەرایەتیەکەی، ئینجا کە هاتنەوە خەدیجە قازانجی زۆر زۆری دەکرد لەو کارەی پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها مەیسەرە ئەو قسەی ڕاهیبەکەشی بۆ خەدیجە گێڕایەوە،[2] ئەوەبوو دڵی چوویە سەر پێغەمبەر(ﷺ) و پێشنیازی خۆی کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تا ببێتە هاوسەری.[3]

**پێشنیاری خەدیجە(ﷺ) بۆ هاوسەرگیری**

سەبارەت بە جۆری پێ وتنەکە بە پێغەمبەر(ﷺ) چەند گێڕانەوەیەک هاتووە:

عەمماری کوڕی یاسر دەڵێت: جارێک لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەچووین

---

[1] أسد الغابة، ج٧، ص ٩٠.

[2] دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٠٦.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٤.

بەرێدا و خوشکەکەی خەدیجەمان بینی دامان بە لایدا لەسەر پێستەیەک بوو دەیفرۆشت، کە منی بینی بانگی کردمە کەنارەوە، پێی وتم: ئەرێ هاوڕێکەت رای چۆنە بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ خەدیجە؟ منیش چووم و ئەوەم بە پێغەمبەر(ﷺ) وت، ئەویش فەرمووی: بەڵێ بەخوا پێم خۆشە، هەواڵەکەم دایەوە بە خوشکەکەی خەدیجەو ئەویش وتی: دەی بۆ بەیانی وەرن، ئێمەش چووین و سەیرمان کرد مانگایەکیان سەربڕیوەو جلی جوانیان کردوەتە بەر باوکی خەدیجە، منیش بە خوشکەکەیم وت ئەویش بە باوکی وت، باوکیشی ئەوکات سەرخۆش بوو، خوشکەکەی خەدیجە وتی: موحەممەد هاتوەتە داوای خەدیجەو ئەویش رازی بوو و خەدیجەی لێ مارە کرد، لە گۆشتەکە خواردنێکیان ئامادە کرد و هەموان نانیان خوارد و باوکی خەدیجە خەوت، دواتر کە لە خەو هەستا هاواری کرد ئەم جلانە چین؟ ئەم خواردن و بەزمە چیە؟ کچەکەی پێی وت ئەو جلە هی موحەممەدی کوڕی عەبدولایەو ئەو مانگایەی بە دیاری بۆ هێناویت و تۆیش کە خەدیجەت لێ مارە کرد ئەو ماگایەمان سەربڕی، بەلام خوەیلید نارازی بوو و کەوتە بۆڵەو هاوارکردن.[1]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) و مەیسەرە گەڕانەوەو مەیسەرە باسی قسەی راهیبەکەی کرد، خەدیجە کەسێکی نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی وت پێی بڵێت:(ئەی ئامۆزا من دڵم چوەتە سەر تۆ لەبەر نزیکی و خزمایەتیت لێم، لەبەر کەسایەتی و نێوەندبوون و سپاردەکاریت لەنێو هۆزەکەتدا، لەبەر رەوشت جوانی و راستبێژیت)،[2] ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) چوو لای مامەکانی مەسەلەکەی باس کرد و دواتر حەمزەی مامی لەگەڵی چوو بۆ لای خوەیلید و داوای خەدیجەی کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش مارەی کرد لێی.[3]

---

[1] السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٢٨٤٠، البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٥-٢٩٦.

[2] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٣٩٤.

[3] أسد الغابة، ج٧، ص ٩١.

نەفیسە کە ئافرەتێکە دەڵێت: خەدیجە منی نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا پێشنیازی بۆ بکەم داخوازی خەدیجە بکات و هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، منیش هەمان کارم کرد و چووم بۆ لای و وتم: بۆچی هاوسەرگیری ناکەیت؟ فەرمووی: هیچێکم لەدەستدا نیە تا هاوسەرگیری بکەم، وتم: ئەگەر من ئەوەم بۆ چارەسەر کردیت و ئافرەتێکی لێهاتوو و دەوڵەمەند و جوانیش هەبوو بیهێنیت، فەرمووی: کێیە؟ وتم: خەدیجەیە، پێغەمبەریش(ﷺ) رازی بوو.[1]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) داوای خەدیجەی کرد مامی خەدیجە عەمری کوڕی ئەسەد خەدیجەی لە پێغەمبەر(ﷺ) مارە کرد، رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو عەمری برای خەدیجە مارەی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ).[2]

**کات و تەمەنی هاوسەرگیریەکە**

سەبارەت بە کاتی هاوسەرگیری خەدیجەو پێغەمبەری خوا(ﷺ) چەند رای جیاواز هاتووە، رایەکیان دەڵێت: ئەوکات خەدیجە تەمەنی چل ساڵان بووە، رایەکی تریش دەڵێت: بەڵکو تەمەنی بیست و هەشت ساڵان بووە،[3] رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو تەمەنی خەدیجە ئەوکات سی و پێنج ساڵان بووە، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو بیست و پێنج ساڵان بوو.[4]

سەبارەت بە تەمەنی پێغەمبەریش(ﷺ) رایەک دەڵێت: تەمەنی بیست و یەک ساڵان بووە، رایەکی تریش دەڵێت: تەمەنی بیست و پێنج ساڵان بووە.[5]

ماوەی پێکەوە ژیانیشیان نزیکەی بیست و پێنج ساڵ بووە، چونکە بە گونجاندنی کاتی هاوسەرگیریەکەو تەمەنی پێغەمبەر(ﷺ) و کاتی وەفاتی خەدیجەدا دەزانین نزیکەی بیست و پێنج ساڵ پێکەوە ژیاون.

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٢.
[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٦.
[3] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١١.
[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٥.
[5] أسد الغابة، ج٧، ص ٩٠.

**وەستانێک:**

لەبەرئەوەی دەقێکی روونی صەحیح نیە سەبارەت بە تەمەنی خەدیجەی کچی خوەیلید لە کاتی هاوسەرگیری لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، بۆیە شیکاریەکی بۆ دەکەین:

یەکەم: تەمەنی خەدیجە چل ساڵان نەبووە، چونکە ئافرەت لە تەمەنی چل ساڵ بە دواوە ئەگەری منداڵ بوونی زۆر کەم دەکات، چ جای ئەوەی چەند منداڵێکی ببێت، پێغەمبەریش(ﷺ) پاش پانزە ساڵ لەو هاوسەرگیریە ئینجا بوو بە پێغەمبەر(ﷺ) تا بڵێین موعجیزەیەکی خودایی بوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و هیچ دەقێکیش لەو بارەوە نیە.

دووەم: دیارە خەدیجە زۆر گەنجیش نەبووە، ئەمەش بەپێی ئەو دەقەی کە عائیشە دەڵێت: کە پێغەمبەر(ﷺ) زۆر باسی خەدیجەی دەکرد دەموت چیە هێندە باسی ئەو پیرەژنە قورەیشیە دەکەیت،[1] هەروەها لەبەرئەوەی پێشتر دوو جار شووی کردووەو دوو منداڵیشی هەبووە.

سێیەم: ئەگەر تەماشا بکەین لە سەرچاوەکاندا چوار تەمەن هاتووە(بیست و پێنج، بیست و هەشت، سی و پێنج، چل)، کەچی ئەوەی چل ساڵەکە زەق کراوەتەوە، هۆکارەکەشی چیە؟!

**ژیانی ژن و مێردایەتی**

خەدیجە لە ماوەی ژیانی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) تەنانەت لەو کاتەش کە پێغەمبەر نەبوو زۆر رێزی دەگرت لێی و بە گەورە تەماشای دەکرد و پێغەمبەر(ﷺ) هەر چی بفەرموایە ئەو بڕوای پێدەکرد،[2] هەڵسوکەوتێکی ژنێکی سەلار بەرامبەرمێردێکی سەلار.

خەدیجە خزمەتکارێکی کڕیبوو بە ناوی زەیدی کوڕی حارثە، هێشتا

---

[1] صحيح البخاري - كتاب مناقب الأنصار - باب تزويج النبي(ﷺ) خديجة، الرقم ٣٨٢١، صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب فضائل خديجة أم المؤمنين(ﷺ)، الرقم ٢٤٣٧.

[2] () الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٢.

پێغەمبەر(ﷺ) سروشی بۆ دانەبەزیبوو، بەڵام خۆشەویستی بۆ زەید زۆر بوو، خەدیجە کە بینی پێغەمبەر(ﷺ) زەیدی زۆر خۆشدەوێت زەیدی پێ بەخشی.[1]

**وەستانێک:**

گومانێک لەلایەن رۆژهەڵاتناسانەوە سەبارەت بە هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ خەدیجە خراوەتەڕوو گوایە مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) لەو هاوسەرگیریەدا بریتی بووە لە دەستکەوتی ماددی تا ببێتە بنەڕەت بۆ بانگەوازی داهاتووی، بەڵام ئەمە لە چەند روویەکەوە ناراستی ئەو مەسەلەیە دەخاتەڕوو:

یەکەم: پێغەمبەر(ﷺ) ئەوکات نەیدەزانی دەبێتە پێغەمبەری خوا و هیچ ئاگاداریەکی نەبوو، ئەگەریش بڵێت وەک کەسێکی کاریزما جووڵاوەتەوە ئەمە بڕوا نەبوونە بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ) و کردنیەتی بە کاریزمایەکی ناو مرۆڤایەتی نەک پێغەمبەرێکی خوا، بۆ ئەوانەش وا دەڕوانن هەر لەوەدا هەڵەن، چونکە مێژوو بە کۆدەنگی پاکداوێنی پێغەمبەری خوای(ﷺ) سەلماندووەو لە گەرمەی گەنجێتیدا نەچووە بە لای هیچ چێژوەگرتنێکی جنسیدا، لەکاتێکدا ئەگەر هاوسەرگیریەکەی بۆ ماددە بوایە ئەوە دەبوو بە نهێنی و یان هەر بە ئاشکراش خۆی بێبەش نەکردایە لە یەکەم چێژی رازێنراوەی سەر زەوی وەک خوا فەرموویەتی: (زين للناس حب الشهوات من النساء...)، بەڵکو دەبینین تا ئەو کاتەی خەدیجە وەفات دەکات پێغەمبەر(ﷺ) هیچ ژنێکی تر ناهێنێت و تەنانەت لە سەردەمی پێش پێغەمبەرایەتیشیدا سەیرێکی ئافرەتێکی تریشی نەکردووە، دەی خەدیجە لە ساڵی سێیەمی پێش کۆچیدا وەفاتی کردووە، واتە ئەوکات تەمەنی پێغەمبەر(ﷺ) نزیکەی پەنجا ساڵ بووە، واتە نزیکەی بیست و پێنج ساڵ پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ خەدیجە ژیا کەچی جارێکیش بیری نەکردەوە لە هاوسەرگیریەکی تر،

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٤.

لەکاتێکدا پاش ئەو ژنی زۆری هێنا، بۆیە ئەوە تەنها کینەیەکی بڕوانەبوونە بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ) و لەو پێناوەشدا هەر هەنگاوێک دەگرنەبەر با ناحەقیش بێت.

**باوەڕهێنانی خەدیجە(رضي الله عنها)**

خەدیجە یەکەم کەس بوو باوەڕی هێنا بە پێغەمبەر(ﷺ)،[1]ئەمەش کۆدەنگی هەموو موسڵمانانی لەسەرە.[2]

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) سروشی بۆ دابەزی جۆرێک لە دڵەخورپێ دایگرت و گەڕایەوە ماڵەوە بۆ لای خەدیجەی کچی خوەیلیدی خێزانی، فەرمووی: (دامپۆشن، دامپۆشن)، دایانپۆشی تا حاڵی ئاسایی بوویەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بارەکەی گێڕایەوە بۆ خەدیجەو فەرمووی: (لقد خشيت على نفسي)، (بەراستی لە حاڵی خۆم دەترسم)، خەدیجەش پێی وت: نەبەخوا هەرگیز خوا سەرشۆڕ و شکت خواردەت ناکات، چونکە تۆ پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنیت و ئەرکی قورس و هاوکاری لەئەستۆ دەگریت و دەستگرۆیی هەژار و مایەپووچان دەکەیت و ڕێزی میوان دەگریت و خزمەتی دەکەیت و پاڵپشت و دڵدەرەوەی بارشێواوانیت، ئینجا پاش ئەو دڵدانەوەیە، خەدیجە پێغەمبەری خوای(ﷺ) برد بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل کە کابرایەکی نەصرانی بوو و نووسینی عیبرانیشی دەزانی، کابرایەکی پیری نابینا بوو، خەدیجە پێی وت ئامۆزاکەم گوێ لە برازاکەت بگرە، وەرەقە بە وردی گوێی گرت لە پێغەمبەر(ﷺ) و دواجار پێی وت کە ئەو بووە بە پێغەمبەر(ﷺ).[3]

**گەورەییەکانی خەدیجە(رضي الله عنها)**

جارێک خەدیجە خواردنی ئامادە کردبوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و چوو بەرەو بەرزاییەکانی مەککە تا خواردنەکەی بۆ ببات، لە ڕێدا جبرەیل خۆی لە

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٠٩.

[2] أسد الغابة، ج٧، ص ٨٩

[3] صحيح البخاري - بدء الوحي - باب كيف كان بدء الوحي إلى رسول الله، الرقم ٣، صحيح مسلم - كتاب الإيمان - باب بدء الوحي إلى رسول الله(ﷺ)، الرقم ١٦٠.

شێوەی مرۆڤێکدا نیشان دا و پرسیاری پێغەمبەری خوای(ﷺ) لە خەدیجە کرد، خەدیجەش ترس دایگرت و ترسا کەسێکی خراپ بێت و نیازی کوشتنی پێغەمبەری خوای(ﷺ) هەبێت، دواتر کە خەدیجە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: (ئەوە جبرەیل بوو، فەرمانی پێکردم سەلامت پێ بگەیەنم)، ئینجا موژدەی دا بە خەدیجە کە لە بەهەشتدا خانوویەکی بێ ژاوەژاوو و ماندووبوونی بۆ تایبەت کراوە.[1]

خەدیجە پشتیوانێکی گەورە بوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵکو هەرکات پێغەمبەر(ﷺ) لە دەرەوە بە دەست بێباوەڕانەوە قسەی ناخۆشی بەرامبەر بکرایە، کە دەگەڕایەوەماڵەوە خەدیجە دڵی هێور دەکردەوەو خەفەتی سەر شانی لادەبرد.[2]

خەدیجە دایکی هەموو منداڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو جگە لە ئیبراهیم کە لە ماریە بوو.

خەدیجە ئەم منداڵانەی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو:(قاسم کە کوڕە گەورەی بوو، عەبدوڵا ناسراو بە طەیب و طاهیر، روقییە کە کچە گەورەی بوو، زەینەب، ئوممو‌کلثوم، فاتیمە)،[3] هەموو کوڕەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە خەدیجەوە پێش دابەزینی سروش وەفاتیان کرد، بەڵام کچەکانی مانەوە تا ئیسلام هات و باوەڕیان هێنا بە ئیسلام و کۆچیان کرد بۆ مەدینە.[4]

خەدیجە زۆر خواناس بوو، پێغەمبەر(ﷺ) موژدەی پێدابوو کە لە بەهەشتدا خانوویەکی هەیە، وەک لە گێڕانەوەکەدا هاتووە: جیبریل هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووی: (يَا رَسُولَ اللهِ، هَذِهِ خَدِيجَةُ قَدْ أَتَتْ، مَعَهَا إِنَاءٌ فِيهِ إِدَامٌ أَوْ طَعَامٌ أَوْ شَرَابٌ، فَإِذَا هِيَ أَتَتْكَ فَاقْرَأْ عَلَيهَا السَّلاَمَ مِنْ رَبِّهَا وَمِنِّي، وَبشِّرْهَا بِبَيْتٍ فِي الجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ لاَ صَخَبَ فِيهِ وَلاَ نَصَبَ)، (ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە خەدیجەیە وا دێت، قاپێکی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٣-٦٠٤.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٠.
[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٤.
[4] أسد الغابة، ج٧، ص ٩١.

پێیه که ئیدام یان خواردن یان خواردنەوەیەکی تێدایە، ئەگەر هات بۆ لات سەلامی پەروەردگاری و سەلامی منیشی پێ بگەیەنەو موژدەی بدەرێ بە ماڵێک لە بەهەشتدا کە لە یاقووت و مرواری دروستکراوەو هات و هاوار و ماندووبوونی تێدانیە).[1]

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو:(إن أفضل نساء أهل الجنة خديجة بنت خويلد و فاطمة بنت محمد و مريم بنت عمران وآسية بنت مزاحم إمراة فرعون)،[2] (چاکترین ئافرەتانی بەهەشت بریتین لە خەدیجەی کچی خوەیلید و فاطیمەی کچی موحەممەد و مەریەمی کچی عیمران و ئاسیەی کچی موزاحیم کە ژنی فیرعەون بوو).

جارێک جیبریل هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووی: : ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوە خەدیجەیە دێت بۆ لات و قاپێکی پێیە کە خواردنی تێدایە، ئەگەر هات بۆ لات سەلامی پەروەردگاری و منی پێ بگەیەنە و موژدەی بدەرێ بە خانوویەک لە بەهەشتدا کە مرواریەو هیچ ژاوەژاو و ماندووبوونێکی تێدا نیە.[3]

خەدیجە لە هەموو نارەحەتیەکاندا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو، تەنانەت لە گەمارۆدانی سەختی هاشمیەکانیشدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە شیوەکەدا بوو، جارێک حەکیمی کوڕی حیزام ویستی بڕێک گەنم بەرێت بۆ خەدیجەی پووری، بەڵام ئەبووجەهل ڕێی پێگرت، ئەبولبوختەری هات و وتی: ئەوە چیتانە؟ ئەبووجەهل وتی: ئەمە خواردن دەبات بۆ هاشمیەکان، ئەبولبوختەری وتی: بۆ پووری خۆی دەبات ڕێی ئەوەشی لێ ئەگریت؟ ڕێی بۆ چۆڵ کە

---

[1] صحيح البخاري – كتاب مناقب الأنصار – باب تزويج النبي(ﷺ) خديجة، الرقم ٣٨٢٠.

[2] السنن الكبرى للنسائي – كتاب المناقب – مناقب مريم بنت عمران ، الرقم ٨٢٩٧، المستدرک على الصحيحين – كتاب التفسير – تفسير سورة التحريم – أربع نسوة أفضل نساء أهل الجنة، الرقم ٣٨٥٧ صححه ووافقه الذهبي في التلخيص، صححه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ١٥٠٧.

[3] مسند احمد بن حنبل، الرقم ٦٩٧٥، صحيح البخاري، الرقم ٣٦٣٢، صحيح مسلم، الرقم ٦٩٧٥، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١١٩، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٩١٨.

کابرا، بەڵام ئەبوجەهل رازی نەبوو، بۆیە کەوتنە دەمەقاڵەو دەستەویەخە.[1]

**کۆچی دوایی خەدیجە(ﷺ)**

سەبارەت بە کاتی مردنی خەدیجە چەند گێڕانەوەیەک هاتووە، لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە گێڕدراوەتەوە کە خەدیجە پێش فەرزبوونی نوێژ وەفاتی کردووە، دەوترێت لە مانگ رەمەزاندا کۆچی دوایی کردووە، رایەک دەڵێت: سێ ساڵ پێش کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە کۆچی دوایی کردووە.[2]

رایەک دەڵێت: کاتێک خەدیجە وەفاتی کرد تەمەنی نزیکەی شەست و پێنج ساڵ دەبوو،[3] ئەمەش بە پشت بەستن بەو گێڕانەوەی کە دەڵێت: خەدیجە لە تەمەنی چل ساڵیدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) هاوسەرگیری کردووە.

حاکم لە موستەدرەکدا دەڵێت: ئەم وتەیە شازە، چونکە ئەوەی لای منە(بەڵگە) ئەوەیە کە تەمەنی نەگەیشتوەتە شەست ساڵان.[4]

سەبارەت بە ماوەی نێوان مەرگی خەدیجەو ئەبوو طالیب رایەک دەڵێت: خەدیجە تەنها دوای سێ رۆژ لە مەرگی ئەبووطالیب کۆچی دوایی کرد، رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو خەدیجە سی و پێنج رۆژ پێش ئەبووطالیب کۆچی دوایی کرد.[5]

**خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خەدیجە(ﷺ) پاش مردنیشی**

خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خەدیجە بە مەرگی خەدیجە کۆتایی پێ نەهات، بەڵکو زۆرجار بە چاکە باسی دەکرد، ئەمەش چەند نموونەیەک لە خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خەدیجە لە دوای مردنی:

خەولەی کچی حەکیم دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتم: ئەی

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٨٨.
[2] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٧.
[3] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٢.
[4] المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٧٩٠.
[5] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٢.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەتبینم بە مەرگی خەدیجە بۆشاییەک کەوتۆتە ژیانتەوە، ئەویش فەرمووی: : (بەڵێ، ئەو دایکی منداڵەکان و خاتوونی ماڵەوە بوو).[1]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) زۆر جار باسی خەدیجەی دەکرد، کاتێک ئاژەڵێکی سەردەبڕی بەشی هاوڕێکانی خەدیجەی جیا دەکردەوەو دەستی بگەیشتایەتە لای هەرکامیان بۆی دەنارد.[2]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: ئەو غیرەی بەرامبەر خەدیجە هەمبوو بەرامبەر هیچ کەسی تر هێندە نەمبوو، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) زۆر زۆر باسی دەکرد.[3]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) کە گۆشتی دەنارد بۆ هاوڕێکانی خەدیجەو و هێندەش زۆر باسی خەدیجەی دەکرد، وام لێدەهات دەموت ئەڵێیت هەر خەدیجە ژن بووە، پێغەمبەریش(ﷺ) دەیفەرموو: ئەو ئاواو و ئاوا بوو و من لەو منداڵم هەبوو).[4]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: جارێک هالەی خوشکی خەدیجە هاتە بەردەرگا، کە پێغەمبەر(ﷺ) زانی هالەیە خێرا راپەڕی و فەرمووی: : (اللهم هاله) (ئای خوایە هالە هاتووە)، منیش غیرە دایگرتم و وتم: چیە ئەوەنە باسی ئەو پیرەژنە قوڕەیشیە دەکەیت،[5] پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوەی لێ بیستم دەموچاوی تووڕە و شێواو هەڵگەڕا.[6]

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: کاتێک ناوی خەدیجە دەبرا ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) زۆر وەسفی دەکرد و زۆر یادی دەکردەوە، منیش رۆژێک غیرەم هەبوو وتم: چیە ئەوەنە باسی ئەو لاجانگ سوورە ئەکەیت خوا لە

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٣، قال الحافظ ابن حجر وسنده قوي مع إرساله.

[2] صحيح البخاري - كتاب مناقب الأنصار - باب تزويج النبي(ﷺ) خديجة، الرقم ٣٨١٦.

[3] صحيح البخاري - كتاب مناقب الأنصار - باب تزويج النبي(ﷺ) خديجة، الرقم ٣٨١٧.

[4] صحيح البخاري - كتاب مناقب الأنصار - باب تزويج النبي(ﷺ) خديجة، الرقم ٣٨١٨.

[5] صحيح البخاري - كتاب مناقب الأنصار - باب تزويج النبي(ﷺ) خديجة، الرقم ٣٨٢١.

[6] صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله عليهم أجمعين - ذكر إكثار المصطفى(ﷺ) ذكر خديجة بعد وفاتها، الرقم ٧٠٠٨.

بری ئەو چاکتری پێ بەخشیویت، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) فەرموویی: (ما أبدلني الله عز وجل خيرا منها، قد آمنت بي إذ كفر بي الناس، وصدقتني إذ كذبني الناس، وواستني بمالها إذ حرمني الناس، ورزقني الله عز وجل ولدها إذ حرمني أولاد النساء)،[1] (خوای گەورە لەو چاکتری پێ نەبەخشیوم، خەدیجە کاتێک باوەڕی پێ هێنام کە خەڵکی بڕوایان پێ نەدەهێنام، بەراستی زانیم کاتێک خەڵکی بە درۆیان دەخستمەوە، کاتێک خەڵک بێبەشیان دەکردم ئەو بە سامانەکەی دڵنەوایی و پاڵپشتی دەکردم، خوای گەورە لەو منداڵی پێ بەخشیم کەچی لە ژنەکانی ترم لە منداڵ بێبەشی کردم).

**پەندو وانە:**

هاوسەرگیری پرۆسەیەکی شەرعیە کە خوای گەورە دایناوە لەنێوان نێر و مێدا ڕووبدات، ئەوەش ویستێکی کاتی نیەو بەس، بەڵکو فەرمانی خوایی لەسەرەو هەر کەسیش لەو مەیدانەدا کەمتەرخەمی کردبێت نابێتە بیانوو بۆ ڕەوایی دەستبەردار بوون لە هاوسەرگیری، ئەگەر هاتو جەستە کامڵ بوو و عەقڵ تەواو بوو و کەسەکە توانای هاوسەرگیری هەبوو، ئیتر خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بە دەستەواژەی فرمان کردن ڕێی هاوسەرگیری پێ نیشان دەدەن، هەروەها مەسەلەیەکی تریش کە گرنگە لە هاوسەرگیریدا پاراستنی ئایینداری تاکە، چ کوڕ کە ئافرەتێک هەڵدەبژێرێت هەڵبژاردنەکەی دەبێت بۆ ئافرەتێکی ئایین‌دار بێت کە هەم پێکەوە بگونجێن و هەم منداڵەکان لەسەر بیروباوەڕێکی چاک پەروەردە بکات، بۆیە خوا دەفەرمویت: (ولأمة مؤمنة خير من مشركة و لو أعجبتكم)، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویت: (فاظفره بذات الدين تربت يداك)،[2] چ ئافرەتیش دەبێت دەبێت زۆر زیاتر ڕەچاوی ئەو خاڵە بکات، چونکە ئافرەت زۆر زووتر کاریگەر دەبێت بە بیرکردنەوەو ڕامانی هاوسەرەکەی، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویت: (إذا أتاكم من

---

[1] مسند أحمد بن حنبل - مسند عائشة(ﷺ)، الرقم ٢٥٥٠٤، قال ابن كثير في البداية والنهاية (ج٣، ص ١٢٨) إسناده لا بأس به، صححه شعيب الأرناؤوط.

[2] صحيح البخاري - كتاب النكاح - باب الأكفاء في الدين، الرقم ٥٠٩٠، صحيح مسلم - كتاب الرضاع - باب استحباب نكاح ذات الدين، الرقم ١٤٦٦.

ترضون خلقه ودینه فزوجوه)،[1] (ئەگەر کەسێک هاتە داوای کچەکەتان، لە ئاکار و ئایینداریەکەی رازی بوون ئەوە لێی مارە بکەن).

هەر سەبارەت بە هاوسەرگیری بابەتێک هەیە کە لە کۆمەڵگەی ئەمڕۆدا زەق کراوەتەوەو وەک تانەیەک دانراوە، ئەویش پێشنیازی هاوسەرگیریە لەلایەن ئافرەتەوە، ئیتر یان کەسی بەرامبەر ئەوە بە کەمی کچەکە دەزانێت، یان کۆمەڵگە تانەی لێدەدات، بەڵام لە راستیدا شەریعەت وا ناڵێت، هەر بە دیدە عەقڵیەکەشی تەماشا بکرێت، ئافرەتێک بە چەندەها ساڵ ماندووبوون تا پەروەردەیەکی تەواوی ئایینی و رەوشتی و کۆمەڵایەتی وەرگرتووە، ئەگەر بیەوێت هەم ژیانێکی بەختەوەرانەی بێ باجدانی هەبێت و هەم ئەو دەستکەوتانەشی بپارێزێت، چاکترین رێچارە ئەوەیە بە دڵی خۆی کوڕێک هەڵبژێرێت کە هەم بەختەوەری پێکەوە ژیانی لێ بەدی بکات، هەم هۆکاری پاراستنی ئەو دەستکەوتانەی بێت، ئەمە نەک کەموکورتی نیە، بەڵکو گەورەییە کە ئەو ئافرەتە دەیەوێت دەستکەوتەکانی دنیا و قیامەتی بپارێزێت، بەڵام باشتر وایە لە رێی کەسێکی دڵسۆزەوە ئەو پێشنیازە بگەیەنێت بە کوڕەکە، هەم بۆ دروست نەبوونی گومان لای ئەو کوڕە کە لەوانەیە جار هەبێت ئەوە بە شتێکی تر لێکبداتەوە، هەم بۆ ئەوەی ئەگەر نەگونجا ئافرەتەکە پێی نەشکێتەوە، چونکە ئەوان دڵیان ناسکە و هەستیارن، پێغەمبەریش(ﷺ) بە شووشەیی ناوی بردون (رويدک بالقوارير).[2]

پێویستە هاوسەرەکان لە خۆشی و ناخۆشیەکاند پشت و هاودەمی یەکدی بن، نەک لە خۆشیەکاندا دۆستی یەک و لە ناخۆشیەکاند دڵسۆزێکی ناچار بە کەنارگیری بن، خەدیجەی دایکی باوەڕداران جوانترین نموونە بوو، کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەم جۆرە پێناسی دەکات: (خەدیجە کاتێک

---

[1] سنن ابن ماجه - أبواب النكاح - باب الأكفاء ، الرقم ٢٠٤٠، حسنه الألباني.

[2] صحيح البخاري - كتاب الأدب - باب ما جاء في قول الرجل ويلك، الرقم ٦١٦١، صحيح مسلم - كتاب الفضائل - باب رحمة النبي(ﷺ) للنساء وأمر السواق مطاياهن بالرفق بهن، الرقم ٢٣٢٣.

باوەڕی پێ هێنام کە خەڵکی بڕوایان پێ نەدەهێنام، بەراستی زانیم کاتێک خەڵکی بە درۆیان دەخستمەوە، کاتێک خەڵک بێبەشیان دەکردم ئەو بە سامانەکەی دڵنەوایی و پاڵپشتی دەکردم)، تا دوا ساتەکانی ژیانیشی هاودەمی نارەحەتیەکانی هاوسەرەکەی بوو، ئیتر هیچ کات بیری لەوە نەدەکردەوە منێکی دەوڵەمەندی خاوەن ناوبانگ لەپێناو چیدا ئەم هەموو باجە بدەم، بەڵکو ئەوەی لای گرنگ بوو هاودەمی مێردی خواناسی بێت.

وەفاداری پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خەدیجە نموونەیەکی باڵای وەفاداری نێوان ژن و مێردە، وەفادارییەک کە دوای مردنیشی هێشتا هەمان خۆشەویستی هەیە بۆی، نە ئامادەیە کەس بە بچووکترین تانەوە ناوی ببات و باسی بکات، نە ئامادەیە هیچ ئافرەتێکی تر وەک ئەو تەماشا بکات، بە ناوهێنانی خێرا چاکەکانی خەدیجەی باس دەکرد، بە هاتنی کەس و دۆستانی خەدیجە دڵی دەگەشایەوە، کە دیاری و خێر و قوربانیەکیشی هەبوایە پشکی خۆشەویستانی خەدیجەی لەبیر نەدەکرد.

پێغەمبەر(ﷺ) تا دوای وەفاتی خەدیجە هیچ هاوسەرگیریەکی تری نەکرد، جا ئەمە لە سەرچاوەکاندا زۆ باسکراوەو وەک فەزڵێک بۆ دایکمان خەدیجە باس کراوە، لە راستیدا ئێمە نازانین ئایا پێغەمبەر(ﷺ) تایبەت لەبەر خەدیجە ئەوەی کردووە یان نا، بەڵام دەزانین پێغەمبەر(ﷺ) لەو ماوەی خەدیجەی هەبوو و پێغەمبەری خواش(ﷺ) بوو لەوپەڕی نارەحەتیدا بوو، لە مەککە بوو کە قۆناغی ئازار و سزادانەکان بوو، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دوای خەدیجە عائیشەی بەهاوسەرگرت کە زۆر زۆر لای خۆشەویست بوو و کچی هاوەڵی هەرە خۆشەویستیشی بوو، بەڵام ئەوە نەبوویە رێگر لەوەی هاوسەرگیری تر بکات و ئافرەتانی تریشی بەهاوسەر گرت، بەڵام ئەوەی لە دەقەکاندا بەدیدەکەین پێغەمبەر(ﷺ) خەدیجەی لە هەر هەموو ژنکانی تری خۆشتر ویستووەو ئەوەشی نەشاردوەتەوە.

## ١١٢٨. خەدیجەی کچی زوبەیر(رضي الله عنها)

ناوی خەدیجەی کچی زوبەیری کوڕی عەووامە، دایکی ناوی ئەسمائی کچی ئەبووبەکری صدیقە، لەپێش غەزای ئەحزابدا لەدایک بووە و ماوەی پێنج ساڵی یەکەمی تەمەنی لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) بەسەر برد.[١]

ئەسمائی دایکی دەڵێت: سکم پڕ بوو بە خەدیجەوە، کە دروایسێیەکی جوولەکەمان گۆشتی لێنابوو، تەواو بێزووم پێوە کرد و خۆم پێ رانەگیرا و چووم بۆ لای ژنە جوولەکەکەو بە بیانووی هێنانی ئاگرەوە چووم بۆ لای، وتم: بەڵکو خۆی تۆزێکم بەش بدات، کە چوومە ئەوێ و بۆنم کرد و گۆشتەکەم بینی زیاتر حەزم لێکرد، ئاگرەکەم برد و ژنەکە بەشی نەدام، ئاگرەکەم کوژاندەوەو هەمدی چوومەوە بۆ ئاگرەکە، سێ جار وامکرد، کەچی هیچی بەش نەدام، منیش دانیشتم و دەستم کرد بە گریان و نزاکردن، مێردی ژنە جوولەکەکە هاتەوەماڵەوەو بە ژنەکەی وت کەس نەهاتووە بۆ لات؟ ژنەکە وتی: ئافرەتێکی عەرەب هات داوای ئاگری کرد، کابرای جوولەکە وتی: دەی تا بەشی ئەو ژنە نەنێریت لێی ناخۆم، ئەوەبوو قاپێک گۆشتی بۆ ناردم، تا ئێستاش شتێکم نەخواردووە هێندەی ئەو خواردنە چێژی پێدابم.[٢]

## ١١٢٩. خەدیجی کوڕی سەلامە(رضي الله عنه)

ناوی خەدیجی کوڕی سەلامە یان کوڕی سالمە،[٣] دواتر لە کووفە نیشتەجێ بوو.[٤]

خەدیج یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەیعەتی دووەمی عەقەبە، بەڵام دواتر

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٥.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٥.
[٣] أسد الغابة، ج٢، ص ١٥٤.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٦.

نەیتوانی لە غەزای بەدر و ئوحوددا بەشداری بکات، بەڵام لە غەزاکانی دواتردا بەشداری کرد.[1]

## ١١٣٠. خەرەشەی ثەقەفی(رضي الله عنه)

ناوی خەرەشەیە و لە ثەقەفیەکانە، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و لە خزمەتیدا موسڵمان بوو.[2]

## ١١٣١. خەرەشەی کوڕی حارث(رضي الله عنه)

ناوی خەرەشەی کوڕ حارثەیە، ئەم هاوەڵە لەو هاوەڵانەیە کە دواتر لە حیمص نیشتەجێ بووە.[3]

خەرەشە فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوەو دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو:

(ستكون من بعدي فتنة، النائم فيها خير من اليقظان، والقاعد فيها خير من القائم، والقائم فيها خير من الساعي، فمن أتت عليه فليمش بسيفه إلى صفاة فليضربه بها حتى ينكسر، ثم ليضطجع لها حتى تنجلي عما انجلت).[4]

(بەم نزیکانە فیتنەیەک دێت کە ئەوەی تیایدا خەوتووە باشترە لەوەی بێدارە، ئەوەی تیایدا دانیشتووە باشترە لەوەی لەسەر پێی وەستاوە، ئەوەی تیایدا لەسەرپێ وەستاوە باشترە لەوەی ڕێ دەکات، هەرکەس گەیشتە کاتی ئەو فیتنەیە با شمشێرەکەی هەڵگرێت و هێندە بیدات بە بەردی پتەودا تا شمشێرەکەی دەشکێت، ئینجا با بۆی ڕاکشێت تا ئەوەی دەرکەوتووە نامێنێت و بارەکە هەڵدەگیرێت).

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ١٥٤.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٣.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٢.
[4] مسند أحمد بن حنبل - مسند الشاميين(رضي الله عنهم) - حديث خرشة بن الحر(رضي الله عنه) ، الرقم ١٧٢٤٨، قال شعيب الأرناؤوط صحيح لغيره.

## ١١٣٢. خەرەشەی کوڕی حارثی مورادی(ﷺ)

ناوی خەرەشەی کوڕی حارثی موڕادیە، وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو، خەرەشە یەکێکە لە بەشداربوانی فەتحی میصر.[1]

خەرەشە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لا يشهدن أحدكم قتيلا، لعله أن يكون قتل ظلما فيصيبه السخط)،[2] (کەس لە ئێوە ئامادەی کوشتنی کەسێک مەبن، چونکە لەوانەیە بە ستەم بکوژرێت و ئەوکات ئێوەش بە سزای بەشداری ئەو ستەمە بکەون).

## ١١٣٣. خەرەشەی کوڕی مالیک(ﷺ)

ناوی خەرەشەی کوڕی مالیکی ئەودیە، وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمان بوو، لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا لە ریزی سوپای عەلیدا بوو و لە جەنگەکانیدا بەشداری کرد.[3]

## ١١٣٤. خەزرەجی ئەنصاری(ﷺ)

ناوی خەزرەجە، کوڕێکی هەیە بە ناوی حارث کە فەرموودەیەکی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، حارث دەڵێت: لە خەزرەجی باوکمم بیست کە ئەویش لە پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیست کاتێک لەسەر سەری کابرایەکی پشتیوانی وەستابوو کە لە سەرەمەرگیدا بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی مەلەکولمەوت لەگەڵ هاوەڵەکەم نەرم بە چونکە ئەو باوەڕدارە)، مەلەکولمەوتیش وتی: ئەی موحەممەد دڵنیاو بێخەم بە، چونکە من لەگەڵ

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٣.

[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند الشاميين(ﷺ) - حديث خرشة بن الحارث وكان من أصحاب النبي(ﷺ) ، الرقم ١٧٧٩٤، ضعفه شعيب الأرناؤوط.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٣.

هەموو باوەڕدارێک نەرمونیانم و سۆزم دەبێت، ئەی موحەممەد بزانە من کە گیانی ئادەمیزادێک دەکێشم کەسێک لە کەسوکاری لەلایەکی ماڵەکەوە هاوار دەکات و گیانی مردووەکەش بە منە، دەڵێم ئەو هاوارە چیە؟ خۆ بەخوا ستەممان لێ نەکردووەو پێش وادەی خۆی گیانیمان نەکێشاوەو هەوڵمان نەداوە قەدەری پێش بخەین و هیچ تاوانێکیشمان نیە لە گیان کێشانیدا.[1]

## ١١٣٥. خەشخاشی کوڕی حارث(ﷺ)

ناوی خەشخاشە، دەوترێت ناوی باوکی حارثە، یان دەوترێت مالیکە، خەشخاش دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و منداڵێکی خۆمم لەگەڵ بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە منداڵی خۆتە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: (لايجنى عليك ولا تجني عليه)،[2] (حاڵی ئەو لەسەر تۆ نیەو حاڵی تۆیش لەسەر ئەو نیە).

## ١١٣٦. خەشرەمی کوڕی حوباب(ﷺ)

ناوی خەشرەمی کوڕی حوبابە، لە جەنگی ئوحود و غەزاکانی تریشدا بەشداری کرد، پاسەوانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، هەروەها لە بەیعەتی ریضواندا بەشداری کرد.[3]

## ١١٣٧. خەصفە(ﷺ)

ئەم هاوەڵە ناوی خەصفەیە یان رایەکی تر دەڵێت: ناوی ئیبن خەصفە بووە، خەصفە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئایا دەزانن پاڵەوان کێیە؟) وتمان: کەسێک کە کەسێکی تر بدات بە زەویدا و بەسەریدا

[1] الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ١٩٨٤، قال ابن حجر في الإصابة: عمرو بن شمر-في السند- متروك الحديث.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٨٤، قال ابن حجر إسناده لا بأس به.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٨٥.

سـەربکەوێت، ئەویـش فەرمـوی (إن الشـديد كل الشـديد الذي يملك نفسه عند الغضب)، (پاڵەوانی تـەواو پاڵـەوان ئـەو کەسـەیە کە لـە کاتی توورەییدا بەسـەر دەروونی خۆیـدا زاڵـەو خـۆی رادەگرێـت)..[1]

## ١١٣٨. خەللاد(رضي الله عنه)

خەلـلاد لـە جەنگی دژ بە بەنی قورەیضـەدا بەشداری کرد و تیایدا شـەهید بـوو، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (پاداشـتی دوو شـەهیدی هەیـە)، هـاوەڵان وتیان: بۆچی؟ فەرمووی: چونکە ئەهلی کیتاب کوشتوویانە، جا ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئـەوە خـودی خەلـلادی کـوڕی عەمـرە، بـەڵام ئیبـن حەجـەر دەڵێت: بەڵکو هاوەڵێکی تـرە چونکە ئەمەیان گەنجێک بـووە، بـەڵام خەلـلادی کـوڕی عەمـر هێنـدە تەمەنـی هەبـوو کـە کوڕەکەشـی هـاوەڵ بـوو.[2]

## ١١٣٩. خەللادی کوڕی رافیع(رضي الله عنه)

نـاوی خەلـلادی کـوڕی رافیعـە، لـە پشـتیوانانە لـە خەزرەجیـەکان، برایەکـی هەبـوو بـە نـاوی ریفاعـە، خـۆی و براکەیشـی لـە بەشـداربوانی بەدرن،[3]دایکـی نـاوی ئوممومالیکـە، [4]خەلـلاد ژنێکـی هەبـوو بـە نـاوی ئوممورافیـع کـە لـەم ژنـەی منداڵێکـی هەبـوو وبـە نـاوی یەحیـا.[5]

زۆرینـە پێیـان وایـە لـە غـەزای بـەدردا شـەهید بـووە،[6] بـەڵام ئیبـن سـەعد دەڵێت: خەللاد لە غەزای ئوحودیشدا بەشدار بوو.[7]

---

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢٢٩٥، موضع إرسال، شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ٣١٨٥، ضعفه الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة(١٤/٥٣٠).

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤١.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٣٨.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٩٧.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٩٧.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٣٨.

[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٩٧.

## ١١٤٠. خەللادی کوڕی سائیب(ﷺ)

ناوی خەللادی کوڕی سائیبی کوڕی خەللادە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان.[١]

سائیبی باوکیشی لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و فەرموودەی گێڕاوەتەوەو خەللادی کوڕی فەرموودەکەی لێوە گێڕاوەتەوە.[٢]

خەللاد دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) کاتێک نزای دەکرد ناو لەپی دەستەکانی تا لای دەموچاوی بەرز و نزیک دەکردەوە.[٣]

خەللاد دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو:(ما من شيء يصيب من زرع أحدكم ولا ثمرة من طير ولا سبع إلا وله فيه أجر)،[٤] (هەرچیەک تووشی کشتوکاڵ یان بەرهەم بێت، چ باڵندە یان دڕندە لێی بخوات، ئەوە خاوەنەکەی لەسەر ئەوە پاداشتی بۆ دەنووسرێت).

ئەمە دنیابینیەکی جوانە بۆ موسڵمان، ئیتر لەوە دڵنیایە تەنانەت ئەو بەرهەمەشی کە بێ ویستی خۆی ئاژەڵیش لێی دەخوات و دەیبات یان زیانی پێ دەگەیەنێت، هەروا بێ مانا ناڕوات، بەڵکو لای خوا پاداشتی لەسەر وەردەگرێت.

## ١١٤١. خەللادی کوڕی سوەید(ﷺ)

ناوی خەللادی کوڕی سوەیدە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، لە بەیعەتی عەقەبەو غەزای بەدردا بەشداری کرد، لە هێرشی سەر بەنی قورەیضەدا شەهید بوو.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٣٩.

[٢] صحيح ابن خزيمة.

[٣] مسند أحمد بن حنبل - أول مسند المدنيين(ﷺ) أجمعين - حديث السائب بن خلاد أبو سهلة(ﷺ) ، الرقم ١٦٨٣٠، ضعفه شعيب الأرناؤوط و قال مختلف عليه إسنادا و متنا.

[٤] المعجم الكبير للطبراني - باب الخاء - من اسمه خلاد - خلاد بن السائب الأنصاري ، الرقم ٤١٣٣، حسنه الحافظ ابن حجر في الإصابة.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤٠.

## ١١٤٢. خەللادی کوڕی عەمر(ﷺ)

ناوی خەللادی کوڕی عەمری کوڕی جەمووحە، دایکی ناوی هیندی کچی عەمرە کە پووری جابیری کوڕی عەبدوڵا بوو، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان لە سولەمیەکان، لە غەزای بەدر و ئوحوددا بەشداری کرد و لە ئوحوددا شەهید بوو.[١]

## ١١٤٣. خەلیفەی کوڕی عەددی(ﷺ)

ناوی خەلیفەیە، یان دەوترێت عەلیفە، کوڕی عەددی کوڕی عەمرە، یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر، تا سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب ژیا و لە ناو سوپای عەلیدا لە جەنگی صفیندا بەشدار بوو.[٢]

## ١١٤٤. خەنسائی کچی خیذام(ﷺ)

ناوی خەنسائی کچی خیذامە، خەنساء سەرەتا ژنی ئونەیسی کوڕی قەتادە بوو، ئەوەبوو ئونەیس لە غەزای ئوحوددا شەهید بوو، ئیتر خەنساء بێوەژن کەوت.[٣]

خەنساء دەڵێت: من بێوەژن بووم و لای باوکم مابوومەوە باوکم بەبێ ویستی خۆم منی لە کەسێک مارە کرد، منیش چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش هاوسەرگیریەکەی هەڵوەشاندەوە،[٤] دواتر خەنساء چوو بە ویستی خۆی شووی کرد بە ئەبوو لوبابە.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤٠.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤٤.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦١١.
[٤] صحيح البخاري - كتاب النكاح - باب إذا زوج ابنته وهي كارهة فنكاحه مردود، الرقم ٥١٣٨.
[٥] سنن الدارقطني - كتاب النكاح، الرقم ٣٥٥٢.

## ١١٤٥. خەنسائی کچی ڕیئاب(رضي الله عنها)

ناوی خەنسائی کچی ڕیئابی کوڕی نوعمانە، دایکی ناوی ئیدامی کچی حەرامە، خەنساء پووری جابیری کوڕی عەبدولایە، واتە عەبدولای باوکی جابیر برای بوو، ئەم ئافرەتە بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ)، خەنساء لەگەڵ عامیری کوڕی عەددیدا هاوسەرگیری کرد.[١]

خەنساء کوڕێکی هەبوو بە ناوی طوفەیل کە یەکێکە لە هاوەڵە گەورەکان و لە بەشداربوانی عەقەبە و بەدر و ئوحود و خەندەق و لە خەندەقدا شەهید بوو.[٢]

## ١١٤٦. خەنسائی کچی عەمر(رضي الله عنها)

ناوی خەنسائی کچی عەمرە، شاعیرێکی ناودار بوو، لەگەڵ هۆزەکەیدا کە بەنی سولەیم بوو هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێدەکرد شیعر بهۆنێتەوەو سەرسام بوو بە شیعرەکانی خەنساء و بە خواناس ناوی دەبرد و بە ئاماژەی دەستی ئاماژەی بۆ دەکرد و دەیفەرموو: ئادەی ئەی خوناس-شیعر بڵێ-.

کاتێک موعاویەی برای و دواتر صەخری برای کوژران، ئیتر خەنساء زۆر شیعری دەهۆنیەوە، بەتایبەت بەسەر صەخری برایدا کە تەنها لە سەری باوکیەوە برای بوو، بەڵام صەخری زیاتر خۆشدەویست چونکە زۆر نەرمونیان و بەخشندە و خوێن گەرم بوو.[٣]

خەنساء دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە جەنگی قادسیەدا بەشدار بوو، هەر چوار کوڕەکەی خۆی لەگەڵ بوو، خەنساء ئامۆژگاری منداڵەکانی دەکرد بەشداری جەنگەکە بن و هانی دەدان چاک بجەنگن و ڕانەکەن، بەوانی

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦١٢.

[٢] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٧٣.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦١٤.

دەوت ئێوە بە ویستی خۆتان موسڵمان بوون و بە ویستی خۆتان کۆچتان کردووە، ئێوە کوڕانی یەک باوک و دایکن، کە بەیانی جەنگ دەستی پێکرد هەر چواریان مەردانە جەنگان تا یەک دوای یەک شەهید بوون.[1]

کاتێک هەواڵی کوژرانی منداڵەکانی گەیشتەوە بە خەنساء، وتی: سوپاس بۆ خوای گەورە کە ڕێزداری کردم بە کوژرانی چوار منداڵەکەم، داوام لە خوایە لە پێگەی حەسانەوەی دوارۆژیدا لەگەڵ منداڵەکانم کۆم بکاتەوە.[2]

عومەری کوڕی خەططاب تا مابوو مووچەو پشکی چوار منداڵەکەی خەنسائی دەدا بە خەنساء.[3]

## ١١٤٧. خەولەی خزمەتکار(ﷺ)

ناوی خەولەیەو خزمەتکاری پێغەمبەری خوایە(ﷺ).[4]

خەولە دەڵێت: جارێک توتکەیەک هاتە ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) و چووبوویە ژێر ڕاخەرێکەوەو لەژێریدا تۆپیبوو، چەند ڕۆژێک تێپەڕ بوو و سروش دانەبەزی بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی خەولە لە ماڵی پێغەمبەری خوادا چی ڕوویداوە، جبرەیل نایەت بۆ لام، ئایا هیچ شتێک لە ماڵی پێغەمبەری خوادا ڕوویداوە؟)، منیش وتم: لە هەموو ڕۆژێک باشترین و هیچ ڕووینەداوە، پێغەمبەر(ﷺ) عەباکەی سەرشانی هەڵگرت و لە ماڵ چوویە دەرەوە، منیش وتم: با دەستێک بێنم بە ماڵەکەدا، سەرقاڵی گسک دانی بووم کە گسکەکەم کرد بە ژێر ڕاخەرەکەدا بینیم شتێکی قورسی لەژێرە، تەماشام کرد توتکەیەکی تۆپیوە، منیش بردم و فڕێم دایە دەرەوە، کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتەوە ماڵەوە سروشی بۆ دابەزی.[5]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦١٥.

[2] أسد الغابة، ج٧، ص ١٠١.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦١٦.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٢٨.

[5] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٠٤٧٧، الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ٣٠٣٥، ضعفه الألباني في

## ١١٤٨. خەولەی کچی ثامر(رضي الله عنها)

ناوی خەولەی کچی ثامرە، لە پشتیوانانە، خەولە دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو:(الدنيا حلوة خضرة و إن رجالا يتخوضون في مال الله بغير حق لهم النار يوم القيامة)،[1] (دنیا خۆش و سەوزە، خەڵکانێکیش هەن بە ناحەق هەڵسوکەوت دەکەن بە سامانی خواوە، لە رۆژی دواییدا دۆزەخیان بۆ هەیە).

## ١١٤٩. خەولەی کچی حەکیم(رضي الله عنها)

ناوی خەولەی کچی حەکیمی کوڕی ئومەییەیە، هاوسەری عوثمانی کوڕی مەظعوونە، کونیەکەی ئوممو شەریکە، ئافرەتێکی زۆر خواناس و چاکەکار بوو،[2] دایکی خەولە ناوی چەعیفەی کچی عاصە.[3]

خەولە لە عوثمانی هاوسەری دوو کوڕی هەبوو بە ناوەکانی عەبدورەحمان و سائیب.[4]

خەولەی کچی حەکیم دەڵێت: کاتێک خەدیجەی کچی خوەیلید وەفاتی کرد، چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەتبینم بە مەرگی خەدیجە بۆشاییەک کەوتۆتە ژیانتەوە، ئەویش فەرمووی: (بەڵێ، ئەو دایکی منداڵەکان و خاتوونی ماڵەوە بوو).[5]

---

سلسلة الاحاديث الضعيفة(٣١٦/١٣).

[1] مسند أحمد بن حنبل - من مسند القبائل - حديث خولة بنت ثامر الأنصارية(رضي الله عنها)، الرقم ٢٧٩٥٩، صححه شعيب الأرناؤوط، وقد أخرجه البخاري - كتاب فرض الخمس - باب قول الله تعالى فأن لله خمسه، الرقم ٣١١٨ من (إن رجالا...).

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٢١.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٠١.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٣٩٣.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٣، قال الحافظ ابن حجر وسنده قوي مع إرساله.

عائیشـەی دایکی بـاوەڕداران دەڵێت: جارێـک خوەیلـەی کچـی حەکیـم هاتـەژوورەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) بینـی شـێوەیەکی شـپرز و شـێواوی هەیـە، بـە عائیشـەی فەرمـوو ئـەوە بـۆ وایـە؟ عائیشـە وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئـەو ژنـە مێردی نیـە، چونکـە مێردەکـەی بـە ڕۆژ ڕۆژوو دەگرێت و بـە شـەویش شـەونوێژ دەکات، دەسـتی لـە خـۆی شـتووەو خـۆی وێـران کـردووە،[1] پێغەمبەریـش(ﷺ) نـاردی بـە شـوێن عوثمانـی کـوڕی مەظعوونـداو ئەویـش هـات، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (ئـەی عوثمـان پشـتت کردوەتـە سـوننەتم؟) عوثمـان وتـی: نەبەخـوا ئـەی پێغەمبـەری خـوا ( بەڵکو بـە شـوێن سـوننەتی تۆدا هەنـگاو دەنێـم، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (فإني أنام وأصلي وأصوم وأفطر، وأنكح النساء، فاتق الله يا عثمان، فإن لأهلك عليك حقا، وإن لضيفك عليك حقا، وإن لنفسك عليك حقا، فصم وأفطر وصل ونم)،[2] (دەی مـن دەخـەوم و نوێژیش دەکـەم، ڕۆژوو دەگـرم و بەربانگیش دەکەمـەوە، ژن بەهاوسـەر دەگـرم، دەی ئـەی عوثمـان لەخـوا بترسـە چونکـە ژن و منداڵـت مافیـان هەیـە بەسـەرتەوەو میوانـت مافـی هەیـە بەسـەرتەوەو جەستەشـت مافـی هەیـە بەسـەرتەوە، دەی ڕۆژوو بگـرەو ڕۆژووش بشـکێنە، نوێـژ بکـەو بشـخەوە).

## ١١٥٠. خەولەی کچی خەولی(﵄)

نـاوی خەولـەی کچـی خەولـی کـوڕی عەبدوڵایـە، لـە پشـتیوانانە، برایەکـی هەبـوو بـە نـاوی ئـەوس، خەولـە بەیعەتـی دا بـە پێغەمبـەر(ﷺ).[3]

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٥٧٣٣، حسنه شعيب الأرناؤوط.

[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند عائشة(﵂)، الرقم ٢٦٩٤٩، حسنه شعيب الأرناؤوط، سنن أبي داود - كتاب الصلاة - باب ما يؤمر به من القصد في الصلاة ، الرقم ١٣٦٩، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ١٣٦٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٢٣.

## ١١٥١. خەولەی کچی عوقبە(ﷺ)

ناوی خەولەی کچی عوقبەی کوڕی رافیعی ئەشهەلیە، خوشکی ئوممولحەکەم و ئوممومسەعدە، بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ)، هاوسەرەکەشی حارثی کوڕی صیممە بوو کە سەعدی لێ بوو و دواتر مێردەکەی مرد و دوای ئەوە شووی کرد بە عەبدوڵای کوڕی قەتادە.[١]

## ١١٥٢. خەولەی کچی قەیس(ﷺ)

ناوی خەولەی کچی قەیسە، ئەم ئافرەتە هاوسەری هیشامی کوڕی عامیر بوو، خەولە موسڵمان بوو و بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ).[٢]

## ١١٥٣. خەولەی کچی قەیسی ئەنصاری(ﷺ)

ناوی خەولەی کچی قەیسی کوڕی قەهدە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان لە بەنی نەجار، کونیەکەی ئەبوومحەممەدە، دەوترێت هاوسەری حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ) بووە.

خەولە لە حەمزە ئەم منداڵانەی هەبوو (عومارەی کوڕی حەمزە،[٣] ئومامەی کچی حەمزە،[٤] یەعلای کوڕی حەمزە).[٥]

کاتێک حەمزە هاتە مەدینە خەولەی کچی قەیسی بەهاوسەر گرت، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی ماڵی حەمزەی دەکرد، بەو هۆیەوە خەولە فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەبیست، خەولە دەڵێت: رۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ ماڵمان و منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیستوومە فەرمووتە لە رۆژی

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٢٤.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٢٤.
[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٨
[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ١٥٨.
[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٤٤٤.

دواییدا حەوزێکت هەیە نێوانی ئەوەو ئەوە فراوانە، ئەویش فەرمووی: (بەڵێ) خەولە دەڵێت: ئینجا قاپێکم بۆ هێنا خواردنێکی تێدا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی خستە ناو قاپەکەوە دەستی سووتا و فەرمووی: (حەسسی).[1]

خەولە دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو:(إن الدنیا حلوة خضرة، فمن أخذها بحقها بورك له فیها، ورب متخوض في مال الله ومال رسوله له النار یوم القیامة)،[2] (دنیا شیرین و سەوزە، هەرکەس بە دروستی لێی بنەوێت بەرەکەتدار دەکرێت بۆی، لەوانەیە هەبێت بە نارەوا بنەوێتە سامانی خوا و سامانی پێغەمبەرەکەی لە رۆژی دواییدا بۆی دەبێتە دۆزەخ).

جارێک دەشتەکیەک هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و داوای قەرزدانەوەی لێکرد، زۆر لەسەری چوو و وتی: ئەگەر ئێستا قەرزەکەم نەدەیتەوە ئازارت دەدەم، هاوەڵان پیایدا هەڵشاخان و وتیان: دەزانیت لەگەڵ کێ قسە ئەکەیت؟ وتی: من هێندە دەزانم داوای مافی خۆم دەکەم، پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو دەبێت لەگەڵ خاوەن حەق بن، ئینجا ناردی بۆ لای خەولەی کچی قەیس و فەرمووی: (ئەگەر بەرهەمت لایە بە قەرز بماندەرێ تا بەرهەمەکەی خۆمان بۆ دێت ئەوکات قەرزەکەت دەدەینەوە)، ئەویش وتی: بە باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)،قەرزەکەی پێدا و کابرای دەشتەکی چوو.[3]

خەولە دوای شەهیدبوونی حەمزە شووی کرد بە حەنظەلەی کوڕی نوعمان و لەو مێردەشی کوڕێکی بوو بە ناوی موحەممەد.[4]

---

[1] مسند أحمد بن حنبل - من مسند القبائل - حدیث خولة بنت حکیم(ﷺ)، الرقم ٢٧٩٥٧، قال شعیب الارناؤوط رجاله ثقات رجال الصحیح.

[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند النساء(ﷺ)ن - حدیث خولة بنت قیس(ﷺ)، الرقم ٢٧٦٩٦، صحیح ابن حبان - کتاب السیر - باب في الخلافة والإمارة - ذکر إیجاب النار نعوذ بالله منها لمن تقلد شیئا من أمور المسلمین وانبسط في أموالهم بغیر إذنهم ، الرقم ٤٥١٢، صححه شعیب الأرناؤوط، صححه الألباني في صحیح و ضعیف سنن الترمذي، الرقم ٢٣٧٤.

[3] سنن ابن ماجه - أبواب الصدقات - باب لصاحب الحق سلطان ، الرقم ٢٤٢٦، صححه الألباني في صحیح و ضعیف سنن ابن ماجة، الرقم ٢٤٢٦.

[4] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٨ ص ٤٤٤.

## ١١٥٤. خەولەی کچی موندیر(ﷺ)

ناوی خەولەی کچی موندیری کوڕی زەیدەو کونیەکەی ئوممو بوردەیەو زیاتر بە کونیەکەی ناسراوە، ئەم ئافرەتە دایەنی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و شیرپێدانی ئەوی لەئەستۆ گرتبوو.[1]

پشتیوانان زۆر حەزیان دەکرد ئەرکی شیرپێدانی ئیبراهیم بگرنە ئەستۆ تا سەرقاڵی ماریە نەهێڵن، چونکە دەیانزانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر ماریەی خۆشدەوێت، بۆیە هەموان هەوڵیاندەدا ئەرکی شیرپێدانی بگرنەئەستۆ.[2]

ئوم بەردەی کچی موندیری کوڕی زەیدی ئەنصاری کە ژنی بەرائی کوڕی ئەوس بوو، هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و داوای لێکرد تا شیرپێدانی ئیبراهیمی پێ بسپێرێت، ئەم ئافرەتە ناوی خەولەی کچی موندیر بوو لە بەنی مازن بوو، داوای کرد رۆژانە شیر بدات بە ئیبراهیم و دواتر بیباتەوە بۆ لای ماریەی دایکی، پێغەمبەریش(ﷺ) بەشە دارخورمایەکی هەبوو دای بە ئوم بەردە.[3]

## ١١٥٥. خەولەی کچی ئیاس(ﷺ)

ناوی خەولەی کچی ئیاسی کوڕی جەعفەری حەنەفیە، سەنەدێکی لاواز هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) خەولەی دیوەو پێکەنیوەو دواتر فەرموویەتی: ئەی عەلی تۆ دوای من ئەم ئافرەتە بە هاوسەر دەگریت و منداڵێکت لێی دەبێت، دەی ناوی منی لێ بنێ و کونیەی منی لێ بنێ.[4]

خەولە هاوسەری عەلی کوڕی ئەبوو تالیب و دایکی موحەممەدی کوڕی عەلیە، واتە باوەژنی حەسەن و حوسەینی کچەزاکانی پێغەمبەرە(ﷺ).

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٢٦.
[2] أسد الغابة ج١ص٦٣، الاستيعاب ج١ ص٥٥.
[3] الاستيعاب ج١ ص٥٥،٥٦.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦١٧.

## ١١٥٦. خەولەی کچی عوبەید(رضي الله عنها)

ناوی خەولەی کچی عوبەیدە، لە پشتیوانانە لە بەنی نەججار، بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ)، خەولە لەگەڵ صامتی کوڕی زەید هاوسەرگیری کرد و کوڕێکی بوو بە ناوی موعاویە.[1]

## ١١٥٧. خەولەی کچی قەعقاع(رضي الله عنها)

ناوی خەولەی کچی قەعقاعی کوڕی میعبەدە، تا سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان ژیا.[2]

## ١١٥٨. خەولەی کچی قەیس(ئومموصوبەییە)(رضي الله عنها)

ناوی خەولەی کچی قەیسەو بە ئومموصوبەییە ناسراوە، هەرچەندە ئیبن مەندە ئەم خەولەیە لەگەڵ ئامۆژنەکەی پێغەمبەر(ﷺ) خەولەی ژنی حەمزە بە یەکێک دادەنێت بەڵام هەریەک لە ئەبوو نوعەیم و ئیبن حەجەر بە هاوەڵێکی جیای دادەنێن.[3]

خەولە دەڵێت: جار هەبوو کە دەستنوێژم دەگرت لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە یەک تەشتدا دەستنوێژمان دەگرت و هەردووکمان دەستمان لەناویدا بوو.[4]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٢٤.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٢٤.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٢٦.

[4] مسند أحمد بن حنبل - مسند النساء(رضي الله عنهن) - حديث أم صبية الجهنية(رضي الله عنها)، الرقم ٢٧٧٠٩، سنن ابن ماجه - أبواب الطهارة وسننها - باب الرجل والمرأة يتوضآن من إناء واحد ، الرقم ٣٨٢، سنن أبي داود - كتاب الطهارة - باب الوضوء بفضل المرأة ، الرقم ٧٨، صححه شعيب الأرناؤوط، قال الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ٣٨٢ حسن صحيح.

## ١١٥٩. خەولەی کچی مالیک(ﷺ)

ناوی خەولەی کچی مالیکی کوڕی بیشرە، لە پشتیوانانەو بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ)، خەولە هاوسەری زیادی کوڕی زەید بوو.[١]

## ١١٦٠. خەولەی کچی یەمان(ﷺ)

ناوی خەولەی کچی یەمانە، خوشکی حوذەیفەی کوڕی یەمانە،[٢]بەڵام یەمان نازناوی حیسلی باوکی بووە، رایەکیش دەڵێت: پێی وتراوە یەمان چونکە کەسێکی کوشتووەو رایکردووە بۆ مەدینەو لەگەڵ بەنی عەبدولئەشهەل هاوپەیمانی بەستووە، ئیتر هۆزەکەی پێیان وتووە یەمان لەبەرئەوەی لەگەڵ پشتیوانان هاوپەیمانی کردووە لەکاتێکدا ئەوان یەمەنین،[٣] حیسلی باوکیشی هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو و لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد، بەڵام بە دەستی یەکێک لە هاوەڵان کوژرا چونکە ئەو هاوەڵە نەیناسیەوەو وایزانی لە بێباوەڕانە، چونکە سوپای موسڵمانان زۆریان دەموچاویان داپۆشیبوو، بۆیە دەبوو نیشانەیەکیان هەبوایە تا بناسرێنەوە، حوذەیفە کاتێک بینی هێرش برا بۆ باوکی هاواری دەکرد باوکم باوکم، بەڵام دەنگی نەگەیشت و باوکی بە هەڵە کوژرا، دواتر حوذەیفە خوێن بایی باوکی وەرنەگرت و لە موسڵمانان خۆش بوو.[٤]

برایەکی هەبوو بە ناوی صەفوان کە ئەویش لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد،[٥]برایەکی تری ناوی عەبدولعەزیز بوو کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[٦]

---

[١] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٣٩٣.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٢٧.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٥٧٢-٥٧٣.
[٤] سير أعلام النبلاء، ج٢،ص ٣٦٢.
[٥] أسد الغابة، ج٣، ص ٣٣.
[٦] أسد الغابة، ج٣، ص ٥٢٣.

خوشکێکی هەبوو ناوی لەیلا بوو کە دایکی هاوەڵی گەورەی پێغەمبەر(ﷺ) سەلەمەی کوڕی ثابتی کوڕی وەقش بوو،[1]خوشکێکی تری ناوی فاطیمە بوو کە ئەمیش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[2]

## ١١٦١. خەولی کوڕی عومەر(رضي الله عنه)

ناوی خەولی کوڕی عومەرە کە باوکی بە ئەبی خەولی ناسراوە، دوو برای هەبو بە ناوەکانی عەبدوڵا و هیلال، ئەم سێ برایە هەموویان لە غەزای بەدردا بەشدار بوون، خەولی لە سەردەمی خیلافەتی عومەردا کۆچی دوایی کرد.[3]

## ١١٦٢. خەوواتی کوڕی جوبەیر(رضي الله عنه)

ناوی خەوواتی کوڕی جوبەیری کوڕی نوعمانە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، کونیەکەی ئەبوو عەبدوڵایە، یان دەوترێت کونیەکەی ئەبوو صاڵحە.[4]

برایەکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە ئەویش یەکێک بوو لە هاوەڵە گەورەکان و لە بەشداربوانی بەیعەتی عەقەبە و بەدر بوو و لە غەزای ئوحوددا بەرپرسی تیرهاوێژەکان بوو و تا دواسات لە شوێنی خۆی مایەوەو دواجار شەهید بوو.[5]

خەووات یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر، بەڵام بەهۆی برینداری قاچیەوە نەیتوانی بەشداری خودی جەنگەکە بکات، بەڵام لە دەستکەوت و پاداشتیشدا وەک بەشداربوویەک حسابی بۆ کرا.[6]

---

[1] الطبقات الکبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٤١.
[2] أسد الغابة، ج٧، ص ٢٥٢.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤٨.
[4] أسد الغابة، ج٢، ص ١٨٢.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٣٥.
[6] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٣٣٠.

دوای ئەوەش خەووات لە غەزای ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی تریشدا بەشدار بوو.[1]

خەووات باسی کاتی شکستی موسڵمانان دەکات لە ئوحوددا و دەڵێت: کاتێک بێباوەڕان گەیشتنە سەر شاخەکە تەنها عەبدوڵای کوڕی جوبەیر و دە کەسی تر مابوونەوە، ماوەیەک جەنگان و دواجار ئەمیری موسڵمانان کە عەبدوڵای کوڕی جوبەیر بوو کوژرا و ئەوانی دیکەش بریندار بوون، ئینجا بێباوەڕان تەرمی ئەو هاوەڵانەیان شێواند، منیش هاودەم بە هاوەڵێکم چووم بۆ لای عەبدوڵا و ناوسکی دەرهاتبوو، بە مێزەرەکەم بۆم بەست، کە هەردووکمان هەڵمانگرت و دوژمنیش شوێنمان کەوتبوو، لەناکاوێکدا مێزەرەکەم بەربوو و ناوسکی شۆڕبوویەوە، هاوڕێکەم ترسا و سەیری دواوەی دەکرد وایدەزانی دوژمنە پێمان گەیشتووە، منیش پێکەنیم.[2]

هەروەها باسی غەزای خەندەق دەکات و دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بانگی کردم ئەوکاتەی لە خەندەقدا گەمارۆ درابووین، فەرمووی: (انْطَلِقْ إِلَى بَنِي قُرَيْظَةَ فَانْظُرْ هَلْ تَرَى لَهُمْ غُرَّةً أَوْ خَلَلاً مِنْ مَوْضِعٍ فَتُخْبِرُنِي) (بڕۆ بۆ نێو بەنوقورەیزە و بزانە هیچ بۆشی و کەلێنێکیان لە هیچ لایەکەوە هەیە و هەواڵیانم بۆ بهێنەرەوە)، منیش دەمەو خۆرئاوابوون ڕۆیشتم، کە نوێژی ئێوارەم کرد و دواتر نزیک بوومەوە لێیان، خۆم حەشاردا و تاوێک چاوم لەسەر قەڵاکەیان بوو، دواتر خەو زۆری بۆ هێنام و حەوتم، هێندەم بینی کەسێک ملی گرتم و بردمی، زانیم یەکێکە لە بەنوقورەیزە، ئەو کاتەش شەرمێکی زۆر دایگرتم لە ئاست پێغەمبەری خوادا(ﷺ) چونکە سەنگەرێکی پێ سپاردبووم و منیش زایەم کردبوو، ئینجا بیری خەوبردنەوەکەم کەوتەوە، کابراش خەریک بوو پەلکێشی قەڵاکەی دەکردم و بە زمانی جوولەکەش قسەی دەکرد، منیش ناسیمەوە، بیرم کەوتەوە ئەوان عادەتیان وابوو هەرکامیان پاچێک بە

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤٦.

[2] الواقدي: المغازي، ج١، ص ٢٨٤.

کەلەکەوەیەتی، خێرا پاچەکەم فڕاند و ئەویش سەرقاڵ بوو لەگەڵ کابرایەک قسە دەکرد کە لەسەر قەڵاکە بوو، دام لە جەرگی و ئەویش هاواری دەکرد: دڕندە.. کابرا مرد و ئەوانیش منیان پێ نەگیرا و لە ڕێی خۆمەوە گەڕامەوە، جیبریل هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پێغەمبەریش فەرمووی: بردتەوە ئەی خەووات، ئینجا چووە نێو هاوەڵانی و باسی منی دەکرد، چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش لەنێو هاوەڵانیدا بوو و قسەیان دەکرد، کە منی بینی، فەرمووی: (أفلح وجهك) (ڕووگەش بیت)، منیش وتم: تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، فەرمووی: باسەکەی خۆتم بۆ بگێڕەوە، منیش بۆم گێڕایەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (هَكَذَا أَخْبَرَنِي جِبْرِيلُ)[1] (جیبریلیش ئاوا بۆی گێڕامەوە).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) خەوواتی کوڕی جوبەیری نارد بۆ لای بەنی قورەیضە تا بانگەوازیان بکات بۆ ئیسلام، ئەوانیش وتیان: ئێمە وەک پیاوێکی دوو پەل واین کە پەلێکی بڕاوەو یەکێکی ماوە، بۆیە ڕازی نەبوون.[2]

خەووات دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە مەڕوظەهران بووم، ئینجا لە خەیمەکەی خۆم هاتمە دەرەوە دەبینم بڕێک ئافرەت قسە ئەکەن، منیش کەیفم هات بە وەزعەکە، بۆیە چوومەوە ناو چادرەکەم و جلە جوانەکانم پۆشی و هاتمەوە لەگەڵ ئافرەتەکان دانیشتم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە خێوەتەکەی هاتە دەرەوەو و پێی فەرمووم (ئەی ئەبوو عەبدوڵا ئەوە بۆ چ شتێک لەگەڵ ئەو ئافرەتانە دانیشتویت؟) منیش کە پێغەمبەرم(ﷺ) بینی سام دایگرتم و قسەم لێ شێوا و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وشترێکم دەرچوو و منیش ویستم گوریسێکم دەست بکەوێت تا بچم وشترەکەمی پێ بهێنمەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) عەباکەی خۆی بۆ فڕێدام و چوو تارەتی گرت و دەستنوێژی گرت و هاتەوە، ئاو لە ریشیەوە دەچۆڕایە سەر سنگی، ئینجا

[1] الواقدي: المغازي، ج٢، ص ٤٦١.

[2] المطالب العالية لابن حجر، الرقم ٤٣٧٦.

فەرمووی: ئەی ئەبووعەبدولڵا وشترەکەت چی لێهات؟ ئیتر کەوتینە ڕێ، لەو ڕێیەدا هەرکات پێم دەگەیشت دەیفەرموو ئەی ئەبوو عەبدولڵا وشترە راکردوەکەت چی لێهات؟ منیش بەوە شەرمەزار دەبووم و هەوڵم دەدا زوو بگەمەوە مەدینە، ئیتر رووم نەبو وبچمە مزگەوت و کۆڕی پێغەمبەر(ﷺ)، ماوەیەکی زۆر وا بووم، ئیتر جارێک کە زانیم مزگەوت چۆڵە دەرفەتم قۆستەوەو چوومە مزگەوت و نوێژم کرد، لە نوێژدا بووم کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە مزگەوت، دوو رکاتی کورت نوێژی کرد، منیش هەر نوێژەکەم درێژ ئەکردەوە بەو هیوایەی پێغەمبەر(ﷺ) بڕوات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (سەلامت لێ بێت ئەبوو عەبدولڵا وشترە راکردووەکەت چی بەسەرهات؟) منیش وتم: سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە ئەو وشترەم تا ئێستا بۆ تاکە جارێکیش راینەکردووە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (رەحمەتی خوات لێ بێت) سێ جار ئەوەی فەرموو، ئیتر دوای ئەوە ئەو پرسیارەی لێ نەدەکردم.[1]

جا لە گێرانەوەیەکی تردا هاتووە خەووات دەڵێت: جارێک نوێژم ئەکرد و نوێژەکەم درێژ ئەکردەوە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم (نوێژەکەت درێژ مەکەرەوە، ئیشمان پێتە)،[2] پێدەچێت لە هەمان رووداودا بووبێت کاتێک خەووات نوێژەکەی درێژ کردوەتەوە تا پێغەمبەر(ﷺ) بڕوات.

خەووات دەڵێت: جارێک لەگەڵ عومەری کوڕی خەططاب چووین بۆ حەج، لە کاروانێکدا بووین کە ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەرراح و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی تێدا بوو، خڵکەکە وتیان: ئەی خەووات شیعرێکمان بە ئاوازەوە بۆ بڵێ، منیش بە ئاوازەوە برێ شیعرم بۆ وتن، ئینجا وتیان: لە شیعری فلانمان بۆ بڵێ، عومەری کوڕی خەططاب وتی: وازی لێ بێنن با لەوانەی ناخی دڵی خۆیمان بۆ بڵێت، منیش شیعری دڵی خۆمم بە ئاوازە

[1] المعجم الكبير للطبراني - باب الخاء - من اسمه خوات - خوات بن جبير الأنصاري، الرقم ٤١٤٦.

[2] المعجم الكبير للطبراني - باب الخاء - من اسمه خوات - خوات بن جبير الأنصاري، الرقم ٤١٥٠.

دەهۆنیەوە بۆیان تا هێندە بەردەوام بووم دەمەو پارشێو هات، عومەر وتی: بەسە وا دەمەو بەیانە، ئەبووعوبەیدە وتی: خەووات وەرە بۆ لای من لە عومەر خراپتر نیم (یانی مەجالت دەدەم)، پێکەوە چووینە ئەولاوەو هەتا کاتی نوێژی بەیانی هەر بە ئاوازەوە شیعرم بۆ هۆنیەوە.[1]

خەووات لە خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو تالیبدا لەناو ریزی سوپای عەلیدا بوو.[2]

لە دواییەکاتی تەمەنیدا خەووات بینایی لەدەستدا.[3]

خەووات لە ساڵی چلی کۆچی و لە تەمەنی حەفتا و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کرد،[4] رایەکی تریش دەڵێت: لە ساڵی چل و دووی کۆچیدا وەفاتی کردووە.[5]

خەووات بۆ رەنگی ریشی خەنەو وسمەی بەکاردەهێنا،[6] دیارە دەبێت ئەمەش لە دواییەکانی تەمەنیدا بووبێت.

## ١١٦٣. خەیبەری کوڕی نوعمان(ﷺ)

ناوی خەیبەری کوڕی نوعمانە، ئەم هاوەڵە فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) سەیری شاخەکەی ئەوانی کردووە کە ناوی ئەجەء بووەو نزای نەبوونی برسێتی کردووە بۆیان و لێیان رازی بووە.[7]

---

[1] السنن الكبرى للبيهقي - كتاب الحج - جماع أبواب ما يجتنبه المحرم - باب لا يضيق على واحد منهما أن يتكلم بما لا يأثم فيه من شعر أو غيره، الرقم ٩٢٧٧.

[2] المعجم الكبير للطبراني.

[3] معجم الصحابة للبغوي، ج٢، ص ٢٧٥.

[4] المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٧٣٤.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤٧.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٧٧.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٥٠.

## ١١٦٤. خەیثەمەی کوڕی حارث(رضي الله عنه)

ناوی خەیثەمەی کوڕی حارثی کوڕی مالیکە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، کوڕێکی هەبوو بە ناوی سەعد کە لە غەزای بەدردا شەهید کرا.[١]

کاتێک هاوەڵان خۆیان ئامادە دەکرد بۆ جەنگی بەدر، خەیثەمە بە سەعدی کوڕی وت دەبێت یەکێکمان بچین و ئەوی ترمان لە ماڵەوە بمێنێتەوەو لای ژن و مناڵەکان بێت، بۆیە تۆ لێرە بە با من بچم، سەعد وتی: باوکە گیان ئەگەر مەسەلەکە جگە لە بەهەشت بوایە بەدڵنیاییەوە رازی دەبووم، بەڵام من هیوام هەیە ئەمجارە شەهیدیم بە نسیب بێت، دواجار باوک و کوڕ گەیشتنە ئەوەی تیرو پشک بکەن، ئەوەبوو سەعد ناوی دەرچوو، بۆیە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)لە بەدردا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[٢]

خەیثەمە یەکێکە لە بەشداربوانی ئوحودو لەو غەزایەدا بە دەستی هوبەیرەی کوڕی ئەبی وەهب شەهید کرا.[٣]

بەوجۆرە ئەو تاسەی شەهیدیەی کە لەگەڵ کوڕەکەی تیروپشکی بۆ دەکرد، لە یەکەم غەزادا بۆ کوڕەکەی بوو کە پاداشتی ئەوەشی دەستکەوت، لە دووەم غەزاشدا بۆ خۆی بوو.

**پەندو وانە**

ئەم بەسەرهاتە نیشانەی راستگۆیی ئەو باوک و کوڕەیە کە چەندە بڕوایان بەو جیهادە هەبووەو تاسەی شەهیدیان هەبووە، بە داخەوە موسڵمانانێکی ئەمڕۆ هەر جەنگێک کە بە دیدی خۆیان بە رەوای بزانن دەیکەنە جیهاد و هەندێ جار خوێنە رەواکان حەرام و خوێنە نارەواکان حەڵاڵ دەکەن، کەچی ئەو جیهادەی هاواری بۆ دەکەن و خەڵکی بۆ هان دەدەن و ئەو شەهیدیەی دڵی گەنجانی بۆ جۆش دەدەن و تاسەی مەرگیان

[١] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٤٥٨.

[٢] أسد الغابة، ج٢، ص ٤١١.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٥٠.

لا زیاد دەکەن، لای خۆیان لەوپەڕی بەهێزی بیرکردنەوەیاندا موستەحەببێکە کە سەدان شتی گەورەتر هەیە لەپێشیەوە، بۆ ئەم کارەیان دەیان بیانوو ریز دەکەن و هەوڵ دەدەن ئەو بیانوانەش بشەرعێنن، جا ئەگەر جیهادێک هەبێت و مەرگ تیایدا شەهیدی بێت و پاداشتەکەشی بەهەشتی فیردەوس بێت، چ گەمژەییەکە بانگەوازکەرەکە خۆی لێ بێبەش بکات، مەگەر برسیەک کە خوانێکی گەورەی رازاوە بەدی بکات و مافی هەبێت لە خواردنیدا، گەمژە نیە ئەگەر برسێتی خۆی بەو خوانە خۆشە زۆرە نەشکێنێت! ئەوەتا ئەم باوک و کوڕە مادەم دەزانن مەسەلەی بەهەشتە، تیرو پشکی بۆ دەکەن، ئایا ئەمە لە ئەزموونی ئەمڕۆی موسڵماناندا هەیە؟ بە دڵنیاییەوە زۆر کەمە، بەڵکو بگرە بووەتە بەسەرهاتێک.

## ١١٦٥. خەیرەی کچی ئەبی ئومەییە(ﷺ)

ناوی خەیرەی کچی ئەبی ئومەییەیە، لە پشتیوانانە، هاوسەری میکنەفی ئەنصاریە، ئەم ئافرەتە موسڵمان بوو و بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ).[1]

## ١١٦٦. خوبەیبی کوڕی عەددی(ﷺ)

ناوی خوبەیبی کوڕی عەددی کوڕی مالیکی کوڕی عامیرە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[2]یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر.[3]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دە کەسی لە هاوەڵانی بە سریەیەک نارد، عاصیمی کوڕی ثابتی ئەنصاری کرد بە ئەمیریان، کە گەیشتنە ناوچەیەکی نێوان عوسفان و مەککە، دەستەی بەنولیحیان بە نزیکەی دووسەد کەسەوە هاتن و کەوتنە شوێنیان، کە گەیشتنە شوێنەکەیان بینییان ناوکی خورما جێماوە،

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٢٩.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٢.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٢.

وتیان: ئەم ناوکە هی خورمای مەدینەیە، بۆیە کەوتنە شوێنیان، کاتێک عاصیم و هاوەڵەکانی ئەوانیان بینی هەستیان بە مەترسی کرد و لە شوێنێک خۆیان پەنا دا، بەڵام بەنولیحیان گەمارۆیان دان و وتیان: خۆتان بدەن بە دەستەوە لە پەنادا دەبن و کەستان ناکوژین، عاصمی ئەمیری سریەکە وتی: بەخوا من خۆم نادەمە بەر پەنای بێباوەڕ، خوایە هەواڵی ئێمە بگەیەنەرە پێغەمبەرەکەت، ئەوەبوو بەنولیحیان تیربارانیان کردن، ئەوەبوو عاصم و حەوت کەسی تریان شەهید بوون، سێ کەسەکەی تر کە مابوونەوە خۆیان دا بە دەستەوەو داوای پەنایان کرد، یەکێک لەو سێ کەسە خوبەیب بوو، کاتێک گەیشتنە لای بەنولیحیان خێرا ئەوانیان بەستنەوە، یەکێک لە سیانەکە وتی ئەمە سەرەتای ناپاکیەکەیانە، بەخوا من لەگەڵتان نایەم، ئەو کوژراوانەمان پێشەنگی رەوان، ئەوانیش بە زۆر رایاندەکێشا تا لەگەڵیان بچێت بەڵام ئەو نەدەچوو، بۆیە ئەویشیان کوشت، ئینجا خوبەیب و ئەو کەسەکەی تریان برد و ئەوانیان فرۆشتن بە خەڵکی مەککە، ئەوەبوو بەنو حارثی کوڕی عامیر خوبەیبیان کڕی، چونکە خوبەیب لە جەنگی بەدردا باوکی ئەوانی کوشتبوو، خوبەیبیان کڕی و بە دیلی لای خۆیان هێشتیانەوە، لە ماڵەوە لە شوێنێک بەندیان کردبوو تا ئەو کاتەی بیکوژن، خوشکەکەیان لەوێ پاسەوانی بوو، خوبەیب داوای گوێزانی لەو ئافرەتە کرد تا خۆی پێ پاک بکاتەوە، کوڕێکی ئەو ئافرەتەش لای خوبەیب بوو، خوبەیب لەسەر ئەژنۆی خۆی داینیشاندبوو، ئافرەتەکە دەیوت منیش ترسام بە مووسەکە ئەو کوڕەم ئازار بدات، بۆیە بە ترسەوە بەرەو ئەوێ چووم، خوبەیب کە منی بینی زانی ترساوم، وتی: ترسایت ئەم منداڵە بکوژم؟ من شتی وا ناکەم، ئافرەتەکە دواتر دەیوت بەخوا هیچ بەندیەکم نەدیبوو هێندەی خوبەیب چاک بێت، سوێند بەخوا رۆژێک بینیم هەرچەندە لای ئێمە بەندکراو بوو کەچی ترێی دەخوارد لەکاتێکدا بە زنجیر بەسترابوویەوە و لەو کاتەشدا لە هەموو مەککە ترێ دەست نەدەکەوت، بۆیە

دڵنیام ئەوە ڕۆژیەکی خوایی بوو ناردبووی بۆ خوبەیب،[1] ئەوان خوبەیبیان بە بەند کراوی هێشتەوە تا مانگە حەرامەکان تەواو بوون،[2] خوبەیب بە یەکێک لەوانەی وت کە بەندیان کردبوو سێ داواکاریم لێت هەیە، ئاوی سازگارم بۆ بهێنیت و گۆشتی بە حەرام سەربڕاوم بۆ نەهێنیت (گۆشتی قوربانی کراو بۆ بتەکان) ئەگەریش ویستیان بمکوژن پێم بڵێیت،[3] ئینجا هاتن و خوبەیبیان برد تا بیکوژن، خوبەیب وتی: دەرفەتم بدەن تا دوو ركات نوێژ بکەم، ئەوانیش مۆڵەتیان دا، خوبەیب دوو ركات نوێژی کرد، دواتر کە تەواو بوو تی ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە وابزانن لە ترسا نوێژەکەم درێژ دەکەمەوە زۆر نوێژەکەم درێژە پێدەدا،[4] ئەمەش بوو بە یەکەم سوننەتی دوو ركات نوێژی پێش کوشتنی موسڵمانان کە خوبەیب ئەنجامی دا، ئینجا نزای کرد لێیان و وتی: خوایە هەموویان کۆکەرەوەو بە جارێ لەناویان بەرەو تاقیان مەهێڵە، ئینجا ئەم شیعرەی وت:

فَلَسْتُ أُبَالِي حِينَ أُقْتَلُ مُسْلِمًا

عَلَى أَيِّ جَنْبٍ كَانَ لِلهِ مَصْرَعِي

وَذَلِكَ فِي ذَاتِ الْإِلَهِ وَإِنْ يَشَأْ

يُبَارِكْ عَلَى أَوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ [5]

هیچ باکم نیە وەک موسڵمانێ کاتێ دەکوژرێم

لەبەرخودایە، بەهەر جۆرێ بێ با لەناو ببرێم

ئەمەش لەبەر خودایە و گەر خۆی بیەوێت

جەستەی پارچەکراو بەرەکەتدار دەبێت

[1] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب هل يستأسر الرجل ومن لم يستأسر، الرقم ٣٠٤٥.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٦٧.

[3] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٤٨.

[4] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب هل يستأسر الرجل ومن لم يستأسر، الرقم ٣٠٤٥.

[5] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب حدثني عبد الله بن محمد الجعفي، الرقم ٣٩٨٩.

جۆری کوشتنەکەی بە وجۆرە بوو لەخاچدرا و ئینجا لێی دەدرا تا دەمرد،[1] کاتێک بەرزیان کردەوە بۆ سەر دارخورماکە تا بیبەستنەوە خوبەیب ئەم شیعرەی دەوت:

لَقَدْ جَمَعَ الْأَحْزَابُ حَوْلِي وَأَلَّبُوا
قَبَائِلَهُمْ وَاسْتَجْمَعُوا كُلَّ مَجْمَعِ
وَقَدْ جَمَعُوا أَبْنَاءَهُمْ وَنِسَاءَهُمْ
وَقُرِّبْتُ مِنْ جِذْعٍ طَوِيلٍ مُمَنَّعِ
إِلَى اللهِ أَشْكُو غُرْبَتِي بَعْدَ كُرْبَتِي
وَمَا أَرْصَدَ الْأَحْزَابُ بِي عِنْدَ مَصْرَعِي
فَذَا الْعَرْشِ صَبِّرْنِي عَلَى مَا يُرَادُ بِي
فَقَدْ بَضَّعُوا لَحْمِي وَقَدْ يَاسَ مَطْمَعِي
وَذَلِكَ فِي ذَاتِ الْإِلَهِ وَإِنْ يشَأْ
يبَارِكْ عَلَى أَوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ
لَعَمْرِيَ مَا أَحْفَلُ إِذَا مُتُّ مُسْلِمًا
عَلَى أَيِّ حَالٍ كَانَ لِلهِ مَضْجَعِي

هەموان لە دەورم تینیان گرتووە
هۆز و دەستەکان پەنگیان خواردووە
ژن و منداڵیان خڕ بوون لەو لاوە
منیش هەڵواسراو بە دار خورماوە
ناڵەی بێکەسی و ئاهی هەر ژانێ
بۆ ئەم کوشتنەم خودا دەیزانێ
پەروەردگارم! صەبرێکم هەبێ
بۆ مەرگێ کە وان لە منیان دەوێ

[1] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب هل يستأسر الرجل ومن لم يستأسر، الرقم ٣٠٤٥.

ئــــەمـــەش لەپێنـاو پـەروەردگـاریّ
بۆ جەستەی لەت بووم گەر ویستی هەبیّ
خــۆی دەیپاریــزیّ و ریـزی لیّ دەنیّ[1]

ئینجا خوبەیب وتی: خوایە وا ئێمە پەیامی پێغەمبەرەکەتمان گەیاند، دەی تۆیش هەواڵی ئێمە بە پێغەمبەرەکەت بگەیەنە.[2]

جا لەو کاتەی تیریان بۆ دەهاویشت پێیان دەوت حەزت ئەکرد ئێستا موحەممەد لە شوێنی تۆدا بێت؟ ئەویش دەیوت نە سوێند بە خوای گەورە، حەز ناکەم لە بری ئەم لەناوچوونەی من درکێکیش بچێت بە پێیدا، ئەوانیش پێدەکەنین.[3]

کاتێک خوبەیب کوژرا دەموچاوی خوبەیبیان بە پێچەوانەی کەعبەوە وەرچەرخاند، کەچی دواتر تەماشایان کرد دەموچاوی روو بە کەعبەیە، چەند جار وایان لێکرد کەچی هەر دەموچاوی رووی دەکردەوە بەرەو قیبلە، بۆیە وازیان لێهێنا.[4]

موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان دەڵێت: من ئەو رۆژە ئامادەی کوشتنەکەی خوبەیب بووم، لە ترسی نزاکەی خوبەیب وام دەزانی زەوی قووتم دەدات.[5]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە هەواڵی خوبەیبی پیّ گەیشت، هەریەک لە میقداد و زوبەیری نارد تا تەرمی خوبەیب لە دارخورماکە دابگرن، کە گەیشتنە ناوچەی تەنعیم دەبینن چل کەس لەوێن، هەرچۆنێک بێت تەرمەکەی خوبەیبیان داگرت، زوبەیر تەرمەکەی خستە سەر ئەسپەکەی و تەرمەکەشی

[1] المعجم الكبير للطبراني - باب الزاي - من اسمه زيد - زيد بن الدثنة، الرقم ٥٢٨٤، ئەگەرچی وتەکان دەقی تەواوی عەرەبیەکە نین، بەڵام کرۆکی واتای عەرەبیەکەن، بۆیە کردمان بە کوردی تاکو خوێنەر لە ئاهی سەرەمەرگی ئەو هاوەڵە تێبگات.

[2] حلية الاولياء، ج١، ص ١١٣.

[3] المعجم الكبير للطبراني - باب الزاي - من اسمه زيد - زيد بن الدثنة، الرقم ٥٢٨٤،

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٣.

[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٦٦.

هیچ تێک نەچووبوو، بەڵام بێباوەڕەکان پێیان زانین، کاتێک کەوتنە شوێنیان زوبەیر تەرمەکەی خستە خوارەوە، زەوی تەرمەکەی خوبەیبی قووتدا و تەرمەکەی دیار نەماو نەکەوتە دەست بێباوەڕان.[1]

رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) تەنها عەمری کوڕی ئومەییەی نارد تا تەرمەکەی خوبەیب ببات، ئەویش چوو و تەرمەکەی خوبەیبی خستەخوارەوە، زەوی تەرمەکەی خوبەیبی قووت دا، دواتر کەمێک گەڕام بۆ تەرمەکە لە هیچ شوێنێک تەرمەکە دیار نەبوو، تا ئێستاش تەرمی خوبەیب دیار نیە.[2]

**پەندو وانە**

کەمجار لە مێژوودا بینراوە دەوڵەت و دەسەڵاتە بێباوەڕەکان وەفایان بووبێت بۆ پەنادانێک، کە داویانە بە تایبەت بەرامبەر بە موسڵمانان، ئەگەرچی ئەمە پێوەر نیە بۆ سفرکردنەوەی پەنای کەسانێ یان دەگمەنە دەسەڵاتێکی بێباوەڕ لە ماوەیەکی مێژووییدا لە بەڵێن و پەناکاندا راستگۆ بووبێ.

موسڵمان هیچ کات لە بەرامبەر ناحەقیدا هەنگاوی ناحەق نانێت، ئەوە رێنماییەکی خواییە بۆ بەندەکانی خوا، هیچ لاریەک بە هەنگاوی لار راست ناکرێتەوە، خوبەیب کە ناپاکی لێکرا و چاوەڕێی مەرگ بوو بە دەست باوک و مام و کەسانی ئەو منداڵەی کە هاتبوو بۆ لای، نەک ئەوەی بیری لەوە نەکردەوە بیکوژێت، بەڵکو نەیهێشت هیچ هەستێک بە ترس و بیم بکات، خستیە سەر ئەژنۆی و نازی پێدا، کە دەموچاوی شێواوی دایکیشی بینی دڵنیایی دایەوە بەو دڵەو رۆشنایی دایەوە بەو دەموچاوەو دڵنیای کردەوە کە هەرگیز نیازی نەبووە ئازاری منداڵەکەی بدات.

ئەوەی لەسەر موسڵمانە تا دواساتی ژیانی بەو جۆرە بژی کە خوای

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٣.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٦٧.

گەورە فەرمانی پێکردووە، لە هەموو بارێکدا خۆی بپارێزێت لە حەرام و ئەوەی چاکەیە پەیڕەوی بکات، خوبەیبیش ئەگەرچی چاوەڕێی مەرگەو لە بەندی بێباوەڕاندایە، بەڵام لەوێشدا ترسی هەیە لە حەڵاڵی خۆراکەکەی و تکادەکات گۆشتی حەرامی بۆ نەهێنن، بەڵام دەبینین ئەمڕۆ موسڵمانانێک کە کەمێک خۆشگوزەرانی ژیانیان دەشێوێ، بێ ئەوەی ناچار بن بە وەرگرتنی کەمترین حەرام، لە ترس و بێ متمانەییان پەنا دەبەنە بەر حەرامەکان و زۆر جاریش دەیان بیانووی بۆ پەیدا دەکەن، بۆ نموونە کەسانێک ئامادەن سوو وەربگرن بۆ شتێک کە مان و نەمانی ژیانیان بەوەوە نەبەستراوەتەوە، بەڵکو بۆ کڕینی ئۆتۆمبێلێکە یان بۆ بازرگانیەکە، هێندەی هەوڵ دەدەن حەرامەکە بشەرعێنن، هێندە بیر لەوە ناکەنەوە خۆیان دوور بگرن لە حەرامەکە.

## ١١٦٧. خوبەیبی کوڕی ئیساف(ﷺ)

ناوی خوبەیبی کوڕی ئیسافی کوڕی عینەبەیە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[١]دایکی ناوی سەلمای کچی مەسعوودە.[٢]

خوبەیب ژنێکی هەبوو بە ناوی جەمیلەی کچی عەبدوڵا کە لەم ژنەی کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا، کوڕێکی تریشی هەبوو لە کەنیزەیەکی بە ناوی عەبدورەحمان، ژنێکی تری ناوی زەینەبی کچی قەیس بوو کە دایکی ئەنیسە بوو.[٣]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە خوبەیب هێشتا موسڵمان نەبووبوو، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو غەزای بەدر چوو، خوبەیبیش چوو بە دوای پێغەمبەردا(ﷺ) و لە رێدا پێی گەیشت و لەوێ موسڵمان بوو، یەکسەریش

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦١.

[٢] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٣٤.

[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٣٤.

چووه ناو غەزاکەو بەشداری غەزای بەدری کرد.[1]

دواتریش لە هەموو غەزاکانی تردا بەشداری کرد تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد.[2]

لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا خەلیفە ئەرکێکی پێ سپارد و ناردی بۆ بەرپرسیارێتیەک.[3]

خوبەیب لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا کۆچی دوایی کرد.[4]

## ١١٦٨. خومیلەی کچی خومیلید(ﵹ)

ناوی خوەیلەی کچی خوەیلیدەو هاوسەری ئەوسی کوڕی صامت بووە، ئەوسی مێردی کەسێکی بە تەمەن بوو و لەگەڵ خوەیلە کێشەی هەبوو.[5]

چەند گێڕانەوەیەک هاتووە سەبارەت بەوەی ئەوس یەکەم کەس بووە لە سەردەمی ئیسلامدا ظیهاری بەکارهێناوە،[6] ئەم مەسەلەش بریتیە لەوەی پیاو بە خێزانەکەی بڵێت وەک دایکم وابیت بۆم، یان بڵێت وەک خوشکم وابیت بۆم، ئەم نەریتە لە پێش ئیسلامدا لە ناو عەرەبەکاندا زۆر باو بوو، بەڵام کە ئیسلام هات ئەمەی حەرام کرد.

ئەوس ئەو ظیهارەی بەرامبەر بە ژنەکەی بەکارهێنا و دواتریش پێش ئەوەی کەفارەتەکەی بدات لەگەڵ ژنەکەی جیماعی کرد، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد پانزە صاع جۆ ببەخشێت بە شەست هەژار.[7]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦١.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦١.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦١.
[4] أسد الغابة، ج٢، ص ١٤٦.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦١٨.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٤٧، الإصابة في تمييز الصحابة، ١، ص١٥٦.
[7] أسد الغابة، ج١، ص٢٢٠.

ئەوس کەسێکی بە تەمەن و پیر بوو،[1] هاوکات جۆرێک لە فێی لەگەڵ بوو، بۆیە جارێکیان لەکاتی تووشبوونی بە فێ خوەیلەی ژنی بێزاری دەربڕی و ئەویش ظیهاری بەرامبەری بەکارهێنا.[2]

خوەیلە دەڵێت: ئەوس کەسێکی بە تەمەن بوو و کەسێکی تووڕەو ئازاربەخش بوو، رۆژێک هاتەوە ماڵ و منیش لەسەر شتێک قسەم لەگەڵ کرد، ئەویش تووڕە بوو و وتی: تۆ وەک پشتی دایکم بیت بۆم، ئینجا چوویە دەرەوە، پاشان لەوێ لەگەڵ خەڵکیدا ماوەیەک دانیشت و دواتر هاتەوە ماڵەوە، دەیویست سەرجێم لەگەڵ بکات، منیش وتم: نا سوێند بەوەی گیانی خوەیلەی بەدەستە دەستت پێم ناگات، قسەش هەر ئەوەیە کە وتم: تا ئەو کاتەی خوا و پێغەمبەری خوا بڕیارمان لەسەر دەدەن، بەڵام ئەو هەر هەڵمەتی بۆ بردم، بەڵام من رێم پێ نەدەدا تا چۆن ژنێک زاڵ دەبێت بەسەر پیرەپیاوێکدا خستمەژێرەوەو چوومە دەرەوە بۆ لای دراوسێیەکمان و داوای جلێکم لێ کردو چوومەدەرەوە تا چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، مەسەلەکەم بۆ باس کرد و سکاڵام کرد لەسەر خراپی رەوشت و هەڵسوکەوتی ئەوس لەگەڵمدا، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) دەیفەرموو:(یا خویلة ابن عمك شیخ كبیر فاتقي الله فیه)، (ئەی خوەیلە ئامۆزاکەت پیرێکی بەتەمەنە، دەی لە ئاستیدا لەخوا بترسە)، خوەیلە دەڵێت: سوێند بەخوا نەچووم تا سروش دابەزی و پێغەمبەر(ﷺ) ئەو بارەی بەسەریدا هات کە لە کاتی سروشدا بەسەریدا دەهات، پاشان باری ئاسایی بوویەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی خوەیلە خوای گەورە لەسەر تۆ و هاوەڵەکەت ئایەتی دابەزاند، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە بەسەرمدا (قد سمع الله قول التي تجادلك في زوجها وتشتكي إلى الله..... وللكافرين عذاب أليم)، پاشان فەرمووی: بڵێ بە مێردەکەت با کۆیلەیەک رزگار بکات، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا هێندەی نیە

[1] صحيح ابن حبان - كتاب الطلاق - باب الظهار - ذكر وصف الحكم للمظاهر من امرأته وما يلزمه عند ذلك من الكفارة، الرقم ٤٢٧٩.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٤٧.

بتوانێت کۆیلەیەک ئازاد بکات، فەرمووی: دەی با دوو مانگ بەسەر یەکەوە ڕۆژوو بگرێت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو پیرێکی بەتەمەنەو توانای ڕۆژووگرتنی نیە، فەرمووی: دەی با کۆڵێک خورما ببەخشێت بە شەست هەژار، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەشی نیە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەی ئێمە یارمەتی دەدەین بە کۆڵە خورمایەک، خوەیلە وتی: دەی منیش کۆڵە خورمایەکی پێ دەدەم بۆ ئەوە، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) فەرمووی: (أصبت و أحسنت، فاذهبي فتصدقي به عنه، ثم استوصي بابن عمك خيرا)، (پێکات و چاکت کرد، دەی بڕۆ و بەوە صەدەقەکەی بۆ بدە، دواتر لەگەڵ ئامۆزاکەت چاک بە و چاکە بنوێنە)، خوەیلە دەڵێت: منیش چووم و وامکرد.[1]

لە ڕیوایەتی ئەبوو داووددا هاتووە لەو کاتەدا کۆڵە خورمایەک(عرق)- شەست صاع دەکات- هات بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش ئەوەی دانا بۆ یارمەتی ئەوس.[2]

## ١١٦٩. خوەیلیدی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

ناوی خوەیلیدی کوڕی عەمرە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان لە سولەمیەکان، یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە جەنگی صفیندا لەناو سوپای خەلیفە عەلی کوڕی ئەبوو طالیبدا بوو.[3]

## ١١٧٠. خورەیمی کوڕی ئەوس(رضي الله عنه)

ناوی خورەیمی کوڕی ئەوسی کوڕی حارثەیە، کونیەکەی ئەبوو لەجەئە.[4]

---

[1] صحيح ابن حبان - كتاب الطلاق - باب الظهار - ذكر وصف الحكم للمظاهر من امرأته وما يلزمه عند ذلك من الكفارة، الرقم ٤٢٧٩.

[2] سنن أبي داود - كتاب الطلاق - باب في الظهار، الرقم ٢٢١٤.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٥٠.

[4] أسد الغابة، ج٢، ص ١٥٩.

پاش جەنگی تەبووک موسڵمان بوو، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە تەبووکەوە گەڕایەوە خورەیم چوویە خزمەتی، دەڵێت: لەوێ موسڵمان بووم، ئینجا لەوێ بووم کە عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەمەوێت وەسفت بکەم و شیعرت پێدا هەڵبدەم، پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی دا و ئەویش شیعرێکی بەسەر پێغەمبەری خوادا(ﷺ) هۆنیەوە.[١]

خورەیم دەڵێت: لە جەنگی دژ بە موسەیلەمەدا بەشداریمان کرد، کە لەوە بووینەوە ئینجا بەرەو رووی هورمز بووینەوەو خالید داوی لە هورمز کرد جەنگی رووبەڕوو بکەن، ئەوەبوو خالید هورمزی کوشت.[٢]

خورەیم دەڵێت: دوای ئەوە چووین تا گەیشتینە ناوچەی حیرە و چووینە ناوی، جا من پێشتر لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستبوو کە دەیفەرموو: (وا حیرەم لەبەرچاوەو شەیمائی کچی بوقەیلەشم لەبەرچاوە کە لەچکێکی رەشی داوە بەسەریدا) منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) جا ئەگەر رۆژ بوو چووینە ناو حیرەو ئەو ئافرەتم بینی بۆ من بێت؟ فەرمووی: بەڵێ، بۆیە کە چووینە ناو حیرە یەکەم کەس بینیمان شەیمائی کچی بوقەیلەی ئەزدی بوو لەسەر هێسترێک بوو، هەمان نیشانەکانی تێدا بوو، منیش گرتم و وتم: پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئافرەتەی دا بە من، خالید داوای بەڵگەی لێکردم، منیش بەڵگەم خستە بەردەست، خالیدیش ئافرەتەکەی پێدام، ئینجا ئەو ئافرەتە برایەکیشی هەبوو ناوی عەبدولمەسیح بوو، هات بۆ لام و وتی: خوشکەکەمم پێ بفرۆشە، منیش وتم: بەخوا لە سەد درهەمێ کەمتر نایدەم، ئەویش هەزار درهەمی پێدام و وتی: بتوتایە هەزار درهەمیش پێمدەدایت، منیش وتم: وامدەزانی لە سەد درهەم پارەی زیاتر بوونی نیە و ئەوە ئەوپەڕی داواکاری و دەوڵەمەندیە.[٣]

[١] المستدرک علی الصحیحین - کتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذکر مناقب العباس بن عبد المطلب بن هاشم عم رسول الله - إنشاد العباس في مدح النبي بحضرته، الرقم ٥٤٥٨.

[٢] المعجم الكبير للطبراني - باب الخاء - من اسمه خالد - خالد بن الوليد، الرقم ٣٨٠٥.

[٣] المعجم الكبير للطبراني - باب الخاء - من اسمه خريم - خريم بن أوس بن حارثة بن لام الطائي، الرقم

## ١١٧١. خورەیمی کوڕی فاتیک(ﷺ)

ناوی خورەیمە، سەبارەت بە ناوی باوکی دەوترێت فاتیکە، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو ئەخرەمە، ئەم هاوەڵە لە ئەزدیەکانە، سەبارەت بە کونیەکەی هەریەک لە ئەبووئەیمەن و ئەبوو یەحیا هاتووە.[١]

خورەیم برایەکی هەبوو بە ناوی سەبرەوە کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[٢]

رایەک هاتووە کە بەشدار بووبێت لە غەزای بەدردا، ئیبن حەجەر دەڵێت: رای دروست ئەوەیە لە رێکەوتنی حودەیبییەدا بەشدار بووە، هەرچەندە رایەکیش دەڵێت: لە دوای فەتحی مەککە موسڵمان بووە.[٣]

خورەیم دەڵێت: لە سەروبەندی کۆچی پێغەمبەردا(ﷺ) بوو کە بە چەند وشترێکەوە دەرچووم، برووسکەیەک هات و دای لە باڵێکی وشترێکم، منیش وەک نەریتی ئەو کاتی عەرەبەکان وتم: پەنا دەگرم بە گەورەی ئەم دۆڵە، دەنگێک هات و بە شیعرێک پێی وتم: دەبێت پەنا بگریت بە خوای گەورە، ئینجا پێی وتم: کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتووە، منیش وتم: رەحمەتی خوات لێ بێت تۆ کێیت؟ وتی: من مالیکی کوڕی مالیکم پێغەمبەر(ﷺ) منی لە خاکی خەڵکی نەجدەوە ناردووە، منیش وتم: ئاخ یەکێک ئەبوو لای ئەم وشترانەم ئەبوو تا دەچوومە خزمەتی و باوەڕم پێ دەهێنا، ئەویش وتی: دەی پشت بە خوا من لایان دەبم و وشترەکانت دەبەمەوە ماڵی خۆتان، منیش بە وشترێکیانەوە چووم تا چوومە مەدینە، ئەوکات نوێژی هەینی بوو، خەریک بووم وشترەکەم مۆڵ دەدا کە ئەبووزەر هاتەدەرەوەو وتی: پێغەمبەر(ﷺ) پێت دەفەرمویت (وەرە ژوورەوە) منیش چوومە ژوورەوە،

٤١٦٨.

[١] الإصابة في تميز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٥.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ٣٠.

[٣] الإصابة في تميز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٥.

کە منی بینی فەرمووی: (ئەو پیرە پیاوەی کە بەڵێنی دا وشترەکانت بگەیەنێتەوەماڵەوە چی کرد) منیش وتم: رەحمەتی خوای لێ بێت بە سەلامەتی وشترەکانی دایەوە بە خاوخێزانم؟ فەرمووی: (بەڵێ رەحمەتی خوای لێ بێت)، منیش خێرا شایەتومانم هێنا.[1]

خورەیم دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو:(من أنفق نفقة في سبيل الله كتب له سبع مائة ضعف)،[2] (هەرکەس لە پێناو خوادا شتێک ببەخشێت ئەوە بە حەوت سەد بەرامبەر بۆی دەنووسرێت).

خورەیم دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیست دەیفەرموو:

(الناس أربعة والأعمال ستة: موجبتان ومثل بمثل، وحسنة بعشر أمثالها، وحسنة بسبع مائة ضعف، والناس موسع عليه في الدنيا والآخرة، وموسع عليه في الدنيا مقتور عليه في الآخرة، ومقتور عليه في الدنيا موسع عليه في الآخرة، ومقتور عليه في الدنيا والآخرة، وشقي في الدنيا وشقي في الآخرة، والموجبتان من قال لا إله إلا الله، أو قال: مؤمنا بالله دخل الجنة، ومن مات وهو يشرك بالله دخل النار، ومن هم بحسنة فعملها كتبت له عشرة أمثالها، ومن هم بحسنة فلم يعملها كتبت له حسنة، ومن هم بسيئة فلم يعملها كتبت له حسنة، ومن هم بسيئة فعملها كتبت له سيئة واحدة غير مضعفة، ومن أنفق نفقة فاضلة في سبيل الله فبسبع مائة ضعف)،[3] (خەڵکی چوار چەشنن، کردەوەکانیش شەش چەشنن، دوو واجبەکە وێنە بە وێنەن، چاکەیەک کە بە دە بەرامبەرە، چاکەیەک کە بە حەوت سەد بەرامبەرە، خەڵکێ هەیە دنیا و قیامەتی بەروودا کراوەیە، خەڵکێ هەیە دنیای بەروودا کراوەیەو قیامەتی بەروودا داخراوە، خەڵکێ هەیە دنیای بەروودا داخراوەو قیامەتی بە ڕوودا کراوەیە، خەڵکێ هەیە دنیا و قیامەتی بە ڕوودا داخراوە، خراپەکارو ماڵوێرانی دنیا

---

[1] المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذكر خريم بن فاتك الأسدي(ﷺ) - ذكر إسلام خريم بن فاتك ، الرقم ٦٦٧٠، قال الذهبي في التلخيص لم يصح.

[2] صحيح ابن حبان - كتاب السير - باب فضل النفقة في سبيل الله - ذكر تضعيف النفقة في سبيل الله على غيره من الطاعات ، الرقم ٤٦٤٧، صححه شعيب الأرناؤوط.

[3] صحيح ابن حبان - كتاب التاريخ - باب بدء الخلق - ذكر الإخبار بعدد الناس وأوصاف أعمالهم ، الرقم ٦١٧١، صححه شعيب الأرناؤوط.

و قیامەتیشـە، دوو واجبەکە ئەوەیە کە بڵێت لا الـه الا اللـه، -یان فەمـووی- ئـەوەی بڕوای هەیە بە خوا دەچێتە بەهەشت، هەرکەسیش بمرێت و هاوەڵی دانابێت بۆ خوا دەچێتە دۆزەخ، هەرکەسیش نیازی بووبێت چاکەیەک بکات و بیکات دە بەرامبەر بۆی دەنووسرێت، هەرکەسیش نیازی بێت چاکەیەک بکات و نەیکات بە چاکەیەک بۆی دەنووسرێت، هەرکەسیش نیازی بێت خراپەیەک بکات و نەیکات بە چاکەیەک بۆی دەنووسرێت، هەرکەس نیازی بێت خراپەیەک بکات و بیکات بە خراپەیەک بۆی دەنووسرێت و زیاتری لەسەر نانووسرێت، هەرکەسیش بەخشێکی چاک و زیادە لە ڕێی خوادا ببەخشێت ئەوە بە حەوت سەد بەرامبەر بۆی دەنووسرێت).

خورەیم دەڵێت: جارێک چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: (ئەی خورەیم ئەگەر دوو خەسڵەت هەن تیاتدا نەبوایە دەبوویتە پیاوی پیاوانە)، منیش وتم: ئەوانە چین بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم؟ فەرمووی: (زۆری قژت و شۆڕکردنەوەی جلەکانت)، ئەوەبوو خورەیم چوو قژی کورت کردەوەو شۆڕی جلەکانیشی نەهێشت.[1]

دوای شەهیدبوونی عوثمانی کوڕی عەففان خورەیم لە دیمەشق نیشتەجێ بوو، وابیصە دەڵێت: چووم بۆ لای و وتم: ئیبن مەسعوود فەرموودەیەکی بۆ گێڕاومەتەوەو دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (إنها ستكون فتنة يكون المضطجع فيها خيرا من الجالس والجالس خيرا من القائم، والقائم خيرا من الماشي والماشي خيرا من الساعي...قتلاها كلهم في النار)، (فیتنەیەک دێت کە ئەوەی تیایدا ڕاکشاوە باشترە لەوەی دانیشتووە، ئەوەی دانیشتوە باشترە لەوەی بە پێوەیە، ئەوەی بە پێوەیە باشترە لەوەی دەڕوات، ئەوەی دەڕوات باشترە لەوەی بە ڕاکەڕاک و هەڵەبەزە دەڕوات، کوژراوەکانی ئەو فیتنەیە هەموو لە دۆزەخدان)،

[1] المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(رضي الله عنهم) - ذكر خريم بن فاتك الأسدي(رضي الله عنه) - ذكر إسلام خريم بن فاتك ، الرقم ٦٦٧١، المعجم الكبير للطبراني - باب الخاء - من اسمه خريم - خريم بن فاتك الأسدي ، الرقم ٤١٥٩، قال الذهبي إسناده مظلم.

خورەیم وتی: سوێند بەو خوایەی تاکە پەرستراوە منیش ئەو فەرموودەم لە پێغەمبەر(ﷺ) بیستووە.[1]

## ١١٧٢. خوزاعی کوڕی عەبدنەهم(رضي الله عنه)

ناوی خوزاعی کوڕی عەبد نەهمی موزەنیە، ئەم کەسە سەرپەرشتیاری بتەکەی هۆزەکەی خۆی بوو، ناوی بتەکەیان نەهم بوو، جارێک چوو تا قوربانی بۆ بتەکە بکات، کەچی ختوورەیەک کەوتە دڵی، وتی: بۆ ئەم بتە لاڵە وا قسە ناکات؟ بتەکەی شکاند و وتی: لەمڕۆوە ئایینی من ئایینی موحەممەدە، چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێدا کە ئایینەکەی لەناو هۆزەکەشیدا بڵاو بکاتەوەو بێتەوە بۆ لای و ئەوانیشی لەگەڵ بێت،[2] کە چویەوە بینی هۆزەکەی وا زوو نایەن بە دەم بانگەوازەکەیەوە، بۆیە ماوەیەک دواکەوت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی کرد بە حەسسان بە شیعرێک سەرکۆنەی ئەو دواکەوتنەی بکات، بەڵام هێرشی نەکاتەسەر، حەسسانیش شیعرێکی لەو جۆرەی هۆنیەوە، کە خوزاعی ئەوەی بیستەوە پێی بێتاقەت بوو، خێرا هاودەم بە ژمارەیەک لە موسڵمان بوانی هۆزەکەی هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[3]

لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا موزەنیەکان کە نزیکەی هەزار چەکدار دەبوون، پێغەمبەر(ﷺ) ئاڵای ئەوانی دایە دەست خوزاعیەوە، هەروەها ئەو دەستکەوتەکانی -غەنیمەتەکانی- پێغەمبەری خوای(ﷺ) وەردەگرت.[4]

---

[1] سنن أبي داود - كتاب الفتن والملاحم - باب النهي عن السعي في الفتنة، ضعفه الألباني في صحيح و شعيف سنن أبي داود، الرقم ٤٢٥٨.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٦.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٢٩١.

[4] أسد الغابة، ج٢، ص ١٦٣.

## ١١٧٣. خوزەیمەی کچی جەهم(ﷺ)

ناوی خوزەیمەی کچی جەهمی کوڕی قەیسی عەبدەریە، هاودەم بە باوک و دایکی لە کۆچی حەبەشەدا بەشدار بوو.[١]

## ١١٧٤. خوزەیمەی کوڕی ثابت(ﷺ)

ناوی خوزەیمەی کوڕی ثابتی کوڕی فاکیهە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان لە خەطمیهکان، زۆر زوو موسڵمان بوو، دایکی ناوی کەبشەی کچی ئەوسی ساعیدیە.[٢]

خوزەیمە ژنێکی هەبوو بە ناوی جەمیلەی کچی زەید کە لەم ژنەی دوو منداڵی هەبووبە ناوەکانی عەبدوڵا و عەبدوڕەحمان، ژنێکی تری هەبوو بە ناوی صەفییەی کچی عامیر کە لەم ژنەی کوڕێکی هەبوو بە ناوی عومارە.[٣]

خوزەیمە کە موسڵمان بوو هەوڵیدەدا بێتوانایی بتەکان بە هۆزەکەی خۆی نیشان بدات، بۆیە دەچوو و بتەکانی ناو هۆزەکەی خۆی دەشکاند.[٤]
خوزەیمە یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر،[٥] بەڵام ذەهەبی دەڵێت: راستتر وایە بەشداری جەنگی بەدر نەبووە، بەڵکو لە ئوحود و غەزاکانی دواتردا بەشدار بووە،[٦] لە جەنگی ئوحوددا بەشداری کرد، دواتریش لە غەزاکاندا بەشدار بوو، لە فەتحی مەککەشدا ئاڵای هۆزەکەی خۆی بەدەستەوە بوو.[٧]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٨.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٨.
[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٧٨.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٩.
[٥] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٥٣.
[٦] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٨٥.
[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٩.

خوزەیمە لای پێغەمبەر(ﷺ) هێندە جێمتمانە و خۆشەویست بوو کە شایەتی ئەوی لەبری شایەتی دوو پیاو وەردەگرت،[1] ئەمەش ببوو بە شانازیەک کە ئەوسیەکان لەناو خۆیان و لە کۆڕو کۆبوونەوەی موسڵماناندا شانازییان پێوە دەکرد کە کەسی وایان تێدایە.[2]

هۆکارەکەش ئەوەبوو، کە جارێک پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپێکی لە کابرایەکی دەشتەکی دەکڕی، کابرا ملەجیڕەی لەگەڵ دەکرد و دەیوت پێم نەفرۆشتویت، خوزەیمە شایەتی دا کە پێغەمبەر(ﷺ) لێی کڕیوە، دواتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تۆ چۆن شایەتیت دا لەکاتێکدا لەوێ ئامادە نەبوویت؟ ئەویش وتی: من بڕوام هێناوە بەوەی تۆ هێناوتەو دەشزانم ئەوەی حەق نەبێت نایڵێیت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (مَنْ شَهِدَ لَهُ خُزَيْمَةُ وَأَشْهَدَ عَلَيْهِ فَحَسْبُهُ) (هەرکەس خوزەیمە شایەتی بۆ بدات و شایەتی لەسەر بدات بەسیەتی).[3]

شەوێک خوزەیمە خەوی بینی لەسەر تەوێڵی پێغەمبەر(ﷺ) سوجدەی برد، ئینجا خوزەیمە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و خەوەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) راکشا و فەرمووی: (خەوەکەت بهێنەرەدی)، ئەوەبوو خوزەیمە لەسەر تەوێڵی پێغەمبەر(ﷺ) سوجدەی برد.[4]

خوزەیمە دەڵێت: لە غەزای موئتەدا بەشدار بووم، لەگەڵ کابرایەک جەنگی دەستەیەخەم کرد کە کڵاوێکی لەسەر بوو کڵاوەکە یاقووتێکی تێدابوو، ئەو یاقووتەم کردبووە ئامانج، ئەوەبوو دەستم کەوت، کە گەڕامەوە بۆ

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب قول الله تعالى من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدوا الله عليه، الرقم ٢٨٠٧.

[2] المطالب العالية لابن حجر، الرقم ٤٠٧٣.

[3] المستدرک على الصحيحين - كتاب البيوع - لا يجوز بيعان في بيع ولا بيع ما لا يملك ولا سلف وبيع ولا شرطان في بيع، الرقم ٢٢٠٠.

[4] مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار(ﷺ) - حديث خزيمة بن ثابت(ﷺ) ، الرقم ٢٢٣٠٠، صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله عليهم أجمعين - ذكر عمرو بن العاص السهمي(ﷺ) - ذكر خزيمة بن ثابت(ﷺ) ، الرقم ٧١٤٩، ضعفه شعيب الأرناؤوط.

مەدینە چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش لێی نەسەندمەوەو رازی بوو بۆ خۆم بێت، منیش هێشتمەوە تا لە سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففاندا فرۆشتم بە سەد دینار و باخێکم پێ کڕی.[1]

لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکردا کاتێک زەید راسپێردرا بۆ نوسینەوەی قورئان، بۆ ئایەتێک رامابوو تا شایەتێ هەبێت بۆ ئەوەی بینووسێتەوە، ئەویش ئایەتی (من المؤمنين رجال صدقوا...) بوو، بۆ ئەوەش تەنها خوزەیمەی دەستکەوت، بۆیە نووسیەوە، چونکە خوزەیمە ناسرابوو بەوەی لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) شایەتی بە دوو شایەتی وەرگیراوە.[2]

خوزەیمە تا سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب ژیا، لە فیتنەی نێوان هاوەڵاندا بەشداری نەکرد، بەڵکو شمشێرەکەی لە کالان نابوو، لە جەمەلدا هەرچەندە ئامادە بوو بەڵام شمشێری لە کالان دەرنەکرد،[3] بەڵام کاتێک لە جەنگی صفیندا بینی عەمماری کوڕی یاسر کوژرا، پێشتر دەیوت جەنگ ناکەم تا بزانم کێ عەممار دەکوژێت، هەرکەس کوشتی ئەوکات دەجەنگم، چونکە بیستوومە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: دەستەی باغی عەممار دەکوژن، کە عەممار کوژرا خوزەیمە وتی: وا گومڕایی و نەپێکانم بۆ روون بوویەوە، شمشێری لە کالان دەرکرد و جەنگا تا کوژرا،[4] واتە خوزەیمە حوکمی عەلی پێ رەوا و دروست بوو و لەناو ریزی سوپای ئەودا مایەوەو کوژرا.[5]

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٨٦.

[2] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب قول الله تعالى من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدوا الله عليه، الرقم ٢٨٠٧.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٥٩.

[4] المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(رضي الله عنهم) - ذكر مناقب عمار بن ياسر(رضي الله عنه) - ذكر شهادة عمار بن ياسر(رضي الله عنه)، الرقم ٥٧٠٥.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٨.

## ١١٧٥. خوزەیمەی کوڕی عاصم(ﷺ)

ناوی خوزەیمەی کوڕی عاصمی عەکلیە، وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) خوزەیمەی کرد بە بەرپرسی کۆکردنەوەی زەکاتی هۆزەکەی و داوای کرد ستەمیان لێ نەکات.[١]

## ١١٧٦. خوزەیمەی کوڕی ئەوس(ﷺ)

ناوی خوزەیمەی کوڕی ئەوسی کوڕی یەزیدە،[٢] بەڵام ئیبن سەعد بە ئەبوو خوزەیمە ناوی هێناوە،[٣] ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە بەنی نەججار، یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر، دواتریش لە غەزای ئوحود و خەندەق و سەرجەم غەزاکانی تریشدا بەشداری کرد،[٤] دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاو لە جەنگی جسردا شەهید بوو،[٥] بەڵام ئیبن سەعد دەڵێت: لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا مردووە.[٦]

## ١١٧٧. خوزەیمەی کوڕی خەزمە(ﷺ)

ناوی خوزەیمەی کوڕی خەزمەی کوڕی عەددیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، ئەم هاوەڵە بەشدار بووە لە غەزای ئوحودو غەزاکانی تریشدا.[٧]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٨٢.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٨.
[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٩٠.
[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٩٠.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٨.
[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٩٠.
[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٨٢.

## ١١٧٨. خوزەیمەی کوڕی عەبدعەمر(ﷺ)

نـاوی خوزەیمـەی کـوڕی عەبدعەمـری عەصریـە، وەک وەفـد هاتووەتـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) و موسـڵمان بـووە.

## ١١٧٩. خوضره(ﷺ)

ئەم ئافرەتە ناوی خوضرەیە و خزمەتکاری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو.[١]

## ١١٨٠. خوفافی غیفاری(ﷺ)

نـاوی خوفافـی کـوڕی ئیمائـی کـوڕی رەحضـەی غیفاریـە،[٢] خـۆی و باوکیشـی هاوەڵـی پێغەمبـەر(ﷺ) بـوون،[٣] خوفافیش بەرنوێـژ و وتاربێـژی غیفاریەکانـی دەکـرد.[٤]

کاتێـک ئەبووسـوفیان بیسـتی خوفـاف موسـڵمان بـووە وتـی: ئەمشـەو گـەورەی غیفاریـەکان لـە ئاییـن هەڵگەڕایـەوە.[٥]

خوفـاف لەگـەڵ باوکیدا زوو زوو دەهـات بۆ مەدینە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ).[٦]

خوفاف لە حودەیبیەو بەیعەتی ڕیضواندا بەشداری کرد.

خوفـاف دەگێڕێتـەوە جارێـک لـە دوای پێغەمبـەرەوە(ﷺ) نوێژی کـردووە، پێغەمبـەر(ﷺ) نـزای لێخۆشـبونی بـۆ غیفاریـەکان کـردووە.[٧]

---

[١] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٤٩٧.

[٢] أسد الغابة، ج٢، ص ١٧٠.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج

[٤] أسد الغابة، ج٢، ص ١٧٠.

[٥] أسد الغابة، ج٢، ص ١٧١.

[٦] أسد الغابة، ج٢، ص ١٧١.

[٧] صحيح مسلم - كتاب المساجد ومواضع الصلاة - باب استحباب القنوت في جميع الصلاة إذا نزلت بالمسلمين نازلة، الرقم ٦٧٩.

خوفاف لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا کۆچی دوایی کرد.[1]

## ١١٨١. خوفافی کوڕی نەضلە(رضي الله عنه)

ناوی خوفافی کوڕی نەضلەی کوڕی عەمرە، وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوت دانیشتبوو کە خوفاف هاتە خزمەتی و بە چەند دێڕە شیعرێک حاڵی خۆی بۆ باس کرد و موسڵمان بوو.[2]

## ١١٨٢. خوفافی کوڕی عومەیر(رضي الله عنه)

ناوی خوفافی کوڕی عومەیرە، دایکی ناوی نودبەیە، کاتێک باپیرەی خوفاف هێرشی بردە سەر هۆزەکەی دایکی، نودبەی بە کەنیزەک گرت و دای بە عومەیری کوڕی، ئەوەبوو خوفافی بوو.[3]

خوفاف شاعیرێکی ناسراو و بەهێز بوو، موسڵمان بوو و لە فەتحی مەککەشدا بەشاری کرد و ئاڵا بەنی سولەیم بەدەست ئەوەوە بوو،[4] لە غەزای حونەین[5] و طائیفیشدا بەشداری کرد.[6]

دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) کە هەڵگەراوەکان دەرکەوتن خوفاف بە چاکی لەسەر ئیسلامەتی مایەوەو تا سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططاب ژیا.[7]

---

(1) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٣٥.

(2) معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٢٣٤٧، دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٥٤٨.

(3) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٣٦.

(4) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٧٥.

(5) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٣٦.

(6) أسد الغابة، ج٢، ص ١٧٢.

(7) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٣٦.

## ١١٨٣. خولەیدەی کچی حوباب(رضي الله عنها)

ناوی خولەیدەی کچی حووبابە، لە پشتیوانانە، هاتە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و بەیعەتی پێدا.[١]

## ١١٨٤. خولەیدی کوڕی مونذیر(رضي الله عنه)

ناوی خولەیدی کوڕی مونذیری عەبدیە، کاتێک پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد باوکی خولەیدیش مرد، عەلائی حەضرەمی ئەوی کردە بەرپرسی یەکەیەک تا لەساڵی حەڤدەی کۆچیدا هێرش ببەنە سەر فارس.[٢]

## ١١٨٥. خولەیدی کوڕی قەیس(رضي الله عنه)

ناوی خولەیدی کوڕی قەیسە، یان دەوترێت ناوی خولەیدەیە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان لە سولەمیەکان،[٣] دایکی ناوی ئیدامی سولەمیە،[٤] خولەید لە غەزای بەدر و ئوحودیشدا بەشدار بوو،[٥] پاش مردنی خۆی هیچ نەوەیەکی بەجێنەهێشت.[٦]

## ١١٨٦. خولەیسەی کچی قەیس(رضي الله عنها)

ناوی خولەیسەی کچی قەیسی ئەشجەعیە، بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم).[٧]

خولەیسە ژنی بەررائی کوڕی مەعروور بوو، منداڵێکی لێی هەبوو بە ناوی بیشر کە پێشتر باسی ژیانیمان کردووە.[٨]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٩.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤٢.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤٣.

[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٧٤.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤٣.

[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٧٤.

[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦١٠.

[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦١٠.

جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەردانی ماڵی خولەیسەی کرد و خولەیسەش خواردنێکی ئامادە کرد بۆی، ئینجا کاتی نوێژی نیوەڕۆ هات و پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ نوێژ.[1]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆتا نەخۆشیدا بوو، خولەیسە چوو بۆ لای، کە حاڵی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بینی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تای وەک ئەمەی تۆم بە کەسەوە نەدیوە، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموو (ئازارمان بۆ دوو بەرامبەرە وەک چۆن پاداشتیشمان بۆ دوو بەرامبەرە، خەڵکەکە چی دەڵێن؟)، خولەیسە وتی: خەڵکی ئەڵێن ژانەسکی هەیە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ما كان الله ليسلطها على رسوله، إنها همزة من الشيطان، ولكنها من الأكلة التي أكلتها أنا وابنك)،[2] (خوا ئەو دەردە زاڵ ناکات بەسەر پێغەمبەرەکەیدا، ئەوە نەفەسێکی شەیتانیە، بەڵام ئەم نەخۆشیەم لەو پاروە خواردنەوەیە کە من و کوڕەکەت خواردمان).

## ١١٨٧. خونەیسی کوڕی حوذافە(ﷺ)

ناوی خونەیسی کوڕی حوذافەی کوڕی قەیسی کوڕی عەددی قورەیشیە، یەکێکە لە یەکەمین موسڵمان بووەکان و لە کۆچەرانی حەبەشەیە، دایکی ناوی ضەعیفەی کچی حیذیمە.[3]

برایەکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە یەکێکە لە هاوەڵانی دیاری پێغەمبەری خوا(ﷺ).[4]

برایەکی تری ناوی قەیس بوو کە ئەویش لە کۆچەرانی حەبەشە بوو و دواتر گەڕایەوە مەککەو ئینجا کۆچی کرد بۆ مەدینە.[5]

---

(١) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٢٤٢.

(٢) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٢٣٦.

(٣) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج ٣، ص ٣٩٢.

(٤) الإصابة في تمييز الصحابة، ج ٤، ص ٥٧.

(٥) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص ٤٦١.

هێشتا بانگەوازی پێغەمبەر(ﷺ) نەچووبووە ناو ماڵی ئەرقەمەوە کە خونەیس موسڵمان بوو.[1]

کاتێک موسڵمانان کۆچیان کرد بۆ حەبەشە خونەیسیش یەکێک بوو لە کۆچەرەکان،[2] ئیبن سەعد دەڵێت: لە کۆچی دووەمی حەبەشەدا بەشدار بووە،[3] پاش ئەوە گەڕایەوە مەککەو دواتر کۆچی کرد بۆ مەدینە.[4]

خونەیس زاوای عومەری کوڕی خەططاب بوو، چونکە حەفصەی کچی عومەر ژنی بوو، ئەوەبوو دوای مەرگی خونەیس حەفصە بوو بە هاوسەری پێغەمبەری خوا(ﷺ).[5]

خونەیس هاودەم بە حەفصەی خێزانی کۆچی کرد بۆ مەدینە.[6]

کاتێک خونەیس کۆچی کرد بۆ مەدینەو دواتر پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینەو برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، برایەتی خستە نێوان خونەیس و ئەبی عەبسەوە.[7]

خونەیس یەکێک بوو لە بەشداربوانی غەزای بەدر، دوای غەزای بەدر زۆر نەمایەوەو پاش بیست و پێنج مانگ لە کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە خونەیس کۆچی دوایی کرد، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) خۆی نوێژی مردووی لەسەر کرد و لە گۆڕستانی بەقیع و لەپاڵ گۆڕی عوثمانی کوڕی مەظعووندا ئەسپەردە کرا.[8]

رایەکی تر دەڵێت: خونەیس لە غەزای ئوحودیشدا بەشداری کرد و تیایدا

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج ٣، ص ٣٩٢.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤٤.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٣٩٢.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٣٤٤.

[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٢٩٤.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٨١.

[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج ٣، ص ٣٩٢.

[8] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج ٣، ص ٣٩٢.

بریندار بوو و بە هۆی برینەکەیەوە کۆچی دوایی کرد.[1]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە دوای تەواوبوونی وادەی عیددەی حەفصە ئینجا بەهاوسەری گرت،[2] هەروەها بە دەقی دروست هاتووە کە لە ساڵی سێیەمی کۆچیدا بەهاوسەری گرتووە، جەنگی ئوحودیش لە مانگی شەوالی ساڵی دووەمی کۆچیدا بوو.[3]

ذەهەبی ئەو رایەی هێناوە کە دوای غەزای بەدر خونەیس مردووە،[4] ئیبن کەثیر هێناویەتی کە لە بەدردا پێکراوەو بەو هۆیەوە مردووەو حەفصەی ژنی بێوەژن کەوتووە.[5]

## ١١٨٨. خونەیسی ئەوسی(رضي الله عنه)

ناوی خونەیسی کوڕی ئەبووسائیبە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، یەکێکە لە بەشداربوانی بەیعەتی ریضوان، دواتریش لە غەزاکاندا بەشداری کرد، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) لە فتووحاتی عێراقدا بەشدار بوو.[6]

## ١١٨٩. خیداشی کوڕی بوشەیر(رضي الله عنه)

ناوی خیداشی کوڕی بوشەیری کوڕی ئەصەممە، رایەک دەڵێت: ئەم هاوەڵە بوو لە جەنگی یەمامەدا موسەیلەمەی کوشت،[7]

بەڵام رای راستتر ئەوەیە کە وەحشی موسەیلەمەی کوشتووە، وەک وەحشی خۆی دەگێڕێتەوە و پاش ئەوەی باس دەکات چۆن حەمزەی مامی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کوشت و دواتر چۆن هات و موسڵمان بوو، دەڵێت:

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ١٨١.

[2] سير اعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٧.

[3] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ١٦٥.

[4] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ١٤٢.

[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٣١٨.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج ٢، ص ٣٤٦.

[7] أسد الغبة، ج٢، ص ١٥١.

کە سەردەمی ئەبووبەکر هات و سوپای نارد بۆ یەمامە، منیش وتم: ئەچم تا موسەیلەمە بکوژم بەوە حەقی کوشتنەکەی حەمزە بکەمەوە،[1] لەگەڵ خەڵکەکە چووم و موسەیلەمەم کردە چاو،[2]بینیم کەسێک لای کەلەبەرێکی دیوارێک وەستاوەو دەڵێیت وشترە رەشەیەکی پرچ بڵاوە،[3] لەگەڵ یەکێک لە پشتیوانان هەڵمانکوتایە سەری و بە هەمان ئەو رمەی کە حەمزەم پێ کوشتبوو دام لە موسەیلەمە،[4] رمەکەم دا لە نێوەندی مەمکەکانی و لە پشتەوە رمەکە دەرچوو، پشتیوانیەکەش بە شمشێر لێیداو دای لە سەری،[5] ئیتر خوا زاناترە کاممان کوشتمان، ئەگەر من کوشتبێتم ئەوە چاکترین کەس و خراپترین کەسیشم کوشتون[6](واتە حەمزەو موسەیلەمە).

## ١١٩٠. خیداشی کوڕی عەییاش(رضي الله عنه)

ناوی خیداشی کوڕی عەییاشە، لە پشتیوانانە، لە جەنگی یەمامەدا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[7]

## ١١٩١. خیداشی کوڕی قەتادە(رضي الله عنه)

ناوی خیداشی کوڕی قەتادەی کوڕی ڕەبیعەیە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر، دواتریش لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و لەو غەزایەدا شەهید بوو.[8]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب قتل حمزة بن عبد المطلب(رضي الله عنه)، الرقم ٤٠٧٢.

[2] مسند أبي داود الطيالسي - وحشي بن حرب، الرقم ١٤١٢، السنن الكبرى للبيهقي - كتاب السير - جماع أبواب السير - باب الكافر الحربي يقتل مسلما ثم يسلم لم يكن عليه قود، الرقم ١٨٢٥٨.

[3] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب قتل حمزة بن عبد المطلب(رضي الله عنه)، الرقم ٤٠٧٢.

[4] مسند أبي داود الطيالسي - وحشي بن حرب، الرقم ١٤١٢، السنن الكبرى للبيهقي - كتاب السير - جماع أبواب السير - باب الكافر الحربي يقتل مسلما ثم يسلم لم يكن عليه قود، الرقم ١٨٢٥٨.

[5] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب قتل حمزة بن عبد المطلب(رضي الله عنه)، الرقم ٤٠٧٢.

[6] مسند أبي داود الطيالسي - وحشي بن حرب، الرقم ١٤١٢، السنن الكبرى للبيهقي - كتاب السير - جماع أبواب السير - باب الكافر الحربي يقتل مسلما ثم يسلم لم يكن عليه قود، الرقم ١٨٢٥٨.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٦.

[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٦.

## ١١٩٢. خیداشی کوڕی ئەبی خیداش(ﷺ)

ناوی خیداشی کوڕی ئەبی خیداشی مەککیە، مامی صەفییەی کچی بەحریەیە، خیداش جارێک پێغەمبەری خوای(ﷺ) بینی لە قاپێکدا نانی دەخوارد، دواتر خیداش داوای کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) تا ئەو قاپەی پێ ببەخشێت، ئیتر ئەو قاپەی لا مابوویەوە تا لە خیلافەتی عومەردا خەلیفە کە دەچوو بۆ لایان داوای دەکرد ئەو قاپەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بۆ بهێنن و ئاوی زەمزەمیان پێ دەخواردەوە.[١]

## ١١٩٣. خیذامی کوڕی ومدیعە(ﷺ)

ناوی خیذامە، سەبارەت بە باوکی دەوترێت ناوی وەدیعە بووە، رایەکیش دەڵێت: باوکی ناوی خالید بووە، کونیەکەی خیذام ئەبوو وەدیعەیە.[٢]

خیذام کچێکی هەبوو بە ناوی خەنساء، خەنساء دەڵێت: من بێوەژن بووم و لای باوکم مابوومەوە باوکم بەبێ ویستی خۆم منی مارە کرد لە کەسێک، منیش چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش هاوسەرگیریەکەی هەڵوەشاندەوە،[٣] دواتر خەنساء چوو بە ویستی خۆی شووی کرد بە ئەبوولوبابە.[٤]

## ١١٩٤. خیراشی کوڕی صیممە(ﷺ)

ناوی خیراشی کوڕی صیممەیە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان لە سولەمیەکان،[٥] دایکی ناوی ئوممحەبیبە کە خەڵکی طائیف بوو.[٦]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٥.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٩.

[٣] صحيح البخاري - كتاب النكاح - باب إذا زوج ابنته وهي كارهة فنكاحه مردود، الرقم ٥١٣٨.

[٤] سنن الدارقطني - كتاب النكاح، الرقم ٣٥٥٢.

[٥] أسد الغابة، ج٢، ص ١٥٦.

[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٦٤.

ژنەکەی خیراش ناوی فەکیهە بوو کە لەم ژنەی کوڕێکی بوو بە ناوی سەلەمە، دوو منداڵی تریشی هەبوو بە ناوەکانی عەبدورەحمان و عائیشە کە دایکیان ئومموەلەد بوو،[1] کوڕێکی تریشی ناوی طەلحە بوو کە فەرموودەی لە هاوەڵانەوە گێڕاوەتەوە.[2]

خیراش یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر،[3] لەو غەزایەدا خیراش دوو ئەسپی پێ بوو.[4]

خیراش خزمەتکارێکی هەبوو بە ناوی تەمیم کە لەگەڵ خۆیدا بردی تا لە غەزای بەدردا بەشدار بێت و پێکەوە بەشداری غەزاکەیان کرد.[5]

دواتریش خیراش لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و تیایدا بریندار بوو، لە غەزای ئوحوددا یانزە جار پێکرا، خیراش یەکێک بوو لە تیرهاوێژەکانی ناو ئەو غەزایە.[6]

## ١١٩٥. خیراشی کوڕی ئومەییە(ﷺ)

ناوی خیراشی کوڕی ئومەییەی خوزاعیە، کونیەکەی ئەبوو نەضلەیە.[7]

لە غەزای مورەیسیعدا بەشدار بوو، هەروەها لە حودەیبیەشدا بەشدار بوو و لەوێ سەری پێغەمبەری خوای(ﷺ) تاشی، رایەکی تریش دەڵێت: بەڵکو لە عومرەی دوای حودەیبیەدا سەری پێغەمبەری خوای(ﷺ) تاشی.[8]

پێغەمبەر(ﷺ) لە حودەیبیەدا خیراشی بە وشترێکەوە نارد بۆ مەککە، قوڕەیشیەکان ئازاریان دا و ویستیان بیکوژن، بەڵام حەبەشیەکان نەیانهێشت،

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٦٤.
[2] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١١٨٥.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٠.
[4] أسد الغابة، ج٢، ص ١٥٦.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٢.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٠.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٩.
[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٩.

بۆیە خیراش گەڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) عوثمانی کوڕی عەففانی نارد.[1]

خیراش لە غەزای خەیبەریشدا بەشداری کرد.[2]

## ١١٩٦. خیرباق(رضي الله عنه)

لە فەرموودەیەکدا باسی هاتووە، دەستەکانی ئەم هاوەڵە درێژ بوون، جارێک پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی عەسری کرد و سێ رکات نوێژی کرد، ئینجا چوویەوە بۆ ماڵەوە، خیرباق چوویە ژوورەوە بۆ ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تۆ سێ رکات نوێژی عەسرت کرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە تووڕەییەوە هاتە دەرەوەو عەباکەی بەدوای خۆیدا رادەکێشا تا هاتە ناو خەڵکەکەوەو فەرمووی: ئەرێ ئەمە راست دەکات؟ هاوەڵانیش وتیان: بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) رکاتی چوارەمیشی خوێند و دواتر سەلامی دایەوەو دواتر دوو سوجدەی برد و ئینجا سەلامی دایەوە.[3]

## ١١٩٧. خیرنیقی کچی حوصەین(رضي الله عنها)

ناوی خیرنیقی کچی حوصەینی خوزاعیە، ئەم ئافرەتە موسڵمان بوو و بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ).[4]



[1] مسند أحمد بن حنبل - أول مسند الكوفيين(ﷺ) - حديث المسور بن مخرمة الزهري ومروان بن الحكم(ﷺ)، الرقم ١٩٢١٢، حسنه شعيب الأرناؤوط.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٩.

[3] صحيح مسلم - كتاب المساجد ومواضع الصلاة - باب السهو في الصلاة والسجود له، الرقم ٥٧٤، سنن أبي داود - كتاب الصلاة - باب السهو في السجدتين، الرقم ١٠١٨.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٨.

## پێڕست

## پێرست

ئەو هاوەڵانەی ناویان بە پیتی (خ) دەست پێ دەکات ........ ٥٠١



**ڕێکخراوی میعراج بۆ توێژینەوە و گەشەپێدان**

**منظمة المعراج للبحوث والتنمية**

**Meraj Organization for Research and Development ( MORD )**

ڕێکخراوێکی فەرمی و سەربەخۆ و بێلایەنی ناحکومی و قازانج نەویستە، خاوەنی مۆڵەتی فەرمانگەی ڕێکخراوە ناحکومییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستانە، بە ژمارە: (٥٢٥٩) لە ڕێکەوتی: (٢٠٢١/٢/٢١ ز).

## - ئـامـانـجـمـان -

١ تێگەیشتن لە قورئان و فەرموودە لە میانەی ژیاننامەی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٢ پتەوکردنی ئیمان و، چاندنی خۆشەویستی زیاتر لە دڵەکان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و تێڕامان لە هەموو جومگەکانی ژیانی و، جێبەجێکردنی لە ژیانی ڕۆژانەمان.

٣ پێگەیاندنی نەوەیەکی شارەزا و بەئاگا لە ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە هەڵقوڵاوی سەرچاوە ڕاست و دروستەکان بێت.

٤ وەڵامدانەوەی هەموو گومان و شوبهەکان لەسەر ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٥ خزمەتکردن بە ژیاننامەی پێغەمبەران - سەلامی خوایان لەسەر -، وە هاوەڵە بەڕێزەکان - خوای گەورە لێیان ڕازی بێت-.

٦ میعراج بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی کە بریتیە لە بڵاوکردنەوە و ئاشناکردنی مسوڵمانانی کوردزمان بە ژیاننامەی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەوڵ دەدات بە هەموو ڕێگایەکی شەرعی و، بە بەکارهێنانی ئامرازە جیاوازەکان و، گەیاندنی بۆ هەموو ئاستەکانی کۆمەڵگە - پشتیوان بەخوا-.


+964 750 143 1929

ئیدارەی ڕاپەڕین - چوارقوڕنە

merajkurd1440@gmail.com

ڕێکخراوی میعراج


